# سەردەم

## گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕان و کولتوری بیانی

**54**

**بەهاری**

2008

**ســـــاڵی دەیەم**

- سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لە بواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.
- داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بە چاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێڕدراو بنێرن.
- ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداریدەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێڕەوبکەن.
- باشتر وایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، بە فۆنتی سەحیفە بۆلد، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێڕدا.
- ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێڕن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.
- بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.
- پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.


**خاوەنی ئیمتیاز:** شێرکۆ بێکەس

**سەرنووسەر:** ڕەووف بێگەرد

**دەستەی نووسین**

ڕێبین هەردی     شوان ئەحمەد

د. شاهۆ سەعید

**دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری**

تاڤگە فائق

**بەرگ:** نەرمین مستەفا

**هەڵەچنی چاپ:** ساکار رەووف

**ناونیشان**

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم 3129609

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

**Tel - Fax: 0044 7543129839**

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( ***14665/615*** و ***14665/616***) تاران

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**

*govarysardam@yahoo.com*

*www.serdamco.info*

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

# سەردەم

## ناوەرۆکی ژمارە 54

### ▪ فیکر و فەلسەفە



### ▪ فایلی ژمارە: سینەما



### ▪ ئەدەب



### ▪ بابەتی تایبەت



### ▪ وێستگەکانی سەردەم



**نرخی ( 1200 ) دینارە**

# پرۆژەی تێگەیشتن و راڤەکردنی ئاین (سۆسیۆلۆژیا و ئاین)

دانیال هیرڤیۆلێژی و ژان پۆل ویلیەم

لە فەرەنسییەوە: عادل باخەوان

### بەشی سێهەم

## ئەلیکسی دوو تۆکڤیل

(1859-1805)

**1-بەهاکانی ئاین لە کۆمەڵگە دیمۆکراتەکاندا**

دانانی ئەلێکسی دوو تۆکڤیل لە ڕیزی سۆسیۆلۆگەکاندا و باسکردنی وەك یەکێك لە دامەزرێنەر و باوکە گەورەکانی سۆسیۆلۆژیا ماوەیەکی زۆری ویست و سۆسیۆلۆگەکان بە ئاسانی خۆیان نەدا بەدەست ئەم واقیعەوە.

رۆبێر نیسبە لە کتێبی (ترادیسیۆنی سۆسیۆلۆژیا) و رایمۆند ئەرۆن لە کتێبی (قۆناغەکانی فیکری سۆسیۆلۆژی)دا تۆکڤیل وەك یەکێك لە دامەزرێنەرانی سۆسیۆلۆژیا ریزبەند دەکەن.

رۆبێر نیسبە پێیوایە کە تۆکڤیل وەك مارکس، بەڵام تەواو بە پێچەوانەی ئاڕاستە فیکریەکانیەوە، بەهێزترین کارایی بەجێهێشتووە بەسەر فیکری سۆسیۆلۆژی سەدەی نۆزدەهەمەوە.

رایمۆند ئەرۆنیش پێیوایە کە تۆکڤیل سیۆسیۆلۆگێکی گەورەیە، چونکە کۆی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان ڕاڤە دەکات و ڕەوڕەوەی دەرکەوتن و گەشەکردنیان دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە. گرنگی ئەم پیاوە لەوەدایە کە تەواو بە پێچەوانەی مارکسەوە کە لە "چاویلکە" ئابوریەکانیەوە دەیڕوانیە هەموو ئەو گۆڕانکاریانە، دێت و لەسەر شارە سیاسیەکانەوە سەرهەڵدانی دیمۆکراسی و دەرەنجامەکانی دەخوێنێتەوە.

وەك هەر یەكێك لە باوكە گەورەكانی سۆسیۆلۆژیا و كلاسیكەكانی ئەم مەیدانە، راڤەكردنی ئاین پانتاییەكی گەورەی فیكر و تووێژینەوەكانی تۆكڤیلی داگیركردووە. وەك ماركس و دۆركایم و ڤێبەر، ئەو دێت و بە وردی لە گۆڕانكاریە كۆمەلآیەتیەكان رادەمێنێت: رامان لەو هەڵوەشانەوەو بیناكردنەوە گەورانەی كە بوون بە مۆركی سەرجەم كۆمەڵگە مۆدێرنەكان، بە مەبەستی دەستنیشانكردنی ئاراستەكانی پێشكەوتنەكانیان.

لێرەوە تۆكڤیل دێت و گرنگیەكی فراوان دەدات بە داهاتووی فاكتە[1] ئاینیەكان لە نێو رەورەوەی سەرجەم ئەم گۆڕانكاریە مەزنانەدا. ئەمە ئەو خاڵە سەنتراڵەیە كە تێبینیەكانی ئێمە بەلای خۆیدا رادەكێشێت و وامان لێدەكات لە سەری بوەستین.

دوور لە هەموو ئەو زانایانەی پێیانوایە كە لەگەڵ مۆدێرنیزەكردن و بەرەوپێشەوە چوونی كۆمەڵگەكاندا ئاین پەراوێز دەكرێت و لە ژیانی كۆمەلآیەتی دوو دەخرێتەوە، تۆكڤیل پێیوایە بە سنووری مۆدێرنیزەكردن و پێشكەوتنی كۆمەڵگەكان فاكتە ئاینیەكان بەهێزتر دەبن و بەردەوام خۆیان بینادەكەنەوەو مۆدێلی نوێی خۆنمایشكردن لە نێو كۆمەڵگە دیموكراتەكاندا دەدۆزنەوە.

مەیدانی توێژینەوەی تۆكڤیل بریتیە لە ولآتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا كە چەندین گرفتی بۆ هەموو ئەو زانایانە دروستكردووە كە تیۆریان لەسەر پەراوێزبوونی ئاین لە كۆمەڵگە دیموكرات و مۆدێرن و سكولاریزەكراوەكاندا بیناكردووە. ولآتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ئەو نیشتمانەیە كە پێشنیاری جۆرێكی دیكە لە پەیوەندی نێوان ئاین و كۆمەڵگە دەكات و دەمانخاتە بەردەم ئەزموونێكی تایبەتەوە كە تەواو جیاوازە لە ئەزموونی فەرەنسی، وەك پیەر بورێتز دەڵێت:

"لێكدژی نێوان مۆدێلی ئەمەریكی و مۆدێلی فەرەنسی لەوەدایە كە لەوبەری ئەتلەنتیكەوە ئەمەریكا ئەولەویەت دەدات بە ئازادی ئاینی بەرادەیەك كە لەیەكجیاكردنەوەی ئاین و دەوڵەت گرفت دروستناكات و وەك شتێكی سروشتی سەیر دەكرێت. لەم بەری ئەتلەنتیكیشەوە فەرەنسا ئەولەویەت دەدات بە خەیاڵدانی جەنگ دژی كۆنەپەرستی و رزگار بوون لە ئیمان و بیروڕا ئاینیەكان[2]"

بێگومان ئەم لێكدژیەی (ئۆپۆزیسیۆن) نێوان مۆدێلی ئەمەریكی و مۆدێلی فەرەنسی، كە ئەمرۆ زیاتر لە هەموو كاتێك بەرهەستمان دەكەوێت، یەكێكە لەو هۆكارە هەرە گرنگانەی كە سۆسیۆلۆژیای تۆكڤیل وەك پێویست لە فەرەنسادا بلآونەبێتەوەو گرنگی پێنەدرێت[3].

بەراوردكردن دڵی زیندووی میتۆدی كاركردنی تۆكڤیلە. ئەو موسافیرێكی بەردەوامبوو (ولآتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا، كەنەدا، بەریتانیای گەورە، ئیرلەندا، سویسرا، سیسیلیا، جەزائیر). لەم ولآتانەدا تۆكڤیل هەوڵیدەدا هەموو ئەو عادات و تەقالیدانە تۆمار بكات كە بەرچاویلكە سۆسیۆلۆژیەكانی دەكەوتن و پاشان بەراوردی دەكردن بە یەكتری و دەیخستنە ژێر تاقیكردنەوەی ئەم ئیشكالیەتە گرنگە:

"بیناكردنە مۆدێرنە كۆمەلآیەتیە – سیاسیەكانی ئەو كۆمەڵگانە و گۆڕانكاریە مەزنەكان تا كوێ پر دەكەن و لە چ ئاستێكدان و جیاوازیەكانیان لە كوێدایە و خاڵە هاوبەشەكانیان كامانەن".

"موقارەبەی" تۆکڤیل، وەك ژان – کلۆد لەمبێرتی دەڵێت، ئیدیال – تیپیێکی گرنگە: ئەو دێت و کۆمەڵگە وەك تیپیێکی ئیدیال دروستدەکات و بۆ تێگەیشتن لەم کۆمەڵگەیەش دەمانخاتە بەردەم بەراوردکردنی بە کۆمەڵگەی ئەریستۆکراسی:

"بۆئەوەی خوێنەر لێم تێبگات، ناچارم بەوەی کە نموونە بە چەند دەوڵەتێکی ئیکستریێم بێنمەوە، ئەریستۆکراسیەکی بێ دیمۆکراسی، دیمۆکراسیەکی بێ ئەریستۆکراسی. هەندێکجار هەردوو پرانسیپەکە دەبەخشم بە یەکێك لەو دەوڵەتانە، بە پێچەوانەی سروشتی بەرهەمهێنانیانەوە.. لە تێکستەکانمدا خوێنەر دەبێت بۆچوونەکانم جیابکاتەوە لەو شتانەی کە ئەوانی دیکە دەیڵێن و ئەمەش ڕێگایەکە بۆ تێگەیشتن لەو چەمکانەی کە من بەرهەمیان دەهێنم[4]"

مەشخەڵێکی دیکەی مێتۆدی کارکردنی تۆکڤیل، کەلای ماکس ڤێبەریش دەیدۆزینەوە، بریتیە لە ڕەدکردنەوەی "تاکە – هۆکار":

"ڕقمە لە هەموو ئەو سیستەمە ڕەهایانەی کە ڕووداوە گەورە جیهانیەکان دەبەستنەوە بە چەند هۆکارێکی گەورەی سەرەتاییەوەو مێژوو دابەشدەکەن بەسەر چەند قۆناغێکی یەك لە دوای یەکی حەتمیداو، ڕۆڵی کارای مرۆڤەکان لە بیناکردن و دروستکردنی مێژوودا دەسڕنەوەو مرۆڤ وەك بێ دەسەلاتێك دەخەنە سەر شانۆ[5]"

ڕاستە تۆکڤیل گرنگیەکی تەواو دەبەخشێت بە کۆی دەرەنجامەکانی پرانسیپی "یەکسانی" هەلومەرجەکان و دڵنیایە لەوەی کە ئەمە باشترین ڕێگای کۆمەڵگەکانە بەرەو گەردوونی دیمۆکراسی. بەلام لە هەمان کاتدا، دڵنیایە لەوەش کە تەنها "یەك" ڕێگامان بەرەو دیمۆکراسی نییە، بەڵکو چەندین "ڕێگا"مان هەیە. تەنها یەك دیمۆکراسیشمان نیە، بەڵکو چەندین دیمۆکراسیمان هەیە. بۆ نموونە مۆدێلی ئەمەریکی تاکە مۆدێلێك نیە، بەڵکو یەکێکە لە مۆدێلەکان.

لەگەڵ ئامادەبوونێکی بەهێزی پەتای ستەمکاریدا، تۆکڤیل، دوور لە دێتێرمینیسم[6]، گەرەو لەسەر ئەکتەرە کۆمەلایەتیەکان دەکات بۆئەوەی پرانسیپی ئازادی بۆ یەکتری دابین بکەن.

تۆکڤیل زۆر بە باشی تێگەیشتبوو لەوەی کە دیمۆکراسی هەرگیز بەدی نایەت بەبێ ئامادەیی ئەکتەری دیمۆکرات، واتە بەبێ ئامادەبوونی ئەو ئەکتەرە کۆمەلایەتی و سیاسیانەی کە ئیمانیان بە بەهاکانی دێمۆکراسی هێناوەو لە ژیانی ڕۆژانەیاندا کاریان پێدەکەن.

### 2-ئەرستۆکراتێکی دێمۆکرات

تۆکڤیل مناڵی خانەوادەیەکی ئەرستۆکراسی بە ئەسڵ نۆرمۆندیە[7] و ساڵی 1805 لە پاریس و لە نێو پانتاییەکی خێزانیی تەواو کاتۆلیکدا لەدایکبووە. ئەو مناڵی بەرەو ئەرستۆکراتی دۆڕاو لە بەرامبەر شۆڕشی فەرەنسیدا بوو. وەك خوێنەرێکی گەورەی فەیلەسووفەکانی سەدەی هەژدەهەم، تێگەیشتبوو لەوەی کە ڕەوڕەوەی مێژوو بۆ دواوە ناگەڕێتەوەو کاروانی کۆمەڵگەکان بەرەو دیمۆکراسی ڕاناوەستێت. وەك گویزۆت دەڵێت "ئەو وەك ئەریستۆکراتێکی دۆڕاو دڵنیابوو لەوەی کە بڕواکان لەسەر هەقن[8]".

تۆکڤیل بە وردی تێبینی دەکرد کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ "یەکسانی" هەلومەرجە

کۆمەڵایەتییەکان دەبێت بە دروشمی کۆمەڵگەکانی سەر ڕێگای دیموکراسی. لێرەوە خەمی گەورەی ئەو دەبێت بە ئاشتکردنەوەی ئەم "یەکسانیە" لەگەڵ چەمکی "ئازادی"دا کە بووبووە خولیای هەمیشەیی و بەرنامەی کارکردنی.

ڕاستە تۆکڤیل تا سەر ئێسقانی لکابوو بە دیموکراسیەوە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئەو تەواو وشیار بوو بە مەترسیەکانی دیموکراسی، مەترسیەکانی وەك:

–تاکگەراییەك کە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لاواز دەکات.

–دورخستنەوەی امرۆڤەکان لە چاکە گشتیەکان.

–لەدەستدانی بەهـ مەدەنیەکان.

–ستەمکاری نەرم.

–دیکتاتۆریەتی بۆچوون.

–بەگدانانی فیکری سەربەخۆو داهێنەر.

لەبەرئەوەی کە ئەو قاچێکی لە نێو ئەریستۆکراسیدا و قاچێکی دیکەی لە نێو دیموکراسیدا بوو، زۆر بەجوانی هەستی بە هەموو ئەو پرسیارانە دەکرد کە سەرهەڵدانی کۆمەڵگە دیموکراتەکان دەیانوروژاندن. لێرەوە ئێمە لەگەڵ فورنسوا فوریێ دا دەڵێین:

"تۆکڤیل لەگەڵ ئەرکایسمی هەڵوێستە وجودیەکەیدا سەرگەرمی دروستکردنی مۆدێرنیتێی پرسیارەکانی بوو[9]"

تۆکڤیل لە نێوان دوو قۆناغی گەورەدا بەشێك لە ژیانی بەسەربرد. قۆناغی کۆتایی ئیمپراتۆریەتی یەکەمی فەرەنسا، ساڵی 1815، دەستپێکردنی قۆناغی ئیمپراتۆریەتی دووەم، ساڵی 1852. ئەم سەردەمە تا ئێستاش بە زەمەنی شۆڕشەکان بەناوبانگە، شۆڕشی 1830 و 1848. ساڵی 1859 لە شاری کان (فەرەنسا) کۆچی دوایی دەکات. واتە تەنها هەشت ساڵ دوای کۆدێتاکەی ناپلیۆن.

–ساڵی 1838 دەبێت بە ئەندامی ئەکادیمیای زانستەکانی مۆراڵ و سیاسەت.

–ساڵی 1941 دەبێت بە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسی.

–هەروەها تا ساڵی 1848 وەك ئەندام پەرلەمان هەڵدەبژێردرێت و نوێنەرایەتی ناوچەی ڤالۆن دەکات.

–ساڵی 1849 وەك یاسادانەر هەڵدەبژێردرێت.

–لە مانگی ژون تا مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی 1849، دەبێت بە وەزیری دەرەوەی فەرەنسا. لەم ماوە کورتەدا سەردانی رۆم دەکات و ئەرکی جێگیرکردنی دەسەڵاتی پاپای ڤاتیکانی پێدەسپێردرێت. مەبەست لە پاپا "*Pie*" یانزەهەمە کە دواتر بەیانێك دەردەکات و تیادا ئیدانەی بنەماکانی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان دەکات و هەروەها هێرشی سەخت دەکاتە سەر شۆڕشی فەرەنسی.

تۆکڤیل هەوڵیدەدا کە ئاین و کۆمەڵگە مۆدێرنەکان پێکەوە ئاشتبکاتەوەو بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵی دەدا کە دەسەڵاتی پاپ بخاتە نێو رژێمێکی دەستووریەوە. ئەو لەم هەوڵەیدا لەبەر دوو هۆ شکست دێنێت: یەکەم لەبەر ئەوەی دەسەڵات وەك پێویست پشتیوانی لێنەکرد و دووەمیش لەبەرئەوەی کە پاپ بە دەنگیەوە نەهات. بۆیە دواتر دەنووسێت:

"گەربێت و پاپ، کە تازە بە تازە دەسەڵاتی گرتووەتە دەست، بیەوێت دەسەڵاتی خۆی فەرزبکات بەسەر ئەوروپایەکدا کە نایەوێت ملکەچی بێت، گەر بێت و پاپ بیەوێت بە

پێچەوانەی مێژووەوە کار بکات، ئەوە ئەوەی دواتر لاواز دەبێت و دەیدۆڕێنێت کەس نیە خودی کەنیسەی کاتۆلیکی نەبێت[10]".

پاش دەستپێکردنی سەرەتا شەرمنەکانی لیبرالیسم لە فەرەنسای پاشایەتی دەستوری لویسی هەژدەهەمدا (1815-1830) و شارلی دەهەمدا، تۆکڤیل بە نادڵنیاییەکی بەردەوامەوە لە شۆڕشی 1830 و دەرەنجامەکانی رادەمێنێت، هەرچەند هاودەنگی خۆی لەگەڵ دروشمەکانیدا رادەگەیەنێت. دامەزراندنی پاشایەتی مانگی ژویە (لویس – فیلیپ) هەلومەرجێکی نالەباری بۆ تۆکڤیل دروستکرد، بۆیە بڕیاریدا خۆی لێدوربخاتەوە. لێرەوە و لەگەڵ گوستاڤی هاوڕێیدا بڕیاردەدات ڕێگای ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بگرێتە بەرەو ئەم هەلەش بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی بە وردی لە دەزگاکانی ئەو ولاتە بکۆڵێتەوە. ئەم سەفەرەی لە مانگی ئەڤریلی 1831 وە دەستپێدەکات و مانگی مارسی 1832 کۆتایی پێدێت و دواتر ساڵی 1833 ڕاپۆرتێك لەسەر سەفەرەکەی بەم ناونیشانە دەنووسێت: لە سیستەمی زیندانەکانی ئەمەریکاوەو چۆنیەتی جێبەجێکردنی لە فەرەنسادا. ساڵی 1835 لە نامەیەکدا دان بەوەدا دەنێت کە هەڵبژاردنی ئەو بابەتە تەنها بیناوویەك بوو بۆئەوەی سەر بکات بە هەموو کونێکی ئەمەریکادا و، ویستویەتی بزانێت: تا چەندێك جێبەجێکردنی بنەمای "یەکسانی" لەگەڵ بنەمای "ئازادی"دا یەکدەگرێتەوە. ساڵی 1835 بەرگی یەکەمی کتێبە بەناوبانگەکەی "دیموکراسی لە ئەمەریکادا" بلأودەکاتەوەو ساڵی 1840یش بەرگی دووەمیشی دەخاتە بازاڕەوە.

لەسەر ئاستی پەیوەندی بە ئاینەوە، تۆکڤیل لە سەردەمی لاوێتیداو رۆژێك بەهاوڕێکەی دەڵێت: "من پیاوێکی ئیماندارم، بەلأم بێ پراکتیك"، بەلأم دواتر کە کامڵ دەبێت، لە 20 ئۆکتۆبەری 1843 دا دەنووسێت:

"من ئیماندار نیم، ئەم شتە ڕاناگەیەنم بۆ ئەوەی بەسەر خۆمدا هەڵبدەم، بەلأم با ئیمانیشم نەبێت، هەرگیز نەمتوانیوە لە چرکەی خوێندنەوەی ئینجیلدا کۆنترۆڵی هەستەکانم بکەم"

ئەمە لەو سەرشارەوە دێت کە تۆکڤیل بەهایەکی گرنگ دەدات بە کارایەکانی ئاین لەسەر کۆمەڵگە مرۆییەکان و پێیوایە کە ئینجیل تا ئێستاش و لە زەمەنی مۆدێرنیشدا ئامادەیەو مۆراڵەکانی بەسەر کۆمەڵگەدا دابەشدەکات:

"پێموایە گەورەترین داهێنانی مۆدێرن لە بواری مۆراڵدا لە گەشەکردنی بەهێز و دروستکردنی فۆرمێکی بایەخداردایە کە لە ئەمڕۆی ئێمەدا خۆی لە دوو بواردا دەبینێتەوەو کە، من پێموایە، پێشتر کریستیانیسم کاری لەسەر کردوون و بەرهەمی هێناون. ئەو دوو بوارەش بریتین لە: پەیبردن بەوەی کە هەموو مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی خاوەنی یەکجۆر مافن لەسەر زەویدا. هەروەها ئەوانەی کە زۆرتریان هەیە دەبێت بێن بە هانای ئەوانەی کە کەمتریان هەیە یان هیچیان نیە."

بە دیوێکی دیکەدا دەکرێت بڵێین، تۆکڤیل پێیوایە کە: "کریستیانیسم قولأیی مۆراڵی سەردەمی مۆدێرنە" و کاتێك ناوەڕۆکی شۆڕشی فەرەنسی قبوڵدەکات، لەبەرئەوەیە کە پێیوایە "ئەو ناوەڕۆکە دەرەنجامی هەمان شۆڕشی کریستیانیسمە[11]". لەگەڵ ئەم دانپیانانەشدا، تۆکڤیل پێیوایە کە:

"ڕۆژێـك دادێـت كـه ئـاین لـه كۆمەڵگـه دیموكراتەكانـدا خـۆی وەردەگێڕێتـه سـەر ڕێكـەوتنێكی كۆمەڵایـەتی نێـوان ئەكتـەرە كۆمەڵایەتیـەكان و لـەم بەهایـەدا كورتدەكرێتەوە[12]".

ڕاسـته تۆكڤیـل زانایـەكی دژە ئـاین نـەبوو، بەڵام ئەوەش ڕاسته كه ڕەخنەگرێكی بەردەوامی كەنیسەی كـاتۆلیكیش بـوو. بەتایبـەتی كاتێك ئەم كەنیسەیه پشتیوانی خـۆی دەردەبڕێت بۆ كۆدێتاكـەی 2 دیـسەمبەری 1851 دژ بـه جمهوریـەتی دووهـەمی فەرەنـسی. ئـەو دەنووسێت:

"له ئەمڕۆدا و زیاتر لـه هـەموو كاتێك تووڕەم لـه هەڵوێـستی هـەموو ئـەو كاتۆلیكانـەی كـه پـشتیوانی لـه سـتەمكاری دەكـەن و خۆیـان خـستووەته خزمـەتی تاوانبـارەوەو بـوون بـه بـازووی بـەهێزی دەسـەڵات و ڕۆڵـی جانـدارم دەبینن و بوون به ڕەقیب بەسەر گەلەوە"

هەڵوێـستی تۆكڤیـل، گەواهیـەكی زینـدووی ململانێی نێوان ئاین و دەوڵەتـه لـه فەرەنسادا، بەتایبەتی له بواری خوێندندا. ئەو پێیوابوو كه، بەداخەوە، له فەرەنسادا، ئاین و ئازادی پێكـەوە هەڵناكـەن. بۆیـه بڕیـاری دا لـه نێـوان ئـەو دوو بەرەیـەدا هیـچكامیان هەڵنەبـژێرێت: بـەرەی ئەوانـەی كـه پرۆگرامـی خوێنـدن بـه نـا ئـاینی دەزانن و پێیانوایـه ڕێگایەكه بۆ لادانی نـەوەی نوێ لـه هیدایـەت و خواناسی. هـەروەها بـەرەی ئەوانەش كه بەشێوەیەكی ڕەها بـەهاكانی ئاین ڕەددەكەنـەوە. لێـرەوە بڕیـاری گۆشـەگیری دەدات. گۆشەگیری بـەو مانایـەی كه نـه یەكـەم و نەدووەم، بەڵكو بێلایەنی.

ئـەم بڕیـارەی تۆكڤـیل لـەو هەڵوێـستەوە دێت كه پێیوایه جیاوازیەكی ڕادیكاڵ له نێوان كاتۆلیسیسم و دیموكراسیدا نیه:

"من پێموایه هەڵەیەكی كوشنده دەكەین گەر پێمانوابێت ئاینی كاتۆلیكی دوژمنی سەرەكی دیموكراسیه[13]"

ئـەو پێیوایـە كاتۆلیسیـسم تـەواو بـه پێچەوانەی پرۆتیستانتیـسمەوە كـه مرۆڤـەكان بـەرەو سـەربەخۆیی دەبـات، كـار لەسـەر دابینكردنی یەكسانی هەلومەرجەكان بۆ هـەموو مرۆڤـەكانی سـەر زەوی دەكـات و بێگومـان ئەمـەش دڵـی زینـدووی دیموكراسـیه. ئـەو پێیوایه كاتێك كه:

"قەشـەیەك لەسـەر مینبـەرێك رادەوەسـتێت، ئەمه مانای ئەوەیه كه هەموو ئەو كەسانەی كه له خوارەوە دانیشتوون یان به پێوەن یەكسانن و كەسیان لەویدیكەیان باڵاتر نییه"

لـه هەلومـەرجێكی ئـاوادا هـەموو لایـەك یەكـسانن، دەوڵەمەنـد و هـەژار، زانـا و نـەزان، بەهێز و لاواز. تۆكڤیل دەنووسێت:

"گـەر كریستیانیـسم بتوانێـت خـۆی پاكبكاتـەوە لـەو حیقدەی كـه لـه كۆمەڵگـەدا بـه دەستی خۆی دروستی كرد، دڵنیام لەوەی كه نـەك هـەر نابێـت بـه جەمـسەری دژایـەتیكردنی سەردەمی مۆدێرن، بەڵكو هەیمەنەشی بەسەردا دەكات[14]".

تۆكڤیـل دان بـەوەدا دەنێـت كـه هەنـدێكجار هەڵوێـستی كاتۆلیكـەكان بـێ ئومێـدی دەكـات: "چونكه لەوە لاوازترن كه كۆمەڵگـەی نـوێ ماڵی بكـەن". ئـەوێك كـه لـه نامەیەكـدا بـۆ براكـەی نووسیبووی:

"كاتێـك بڕیارمـدا بڕۆمـه نێـو جیهـانی سیاسـەتەوە، بـۆ ئـەوەبوو كـه ئـاین و ئـازادی پێكەوە ئاشتبكەمەوە"

كەبێ ئومێد دەبێت لەهەڵوێستی هەموو ئەو

کاتۆلیکانەی کە بە پێچەوانەی ئەم بنەمایەوە کاردەکەن و دەیانەوێت جەنگ لە نێوان ئەم دوو چەمکەدا دابمەزرێنن. لێرەوەو لە 5ی مارسی 1845 دا، لە دانیشتنێکی پەرلەماندا، بە توونــدی هێرشی کـردە سەر سەرۆکی ئەساقیفەکانی لیـۆن و بایـەکۆتی ئەو هەڵوێستەی کرد کە دەیویست یاسایەك لەسەر "هەرگیز هەڵە نەکردنی پاپ" دروستبکات:

"تۆ کە لەبەردەم سەدەیەك لە ڕاپەڕین و شۆڕش و یاخیبوون لە دەسەڵاتداری، تۆ کە لەبەردەم نەتەوەیەکدای کە تەنانەت لە ئیمپراتۆریەت یاخی دەبێت و ڕێزی یاساکانی ناگرێت، ئێستا دەتەوێت دەسەڵاتی پاپ بکەیت بە دەسەڵاتێکی ڕەهای بێ هەڵە و دەتەوێت ئەم نەتەوەیە گوێڕایەڵی بکات؟ نەتەوەیەك کە ڕێز لە هیچ شتێك ناگرێت، تەنانەت لە شتە پیرۆزەکانیش، چۆن یاسایەکی وا قبوڵدەکات؟[15]"

لە ئیمپراتۆریەتی دووەمدا، تۆکڤیل لەسەر هەمان هێڵی گەورەی پیاوی ئاینی ئەمەریکی ویلیەم ئێلیری شانینگ (1780–1842)، بانگەشە بۆ کریستیانیسمێك دەکات کە لەگەڵ ڕۆشنگەریدا بگونجێت و دادپەروەری کۆمەڵایەتی بکات بە سەنتەری کارکردنی.

### 3-بیریاری دیمۆکراسی

دیمۆکراسی لە فیکری تۆکڤیلدا پێش هەموو شتێك بریتییە لە دۆخێکی کۆمەڵایەتی چوارچێوە بۆ کێشراو لەلایەن یەکسانی هەلومەرجەکانەوە. ئەم دۆخە گوزارشتە لە ئارەزوی ئەو کەسانەی کە دەکرێت سیفەتی دیمۆکراتیان پێببەخشین.

ڕاستە دیمۆکراسی بریتییە لە دەسەڵاتی گەل، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە پێش ئەوەی خۆی وەربگێڕێتە سەر دەسەڵاتی گەل، دەبێت خۆی وەربگێڕێتە سەر ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییەی کە دەستکاری کۆی پەیوەندییەکان دەکات و سەرلەنوێ دایان دەڕێژێتەوە، لە دۆخێکی کۆمەڵایەتی ئاوادا، ئیتر مرۆڤەکان بەسەر کۆیلەو ئاغادا دابەشناکرێن، بەڵکو دەبن بەو "تاك"انەی کە تەواو سەربەخۆن و بەوپەڕی ئازادییەوە بڕیارە شەخسییەکانیان دەدەن و ڕێز لە خواستی گشتی دەگرن.

ڕاستە لە واقیعدا هەمووومان یەکسان نین و پێگە کۆمەڵایەتییەکان جیاوازن و گەورە و بچووك و دەوڵەمەند و هەژار و حاکم و حوکمکراو هەیە، ئەوەی لە گەردوونی دیمۆکراسیدا دەستکاری دەکرێت و دەگۆڕێت پەیوەندی نێوان ئەم دووانەیە. تۆکڤیل دەپرسێت:

"چی وا دەکات کە یەکەم سەرکردایەتی بکات و دووەمیش گوێڕایەڵبێت؟ بێگومان ئەوەی ئەم پەیوەندییە دەبات بەڕێوە سیستەمێکی دیکەی تەواو جیاوازە. لێرەدا گوێڕایەڵی ڕەها و فەرماندەی ڕەها بوونی نییە. کە حوکمکراو بە گوێی حوکمکار دەکات، لەبەرئەوەیە کە کۆنتراکێکی لەگەڵدا ئیمزا کردووەو لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا بچوکێك گوێ لە گەورەیەك دەگرێت و خاوەنکارێك کرێکارێك دەبات بەڕێوە. بەڵام لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیەدا، ئەو دوانە دوو هاوڵاتی یەکسان و دوو مرۆڤی یەکسانن لە ماف و ئەرکدا[16]".

لێرەوە یەکسانی هەلومەرج کارایی ڕاستەوخۆ دادەنێت بەسەر چۆنیەتی پەیوەندی

بە دەسەڵاتەوە. لەم ڕژێمە تازەیەدا، مرۆڤەکان بەسەر چەند مەخلوقێکدا دابەش ناکرێن، بەڵکو هەموویان بەیەکچاو تەماشا دەکرێن، با لەسەر ئاستی پێگە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانیش جیاوازبن. تۆکڤیل پێیوایە ئەم یەکسانیە گۆڕانکاری مەزنی سۆسیۆ-پۆلیتیك لە ژیانی کۆمەڵگەکاندا دروستدەکات، چونکە گورزی پوڵاین دەوەشێنێت لە هەموو ئەو دەسەڵاتە ئابوری و ڕۆحیانەی کە ستراکتۆرەکانیان لەسەر ڕژێمی کۆن بیناکردووە.

"پێتان وایە کە پاش لەناوبردنی پاشایەتی و فیۆدالیتیٚ، بۆرژوازی و دەوڵەمەندەکان دەتوانن ئەژنۆ بە دیمۆکراسی دابدەن؟"

بە دیویکی دیکەدا، تۆکڤیل پێیوابوو کە بزوتنەوەی یەکسانی هەلومەرجەکان هەڵگری پەیامی هەڵوەشانەوەی هەموو دەسەڵاتە پیشەسازیەکانی بۆرژوازیەتەو هیچ دەسەڵاتێك ناتوانێت لە ریفۆرمەکانی خۆی دەرباز بکات. یەکسانی هەلومەرجەکان کە دەکرێت وەك ڕێکخەری کۆمەڵایەتی تەماشای بکەین، هەموو ئەو قوفڵانە دەشکێنێت کە ڕێگا لە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیەکان دەگرن.

لێرەوە تۆکڤیل هەوڵدەدات ڕەهەندێکی شۆڕشگێڕانە بە مافەکانی مرۆڤ ببەخشێت و کۆی ستراکتۆرە کۆمەڵایەتیەکان بخاتە ژێر کارایی ئەو ڕەهەندەوەو ئاراستە گشتیەکانی بە ڕەنگەکانی بنەخشێنێت. ئەو پێیوایە "یەکسانی هەلومەرجەکان" ئەو پرانسیپەیە کە لە سایەیدا "تاك" وەك "خود"ی ئۆتۆنۆم لەدایك دەبێت و بە سەربەخۆییانە بڕیارەکانی هەڵدەبژێرێت و هەوڵدەدات لە دیتێرمینیسم[17] بێتە دەرەوە.

هەندێکجار و لە هەندێك جێگای جیهاندا، ئارەزوی هەنگاونان بەرەو گەردوونی "یەکسانی هەلومەرجەکان" وەك هەڕەشەیەك لەسەر چەمکی "ئازادی" خراوەتە سەر شانۆ. مەبەست لێرەدا ئازادی تاکەکانە:

"ئەم هەستە وا لە هەر هاوڵاتیەك دەکات کە ڕێگای گۆشەگیری بگرێتە بەر و بۆ خۆی و بە تەنها لەگەڵ خێزان و هاورێکانیدا بژی و خۆی بە دوور بگرێت لەو شتانەی کە لە دەوروبەری ڕوودەدەن. لێرەوە تاك کۆمەڵگەیەکی بچووك بۆ خۆی دروستدەکات و پشتدەکاتە کۆمەڵگەی گەورە و بەرژەوەندی و گرەوەکانی[18]".

بەدیویکی دیکەدا، تۆکڤیل پێیوایە یەکسانی هەلومەرجەکان هەڕەشەیەکی بەردەوامی ناوەکیە لە کۆمەڵگە دیمۆکراتەکان، چونکە کاردەکات بۆ هەڵوەشانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان. یەکسانی هەلومەرجەکان دێت و تاکەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە بەبیٚ ئەوەی هیچ جۆرە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی لە نێوانیاندا دروست بکات. لێرەوە دیمۆکراسی بە دەستی خۆی کار لەسەر هەڵوەشانەوەی خۆی دەکات، ئەمەش لە ڕێگای هەڵوەشانەوەی هەموو ئەو پەیوەندیانەوەی کە لەسەر ترادیسیۆن دامەزراون.

لە بارودۆخێکی ئاواشداو بۆ دامەزراندنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان، دیمۆکراسی ناچارە پەنا بەرێتە بەر کۆکردنەوەی تاکەکان لە نێو سەندیکا و ڕێکخراوە جەماوەری و مەدەنیەکاندا کە لەسەر دیمۆکراسی لۆکاڵ کاردەکەن. لێرەوە پرسیاری پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەبێت بە پرسیاری دەسەڵات: واتە لە ژیانی ڕێکخراوەکاندا، هەموو بۆچوونەکان یەك بەهاو یەك قورساییان هەیە و

بۆچوونێك بە تەنها ناتوانێت خۆی فەرزبكات بەسەر هەمووان‌دا.

کەواتە چۆن فەرمانڕەوایی بکەین؟ تۆکڤیل پێیوایە لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا ئەو شتە لەدایك دەبێت کە ئەمڕۆ ناوی دەنێین: دەسەڵاتی زۆرینە.

بەڵام لەبیرمان نەچێت ئەم "دەسەڵاتی زۆرینەیە" یەکێکە لە مۆتەکەکانی سەر سنگی تۆکڤیل و هەندێکجار بە "دەسەڵاتی ستەمکار" ناوی دەبات، بەتایبەتی کاتێك باس لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکات:

"تا ئێستا هیچ ولاتێکم نەدیوە وەك ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا زیاتر رێگا لە سەربەخۆی بیروبۆچوون و ئازادی رادەربڕین بگرێت[19]".

تۆکڤیل یەکێکە لەو بیریارانەی کە بە درێژایی ژیانی بەرگریکردووە لە ئازادی بە گشتی و ئازادی رادەربڕین بەتایبەتی و هەمیشە بایەکۆتی ئەو شتەی کردووە کە ئەمڕۆ ناوی دەنێین: فیکری تاقانە. لێرەدا تۆکڤیل بەراوردی ئیسپانیای سەردەمی پشکنینە گەورەکان و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکات و پێیوایە لەگەڵ هەموو زەبر و زەنگە فیزیکیەکانیشدا هێشتا پرسیاری ئازادی و سەربەخۆی و جیاوازی لە ئیسپانیادا باشتر پیادەکراوە تا لە ئەمەریکادا:

"لە ئیسپانیادا دەزگاکانی پشکنین نەیانتوانی رێگا بگرن لە بلاوبوونەوەی کتێبی دژ بە ئاین. بەڵام ئیمپراتۆریەتی زۆرینە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بیری لەوە کردوەتەوە کە رێگا لە بلاوکردنەوەی ئەو جۆرە لە کتێبیش بگرێت[20]".

هەروەها دەڵێت:

" لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لایەنی زۆرینە هەوڵدەدات چەند پاکەتێك لە بیروبۆچوونی ئامادەکراو دابەشبکات بەسەر هەموو تاکەکاندا و لێرەوە رێگایان لێدەگرێت کە خۆیان بۆ خۆیان بیر بکەنەوە و شتەکان هەڵبژێرن و بڕیارەکان بدەن[21]".

تۆکڤیل پێیوایە لە کۆمەڵگە دێمۆکراتەکاندا:

"ئیمان هێنان بە ڕای گشتی دەبێت بە ئاینێك کە پێغەمبەرەکەی ئەو شتەیە ناوی دەنێین زۆرینە[22]".

تۆکڤیل دەمانخاتە بەردەم مەترسیەکانی دیمۆکراسی کە یەکێك لەوانە بریتیە لە لاوازکردن و کوژانەوەی ئازادی بیرکردنەوەو تەسلیمبونیەتی بە ڕای گشتی.

هەروەها تۆکڤیل پێیوایە راکردنی بەردەوام بە دوای وەڵامدانەوەی ئارەزووەکاندا هەڕەشەیەکی دیکەیە لەسەر دیمۆکراسی:

"من رەخنە ناگرم لە وەڵامدانەوەی ئارەزوەکان، بەڵام ئەوەی بەلامەوە جێگای رەخنەیە کردنەوەی دەرگای هەمیشەی و ڕاکردنێکی رەهایە بە دوای تێرکردنیاندا[23]".

ئەو پێیوایە ئەم کردەیە مرۆڤەکان دوور دەخاتەوە لە چاکەی گشتی و بەرژەوەندیە گشتیەکانی کۆمەڵگە. پارادۆکسی دیمۆکراسی لەوەدایە کە لە هەناوی خۆیدا تۆوی لەناوبردنی خۆی چاندووە و هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەی خۆی بە شانەوەیە. هەر ئەمەشە وا لە تۆکڤیل دەکات کە بترسێت لە بیناکردنی پانتایی ستەمکاری لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا:

"پێموایە گەر ئەمڕۆ، لە کۆمەڵگە دیمۆکراتەکاندا، ستەمکاری بگەڕێتەوەو خۆی بینابکاتەوە، وەك جاران نابێت و ڕەنگی دیکە دەگرێت. بۆ نموونە، دەکرێت نەرمتر خۆی

دەربخات و نەرمتر مامەڵە لەگەڵ ستەملێکراوەکاندا بکات. لە هەلومەرجێکی ئاوادا، ستەمکاری دەتوانێت ستەملێکراوەکان بکوژێت بەبێ ئەوەی رۆحیان لە لاشەیان جیابکاتەوە. ستەمکاری هەوڵدەدات ئەم جۆرە لە کوشتن، یان لە کۆیلەیبوون لەگەڵ فۆرمە دەرەکیەکانی ئازادیدا بگونجێنێت و بە ناوی سەروەری گەلەوە پێیان بفرۆشێت[24]".

تۆکڤیل مرۆڤەکانی کۆمەڵگە دیمۆکراتەکان وەك چەند سەرگەردانێکی ڕاڕای ماندو دەبینێت، وەك گەڕیدەیەکی ماندوی ئارەزوە تێرنەبووەکان کە ڕۆحیان پیسدەکات. ئەو پێیوایە مرۆڤەکانی کۆمەڵگە دیمۆکراتەکان خۆیان داخستووە بەسەر خۆیانداو تەنها بەرپێی خۆیان دەبینن و هەموو شتەکانیان سپاردووە بە دەسەڵاتێك کە دەوری باوکیان بۆ دەبینێت. باوکێك کە هەموو ئەرکەکان دەگرێتە ئەستۆی خۆی: چاودێریان دەکات، ئارەزووەکانیان بۆ دابین دەکات، باوکێکی ڕەها، وردکار، نەرم، بینا. دەسەڵاتێك کە نابێت بە بەربەری، بەڵام دەتوانێت گڵۆپەکان بکوژێنێتەوەو نەتەوە کورتبکاتەوە لە ئارەزووە حەیوانیەکانیدا.

لە نێوان ئەم دوانەدا: تاکەکانی کۆمەڵگەیەکی دیمۆکرات کە بوون بە "موستەهلیك/ کۆنسۆماتۆر" و وشیاریە سیاسی و رۆشنبیریەکانیان لەدەستداوە، لەلایەك. دەوڵەتیش وەك دەسەڵاتێکی هەمیشە ئامادەی بیرۆکراتیك لەلایەکی دیکەوە، لەدایکبوونی حکومەتێکی ڕەها و ستەمکار زۆر ئاسان و چاوەڕوانکراوە. چونکە یەکسانی هەلومەرجەکان رێگا بۆ لەدایکبوونی ئەمجۆرە لە حکومەت خۆش دەکات و ئەم یەکسانیەش تەنها لە کۆمەڵگە دیمۆکراتەکاندا بوونی هەیە.

تۆکڤیل دەیەوێت ئێمە بخاتە بەردەم ئەو هەڕەشانەی کە بەسەر دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و کۆمەڵگە دیمۆکراتەکانەوەیە: واتە تەحەدای پارێزگاریکردن لە بەها شارستانی و گشتیەکان لە کۆمەڵگەیەکدا کە تا سەر ئێسقانی ڕۆچووە لە تاکگەرایی و بەدیهێنانی ئارەزوە شەخسیەکاندا.

بۆ رێگاگرتن لە "ستەمکاری دیمۆکرات"، تۆکڤیل ئەم چەند رەگەزە پێشنیار دەکات:

–بەهێزکردنی گیانی ژیان لە نێو رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا.

–بەهێزکردنی دەسەڵاتی ئەو لایەنانەی کە دەسەڵات و کۆمەڵگەی مەدەنی پێکەوە گرێدەدەن و ئەو ناویان دەنێت "میدیاسیۆن/ وەسیت".

–ئازادی بێ قەید و شەرتی پریس و بازدان بەسەر هەموو کۆسپ و کەندەلانەکانی ئەو ڕێگایەدا.

–ڕابوونی وشیاری ئاینی، بێگومان بە تێگەشتنە مەدەنیەکەی.

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کە کۆمەڵگەیەکی بێ میراتی ئەرستۆکراتیکە و ئازادیە لۆکالیەکان بوون بە ترادیسیۆن، دەبێت بە باشترین تاقیگە بۆ تۆکڤیلی توویژەرو پاش توێژینەوە گرنگەکەی دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە دەکرێت لە ولاتێکی وەك ئەمەریکادا دیمۆکراسی لەسەر بنەمای دیکەی جیاواز بینابکرێت. هەر لەم تاقیگەیەدا ئەو بۆی دەردەکەوێت کە ئاین نەك هەر نابێت بە گرفتێك بۆ دیمۆکراسی بەڵکو رێگاشی بۆ خۆش دەکات و

بازووی بەهێز دەکات و دەبێت بە مەشخەڵە کولتوریەکەی:

"هەرگیز نابێت لەبیرمان بچێت کە ئاین هۆکاری یەکەمی لەدایکبوونی ئەمەریکایە. لەم ولاتەدا ئاین تێکەڵ بە هەموو عادات و تەقالید و هەستە ناسیۆنالەکان بووەو ئەمەش هێزێکی تایبەتی پێدەبەخشێت"[25].

تۆکڤیل پێیوایە ئاین رەگەزێکی زۆر گرنگە، وەك دواتر باسی دەکەین، لە دروستکردنی "رێکەوتنی کۆمەلایەتی"دا و هاولاتیە دیمۆکراتەکان دەپارێزێت لە خواستی نامەعقولی پەیبردن بە هەموو شتێك و گۆرانی هەموو شتێك.

**4-ئاین لە کۆمەڵگە دیمۆکراتەکاندا: باوەرو زەرورەت**

تۆکڤیل زۆر بە وردی بەشداری گرنگی رەهەندی کۆمەلایەتی لە بەرهەمهێنانی تاقیکردنەوەی ئازاد و سەربەخۆیی بیرکردنەوەو گەشەپێدانی عەقلدا دەخستە ژێر چاودێریەوەو بەردەوام دەسەلاتی دەخستە ژێر پرسیار و پێداچوونەوەوە:

"یەکسانی هەلومەرجەکان وا دەکات کە مرۆڤەکانی هەر کۆمەڵگەیەك لەسەر ئاستی تاك بەدوای حەقیقەتدا بگەرێن. لە نێو دیمۆکراسیدا، من تێبینی ئەوە دەکەم کە هەر ئەمەریکیەك خۆی بە تەنها و لە رێگای پەنابردن بۆ عەقلی خۆی هەوڵدەدات چالاکیەکانی ئەنجام بدات"

تۆکڤیل ئەمە ناو دەنێت "میتۆدی فەلسەفی ئەمەریکیەکان" و ئەم میتۆدە بەردەوام ئەمەریکیەکان بەرەو گوومان دەبات:

"دەتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە گەلە دیمۆکراتەکان لە داهاتوودا ئیمان بە غەیب لەدەست دەدەن و هەوڵدەدەن پێغەمبەری نوێ بدۆزنەوە. پێغەمبەرێك کە لە چوارچێوە مرۆییەکان تێنەپەرێت و منالی سەر زەوی بێت نەك ئاسمان"[26].

ئەم جۆرە لە گوزارشتکردن دەمانگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە تۆکڤیل ویستویەتی بیرۆکەی سیکیولاریزاسیۆن وەك رزگارکردنی مرۆڤەکان لە دەسەلاتە ئاینیەکان، بخاتە سەر شانۆ: تاکی کۆمەڵگە دیمۆکراتەکان دەیەوێت خاوەنی دەسەلاتی بریاردان بێت و وەك کائینی سەربەخۆ مامەڵە بکات. ئەمە ئەو شتەیە کە ئەمرۆ لە بواری زانستە کۆمەلایەتیەکاندا ناوی دەنێین "رێفلێکسیڤیتێی رەخنەیی گشتێنراو"[27]. بێگومان تۆکڤیل لە گشتاندنی گووماندا کۆتایی ئاین نابینێت. بە پێچەوانەوە، لەگەڵ بەهێزبوونی گوومانی میتۆدۆلۆژی گشتێنراودا، مرۆڤەکان زیاتر پەنا دەبەن بۆ ئەو بنەما ئیمانیانەی کە لە دەرەوەی گوماندا کاردەکەن و خۆیان بەدەست گومانەوە نادەن. ئەو پێیوایە ئەم حاڵەتەش یارمەتی دامەزراندن و بەهێزبوونی دیمۆکراتی دەدات:

"کاتێك دەسەلاتی ئاینی و دەسەلاتی سیاسی لاوازدەبن، ئیتر مرۆڤەکان لە دەریای سەربەخۆیی بێسنوردا دەخنکێن (...). من پێموایە زۆر بە زەحمەت مرۆڤ دەتوانێت لە یەککاتدا حەماڵی سەربەخۆیی ئاینی و سەربەخۆیی سیاسی بێت. من پێموایە ئەم مرۆڤە گەر ئیمانی نەبێت دەبێت بە دوایدا بگەرێت تا دەیدۆزێتەوەو گەر ئازادیش نەبێت دەبێت تێبکۆشێت تا بە دەستی دەهێنێت"[28].

تۆکڤیل پێیوایە کە مرۆڤەکان پێویستیان بە ئیمانی دامەزراو لەسەر دۆگم هەیە، چونکە ڕێگایان پێدەدات متمانە بە خۆیان بکەن بەبێ ئەوەی هەمیشە لە موناقەشەدابن. هەروەها ئەم ئیمانە وایان لێدەکات کە بە ئاسانی لە کۆمەڵگەکاندا بژین و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەڵبکەن:

"ئێمە بە دەگمەن دەتوانین کۆمەڵگەی بێ ئیمان بدۆزینەوە. کۆمەڵگە ناتوانێت بەبێ ئیمان بەردەوامبێت. ئاخر گەر مرۆڤ ناچار بکرێت کە خۆی بە تەنها دەبێت هەموو حەقیقەتەکان بدۆزێتەوە تاماوە سەرگەردان دەبێت و دەبێت بە گەڕیدەیەکی هەمیشەیی.. لە نێو هەموو ئیمانەکاندا، ئیمانی ئاینی دەتوانێت زۆرترین کەس لەسەر سفرەی خۆی کۆبکاتەوە[29]".

لە کۆمەڵگە دیمۆکراتیەکاندا کە هەموو شتێك دراوەتە دەست توانایی و خواستی تاکە کەسەکان، بۆ ئەوەی ژیان بەردەوام بێت باشتر وایە کە چەمکی "خوا" و هەلومەرجی ژیانی مرۆڤەکان ئەو دوو بنەمایەبن کە هەموو لایەك لەسەری ڕێکبکەون:

"من پێموایە بەشێوەیەکی گشتی هەموو چالاکیەکانی مرۆڤ لەو بیرو بۆچوونانەوە سەرچاوە دەگرێت کە مرۆڤەکان لەسەر خواو پەیوەندی بە مرۆڤەکانەوەو هەروەها لەسەر چۆنیەتی ئامادەیی ڕۆحیان و ئەرکی ئەوان بەرامبەر بە خواو بەرامبەر بە هاوشێوەکانیان دروستی دەکەن. دەمەوێت بڵێم، مرۆڤەکان بەرژەوەندیەکی زۆریان هەیە لە دروستکردنی فیکرەیەك لەسەر خواو ڕۆح و ئەرکە گشتیەکانیان لە بەرامبەر خالق و هاوشێوەکانیاندا. هەر گومانکردنێك لەم بنەمایە، مرۆڤەکان دەداتە دەست ڕێکەوتو مەحکومیان دەکات بە فەوزا و ئیفلیجبوون[30]".

هەروەها لەسەر پەیوەندی مرۆڤی کۆمەڵایەتی بە خواوە دەڵێت:

"ئامادەیی چەند بۆچوونێکی ڕێژەیی لەسەر خواو سروشتی مرۆڤ یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ ئەنجامدانی چالاکیە عەقلانیەکانی ڕۆژانەی. بە فەزڵی ئەم ئیمانەوە، مرۆڤ لە بەرامبەر دەسەلاتێکدا زۆرترین شت دەباتەوەو کەمترین شت دەدۆڕێنێت. گرنگی ئاین لەوەدایە کە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی مرۆڤ دەداتەوەو بۆ هەر کێشەیەك چارەسەرێکی دیاریکراوی تەمەندرێژی وردکراوەی پێیە. بێگومان ئێمە چەندین ئاینی بێ مانامان هەیە کە نایەوێت ئەم ڕۆڵە ئەنجامبدات. ئەم ئاینانە دەبن بە گرفت بەسەر وشیاری مرۆڤەکانەوە. بەلام لە هەمانکاتدا، ئاینیشمان هەیە کە، گەر لەو دونیاش بەختیاری بۆ مرۆڤەکان دابین نەکات، ئەوا لەم دونیا دەبێت بە سەرچاوەی یەکەمی بەختیاری و کامەرانیان[31]".

لێرەدا تۆکڤیل دەیەوێت تێزی بەهای کۆمەڵایەتی ئاین بخاتە سەر شانۆ. لە چرکەی ڕاڤەکردنی دەرەنجامە قوڵەکانی ئازادی سیاسیدا، ئەو زۆر دورتر دەڕوات. مەبەست لەو ئازادیە سیاسیەیە کە پیرۆزیەکان لە سیاسەت دەسەنێتەوەو لە ڕێگای یەکسانی هەلومەرجەکانەوە دەیخاتە نێو کردەیەکی پراگماتیستیەوە. لێرەوە وەك کلۆد لۆفۆر دەڵێت، لە نێو دەسەلاتدا پانتاییەکی بۆش هەیە و هیچ کاتیگۆریەکی کۆمەلایەتی ناتوانێت بۆ هەمیشەیی دەستەمۆو ماڵی بکات[32]. کاتێك دەڵێین "مرۆڤی بێ ئیمان" دەبێت خزمەت بکاتو "مرۆڤی ئازادیش" دەبێت ئیمان بێنێت،

تۆکڤیل دێت و کلیک دەکات لەسەر "جیاکردنەوە" لە نێوان ئیمان و سیاسەتدا و پێیوایە ئاین دەتوانێت ئەم "جیاکردنەوەیە" بە شێوەیەکی ئیجابی ئەنجامبدات. ئەم جیاکردنەوەیە بەمانای دیاریکردنی سنوری پانتاییەکان و تێکەڵنەکردنیان. بۆ سەلماندنی ئەم تێزە دەتوانین باس لە رۆڵی ئاین بکەین لە نێو ئەو رژێمە تۆتالیتێرانەدا کە دەیانەوێت ببن بە سەنتەری هەموو شتەکان. رۆڵی ئاین لەم رژێمانەدا زۆرجار رۆڵی یاخیبوون و رەفزکردنو ناڕەزایی دەربڕینە. هەروەها ژان ڤیدەرت دەڵێت:

"لە کاتێکدا ئاین پێشنیاری جیهانێکی دیکە دەکات و قیامەت وەك ئەلتەرناتیڤ دەخاتە بەردەست ئەو مرۆڤانەی کە لێرەن، لەسەر زەوین، ئایا ئەمە باشترین کەرەسە نیە بۆئەوەی رێگا لە هەر مرۆڤێك یان گروپێ بگرێت کە بیەوێت تەواوی دەسەڵاتەکان بۆ خۆی کۆنترۆڵ بکات؟"[33].

لە راستیدا ئەوەی کە تۆکڤیل پێشنیاری دەکات دروستکردنی ئاینێکی مەدەنیە کە:

-گرفت بۆ ئازادیەکان دروست ناکات.

-یارمەتی مرۆڤەکان دەدات تا پێکەوە هەڵبکەن و لە پانتاییە گشتیەکاندا پێکەوە بژین.

-چەك دەداتە دەست تاکەکان بۆئەوەی پیرۆزی لە هەموو شتەکان بسەننەوە، بەبێ ئەوەی دەستکاری ئەو یاسایانە بکەن کە یاریە دیموکراتیەکان دەبەن بەڕێوە.

-تام دەداتەوە بە ژیانی داهاتوو.

-گوڕوتین دەدات بە پرۆژەکان.

-ماندویەتی لە گیانی مرۆڤ دەردەکات.

-مۆڕاڵێکی نوێ بۆ دیموکراسی دروست دەکات.

ئەمە ئەو گۆشە نیگایەیە کە خاوەنی کتێبی "دیموکراسی لە ئەمەریکادا" گوزارشتی لێدەکات و پێیوایە کە ئاین دەتوانێت رۆڵێکی ئیجابی کۆمەڵایەتی لە نێو کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا ببینێت. ئەو پێی وایە لە کۆمەڵگەکانی ئەمەریکای باکوردا شانسی لەدایکبوونی ئەم ئاینە مەدەنیە زۆرترە تا لە کۆمەڵگە ئەوروپیەکاندا، چونکە لە یەکەمدا پەیوەندی نێوان رۆحی ئاین و رۆحی ئازادی نەك هەر نەبووە بە بەربەست، بەڵکو یەکتری بەهێز دەکەن، بەلام لە دووەمدا نەك هەر بەربەستە بەڵکو تا سەر ئێسقانیش دژایەتی یەکتر دەکەن.

**5- پەیوەندی نێوان رۆحی ئاین و رۆحی ئازادی**

"کاتێك گەیشتمە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا شتێك زۆر سەرەنجی راکێشام (...). لە فەرەنسادا هەمیشە رۆحی ئاین و رۆحی ئازادی بە پێچەوانەی یەکتریەوە کاریان کردووە، بەلام لێرە، لە ئەمەریکادا، ئەم دوو رۆحە پێکەوە رێدەکەن و یەکتری تەواو دەکەن"[34].

ئەو چرکەیەی کە تۆکڤیل دەگاتە ئەمەریکا، شەپۆلێکی ئاینی بەهێز سەرتاپای ولات دادەپۆشێت و رۆحی ئاین لە هەموو کاتێك بەهێزتر تێکەڵ بە رۆحی ئازادیخوازی ئەمەریکیەکان دەبێت، بە تایبەتی لە نێوان سالانی 1800-1830 دا. هەر لەو ساڵەدا کە تۆکڤیل کتێبی "دیموکراسی لە ئەمەریکادا" بلاودەکاتەوە، شارل گراندیسۆن فێننەی یش کتێبی "خوێندنەوەی رابوونی ئاینی"

بلأودەکاتـەوە. بێگومـان ئـەم پیـاوە یەکێکـە لـە گـــەورە نووســـەرە ئینجیلیـــەکانی ســـەدەی نۆزدەهەم.

هارمۆنی نێوان رۆحی ئاین و رۆحی ئازادی زۆر بە توندی بەر هەستی تۆکڤیلێك دەکـەوێت کـە لـە فەرەنساوە هـاتووە، فەرەنسایەك کـە لـە یەکـــەم رۆژی شۆڕشـــی 1789 وە ماشـــێنی دیمۆکراتیزاســـیێۆنی دژ بـــە ئـــاینی خـــستبووە کـارو بـــەهیچ شـــێوەیەك نەیدەهێـــشت ئـــاین و ئازادی لە یەکتر نزیك ببنەوە و شکستی هێنا بە هـەموو ئـەو هەولأنـەی کـە کاتۆلیکـە لیبرالـەکان دەیانخستە کار بۆ ئاشتکردنەوەی خواو ئازادی و ئـــاین و دیمۆکراســـی و ئیمـــان و لایـــسیتیٚ. لامونیٚ یەکێکبوو لەو کاتۆلیکە هەرە بەناوبانگە لیبرالأنـــەی کـــە دەیویـــست ئـــەم دوو گەردوونـــە پێکەوە ئاشتبکاتەوەو، وەك تۆکڤیل، دەیویست کۆمەڵگەی فەرەنسی قەناعەت پێبێنێت کە ئاین نەك هەر دژی دیمۆکراسی و ئازادی نیە، بەڵکو رەگـەزێکی گرنگـە بـۆ بـەهێزکردنیان. تـەواو بـە پێچەوانەی ئەمەریکیەکانەوە، فەرەنسیەکان نەك هـەر گوێیـان بـۆ نـەگرت، بـەڵکو زۆر بـە تونـدی دژایەتیشیان کرد. تۆکڤیل دەڵێت:

"ئەمەریکیـەکان بەشـێوەیەك ئـاین و ئـازادی تێکەڵ بە رۆحیان بووە کە مومکین نەبێت رۆژێك لـە رۆژان لـە یـەکتری جیابکرێنـەوە. بەشـێکی گـەورەی ئەمـەریکای ئینگلیـزی لـەو کەسـانە پێکهاتووە کـە ملکەچـی هـیچ جـۆرە دەزگایـەکی دەســـەڵاتی لەســـەر ئـــاین بینـــاکراو نـــەبوون. ئـازادبوون لـە ملکەچـی بـۆ پیـاوانی ئـاین. ئـەو کریستیانیـسمەی کـە ئـەوان هێنایـان بـۆ ئـەم جیهانە تازەیەی کە پێیدەڵێن ئەمەریکا دەکرێت وەك ئـاینی دیمۆکراســی و جمهوریــەت نــاوی بەرین، ئاخر ئەم ئاینە پشتیوانی دروستکردنی جمهوریـەت و دیمۆکراسـیە. لێـرەوەو هـەر لـە سـەرەتای دامەزرانـدنی ئـەم ولأتـەوە، ئـاین و سیاسـەت بەیەکـەوە کـار دەکـەن و لـە یـەکتری جیانابنـــــەوەو گرفـــــت بـــــۆ یـــــەکتری دروستناکەن"[35].

تـــۆکڤیلی فەرەنـــسی، پـــەردە لەســـەر شانۆگەریەك لادەدات کـە تـەواو بـە پێـچەوانەی شـــانۆگەری فەرەنـــسییەوە نمایـــشدەکرێت و نموونەیـەك لـە پەیوەنـدی بـە ئاینـەوە دەخاتـە بەردەسـت جیهـان کـە جیایـە لـەو نموونەیـەی فەرەنسیەکان دەیانویست فـەرزی بکـەن بەسـەر جیهاندا.

بـە شـێوەیەکی گـشتی ئـاین لـە یـادەوەری کـۆلێکتیڤی کۆمەڵأیـەتی فەرەنسیەکاندا بریتیـە لە:

–کەرەسەی دەستی دەسەڵأتداران.
–چەوسانەوەی هەژاران.
–کۆیلایەتی.
–کوشتنی ئازادی.
–کوشتنی تاکگەرایی.

بەلأم هـەمان ئـاین لـە یادەوەری کـۆلێکتیڤی کۆمەڵأیەتی ئەمەریکیەکاندا بریتیە لە:

–رێگا بەرەو ئازادی.
–کردنەوەی دەرگا لەسەر تاکگەرایی.
–دروســتکردنی دەســەڵأتی هەڵبــژاردن لای تاکەکان.
–بیناکردنی پەیوەندی کۆمەڵأیەتی ئیجابی.

تۆکڤیـــل، وەك ئیـــدوار تیریاکیـــان دەڵێـــت، یەکێك بوو لە رەخنەگرە هەرە گەورەکانی تیۆری سێکیولاریزاسیۆن:

"زۆرن ئـــەو کەســـانەی کـــە پەیوەنـــدی ئۆتۆمـــاتیکی لـــە نێـــوان مۆدێرنیزاســـیۆن و سێکیولاریزاســـیۆندا دروســـت دەکـــەن. بـــەلأم

هەموومان دەزانین لە ئەمەریکادا ئەم تیۆریە برناکات و فەشەل دەهێنێت. ئەو کەسانە پێیانوایە، بە قەدەر بڵاوبوونەوەی ڕۆشنگەری ئاین دەکشێتەوە، بەڵام لەم وڵاتەدا ڕۆشنگەری بڵاودەبێتەوەو ئاینیش ناکشێتەوە"[36].

تۆکڤیل بە پێچەوانەی هەموو ئەو سۆسیۆلۆگانەوە کە پێیانوایە: "بە سنووری زیادبوونی مۆدێرنیتیێ ئاین پاشەکشە دەکات"، تیۆریەکی دیکە بەرهەمدەهێنێت و ڕاڤەکردنێکی دیکە پێشکەش دەکات. لەو تیۆریەدا ئەو پێمان دەڵێت: بە قەدەر زیادبوونی مۆدێرنیتیێ ئایندارییش زیاد دەبێت، بەڵام بە شێواز و لەسەر ئاستی جیا جیا. ئەو پێیوایە تەنانەت خودی مۆدێرنیتیێ هیچ نیە جۆرێك لە ئایندارێ نەبێت، ئایندارێ بەشێوەیەکی جیاواز!

بێگومان جیاوازی نێوان کۆمەڵگەی فەرەنسی و کۆمەڵگەی ئەمەریکی لەسەر پەیوەندی بیناکردن لەگەڵ ئایندا، کارایی دادەنێت بەسەر لەدایکبوونی سۆسیۆلۆژیا لە هەریەك لەم دوو وڵاتەدا. لە کاتێکدا لە فەرەنسادا، سۆسیۆلۆژیا هەر لە ئۆگیوست کۆنتەوە تا دەگاتە دۆرکایم، بەدیلێکی سێکیولێر لە جێی ئاین پێشکەش دەکات، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، تەواو بە پێچەوانەوە، سۆسیۆلۆژیا لە ژێر کارایی ئایندا لەدایك دەبێت و یەکەم کەسێك کە یەکەم وانەی سۆسیۆلۆژیای لە هارڤارد وتەوە، ساڵی 1891-1892، قەشەیەك بوو. هەر ئەویش یەکەم کۆلێژی سۆسیۆلۆژیای لە زانکۆی شیکاگۆ دامەزراند.

**6-لێکجیابوونەوەی ئاین و دەوڵەت**

تۆکڤیل پێیوایە پێکەوە هەڵکردنی ڕۆحی ئاین و ڕۆحی ئازادی دەگەڕێتەوە بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت. کاتێك ئاین دێت و بۆ ئاسانکردنی کاروبارەکانی کلیك دەکات لەسەر دەسەڵاتێکی کاتی و دونیای، ئیتر مەترسیەکی گەورە لەسەر خۆی دروست دەکات، چونکە لە هەڵومەرجێکی ئاوادا:

"داهاتوو دەکات بە قوربانی ئێستایەکی کاتی و هەر هاوپەیمانیەك لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا، ڕەنگە چەند دەسکەوتێکی کاتیی لێبکەوێتەوە، بەڵام دواتر دەبێتە مایەی لەدەستدانی تەواوی کۆمەڵگە"[37].

بە پێچەوانەوە گەر ئاین و دەوڵەت لەیەك جیابکەینەوە، ڕەنگە ئاین چەند دەسکەوتێك لەدەست بدات، بەڵام هێزی واقیعی کارای کۆمەڵگە دەباتەوە. تۆکڤیل پێیوابوو، بەقەدەر دورکەوتنەوەی ئاین لە دەزگا دەوڵەتیەکان کارایی لەسەر کۆمەڵگە بەهێزتر دەبێت، چونکە لێرەوە دەبێت بە سەرچاوەی ئومێدی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە، لە هەندێك حاڵەتیشدا پێیوایە ئاین نەك هەر دەبێت بە سەرچاوەی ئومێد، بەڵکو دەبێت بە خودی ئومێدیش. بە دیوێکی دیکەدا، تۆکڤیل پێیوایە، داهاتووی ئاین لە کۆمەڵگە دیموکراتەکاندا یەکلایی بووەتەوەو بە زیندوویی دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی خۆی دوور لە دەوڵەت دەگرێت و بە ناخی ئەزموونە فەردیەکاندا دەچێتە خوارەوە:

"بێئیمانی شتێکی نائاساییە لە مێژووی کۆمەڵگەکاندا. ئیمان ماکینەی بەردەوامبوونی کۆمەڵگەکان و مێژووی مرۆڤایەتیە"[38].

لێرەوە تۆکڤیل دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە:

"ئاین دەبێت لە چوارچێوەکانی خۆیدا

بمێنێتــــەوەو هــــەوڵ نــــەدات لێیـــان بێتــــە دەرەوە. چـونکە هـەر هاتنـە دەرەوەیـەك و هـەر هـەنگاوێك بـەرەو دەسـەڵات دەبێـت بـە هەڕەشـە لەســــــەر بڵاوبوونــــــەوەو لەدەســـــــتدانی میسداقیەت[39]".

پەیوەندی نێوان ئاین و دەوڵەت سروشتێکی ئاڵۆزی هەیـە، بەتایـبەتی لـە ئـەوروپادا. تۆکڤیل لەم بارەیەوە دەڵێت:

"بـێ ئیمانـەکانی ئـەوروپا کەوتونەتـە ڕاوی ئیمانــــدارەکان و وەك دوژمــــنی سیاســـــی تەماشـــایان دەکــــەن نــــەك وەك خەســــم/ ئەدڤێرسـێری ئـاینی. ئـەوان حیقـدیان هەیـە بەرامبـەر بـە ئیمـان و وەك بۆچوونێکی سیاسـی حیزبێـك تەماشـای دەکـەن نـەك وەك ئیمـانێکی هەڵە یان ڕاست. لە ئەوروپادا، کریستیانیسم لـە قۆناغێکی مێژوویدا خۆی بەستەوە بە دەوڵـەت و دەســـەڵاتەوە. لــــە ئــــەمڕۆدا ئــــەو دەوڵــــەت و دەســـەڵاتانە لەناوچـوون، بـەڵام کریستیانیـسم مایــەوە. لــە ئێــستادا، براوەکــان دەیانــەوێت جـەنگی مردووەکان بە کریستیانیسمی زینـدوو بفرۆشن. کریستیانیسمیش تا ئێستاش باجی ئــەو هاوپەیمانیــە دەدات کــە ڕۆژێــك لەگــەڵ دەسەڵاتدا هەیبووە[40]".

کاتێك کـە تۆکڤیـل ئـەم پایـە بـەرزە بـە ئـاین دەبەخــشێت لەبەرئــەوە نیــە کــە دەوڵــەتی پێبـسپێرێت. بـە پێـچەوانەوە، لەبەرئەوەیـە کـە ئاین لە پانتاییە تایبەتەکانی خۆیدا بمێنێتەوەو پــەلاماری دەرەوەی خــۆی نــەدات و تــەنها لــە هەلومـەرجێکی ئاواشـدا ئـاین دەتوانێـت ڕۆڵـی نوێکــەرەوە لــە نێــو کۆمەڵگــە دیمۆکراتەکانــدا ببینێت و درێژە بە مانـەوەی خۆی بدات. گـەرنا دواتر پـەراوێز دەکرێت و خاڵی کۆتایی لەسـەر پەرەگرافەکانی دادەنێت.

**7-ڕۆڵــی ئــاین لــە وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئەمەریکادا**

"پیوریتانیــسم (بــە عــەرەبی دەبێــت بــە تـەزەمووت) بە تـەنها ڕێبـازێکی ئـاینی نـەبووەو نیـە، بـەڵکو لـە چـەندین خاڵـدا لەگـەڵ تیۆریـە ڕەهاکـانی دیمۆکراسـی و جمهوریەتـدا یـەکتری دەگرێتەوە[41]".

تۆکڤیــــل لــــە ڕێگــــای وەســــفکردنی کارەکتــــەرەکانی دروســــتکردنی ئەمــــەریکای "موتـەزەمیت"ەوە، دەیـەوێت پێمـان بڵێـت تـا چ ئاسـتێك فەرمانـە ئاینیـەکان بـوون بـە یاسـای سیاسـی کۆمەڵگـە. پیـەر مانانـت لـەم بارەیـەوە دەڵێت:

"هــەر ئەنــدامێکی کۆمەڵگــە مومارەســەی دەســـەڵاتی ئــاین دەکــات بەســەر هەموانــەوەو هــەموانیش مومارەســەی دەکــەن بەســەر هــەر تاکێکـەوە. ئـەم دەسـەڵاتە، دەسـەڵاتی ئـاین نیـە بەسەر کۆمەڵگەوە، بەڵکو دەسەڵاتی کۆمەڵگەیـە بەســەر خۆیــەوە، بــەڵام لــە ڕێگــای کەرەســە ئاینیەکانەوە[42]".

لــەم وڵاتــەدا ئــاین ماشــینی ڕێکخــەری خوڕەوشت و ئاکارەکانە، تۆکڤیل دەڵێت:

"نــاتوانین بڵــێین ئــاین ڕاسـتەوخۆ کـارایی دادەنێت بەسەر یاسا و ڕای گشتیەوە، بەڵام لـە ڕێگــای ڕیکخــستنی خێــزان و داڕشــتنی خوڕەوشتەوە، کاروبـاری دەوڵـەت ڕێکـدەخات و بەشداری زیندوو دەکات[43]".

تۆکڤیــل پێیوایــە ئاســتی پەیوەنــدی ئەمەریکیەکان بە ئاینـەوە هـەر چۆن و هەرچـەند بێت مەسەلەیەکی زۆر گرنگ نیـە، بـەڵکو ئـەوەی گرنگە ئەو "میسداقیەتەیە" کە ئەوان بە ئیمـانی ئاینی دەبەخشن:

"مـن نـازانم هـەموو ئەمەریکیـەکان ئیمانیـان هەیە یان نا، کێ دەتوانێت دڵەکان بخوێنێتەوە؟ بەڵام دەزانم هەموو ئەمەریکیەکان باوەڕیان بەوە هەیە کە بۆ راگرتنی دەزگا دەستوریەکان ئیمان رەگەزێکی زۆر پێویستە" (بەشی یەکەم، 399).

لێـرەوە فـاکتی[44] ئـاینی بـە قـوڵایی کـردە کۆمەڵایـــەتی و سیاســـیەکانی کۆمەڵگـــەی ئەمەریکیـدا دەڕواتـە خـوارەوە. ئـاین ئـارەزووە دیمۆکراتیـــەکان نوێدەکاتـــەوە، کۆمەڵگـــە ئازادیخوازەکان رێکدەخاتەوە، بەشداری دەکات لــە ئامــادەکردنی هەلومــەرجی یەکـسانی بــۆ هەموان:

"لێرەوە رۆحی مرۆڤ هەست بەوە ناکات کە لە کێڵگەیەکی بێ سنوردایە، بەڵکو هەست بەوە دەکات کە شتەکان سنوریان هەیە و مەرج نیە لە هـەموو شـتێك تێبگـەین و بیگـۆڕین(...) لێـرەوە گەر یاسا رێگا بە ئەمەریکیەکان بدات کە هەموو شتێك بزانن و هـەموو شـتێك بگۆڕن، ئـەوا ئاین رێگایان لێدەگرێت ئەم کارە ئەنجام بدەن. ئاین، کـە لـە ئەمــەریکادا هــەرگیز راســتەوخۆ خــۆی تێکـەڵ بـە حکومـەت ناکـات، وەك یەکـەم دەزگـا دەسـتوری و سیاسـیەکانیان تەماشـا دەکرێـت. چــونکە گـــەر ڕاســـتەوخۆ تـــامی ئازادیـــشیان پێنەبەخـشێت ئـەوا کاریـان بـۆ ئاسـان دەکـات" (بەشی یەکەم، 398).

هەموو ئەم تێبینیانە وا لە تۆکڤیل دەکات کە پێیوابێت ئاین پێویستیەکی بەردەوامی هـەموو ئــەو جمهوریەتانەیــە کــە لەســەر دیمۆکراســی خۆیان بیناکردووە، بەڵام ئەم ئاینە دەبێت:

"خـــــۆی ســـــەرگەرم نـــــەکات بـــــە دووبارەکردنــەوەی مێــژووی هــەزار ســاڵەی و مومارەسەکردنی کۆی دۆگمەکانی. ئەم ئاینـە بـۆ ئـەوەی لـە سـەدەکانی داهـاتوودا بمێنێتــەوە، دەبێت هەموو ئەو دۆگمانە دوور بخاتەوە کە بە کەڵکی ئێستا و ئێرەکان نایەن. گـەرنا لـە نێوان بـێ ئیمانـەکانی سـەدەی داهـاتوودا تـەواو لاواز دەبێت و کارایی خۆی لە دەست دەدات" (بەشی دووەم، 34-35).

## 8-ئایینداری لە ئەمەریکادا

تۆکڤیـــل پێیوایـــە کـــردەی ئاینـــداری لـــە ئەمەریکادا پەیوەندیەکی راستەوخۆ و زیندووی لەگـەڵ پراگماتیـسم و بیرۆکـەی بەرژەوەندیـدا هەیە:

"پێموانیـــە تاکـــە هۆکـــاری بزووتنـــەوەی پیاوانی ئاینی بریتی بێت لە بەرژەوەندی، بـەڵام لــە هەمانکاتــدا پێموایــە یەکێکــە لــە هۆکـارە سـەرەکیەکانی کۆکردنـەوەی ئەمەریکیـەکان بـە دەوری ئاینەکانـدا. هـیچ گومـانم لـەوەدا نیـە کـە لـــەم رێگایـــەوە پیـــاوانی ئـــاینی دەتـــوانن چوارچێوەی رەفتارە کۆمەڵایـەتی و سیاسیەکان دیاری بکەن[45]".

کاتێك تۆکڤیل دەڵێت لە ئەمەریکادا دیالۆگی لەگەڵ ئەو خواناسانەدا کردووە کە گوایە تـەنها لەبەر رەزامەندی خواو بەهەشت و قیامەت و ئەو دونیا کاردەکـەن و تـەنها مەبەسـتیان بـەختیاری مرۆڤەکانـە و هـیچ بەرژەوەندیـەکیان بـۆ خۆیـان ناوێـت، دەڵێـت: ئەمانـە هـەموویان زیـادەڕەوی دەکەن. (بەشی دووەم، 157):

"ئەمەریکیـەکان نـەك تـەنها لەبـەر خـاتری بەرژەوەنـدی دوای ئـاین دەکـەون، بـەڵکو ئـاین دەخەنـە نێـو سـەنتەری بەرژەوەندیەکانیانـەوەو بـۆ بـەدیهێنانی بەرژەوەندیـەکانیان مـۆبیلیزەی دەکەن. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، قەشـەکان بـە تـــەنها باســـیان لـــە قیامـــەت دەکـــرد، بـــەڵام داعیەکانی ئەمڕۆ بەردەوام باس لە ئێرە دەکەن و

ناتوانن دابڕان لە نێوان خۆیان و ئێرەدا دروست بکەن. ئەوان بۆ ئەوەی لە پەیوەندی بەهێزدابن لەگەڵ ئیمانداراەکاندا، گرنگی دەدەن بە خەونە هەنووکەیەکانیان و باس لە ئازادی و یاسای گشتی دەکەن. لێرەوە زۆر بە ئەستەم دەتوانین جیاوازی نێوان قیامەت و دونیا لە گوتاری داعیە مەسیحیەکاندا بدۆزینەوە" (بەرگی دووەم، 159).

تۆکڤیل ئاینداری پراگماتیست و بەرژەوەندگەرای ئەمەریکیەکانمان بۆ دەخاتە سەر شانۆ و وەك وێل هێربەرگ، چۆنیەتی بەشداریکردنی کاتۆلیك و پرۆتیستانت و جولەکە لە سێکیولاریزاسیۆنی ئاینماندا بۆ دەگێڕێتەوە.

### 9-شۆڕشی فەرەنسی وەك شۆڕشێکی ئاینی

لە کتێبی "ڕژێمی کۆن و شۆڕش"دا کە ساڵی 1856 بڵاوبووەوە، تۆکڤیل روناکی دەخاتە سەر لێکدژیە بوونیەویەکانی نێوان فاکتی کۆمەڵایەتی و فاکتی سیاسی ڕژێمی کۆن و چۆنیەتی زاڵبوونی شۆڕشی فەرەنسی بەسەر ئەو لێکدژیانەدا و داهێنانی کۆمەڵگەیەك لەسەر بەها جیهانیەکان، بەبێ ئەوەی پشتبکاتە سروشتە ئەریستۆکراتیەکەی. شۆڕشی فەرەنسی ئەو سنورانەی پێچایەوە کە ئەم دوو فاکتەیان لە یەکتری جیادەکردەوە. لەم سەرشارەوە تۆکڤیل دێت و شۆڕشی فەرەنسی وەك شۆڕشێکی ئاینی پێناسە دەکات:

"ئێمە پێمانوایە ئەم شۆڕشە سیاسیە چەند رەنگێکی تایبەتی ئاینی پێوە دیارە چونکە وەك شۆڕشە ئاینیەکان پەنا بۆ دەعوە دەبات و دەیەوێت لە ڕێگای پروپاگەندەوە خۆی بکات بە هەموو بوارەکانی ژیاندا" (بەرگی یەکەم، 106)

هەروەها چونکە ئەم شۆڕشە، وەك هەر شۆڕشێکی ئاینی، بە تەنها باس لە "مرۆڤ" دەکات، مرۆڤ لە دەرەوەی زەمان و مەکان، باس لە تاك دەکات، تاك لە دەرەوەی زەمان و مەکان، باس لە جیهان دەکات، جیهان لە دەرەوەی زەمان و مەکان. تۆکڤیل پێیوایە ئەمە هەمان ئەو بەرنامەیەیە کە شۆڕشێکی ئاینی کاری لەسەر دەکات.

مونا ئۆزوف مێژوونووس، لە بەرهەمە جوانەکانیدا، بە ڕونی ئەو چیرۆکەی بۆ گێڕاوینەتەوە کە تا چ ئاستێك بیرۆکەی تازەگەری لە شۆڕشی فەرەنسیدا بەهێز بووەو چۆن ئەم شۆڕشە ویستویەتی ببێت بە ئەلتەرناتیڤی ئاینەکان و چۆن ئاینی وەك یەکێك لە کێشە هەرە سەرەکیەکانی خۆی تەماشاکردووەو چۆن لە ڕێگای ئەم پرۆژەیەشەوە جەنگی ئاینی دەستپێکردوو بۆ ماوەیەکی زۆر فەرەنسای کرد بە دوو وڵاتەوە، فەرەنسای ئیمانداراەکان و فەرەنسای بێ ئیمانەکان.

لە ڕێگای ئەم تیپە لە ڕاڤەکردنەوە تۆکڤیل دەگەڕێتەوە سەر هەمان بیرکردنەوەی مێژوونووسی ئەمەریکی گۆلدستۆن کە پێیوایە ئەو شتەی کە شۆڕشی فەرەنسی لە هەموو شۆڕشە مێژووییەکانی دیکە جیادەکاتەوە چوار چێوە کولتوریەکەیەتی:

"بۆ یەکەم جار لە چەرکەی شۆڕشی فەرەنسیدا چوارچێوە ئاینیەکانی کریستیانیسم و چوارچێوەی سەدەکانی رابوردوو هەڵوەشێنرانەوەو بۆ یەکەم جار بەهاکان سێکیولاریزەکران و بەدیلێکی دیکەی ئاین درایە دەست مرۆڤ و، مرۆڤ بوو بە بیناکاری جیهانێکی دیکەی باڵا[46]".

نـا "میـسداقیەتی" ئیمانـە ئاینیـەکان لـە کۆتـایی سـەدەی هەژدەهەمـدا، کارەکتـەرێکی ئاینیان بە شۆڕشی فەرەنسی بەخشی. تۆکڤیل پێیوایـە شۆڕشـی فەرەنـسی تـوانی مانـا ببەخشێت بە ژیانی مرۆڤەکان و بۆشاییەکانیان بۆ پڕ بکاتـەوەو سیستەمێکی نویێ لـە بـەهایان بداتە دەست. ئەمە هەمان ئەو پەیامەیە کە ئاین هەیـەتی. ئـەو فەرەنـسیانەی کـە شۆڕشـەکەیان ئەنجامـدا، پێیـانوابوو کـە دەبێـت کۆمەڵگـە بگۆڕن و شـتەکان نوێبکەنـەوەو شـتێکی تـازە بـە مرۆڤایـەتی ببەخـشن. ئـەم ئارەزوانـە ئـەم خواسـتانە خۆیـان وەرگێڕابـووە سـەر ئاینێکی تایبەتی شۆڕشگێڕە فەرەنسیەکان. بە فـەزڵی ئـەم ئاینـە نوێیـەوە، ئـەوان دەسـتیان هـەڵگرتبوو لـە خۆپەرستی و رویـانکردبووە خـۆ فیـداکاری لـە پێنـاوی ئـەوانی دیکـەدا. (بـەرگی یەکەم، 247).

بـەڵام لـە هەمانکاتـدا تۆکڤیـل پێیوایـە، لەگـەڵ ئـەم رەهەنـدە ئیجابیەشـدا، تێکـەڵکردنی ئـاین و سیاسـەت رەهەنـدێکی سەلبیشی هەبوو:

"لە نێو هەموو شۆڕشەکاندا، شتێك هەیە بە نـەگۆڕی دەمێنێتـەوە: ئەگـەر شـۆڕش سیاسـی بـوو ئـەوا ئیمـانی ئـاینی دەسـتی بـۆ نابرێـت، ئەگەر شۆڕشیش ئاینی بوو ئەوا یاسای گشتی دەستی بۆ نابرێت، بەڵام لە شۆڕشی فەرەنسیدا دەست بۆ هەردووکیان براو لە یەککاتدا ئیمانی ئاینی و یاسای گشتی هەڵوەشێنرایەوە و ئیتر نەمانـدەزانی سـنورەکان لـە کوێـدا کۆتاییـان پێدێت" (بەرگی یەکەم، 247).

ئەم شۆڕشە سیاسیەی کە هاتووە ئاینێکی تۆتـالیتێر دوربخاتـەوە، لـە رێگـای باسـکردن و دروسـتکردنی چوارچێوەی گشتی بۆ مرۆڤەوە، خـۆی وەردەگێڕێتـە سـەر ئـاینێکی دیکـەی تۆتـالیتێر. تۆکڤیـل لـە یەککاتـدا دژی هـەر ریفـۆرمێکی ئـاینی بـوو کـە بیویـستایە دەسـتبگرێت بەسـەر هـەموو پانتاییـە گـشتیەکاندا، هـەروەها دژی هـەر جیاکردنەوەیەکی توندڕەوانەی ئاین و دەوڵەت بـوو کـە ببوایـە بـە مەترسـی بەسـەر دیمۆکراسیەوە.

### 10-کۆتایی

پیەر مانەنت لەسەر تۆکڤیل دەنووسێت:

"ئـاین فـراوانترین پانتـایی سـتراتیژی کـارکردنی تۆکڤیلـە. لـە ئاینـدا نوێکردنـەوەی پراکتیکی هەناسەی دیمۆکراسی دەبینێت. لـە ئاینـدا تیۆریـەك دەبینێـت کـە رێگـا دەدات ئەندامـەکانی کۆمەڵگەیـەکی دیمۆکراسـی پەیوەندی بە (دەرەوەیەك) کەوە بکەن کە ئێرە نیـە. ئـەو پێیوایـە مرۆڤـی سروشـتی هەمیـشە پیاوێکی ئایندارە[47]".

تۆکڤیـل، بـە شـێوەیەکی گـشتی هەوڵـدەدات چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ ئاین دروست بکات. چوارچـێوەیەك کـە لەگـەڵ داهـاتووی کۆمەڵگـە دیمۆکراتەکاندا بگونجێت.

لەم چوارچێوەیەدا:

-ئاین دەبێت بە سەرچاوەی مانابەخشین.

-ئاین دوور دەکەوێتەوە لە سەپاندنی دۆگم.

-خـوا راسـتەوخۆ دەسـتناخاتە کاروبـاری سیاسیەوە.

-خـوا پانتـایی دەسـەڵات بەجێـدەهێڵێت بـۆ مرۆڤەکان.

-ئیماندارەکان دەبن بە مرۆڤی دیمۆکرات.

-ئیمان دەبێت بە بەهایەکی مەدەنی.

**ئـەم ئـەو چوارچـێوە گـشتیە تیۆریەیـە کـە تۆکڤیـــل پێـــشنیاری دەکـــات بـــۆ ڕێکخـــستنی پەیوەنـدی ئـاین بـە دیمۆکراسـی و دەوڵـەت و سێکولاریزاسیۆنەوە.**

## پەراوێزەکان:

1–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

2–پیـەر بورێتز، دیمۆکراسی فەرەنسی لە ڕیسکی جیهاندا، لە کتێبی دێمۆکراسی لە فەرەنسادا، پاریس، چاپخانەی گەلیمار، ساڵی 2000.

3–فرۆنـسواز میلۆنیـۆ، تۆکڤیـل و فەرەنـسیەکان، پاریس، چاپخانەی ئوبیە، ساڵی 1993.

4–ژان –کلـــۆد لـــە مبێرتـــی، تۆکڤیـــل و دوو دیمۆکراسی، پاریس، چاپخانەی *PUF*، ساڵی 1983.

5–ئەلێکسی دوو تۆکڤیل، یادەوەریـەکان، پـاریس، چاپخانەی گەلیمار، ساڵی 1964.

6–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

7–نۆرمۆندی ناوچەیەکی گرنگە لە فەرەنساداو زۆر لە پاریسەوە دوور نیە.

8–نامەی گویزۆت بۆ تۆکڤیل لە 30 ژون 1856.

9–فروانسوا فـورێ، سـەرەتای کتێبی (دیمۆکراسی لە ئەمەریکادا)، بەشی یەك، چاپخانەی فلاماریۆ، ساڵی 1981.

10–ئەندرێ ژاردین، ئەلێکسی دوو تۆکڤیل 1805–1859، پاریس، چاپخانەی ئەشێت، ساڵی 1984.

11–ژان–کلـــــۆد لامبێرتـــــی، تۆکڤیـــــــل و دیمۆکراسیەکان، پاریس، *PUF*،

12–ە، س پ.

13–ئەلێکـــسی دو دۆکیڤیـــل، دیمۆکراســـی لـــە ئەمەریکادا، چاپخانەی فلارماسیۆن، ساڵی 1981.

14–نامــەی تۆکڤیـل لـە 15 نۆڤەمبــەر 1843. لـە زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانیدا ساڵی 1983 لە پاریس بڵاوبووەتەوە.

15–کـۆی کتێبـەکانی تۆکڤیـل، کـە سـاڵی 1985 لەلایـەن چـاپخانەی گـەلیمارەوە بڵاوبووەتـەوە. لاپـەڕە 605.

16–ئەلێکـــسی دو دۆکیڤیـــل، دیمۆکراســـی لـــە ئەمــەریکادا، چــاپخانەی فلارماســیۆن، ســاڵی 1981، لاپەڕە 226.

17–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

18–ە. س. پ.

19–ە،س پ. لاپەڕە 135.

20–ە،س پ لاپەڕە 355.

21– ە،س پ لاپەڕە 18.

22– ە،س پ لاپەڕە 18.

23– ە،س پ لاپەڕە 139.

24– ە،س پ لاپەڕە 384.

25– ە،س پ. بەرگی دووەم، لاپەڕە 12.

26– ە.س پ. بەرگی دووەم، لاپەڕە 17.

27–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

28–ئەلێکـــسی دو دۆکیڤیـــل، دیمۆکراســـی لـــە ئەمــەریکادا، چــاپخانەی فلارماســیۆن، ســاڵی 1981، لاپەڕە 226.

29– ە،س پ. بەرگی دووەم لاپەڕە 29.

30– ە،س پ. بەرگی دووەم لاپەڕە 30.

31– ە،س پ. بەرگی دووەم لاپەڕە 30.

32–کلۆد لۆفۆر، داهێنانی دیمۆکراسی، چاپخانەی فەیار، پاریس، 1981.

33–ژان ڤیـــدێرت، سیاســـەت و کولتورەکـــان و ئاینەکان، چاپخانەی بەیار، پاریس، 1998، لا12.

34–ئەلێکـــسی دو دۆکیڤیـــل، دیمۆکراســـی لـــە ئەمــەریکادا، چــاپخانەی فلارماســیۆن، ســاڵی 1981، لاپەڕە 401.

35– ە،س پ. بەرگی دووەم، لاپەڕە 393.

36–ئیـــدوارد تیریاکیـــان، تاقانـــەیی ئاینـــداری زیندوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، چاپخانەی

سۆسیال،ساڵی 1991، لا 217.

37–ئەلێکــسی دو دۆکیڤێــل، دیمۆکراســـی لــە ئەمــەریکادا، چــاپخانەی فلارماســیۆن، ســاڵی 1981، لاپەڕە 404.

38– ه،س پ. بەرگی دووەم، لاپەڕە 403.

39–ه، س پ. بەرگی دووەم، لاپەڕە 32.

40– ه، س پ. بەرگی یەکەم، لاپەڕە 407.

41– ه، س پ. بەرگی یەکەم، لاپەڕە 31.

42–پیەر مانانت، تۆکڤیل و سروشتی دیمۆکراسی، پاریس، چاپخانەی فەیار، ساڵی 1993، لا 132.

43– ه، س پ. بەرگی یەکەم، لاپەڕە 397.

44–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

45–ئەلێکــسی دو دۆکیڤێــل، دیمۆکراســـی لــە ئەمــەریکادا، چــاپخانەی فلارماســیۆن، ســاڵی 1981، لاپەڕە 358.

46–جــاک گۆلدســتۆن، "شــۆڕش لــە مێــژوودا و مێژووی شـۆڕش" لـە گۆڤـاری فەرەنسی سۆسـیۆلۆژیا، ساڵی 1989، ژمارە 30، لاپەڕە 420.

47–پیەر مانەنت، تۆکڤیل و سروشتی دیمۆکراسی، پاریس، چاپخانەی فەیار، ساڵی 1993، لا 148.

## بیبلۆگرافی

## کتێبەکانی ئەلێکسی دوو تۆکڤیل


***Alexsi de Tocqueville, L'Ancien Régime et la Révolution (1856) Paris, Flammarion, 1988.***

***Alexsi de Tocqueville, De la démocratie en Amérique, (1835) Paris, Flammarion, 1981.***


## کتێب لەسەر ئەلێکسی دوو تۆکڤیل


***André Jardin, Alexsi de Tocqueville 1805-1859, Paris, Hachette, 1984.***

***Jean-Claude Lamberti, Tocqueville et les deux démocraties, Paris PUF, 1983.***

***Pierre Manent, Tocqueville et la nature de la démocratie, Paris, Fayard, 1993.***

***Françoise Melonio, Tocqueville et les françes, Paris, Aubier, 1993.***

# نوێپلاتۆنیزم

له ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

کاتێک هەموو فێرگە فەلسەفییەکان لە سەردەمی کایزەرێتیی رۆمدا هێدی هێدی بەرەو نەمان دەچن، ئەوە لە نوێپلاتۆنیزمدا گۆڕانێکی پێچەوانە دەبینین. ژیانی هۆشەکییانەی گریکی جارێکی دی لە نوێپلاتۆنیزمدا دەگەشێتەوە. بێگومان ئەم گەشانەوەیە بەزۆریی هەڵچوونێك بوو، چونکە کتوپڕ دادەمرکێتەوە.

سەرجەم نوێپلاتۆنیزم سیمایەکی بەهێزی هەستی ئایینیی هەڵگرتووە و ئەم هەستە زۆر جار دەبێ بە میستیك. بێگومان ئاشکرایە، کە فەلسەفەی گریکی بۆ مەسەلەی ئایین کراوەیە. پلاتۆن لەبارەی (تەقوا) دەنووسێ، ئەرِیستۆتێلیس لەبارەی نوێژ، تیۆفراست و یۆدێمۆس لەبارەی خواکان و پەرستنی خواکان.

بێگومان نوێپلاتۆنیزم هەمیشە راستەوخۆ لە نووسینەکانی پلاتۆنەوە هەڵناهێنجێ، بەڵکو هەروەها لە تراديسيۆنی فێرگەی پلاتۆنییەوە، کە لە پلاتۆنەوە هەتا پلۆتین نەپچرا بوو.

هێزی ژیانی نوێپلاتۆنیزم بەتایبەتی بەوەدا دەردەکەوێ، کە نوێنەرەکانی سەراپا لە سەنتەرەکانی کولتووری هێلێنیستیدا شیاوی دۆزینەوەن: لە ئەلێکساندریا، رۆما، ئەسینا، ئەنتیۆخیا، پێرگامۆن. بەڵام مرۆڤ هاوکات دەبینێ، کە دەبێ پلاتۆنیزم چ مەزنێتییەکی هزریی هەبووبێ، کە بتوانێ ئەوها گشتگیر لە نوێپلاتۆنیزمدا بژێتەوە. بێگومان ئەم ژیانەوەیە تەنها شتێکی دەستکردە، تەنها "نوێکردنەوە"یە، هەروەها ئێمە ئەمڕۆ دەڵێین، کە نوێپلاتۆنیزم چیدی پلاتۆنیزمی سەرچاوەیی نییە، بەڵکو پلۆتینیزمە. بەڵام نوێپلاتۆنییەکان خۆیان بە میراتگری راستەقینەی پلاتۆن دەزانن. لە راستیدا هزرۆکەو تێگەکانی پلاتۆن لە نووسینە نوێپلاتۆنییەکاندا زۆر بە فراوانی دەگەڕێنەوە.

## پلۆتین

فەلسەفەکەی پلۆتین سەرەنجامی دوو بزووتنەوەی هزرییە: لە لایەك بوون لە یەك دەپچڕێنرێ و بەسەر کایەکانی سەرسروشت و سروشتدا بەش دەکرێ، بەڵام لە لایەکی دیکەوە هەوڵ دەدرێ ئەم دەلاقەیە بگیرێتەوە، ئەویش

بەوە، کە مرۆڤ هەوڵ دەدات بوونی سروشتی بەڕێی ریزێك پلەی نێوانییەوە وەك دەرەنجام لە بوونی سەرسروشتییەوە دەربکێشێ. لێرەدا دوالیزم و مۆنیزم خۆیان لە گرژییەکی دیالێکتیکیدا دەبیننەوە، گرژییەك، کە دەرفەت دەرەخسێنێ ئاخافتن لەبارەی بوون بەهەڵواسراوی بهێڵرێتەوە و هاوکات مرۆڤ لەبارەی یەك و زۆرێتی بدوێ، بەبێ ئەوەی لێرەدا خۆی بۆ یەکلایەنییەکانی مۆنیزمێك یان دوالیزمێك ساغ بکاتەوە.

پرۆسەکە بەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ئێستا خوا نەك تەنها لە جیهان، بەڵکو هەروەها لە خودی بوون تەواو جیا دەکرێتەوە. خوا برێتییە لە سەربوونەوەر. هیچ هەڵگرێك، کە ئێمە لە جیهانی زەمینیدا دەیناسین، بەسەر ئەودا شیاوی بەکارهێنان نییە. بەڵام ئێمە هەروەها ناتوانین کاتیگۆریی هۆشەکییانە لەبارەی ئەو دەربڕین. پلۆتین پەیوەست بەمەوە دەبێژێ: "ئەو یەکەمە تەنانەت هۆش نییە، بەڵکو لە پێش هۆشەوەیە" ئاخر هۆش ئەوەیە کە شتە هەبووەکان هەیانە" بەڵام ئەو شتێك نییە، بەڵکو لە پێش هەر شتێکەوەیە" ئەو هەروەها بوونەوەریش نییە، چونکە بوونەوەر فۆرمی بوونەوەری وەك فۆرم هەیە، بەڵام ئەو بەبێ فۆرمی هۆشەکییانەشە. لەبەرئەوەی جەوهەری یەك دروستکەری سەرجەم شتەکانە، ئەوە ئەو خۆی سەر بە ئەو شتانە نییە. کەواتە ئەو نە شتێکە، نە چۆنێتییەکە، نە چەندێتییەکە، نە هۆشە و نە دەروونە، نە بزواوێك و نە سرەوتووییەکە، ئەو لە فەزادا نییە و لە کاتیشدا نییە، بەڵکو ئەو یەك-شێوەییە، یان بە پێچەوانەوە، ئەو بەبێ شێوەیە، چونکە ئەو پێش هەموو شێوەیەکە، پێش بزووتن و سرەوتنە، ئاخر ئەمانە بە بوونەوەرەوە لکاون و بوونەوەر دەکەن بە زۆرێك" (*Enneaden VI9,3*).

پلۆتین دەیەوێ خوا تەنها ناو بنێ یەك (هێن)، بێگومان ئەم یەکە وەك هیچاندنی (نێگاسیۆنی) زۆرێتی و هاوکات لە مەغزای یەکەمیندا. بەڵام ئەو هەروەها ناوی "چاك"یش لە یەك دەنێ. لە پلاتۆنیزمی ناونجی و نوێپلاتۆنیزم بەدواوە هەمیشە پتر دەنگ دەنرێ بە ترانسێندێنسی خوادا. "لەبارەی خوا نە تێگە و نە زانست هەیە، هەر بۆیە لەبارەی ئەو دەگوترێ، ئەو لە ئەوبەر بوونەوەیە" (*Enneaden V, 4, 1*).

مرۆڤ ناتوانێ لە جیهانەوە خوا دیاری بکات، بەڵام دەتوانێ لە خواوە جیهان بناسێ. ئێمە بۆیە دەتوانین لە جیهاندا لە یەك-ێك بدوێین، چونکە سەرجەم یەك لە هەرە یەك-ی سەرەتاییدا بەشدارە. ئەمە هەروەها سەرجەم بوونەوەرەکانی دیکە، هۆش و دەروون و ژیانیش، دەگرێتەوە. پلۆتین لە ژێرەوە بوون روون ناکاتەوە، بەڵکو لە خواوە، بەڵام ئەوەی پلۆتین لێرەوە هەڵیدەهێنجێ، وەك پلاتۆن وەك هیپۆتێزیس (گریمانە) یان وەك ئەریستۆتێلیس وەك بالاترین هۆکار داینانێ، بەڵکو تێگەی "رژان" بۆ روونکردنەوەی بوون دەهێنێتە نێوانەوە. یەك لەپڕیی خۆیدا دەڕژێ، بەڵام بەبێ ئەوەی بلێشاوێ، بەڵکو تەنها بەو شێوەیە دەڕژێ، وەك چۆن خۆر روناکی دەپەخشێنێ بەبێ ئەوەی بەم پەخشانە کەم بکات، یان وەك چۆن سەروێنەیەك دەروێنەکە دەردەخات.

ئەوەی بەدووی یەك-دا دێ، هەمیشە ئەویدییەکە و سەرباری ئەمەش هێشتا هەر سەر بە سەرچاوەیە، کە ئیتر لێرەوە ئەم دەربڕینە شیاو دەبێ: "یەك هەمووە"، ئێستا بێگومان

ئەم شیمانەیەش دێتە گۆڕێ بۆ ئەوە کە دەربڕینەکە راست بکرێتەوە: "هەموو لە ئەوەوە" هاتووە (*Enneaden, V 2, 1*). گەر بێگومان لەم هزرۆکەیە بڕوانین: کامیل ناکامیل دادەنێ، ئەوا بۆمان روون دەبێتەوە، کە ئەوە هیپۆتێزیس ی پلاتۆنی و هزرۆکەی بەشداریکردنە (مێتیکسیس)، کە لێرە بەردەوامیی پێدەدرێ، بەڵام هێندە نەبێ، کە لێرە ئێستا پلە نێوانییەکان زیت دەکرێنەوە. بێگومان لای پلۆتین ریالێتیی دیکە نییە، بەڵکو دەیەوێ بە هەمان شێوەی پلاتۆن هەموو شتێك لە سەرەوە روون بکاتەوە، واتا بۆ پلۆتینیش تەنها یەك ریالێتی هەیە، کە برێتییە لە ریالێتیی "یەك". ئەم ریالێتییە هەمیشە پتر لە رەوتی دابەزیندا کەم دەکات، بە هەمان شێوەی رووناکی، کە بە دوورکەوتنەوەی لە سەرچاوە کزتر دەبێ، هەتا ئیتر لە کۆتاییدا لە کایەی جەستەدا تەنها سێبەر هەیە.

کەرەسەی جیهان بەرێی فۆرمەکانەوە دەبێ بە هەقیقەت، ئەم فۆرمانە لە دەروونەوە دێن، فۆرمی دەروونیش لە هۆشدایە، "کە ئیتر لەنێو هۆشدا هەموو شتێك، کە ئەو رایدەگەیەنێ، هەیە" (*V 9, 3*)، ئینجا لەبەرئەوەی هۆش لەلایەن یەکەوە دانراوە، ئەوە هەموو شتێك لەنێو ئەودا هەیە.

ئەو یەکەمە، کە یەك لە خودی خۆیەوە بەری دەدات، هۆشە، نووسە. بەڵام سەرهەڵدانی ئەم نووسە لە لای پلۆتین ناگەڕێتەوە بۆ دۆخێکی ریال، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ دۆخێکی مێژوویی. نووس برێتی بوو لە قەوارەیەکی ناسراو، بەڵێ لەنێو سەرجەم هەوڵەکانی روونکردنەوەی بووندا ناسکترین قەوارە بوو، هەر بۆیە دەبوو لە لای پلۆتینیش دیار بدات. بێگومان ئاشکرایە، کە چیدی ناشێ نووس هەرە یەکی سەرەتایی بێ، چونکە نووس ئێستا واتای دوانەتییەك دەگەیەنێ. ئاخر لەکوێ زانین (ناسین) هەبێ، لەوێ زانراویش (ناسراویش) هەیە. بەڵام نووس هیچ نەبێ راستەوخۆ دوای یەك دێ. نووس بۆ پلۆتین برێتییە لە بەرجەستەی سەرجەم ئیدێ و نۆرمەکان (پێوەرەکان)، یاسا و بونیادەکانی بوون، برێتییە لە دەمیورگەکەی پلاتۆن، کە هێشتا تەواو لە یەك نزیکە، برێتییە لە دەروێنەی یەك، بەڵام هاوکات ئەو دیدەیە، کە یەك خودی خۆی پێدەبینێ، یان بە زمانی میتۆلۆژی ببێژین: نووس خوای دووەمە، کوڕی خوایە، کە لە لایەن خوای یەکەمەوە دروست کراوە (*V, 1, 7*). بەڵام نووس خوا نییە. کاتێك هەڵگری "خوایی" بۆ ئەو بەکاردەهێنرێ، ئەوە ئەو بەکارهێنانە تەنها واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێ، کە نووس لە خوا دەچێ. تەنها خوا یەکەم جەوهەرە، دوانەکەی دی، واتا هۆش (نووس) و دەروون، دەرخوایین.

ئێستا هۆش دەکەوێتە کارکردن، تاکو درێژە بەو رژانە بدات، کە ئەو خۆی بەرێیەوە هاتە گۆڕێ. هۆش، وەك بەرجەستەی سەرجەم ئیدێکان و وەك دەمیورگ، جیهان دروست دەکات، "چونکە هۆش وەك هەرە خاوێنترینێك شایستەی ئەوەیە، کە لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەوە جگە لە هەرە یەکەم بناغەوە پێبگات، ئینجا کاتێك دێتە نێو دروستبوونەوە، ئیتر ئێستا شایستەی ئەوە دەبێ لەتەك خودی خۆیدا هاوکات سەرجەم بوونەوەر و سەرجەم ئیدێکان لەنێو سەراپای جوانییاندا و هەروەها سەرجەم خوا هۆشەکییەکان دروست بکات" (*V, 1, 7*). "لەبەر ئەوەی نووس لە هەرەتی کامڵیدایە، ئەوە دەبوو دروست بکات“ ئاخر

نەشیاوە هێزێکی ئەوەندە مەزن توانستی دروستکردنی نەبێ" (V, 1, 7).

جیهان بە ئەندازەی ئیدێکان لە لایەن نووس (هۆش) دروست دەکرێ. ئیدێکان، کە نووس وەك سەروێنەی دروستکردن وەریان دەگرێ، بە تەواوکراوی لەنێو نووس (دەمیورگ) خۆیدان. ئێستا هەروەها سەروێنان بۆ تاکێتی و تاکەکانیش هەن. بێگومان ئەمە هزرۆکەیەکی نامۆیە بە پلاتۆنیزمی رەسەن، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ لێرەدا دەرك بە کاریگەریی سیمپۆزیۆن و تیمایۆسی پلاتۆن، بەڵام هەروەها ستۆئایزم، بکات، ئێمە بەم هزرۆکەیە هاوکات خۆمان لەو جێیەدا دەبینینەوە، کە لێوەی باوکانی کلێسە (پاتریستەکان) پاڵهێزیان وەرگرت، تاکو ئیدێکانی پلاتۆن لە نێو هۆشی خوادا دابنێن.

هۆش لە دروستکردنی جیهاندا پێش هەموو شتێك دەروون دادەنێ: "هەرچۆنێك بێ، تەنها هزر بەرهەمی هۆشە، هزر لەو بەشەی دەروونەدا سەرهەڵدەدات، کە لێدەهزرێ" ئەم بەشەیە کە بە دەوری هۆشدا دەبزوێ، ئەمە روناکییەکە، کە لە لایەن هۆشەوە پەخشێنراوە" (V, 1, 7). بێگومان ئەوە دەروونی جیهانە کە بەم چەشنە دێتە گۆڕێ، بەڵام تاکە دەروونەکان، کە لەنێو دەروونی جیهاندا تەواوکراون و لەبەر ئەم هۆیەش لە سیمپاتییەکی هەمیشەییدا پێکەوە بەستراون، لە نێویدا دەژین. دەروون نێوەندێکە لە نێوان کایەی هۆشەکی (بە سێ جەوهەرەکەیەوە: یەك، نووس، دەروون) و کایەی سروشتیدا (سێنسیدا). دەروون بۆیە پردێك پێکدەهێنێ، چونکە ئەو خۆی هەمیشە سەرجەمێتییە و بەمەش لە یەك-ەوە نزیکە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە روو دەکاتە کەرتەکان و بەم رێیەشەوە لە زۆرێتی نزیکە. دەروون "وەك جەستەکان شیاوی کەرتکردن نییە، بەڵام دوای ئەوەی دەچێتە نێو جەستەوە (لەشەوە)، ئیتر شیاوی کەرتکردن دەبێ" (IV, 2, 1). بەمەش دەروون دێتە نزیکی زۆرێتی و هاوکات ئاراییەوە، چونکە زۆرێتی و ئارایی پێکەوەن. دەروون هەردەم لە فەلسەفەی گریکیدا وەك ئارایی دیاری دەکرا. دەروون بەگوێرەی فائیدرۆس (لای پلاتۆن) خۆبزووتنە. هەروەها ئەریستۆتێلیس بەم شێوەیە دەرون دیاری دەکات. بەڵام ئێستا دەروون لەم رەوتەدا چەند زۆرتر لە فریشتە و دێمۆنەکانەوە هەتا مرۆڤ و ئاژەڵ و رووەك دابەزێ، ئەوەندەش یەکێتییەکەی کەم دەکات، هەروەها ئەوەندەش لە زۆرێتی، لە شیمانەی کەرتبوون و حەز لە ئارایی، نزیکتر دەکەوێتەوە.

نزمترین پلەی دەروون برێتییە لە سروشت، واتا کاتێك ئەو خۆی بە لەشێك دادەپۆشێ. سروشت برێتییە لە دەروێنەی کایەی هۆشەکی (ئینتەلیگیبل)، هەر بۆیە کامیلە. بەڵام سروشت سەرباری ئەمەش تەنها دەروێنەیە. بۆیە لێرە کەمتر هۆش، کەمتر هێز و ئازادی و چالاکی هەیە، بەڵام بە ئەندازەی ئەمە پاسیڤێتی هەیە. ئێستا هەروەها فەزا و کات دێنە ئاراوە، رەمەك جێی ئازادی دەگرێتەوە. بێگومان دەروون لە خۆدا ئازادە، بۆیە بە شێوەیەکی سپۆنتان لەنێو خۆیەوە هۆکاری نوێ دادەنێ. بەڵام: هەتا ئەو کاتەی دەروون لە دەرەوەی لەشدایە، تەواو سەروەری خودی خۆیەتی، ئەو لەنێو لەشدا چیدی سەربەخۆ نییە، بەڵکو بە ریزی هۆئەنجامییەکانی نێو جیهانەوە لکاوە.

دوایەم پلەی رژان ماتەرییە (ئەستووە)، کە بە هیچ شێوەیەك پۆزەتیڤ نییە، بەڵکو برێتییە

لە نێگاسیۆنی پەتی. هەر بۆیە ئەستوو نێگاسیۆنی چاکەشە، بریتییە لە پرنسیپی خراپە و دژەتەوەری یەک-ی سەرەتایی. بەم شێوەیە دەلاقەکە پڕکرایەوە، سەرجەمی بوون لە یەک تاکە پرنسیپەوە هەڵهێنجرا، کەچی لە کۆتاییدا ئەم دەلاقەیە، تەواو دیالێکتیکییانە، واز دەبێتەوە، ئەویش کاتێک ئەستوو وەک دژەتەوەرە دەردەکەوێ.

بێگومان جاری پرۆسەی جیهان کۆتایی نەهاتووە. چۆن یەک بەرێ دەکەوێ، بەهەمان شێوە گەرەکە سەرجەم ئەوەی دروست بووە سەرلەنوێ بۆ لای پنتی دەرچوونی خۆی بگەڕێتەوە. ئەم گەڕانەوەیە بەڕێی تاکەدەروونەوە روو دەدات. پلۆتین لێرەدا تێڕوانینە ئێتیکییەکانی خۆی دادەڕێژێ. لەبەرئەوەی تاکە دەروون تەنها بەشێکی (مۆمێنتێکی) دەروونی جیهانە، ئەوا خودی پرۆسەی گەڕانەوە دەبێ بە رووداوێکی جیهانی. لەبەر ئەوەی دەروون چۆتە نێو لەشێکەوە، ئەوە گوناهبار بووە، ئێستا گەرەکە خۆی لە لەش ئازاد بکات، پاکژ بکاتەوە، لەتەک نووسدا یەک بگرێ و خۆی لەلایەن نووسەوە رۆشن بکاتەوە، لەتەک ئیدێکانی نووسدا ببێ بە یەک، لە کۆتاییدا تەنانەت لەتەک خودی یەک-ی سەرەتاییدا ببێ بە یەک. بێگومان گەرەکە ئەم یەکبوونە لە شێوەی لێڕوانین و خۆشەویستیدا، لە شێوەی زانین و ویستندا، رووبدات، لێرەشدا رەنگە ئێرۆس لایەنە زۆرترە کاریگەرەکە پێکبهێنێ. ئەم بەرزبوونەوەیە بریتییە لە رووەکەی دیکەی رژان، لێرەشدا ئەوە سروشتی راستەقینەی یەک-ە، ئەوە ویستە، کە کاریگەری دەنوێنێ.

کەواتە لەنێو هەرە-یەک-ی خوایانەدا ویست هەیە، واتا ئەو ویستەی چاکە کە ئاڕاستەی خودی خۆی دەبێتەوە. پلۆتین لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیی لەبارەی ئازادیی ویست لەنێو یەک-ی سەرەتاییدا نووسی (*VI, 8*). ئەم لێکۆڵینەوەیە یەکێکە لە گرنگترین داتەکانی مێژووی فەلسەفە، چونکە لە ئێستا بەدوواوە ئەوە دەشکێنرێ، کە ناونراوە ئینتەلەکتوالیزمی گریکی، لە ئێستا بەدوواوە مێتافیزیکی خۆرئاواییانەی ویست سەرەتا دەگرێ و لێرەوە ئەو تێگەیانە بۆ لای ئۆگوستین دەلێشاوێن، کە دەرفەتی بۆ دەرەخسێنن خوا وەک خۆشەویستی، ئینجا، لە مەزەنەگەرایی سێیەکێتیدا، لە رۆحی پیرۆز ئەو ئەڵقەیە تێبگات، کە باوک و کوڕ پێکەوە دەلکێنێ، ئەمەش سەرلەنوێ گەرەکە ویست و خۆشەویستی بێ (*memoria-intellectus-voluntas*). "کاریگەرییەکانی یەک بریتین لە دەربڕینەکانی ویستی، ئاخر ئەو کاریگەر نابێ، گەر نەیەوێ. چالاکییەکانی ئەو هەتا رادەیەک توخمی ئەو پێکدەهێنن. کەواتە ویستی ئەو و توخمی ئەو هەمان شتن" (*VI, 8, 13*).

گەر لە روانگەی ئێتیکییەوە لە دەروونی خۆیی مرۆڤ بڕوانین، ئەوە سەرەتا لێرەوە وەرچەرخانەکە شیاوی ئیزۆلەکردنە، هەر وەک بڵێین، لەبەر هۆی پەروەردەیی. دەروون دەبێ خۆی لە داوەشانەکەی چاک بکاتەوە، دەبێ بەڕێی تەقەلای گەڕانەوە بۆ لای یەک سەرلەنوێ ئەو تاکاندنە، کە نامۆبون بوو، هەڵبگرێ (نەفی بکات)، بۆیە دەبێ هەوڵ بدات تەواو ببێ بە هۆش، ببێ بە هاوشێوەی خوا و چرووسانەوەی بوون تور بدات، ئینجا لەبریی ئەمە فۆرمە باڵاترین و سادەترین و پاکژترینەکان، واتا

گشتێتی لەبریی تایبەتێتی، وەربگریٚ. ئەوسا ئیتر دەروون سەرلەنویٚ ئازادە. هۆش چەند زۆر بیٚ، ئازادیش ئەوەندە زۆر دەبیٚ، یەکێتی و هەروەها بەختیاریش ئەوەندە زۆر دەبیٚ. ریٚگەی رووەو بەختیاری (یۆدێمۆنییا) هیچی دیکە نییە جگە لە ریٚگەی رووەو خودی بوون. ئیتر مرۆڤ بەم ریٚیەوە دەبیٚ بە کەسێکی کامڵ و بەرەوشت (ئاکاری). کەواتە ریٚگەی رووەو رەوشت بریٚتییە لە پرۆسەیەکی ئۆنتۆلۆژییانە، بریٚتییە لە وەرگرتنی بوونی راستەقینە. ئەمەیە جەوهەری مرۆڤ وەك کەسێکی ئاکاری. کەس "نییە"، بەڵکو کەس "دەبیٚ" (دروست دەبیٚ). ئەم کەسە بەریٚی هەڵچوونەوە رووەو بوونی راستەقینە و سەرچاوەیی دێتە ئاراوە، رووەو یەکەم بناغەکان، کە لە مرۆڤدا یەکەمین و راستەقینەن و لە دیاردە دووری دەخەنەوە و دەیگەیەنن بە بوونی خۆی. هەر بەم ریٚیەشەوە بوون بەئاگا دێتەوە، چونکە هیچ بوونێك بەبیٚ هۆش نییە، هەر وەك چۆن هیچ هۆشێك بەبیٚ بوون نییە. کەس و بوون مەرجی سەرهەڵدانی یەکترین. بەمە "جیهان" بۆ پلۆتین دێتە گۆریٚ. بەبیٚ ئەمە تەنها سروشت و ماتەریمان دەبوو.

ئەم هەڵچوونە بۆ مرۆڤ دەلویٚ، چونکە ئەو لەنێو قووڵترین پنتی ناخیدا خاوەنی شتێکی خوایانەیە، سەنتەریٚك، بە هەمان شێوەی بازنە. ئەم سەنتەرەیە کە نیوەتیرە و چێوەی بازنە دەکات بە ئەوە، کە ئەوان ئەوەن، ئەم سەنتەرە ئەوان لەنێو خۆیەوە دەرژێنیٚ، ئەوانیش لەنێو سەرجەم بوونیاندا، کاتێك ئەوان ئەوەن کە ئەوان ئەوەن، هەمیشە روویان لە سەنتەرە. کەواتە سەرجەم بوونی ئەوان بەم سەنتەرەوە "بەندە". ئەم تێگەیە، کە تایبەتمەندە بە دیالێکتیکی پلاتۆنی، لێرەش سەرلەنویٚ دێتەوە نێوان و پێشانی دەدات، کە مێتێکسیس لە لای پلۆتینیش یاسا ترانسێندێنتالەکەی بوونە. مرۆڤ لەم سەنتەرە خواییەی دەروونیدا لەنێو قووڵترین پنتی ناخی خۆیدایە، ئینجا رەسەنترین ئەرکی ئەو لەوەدایە، کە ئەم هێزانەی خوایەتی لەنێو دەروونیدا ئاوەڵا بکات و سەرکەوتنەکان رووەو کایەی هۆشەکی (ئینتەلیگیبل) بەگەر بخات. چۆن لە لای پلاتۆن سەرکەوتن رووەو چاکە–لە–خۆدا (لە فائیدۆن و سیمپۆزسیۆندا) دیاری دەکریٚ، ئەمە هەروەها لێرە لە لای پلۆتینیش بریٚتییە لە یەکێتی نێوان فرۆنێزیس و ئێرۆس. سیٚ قۆناغەکە بریتین لە پاکژبوونەوە، رۆشنبوونەوە، یەکبوون (یەکگرتن).

یەکگرتن (*Unio mystica*) بالاترین (قۆناغ) دەبیٚ، بەلام هاوکات دەگمەنترینیشە. بەلام پلۆتین وەك دوا ئامانج دای دەنیٚ و بە رەنگی پرشنگدار روونی دەکاتەوە. بەلام ئەوەی پلۆتین سەبارەت بەم حاڵەتە شازە دەری دەبریٚ، نابیٚ مرۆڤ هەروا سووك ئاسان بۆ خودی خۆی وەری بگریٚ و بیرازێنێتەوە، وەك چۆن دۆستە پەلەکەرەکانی میستیك پێی هەڵدەستن. ئەو حاڵەتە شازە لە جەوهەر و بناغەدا هیچی دیکە نییە جگە لەو هەڵچوونە رووەو کایەی هۆشەکی، کە وەك هەڵچوون هەمیشە لە خۆیدا دینامیکی بزووتن پێکدەهێنیٚ و بەتایبەتیش گەرەکە هەر کردارێکی کەسییانەی مرۆڤ پێکبهێنیٚ. بەلام بەخوابوون تەنانەت لەنێو ئێکستازیشدا (فەنابووندا) نایەتە گۆریٚ. ئێمە نابین بە خوایانە، بەڵکو دەبین بە هاوشێوەی خوا. هۆشی مرۆڤ تەنانەت لە تروسکە "خوایانەکە"ی دەروونیشدا هێشتا هەر دەروێنەیەکی سەروێنەی خوایانەیە.


**سەرچاوە:**

ئامادەکراوە لە: *Johannes Hirschberger, Geschichte der Philosophie, Bd. 1 (Zweitausendeins)*

# سێکولاریزمی دژگەر

د. عبدالكريم سروش

لە ئینگلیزییەوە: د. هادی محمد

بڕیار بوو سێکولاریزم ***secularism*** توانای هەرسکردنی ئایینەکانی هەبێت، نەوەك ئەوەی خۆی ببێتە ئاینێك و هەندێك لە ئایینەکانی دیکە بکاتە دەرەوە. مەگەر ئەمە ئەو نەخۆشییە نەبوو کە هەموو ئاینەکان دووچاری بوون؟ بۆ نمونە، دەوڵەتی ئیسلامی مامەڵەیەکی باش لەگەڵ جولەکەکان یاخود مەسیحییەکاندا ناکات، بەیەك چاو سەیریان ناکات و مافگەلێکی تایبەت بە موسڵمانەکان دەدات و بەوانی دیکەی نادات. باشە، ئەگەر سێکولاریزم بەم شێوەیە ڕەفتار بکات و لەگەڵ مرۆڤە ناسێکولارەکاندا بە باشی مامەڵە نەکات و هەندێك لە مافەکانیان پێنەدات، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ جێگای یەکەم جارمان..

لەسەر بانگهێشتی کۆمەڵێك لە قوتابیان و دڵسۆزانی بواری ڕۆشنبیری دینی، د. عبدالكريم سروش لە پاریس لە 2007/8/2، ڕۆژی پێنج شەممە، لە هۆڵی کۆبوونەوەی قوتابیانی زانکۆ، ووتارێکی پێشکەشکرد..

سەرەتا د. سروش بە ڕونکردنەوەی چەمکی سێکولاریزم دەستی پێکرد. ووتی: لە زمانی فارسیدا، زاراوەیەکی تایبەتمان نییە بۆ ڕونکردنەوەی ئەم چەمکە، لە ڕاستیدا ئەم چەمکە تەنها لە زمانی لاتینیدا هەیە و ناتوانین بە زاراوەی زمانە دەرە – لاتینییەکان ڕونیکەینەوە. عەرەبەکانیش نەیانتوانیوە زاراوەیەکی هاوتای بۆ بدۆزنەوەو زۆرجار چەمکە بنەڕەتییە بیانییەکەیان بەکارهێناوە. لە زمانی فارسیدا، چەمکەکانی "گیتیانگی" و "دنیاویت" پێشنیار کراوە (بە وەرگرتن لە وشەکانی "گێتی ***"cosmos***" و دنیا ***world***). لە زمانی عەرەبیشدا، چەمکی "علمانیەت" بەکارهاتووە کە لە ووشەی "زانست ***science***" یاخود "جیهانی جیاوازییەکان" وەرگیراوە. لە

زمانە لاتینییەکاندا، "سیکۆلاریزم" لە ووشەی "سیکولوم *saeculam*"ەوە وەرگیراوە بە مانای "لێرەو هەر ئێستا"، واتە ئەم جیهانە و نەك جیهانێکی دیکە پاش مردن. لە راستیدا، سیکولاریزم جەغدکردنی یەك جیهان و رەتکردنەوەی دوو جیهانی دیکەیە. مانای ئەوەیە ئێمە وابەستەی ئەم جیهانە زەمینی و سروشتییەین کە تیایدا دەژین، سەرقاڵی ناسین و بەئاکام گەیشتنین لەم جیهانەدا، پەیوەست نین بە جیهانێك پاش مردن، یاخود بە جیهانێکی بان سروشت *super natural*، بەشێوەیەکی گشتی، سیکولاریزم واتە رەتکردنەوەی زوهد *asceticism* و جەخت کردنە سەر ئەم دنیایە و سەرقاڵ بوون بەم دنیایەوە لە کۆی مانای چەمکەکەدا، هەروەها پشتگوێ خستنی ئاخیرەت و بان – سروشت.

د. سروش ووتی: "ئێمە بە گوێرەی پێویست بەم چەمکە ئاشنانەبووین، لەبەرئەوەشە زاراوەیەکمان بۆ دروست نەکردووە و لە ڕووی زەینی و کردەییەوە جوڵەی تیا دروست نەکردووین. بەڵام سێکولاریزم لە رۆژئاوا دەرکەوت و ڕێچکەی سروشتی خۆی گرت و بوو بە درەختێك کە سایەی خۆی بەسەر شارستانیەتی رۆژئاوادا دروست کرد. ئێستا رۆژئاواییەکان لە ژێر سایەی ئەم درەختەدا دەژین. بەڵێ، لە ئەدەبیاتی ئیسلامیدا، دوو زاراوە بەرچاو دەکەون کە پەیوەندی نزیکیان هەیە لەگەڵ هەندێك ڕووی سێکولاریزمدا، یاخود لانیکەم لە ڕووی ڕیشەناسی وشەوە زۆر لێکەوە نزیکن. یەکێك لەو زاراوانە "دەهر"ە کە رووکەشن لە هەمان ڕیشەی وشەی "*dure*" فەرەنسی و وشەی "*duration*"ی ئینگلیزیی.

لە روونکردنەوەی وشەی "دەهر"دا، د. سروش ووتی: ئەم ووشەیە لە قورئانیشدا هاتووە، لەو جێگەیەدا کە "منکران *deniers*" دەڵێن: ئێمە خۆمان هاتووینەتە جیهان و هەر خۆشمان جێیدەهێڵین، ئەوە رۆژگار و دەهرە ئێمە بە هیلاکدا دەبات و لەناومان دەبات، هۆکارێکی دیکە نییە و خودایەك لە ئارادا نییە، هیچ هێزێکی بان – سروشتی یاخود غەیبی بوونی نییە، هەر ئەم دنیاو زەمانەیە کە ئێمە دێنێتە کایەوەو دواجاریش دەمانباتەوە.

د. سروش لە درێژەی قسەکانیدا ووتی: "دەهر" واتە سەردەم یاخود رۆژگار، ئەمەش هاوگونجاوی تەواوی لەگەڵ وشەی "سێکولاریزم"دا هەیە چونکە سێکولاریزم بیرۆکەی رۆژگاری تێدایە. بێگومان پێشنیاری ئەوە ناکەم کە ئێمە بە کەسە سێکولارەکان بڵێین دەهری چونکە لە زمانی عەرەبی و فارسیداو لە کەشێکی دینیدا ئەم چەمکە جێگای گومڕایی و دژوارییە. بە هەرحاڵ، فەیلەسوفان باوەڕیان وایە سیفەتی جیاکەرەوەی ئەو سروشتەی تیایدا دەژین پەیوەستی کاتەو جیهانی بان – سروشتیش جیهانێکی نا – شوێنکاتەو لە زمانی ئینگلیزیدا "*temporal order*" واتە کات – پەیوەستی و "*eternalorder*" واتە نا – کاتی (بان – کات). "*temporal*" و "سیکۆلار *secular*" هەمان مانایان هەیە. هەردووکیان واتە دنیایی و زەمینی و کاتی و سروشتی و مادی. چ بڵێین "مادی" یاخود "کاتی" هیچ جیاوازی نییە چونکە جیهانی بان – سروشتی نە مادییە و نە کاتییە، لە دیدی فەیلەسوفانەوە، کات (زەمان) نەوەی مادەیە، نەوەی جوڵەی مادەیە، لێرەوە، سێکولاریزم واتە

وابەستەبوون و روکردنە جیهانی مادە کە جیهانی کات — پەیوەستییە..

د. سروش ئاماژەی بە سورەتی "عەسر" کرد لە قورئاندا کە زاراوەیەکی تری پەیوەندیدار بە کاتەوە یاخود زەمانەوە بریتییە لە "عەسر"، وتی: خوای گەورە لەم سورەتەدا سوێند بە عەسر دەخوات: سوێند بێت بە عەسر، مرۆڤەکان لە خەسارەتدان جگە لەوانەی ئیمانیان *faith* هەیە و کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن". راڤەکارانی *commentators* قورئان لەسەر مانای عەسر رای جیاوازیان هەیە هەندێکیان بە سادەیی ووتوویانە عەسر واتا دوانیوەڕۆ و گەیشتوونەتە ئەوەی چۆن خودا سوێند بە رۆژ و شەو دەخوات، ئاوهاش دەتوانێت سوێند بە دوانیوەڕۆ بخوات. بەلاَم هەندێکیان پێیانوایە کە لەم سورەتەدا، عەسر مانای زەمانە (کاتە)..

جارێکیان چاوم بە روحانییەکی *cleric* چەپڕەو کەوت کە لە راڤەی ئەم سورەتەدا نووسیبوی یەکێك لە ماناکانی عەسر "فشارکردن"ە *pressure*، ووتبووی: خودا سوێندی بە فشار خواردووە و مانای ئەمەش فشاری شۆڕشگێڕانەیە کە دەبێت لە بالاَوە بێت و چاکسازی لە کۆمەڵگادا بکات!! ئەگەر ئەم راڤە سەیر و سەمەرانە بخەینە لاوە، ئەوا زاراوەی "کات" باشتر دەگونجێت لەگەڵ "عەسر" دا. لە راستیدا، خودا ئەم چەکە لە دەست بێباوەڕان دەستێنێتەوەو دەڵێت: ئەم کاتە (عەسر) کە ئێوە قسەی لێدەکەن مەخلوقی منە هەروەکو خۆر و مانگ و سوێندی پێدەخۆم. هەرچەندە کات پێگەیەکی وای هەیە، وای لێکردووە شایانی سوێند خواردن بێت، بەلاَم لە سنوری مەخلوق بوون دەرناچێت بۆ سنوری خالق بوون..

پاشان د. سروش قسەی لە هاوتایەکی دیکەی زاراوەی سێکولاریزم کرد و ووتی: هەندێك لە ئێوە ئاشنان بە فەلسەفە و مێژووی زانستی کەلام و گومانی تێدا نییە تێبینیتان کردووە کە چۆن فەیلەسوفان و کەلامناسەکانمان گفتوگۆی مەسەلە ئاینییەکانیان کردووە، ووتویانە دەتوانین بە دوو رێگا گفتوگۆیان بکەین: یەکێکیان عەقڵی *rational* و ئەوی دیکەیان ئەقڵی *narrative*. رێگای ئەقڵی واتە گەڕانەوە بۆ ووتە و کردە بەجێماوەکانی پێغەمبەر و پێشەوایانی دین و بزانین چییان فەرمووە لەبارەی بابەتی پەیوەندیدارەوە، رێگەیەکی دیکە رێگەی عەقڵییە واتە پشت بەستن بە خودی عەقڵی خۆمان بەبێ گەڕانەوە بۆ ئایەتەکانی قورئان و ریوایەتەکانی پێغەمبەر، بزانین چی تێدەگەین و عەقڵ چیمان پێدەڵێت لەبارەی بابەتەکەوە. ئەم تێگەیشتنە عەقڵییەی لێرەدا باسمان کرد زۆر نزیکە لە چەمکی "عەقڵی سێکولار *secular reason*" لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا. واتە عەقڵێك لە ژێر کاریگەری دیندا نەبێت و خۆی دەیهەوێت بڕیار بدات لەبارەی مەسەلە دنیاییە پەیوەندیدارەکان. کاتێك عەقڵ لە بەرامبەر ئەقڵدا دەوەستێنین، مەبەستمان عەقڵێکە سەربەخۆ لە وەحی (سروش *revelation*)، ئەمەش کت و مت هەمان ئەو شتەیە کەسێکی سێکولار خوازیاریەتی..

د. سروش درێژەی بە قسەکانی دا و وتی: بەرێزتان دەتوانن ببینن کە سێکولاریزم یەك رووی کردەیی پەیوەست بە ژیانەوەی هەیە و هەروەها یەك رووی عەقلاَنی پەیوەست بە

هزرەوە (فكر)ی هەیە. ڕووە ژیانییەكەی سێكولاریزم دەیهەوێت ژیانێكی تێر و دڵگیر مسۆگەر بكات و ڕووە هزرییەكەشی دەیهەوێت خۆی تێبگات و داوەری بكات و شوێن لۆژیكی سروش (وەحی) نەكەوێت.

هەركاتێك میللەتێك ئیرادەی كرد و هەوڵی دا ئەم چەمكانە كردەیی بكات و بیانباتە بواری كردەییەوە، سێكولاریزم لەدایك دەبێت، واتە میللەتێك لەدایك دەبێت كە لە داوەری كردن و شیكاركردنی دیاردە كۆمەڵایەتی و سروشتییەكان پەنا نەباتە بەر بان – سروشت *supernatural* و لە هێزە غەیبییەكان داوای یارمەتی نەكات، دوعا نەكات، نەزر نەكات گەر دوعاكانی هاتە دی، داوای یارمەتی لە گەورەكان نەكات، سحر و جادوو پشتگوێ بخات و ئەفسانە و خورافات فڕێ بدات و واز لە ڕەهبانیەت *monasticism* و زوهد *asceticism* و خەڵوەتكێشان *austerity* لە ژیاندا بهێنێت چونكە یەك ڕووی گرنگی كردەیی سێكولاریزم ئەوەیە كە مرۆڤەكان زاهد نین هەروەكو حافز (شاعیری ئێرانی سەدەی چواردەهەم) دەڵێت: "من مرۆڤێكی بەهەشتیم بەڵام لەم گەشتەی ئێستامدا ئەسیری عشقی لاوە جوانەكانم" یەكەمین پریشكەكانی سێكولاریزم لە خۆرئاوا پریشكەكانی دژە – زوهد بوون، واتە وازهێنان لە وازهێنانی دنیا، بەلاوەنانی زوهد و دنیا بەجدی گرتن لە هەموو ڕووەكانییەوە، واتە مامەڵەكردنێكی عەقڵانیانە لەگەڵ سیاسەت و ئابوری و پەروەردە و زانست و هونەر و پیشەسازی و.. هەروەها..

پاشان د. سروش ئاماژەی كرد بەجۆرە جیاوازەكانی سێكولاریزم و ووتی: لانی كەم دوو جۆر سێكولاریزممان هەیە: سێكولاریزمی سیاسی و سێكولاریزمی فەلسەفی. مانای سێكولاریزمی سیاسی ڕۆشنە، واتە جیایی دین لە دەوڵەت، واتە بەڕێوەبردنی ئەم جیهانە بەبێ ڕەچاوكردنی دوو جیهانی دیكە، گوایا هەر ئەم جیهانە بوونی هەیە و فەرمانڕەواكەشی ئێمەی مرۆڤین و عەقڵی خود – بنیادی ئێمەش هەموو شتێك دەكات. واتە شەرعیەتی دەوڵەت *state* لەسەر ئایین بنیاتنانرێت، واتە بێ لایەنی دەوڵەت لەبەرامبەر ئایینەكاندا. واتە یاساكانی كۆمەڵگە لە ئایینەوە وەرناگیرێن. هەروەها سێكولاریزمی فەلسەفیمان هەیە. سێكولاریزمی فەلسەفی واتە خودا نییە، جیهانی بان – سروشت نییە، ئاخیرەت *hereafter* بوونی نییە. نزیكە لە سروشتگەرایی *naturalism* و مادەگەراییەوە *materialism*. لە سێكولاریزمی سیاسیدا، پێویست نییە خودا ڕەتكەیتەوە، بەڵكو لە سیاسەتدا، كارت بەخودا و دینەوە نییە، پێویست ناكات ئاخیرەت ڕەتكەیتەوە، بەڵكو كارت پێوەی نییە و خۆتی پێوە سەرقاڵ ناكەیت. بەڵام لە سێكولاریزمی فەلسەفیدا، تۆ داوەری دەكەیت و داوەرییەكانتان *judgment* نەرێین *negative*، ئایینەكان لە نەبوونی حەقیقەتدا ڕەچاو دەكەیت. كاتێك ماكس ڤیبەر ووتی مۆدێرنێتە واتە لە رازخستنی *demystification* ئەم جیهانە، مەبەستی هەر ئەمە بوو.

د. سروش ئاماژەی كرد بە هۆكارەكانی دەركەوتنی سێكولاریزم لە ڕۆژئاواو ووتی: ئێستا، بۆچی لە سەدەی شانزدەهەمەوە بەدواوە، سێكولاریزم لە ڕۆژئاوا دێتە بوون و لە جیهانی ئیسلام و ڕۆژهەڵات (وەكو گشتێك) دروست نابێت؟ هۆكاری گەشەی سێكولاریزم لە ڕۆژئاوا چی بوو؟ یەكەمین شت ئەوەیە كە

دەبێت بڵێم لەدایکبوونی سیکولاریزم لە ڕۆژئاوا لەدایکبوونێکی سروشتی بوو. واتە ساوایەك بوو لە منداڵدانی مێژووی ڕۆژئاوادا کاتی گونجاوی خۆی بڕی و کاتێکیش گەیشتە کاتی پێگەیشتنی، هاتە ئەم دنیاوەو لەدایکبوونیشی پێویستی بە نەشتەرگەری (نەشتەرگەری قەیسەری) نەبوو و دووچاری خوێن بەربوونیش نەبوو. ئەم مەسەلەیە دوو هۆکاری هەیە: هۆکاری یەکەم: بریتییە لە ڕووبەڕوبونەوەو پێکدادانی زانست و دین. ململانێی نێوان زانست *Science* و دین *Religion* ململانێیەکی زۆر چارەنوسساز بوو لە ئەوروپا. ئەم ململانێیە بەرهەمی پلانگێڕان و ئیرادەی نەخۆش و ڕق و کینە و بێباوەڕی نەبوو، بەڵکو لە ڕاستیدا ململانێیەکی زۆر سروشتی بوو: گەشە لە زانستە سروشتییەکاندا ڕوویدا لە بواری زەوی ناسی و زیندەوەرزانی و ئەستێرەناسی. ئەو زانیارییە تازانەی بەدەست هاتن لەگەڵ ناوەڕۆکی کتێبی پیرۆزدا نەدەهاتەوەو دژوەستانەوەو ئەم دژوەستانەوەیەش وورده وورده چڕ بوویەوەو زیادی کرد تا گەیشتە ئاستێك شاردنەوەو ئینکاری کردنی مەحاڵ بوو. کۆپەر نیکۆس و کیپلەر و گالیلۆ و نیوتن و پاشانیش بوفۆن و داروین هاتن. هەندێك لەمان خۆیان کەسانی ئایینی و خوداپەرست بوون. گالیلۆ پیاوێکی دیندار بوو، کۆپەرنیکۆس پێشینەیەکی قەشەیی هەبوو، کیپلەر کەسێك بوو چەندان پلە لە پشت دینداری خەڵکی ڕەشۆکەوە بوو و گەیشتبووە ئاستێکی خوراف بەلاّم بەرهەمی کاری ئەم کەسانە شتگەلێك بوو هیچ هاوتانەبوو لەگەڵ ناوەڕۆکی کتێبی پیرۆزدا و لەگەڵ یەکدا نەدەهاتنەوە بەتایبەتی لەبارەی بابەتی جوڵەی زەوی و خۆر و هەسارەکان. تا ماوەیەك کڵێسا لەگەڵ ئەم بیرۆکانەدا هەڵی کرد پاشان ململانێ گەشەی کرد و بالاّی کرد. دۆخێك کە کڵێساو کتێبی پیرۆز تێیکەوتن هەرگیز نەگەڕایەوە دۆخی پێش ئەم ململانێیە. بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە، سەرەڕای ئەم هەموو نەیارییەی کڵێسا لە بەرامبەر زانستدا، کەچی ڕێگای توندڕەوی و دەمارگیری نەگرتەبەر. کڵێسا ڕێگای بە بلاّوبوونەوەی کتێبەکەی کۆپەر نیکۆس دا. لە کتێبی "سوڕانەوەی تەنە ئاسمانییەکان"دا، کۆپەرنیکۆس زۆر ئاشکرا ڕوونی دەکاتەوە کە زەوی لە جوڵەدایە و خۆر جێگیرە، لە کاتێکدا، بە گوێرەی کتێبی پیرۆز، زەوی جێگیرە و خۆر دەجوڵێت. لە چوارسەد دانەی ئەو کتێبە کە لە سەدەی شانزدەهەمدا بلاّوکرایەوە، ئێستا دووسەد دانەی ماوە. ئەوەی کە دەوترێت گالیلۆیان کوشتووە و ئیعدامکراوە هەمووی درۆیە. بێگومان، گالیلۆیان لە ماڵ دەستبەسەر کردووە. کڵێسا ڕێگای بە بلاّوبونەوەی کتێبەکەی کۆپەرنیکۆس دا بەلاّم پێشەکییەکی بۆ نووسی. ئەو خاڵە گرنگەی لەم پێشەکییەدا هاتووە ئەمەیە: "ئەوەی لەم کتێبەدا هاتووە یەك تیۆرییە نەك حەقیقەتێکی ڕەها"، ئەمە گوتەیەکی باش و عاقلاّنەبوو.

ئەو دۆزینەوە وورد و درشتانەی لێرەو لەوێ ڕوویانـدا وورده وورده کتێبی پیرۆزیان لەو پلەوپایە بەتاڵکردەوە کە پێشتر هەیبوو. ئایین هێزو پایەی پێشووی لەدەستداو لەوە بەدوا چیتر ئەکتەری سەر مەیدانی کۆمەلاّیەتی و سیاسی نەبوو. ئایین ئەو دەمە بەهێز بوو کە لە کایەی سیاسەتدا ئامادەیی هەبوو. کاتێکیش ئیمان *faith* لاوازبوو و پێگەی ئایین لێژبوو، ئەم ئەکتەرە ڕۆڵی کەمتر بۆوە، کەسێك نەهات ئایین

له مەیدانی سیاسەت دەربهێنێت، بەڵکو خۆی لاواز بوو کەوتە کەنارەوە لەبەر هەمان ئەو دەلیلەی کە ووتم لەدایکبوونێکی سروشتی بوو. مەیدانی سیاسەت مەیدانی یاریزانە بەهێزەکانە. کاتێک ئایین خۆی بەهێز بوو، پێویست نەبوو کەس پەلی بگرێت و بیباتە ناو مەیدانی سیاسەتەوە. کاتێکیش لاواز بوو، خۆی مەیدانەکەی بەجێهێشتوو کەس ناچاری نەکرد بچێتە دەرەوە.

هۆکاری دووەم پسانێك بوو کە لە مەسیحیەتدا ڕوویدا، واتە، لەدایك بوونی پرۆتستانتیسم لە لاتەنیشتی کاسۆلیسیزم. ئەم پرۆتستانتیسمە هێزی کڵێسای لاوازکرد، لە ڕاستیدا ڕووبەڕووی کڵێسا وەستاو مارتن لۆسەر یەکەم کەس بوو کە ئینجیلی وەرگێڕا بۆ سەر زمانی ئەڵمانی و هەر کەسێك خۆی بە ڕوحانی دەزانی و دەسەڵاتی کڵێسای ڕەت دەکردەوە.. ئەم دوو ڕوداوە پێکەوە بوونە هۆی لاوازی کڵێسای مەسیحی و کردنە دەرەوەی لە گەمەی هێز و دەسەڵات، ئەم کردنە دەرەوەیەش واتە جیایی دین لە حکومەت و دەوڵەت. هەندێك کەس وا بیر دەکەنەوە، لە وڵاتە ئەوروپاییەکاندا، کەسانێك هاتوون و لە دەستوورەکانیاندا نووسیویانە کە دەبێت دین لە سیاسەت جیا بێت. هەرگیز دۆخەکە بەم شێوەیە نەبوو، ئەوەی لە دەستورە ئەوروپییەکاندا هاتووە دەرەنجامی ئەم رووداوە بوو نەك هۆکاری دروستبوونی ئەم رووداوە. بەهەرحاڵ، ئەو سێکولاریزمەی لەدایکبوو سێکولاریزمێکی هەڵکەر بوو، واتە توانای هەڵکردنی لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا هەبوو، نەك سێکولاریزمێکی دژگەر. سێکولاریزم دەیزانی ئایین لاوازبووە، لەبەرئەوە پێویستی نەدەکرد هێرشی بکاتە سەر. سی چل ساڵ لەمەوپێش، زۆرێك لە کۆمەڵناسان باوەڕیان وابوو نەك مەسیحیەت بەڵکو هەموو ئایینەکانی تر روو لە لاوازی دەکەن، باوەڕیان وابوو مێژوو بە ئاراستەی سێکولاریزمی سیاسی جووڵە دەکات. ئێستا جەنابتان لە بەرامبەر ئەم لاوازییانەدا چی دەکەن؟ هەڵدەکەن و دەڵێن جێگەی مەترسی نین، زەرەر نادەن، لێیان گەڕێ مزگەوت و کڵێسایان هەبێت، لێیان گەڕێ شوێن سروت و داب و نەریتەکانیان کەون. سێکولاریزم لەسەر ئەم پێشگریمانە بینابووە کە دەبێت لە بەرامبەر هەموو ئایینەکاندا بێ لایەن بێت و بەیەك چاو سەیری هەموویان بکات. تا ئەو جێگەیەی پەیوەندی بە سێکولاریزمەوە بێت، جیاوازی نییە لە کۆمەڵگادا بەهایی بوونی بێت، مەسیحی بوونی بێت، موسڵمان بوونی بێت، جولەکە بونی بێت، زەردەشتی بوونی بێت چونکە پێی وایە هەموو ئەمانە بەرهەمی مێژوون.

سێکولاریزم بەم مانایە هەم جیایی دین لە دەوڵەت و هەم شێوازێکی بێ لایەنانە لە بەرامبەر ئایینەکاندا دەگرێتەخۆ. وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکا کۆڵن پاوڵ بە شانازییەوە ووتی: "ئێستا لە ئەمریکا ئێوە مزگەوت پەرستگای جولەکەکان لە تەنیشت کڵێسای مەسیحییەکانەوە دەبینن و هەموویان پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانەیان هەیە، لە ڕاستیدا ئەمە جێگەی شانازییەو دۆخێکی زۆر باشە".

بەڵام وورده وورده سێکولاریزم پێدەنێتە سەردەمێکی نوێوە کە من بە سەردەمی سێکولاریزمی دژگەر ***militant secularism*** ناوی دەبەم، سێکولاریزمێکە توانای هەڵکردنی

*tolerance* لەدەست داوەو هەموو ئایینەکان بە یەك چاو سەیر ناکات. سێکولاریزمێك کە دەزگا هەرسییە بەهێزە پێشووەکەی لەداست داوە، وەکو ئەوەی خۆی بە دەست دوژمنەکانی سێکولاریزمەوە دابێت.

نمونەی ئەمەش مەسەلەی حیجابی کچانە لە فەرەنسا، یاخود ئەوەی تۆنی بلێر ووتی: " ئەوانەی بەهاکانی ئێمەیان قبوڵ نییە، بەریتانیا بەجێبهێڵن". لەم ڕووەوە، بارودۆخی تورکیا لە هەموویان ڕۆشنترە، بەشێوەیەکی ڕەسمی بیرۆکەی هەبوونی یەك سەرۆك کۆماری موسڵمان ڕەتدەکەنەوەو بە ناوی بەرگریکردن لە سێکولاریزمەوە دەڕژێنە سەر شەقامەکان و ڕاگەیاندنەکانی خۆرئاواش ئەم ئاگرە خۆش دەکەن.

سەبارەت بە شکنینی ریشەکانی دەرکەوتنی سێکولاریزمی دژگەر، د. سروش ووتی: یەکەم: یەکێك لە تێزەکانی پشت سێکولاریزم ئەمڕۆ بە هەڵەدا ڕۆیشتووە. سێکولاریزمی سیاسی یەك مانای هەیە ئەویش جیایی دین لە دەوڵەت و یەك پێشبینی مێژوویی هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئایینەکان وورده وورده لاواز دەبن. لێرەوە، سێکولاریزم بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئاسانتر دەبێت. ئەمڕۆ ئەم پێشبینییە هەڵە دەرچووەو ئەمەش لە بیست سی ساڵی دوایدا لە کۆمەڵناسە گەورەکانەوە دەیبیستن کە ئایینەکان سەر لە نوێ بەهێزدەبن. ئێستا باسی ئەوە ناکەم کە بۆچی ئەمە ڕوودەدات، بەڵام شتێکە بوونی هەیە و ڕوودەدات. لە کۆمەڵناسیدا، ئەمریکا هەمیشە وەکو هەڵاوێردنێك قسەی لێدەکەن چونکە لە ئەمریکا دینداری بەهێزە، بەڵام ئێستا ئەمە لە هەموو جێگایەك ڕوودەدات. کەسانێکی وەکو پیتەر بێرگەر و جۆزێ کازانوا بە ئاشکرا دەڵێن کە سێکولاریزم چارەنووسی مێژوو نییە، هەروەکو چۆن لە مارکسیزمدا دەیانووت کە سۆشیالیزم چارەنووسی حەتمی مێژووە، بەڵام دەرکەوت کە بەپێی پێویست وانەبوو..

ئێستا کە ئایینەکان ڕوو لە بەهێزی دەکەن، ڕۆشن نییە ئاخۆ لەگەڵ ئەواندا هەڵدەکەن یاخود نا. ئەمە کەم و کورتییەکە بەسەر هەردوو لیبرالیزم و سێکولاریزمدا جێبەجێ دەبێت. کۆئەندامی هەرسی سێکولاریزم بۆ قوتدانی ئاینە لاوازەکان باش بوو، بەڵام ناتوانێت ئایینە بەهێزەکان قوتبدات و لە قورگی دەگیرێت و دەبێتە دژگەر و وەکو دوژمن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. لێرەدا، تیۆرییەکی تازەمان پێویستە. ئێوە تەماشای ڕێکخراوی ئەلقاعیدە و هاوشێوەکانی مەکەن کە هەندێك لە بەرێزان حەز دەکەن جەختی لێبکەنەوە. چونکە یەکەم: بزوتنەوەیەکی بنکە فراوان نییە، دووەمیش یەك هاڵاوێردنێکی بچوکە و توانای مانەوەی نییە. مەبەست لە بەهێزتربوونی ئایینەکان ئەمە نییە.

هۆکاری ئەوەی کە بۆچی دووبارە ئایین گەڕایەوە و ژیایەوە، کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان دەڵێن چونکە قەیرانی شوناس *Identity* هەیە، هەندێکی دیکە دەڵێن قەیرانی مانا و مەعنەویەت *spirituality* هەیە. هەرچییەك بێت هۆکاری خۆی هەیە و ئەم هۆکارانەش هەرچییەك بن، ئەوەیە کە ئێستا دەیبینین. ئەمریکا هێرشی کردە سەر ئەفغانستان و عێراق، هەردووکیان لە دەستورەکانیاندا پێدادەگرن لەسەر ئەوەی کە دەبێت یاساکانیان لە شەریعەتەوە وەربگرن. ئەمە شتێکە ئەمریکییەکان تەسەوریان نەکردووە، واتە سێکولاریزمی سەدامی گۆڕا بۆ دژە-

سێکولاریزم (*anti - secularism*) کە ئێستا لە عێراقدا بوونی هەیە. لە ئەفغانستانیش بەشێوەیەکی ڕەسمی هاتووە کە دەبێت یاساکان پێچەوانە نەیەنەوە لەگەڵ شەریعەتدا. جاری دووەم کە سەرۆک بۆش هەڵبژێردرایەوە، لەبەرئەوەبوو کە هەندێک کەس پێیانوابوو کە بۆش پیاوێکی زۆر دیندارە و بۆ خودا گونجاوەو دەنگیان پێدا.

ئێستا کەمایەتیە ئاینییەکان هەستێکی بەهێزتریان بۆ شوناسی خۆیان هەیە. بەهۆی ئەو ڕەفتارانەی لەسەر مەسەلەی حیجاب دەیگرنە بەر، حیجاب بووەتە مەسەلەی شوناس. پێشتر، حیجاب مەسەلەیەکی ئایینی بوو هەروەکو نوێژ و ڕۆژوو کە موسڵمانان بە ئەرکی سەر شانی خۆیان دەزانی جێبەجێی بکەن بەبێ بانگەشەکردن و نیشاندانی. بەشێوەیەکی سادە ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکرد. حیجاب بووەتە مەسەلەیەکی شوناسی. ئایین دوو ڕووی هەیە: ڕوویەکی شوناسی و ڕوویەکی حەقیقەتی. بەداخەوە، سێکولاریزمی دژگەر دیوە شوناسییەکەی دین زەقتر دەکاتەوە کە ئەمەش هەم بە زەرەری ئایین و هەم بە زەرەری سێکولاریزمە.

خاڵی دووەم: لە وڵاتەکانی وەکو تورکیا کە تیایدا ئایین بەهێزە، سێکولاریزم ناتوانرێت لەسەرەوە بە دژایەتی و دەسەڵات بسەپێنرێت. وەکو ووتم، سێکولاریزم لە ئەوروپا لەدایک بوونێکی سروشتی بوو، ئایین لاواز بوو، لە گەمەی سیاسەت چووە دەرەوە. بەڵام لە تورکیا ئایین لاواز نییە، خەڵکی زیاتر ڕوو لە مزگەوت دەکەن وەک لە ئێران. سی ساڵ لەمەوپێش چووم بۆ تورکیا، قەرەباڵغییەکی زۆری نوێژ خوێنانم بینی لە مزگەوتەکانی ئەستەنبوڵدا. کاتێک گەڕامەوە بۆ ئێران، ووتم: "من دڵنیام شتێک لە تورکیا ڕوودەدات". لە تورکیا، هیچ کەسێک لە بەرامبەر موسڵمان بوونیدا پاداشت وەرناگرێت. لە ئێران بە پێچەوانەوە، ئەگەر دووجار بچیت بۆ مزگەوت و لە نوێژکردندا دەرکەویت، کاریگەری ئیجابی لەسەر پێگەی زانکۆییت دادەنێت!. لە تورکیا، دەتوانن بە لێشاو ڕۆیشتن بۆ نوێژەکانی هەینی و نوێژە جەماعییە ڕۆژانەییەکان ببینن ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئایین زیندووە. لە شوێنێکیشدا کە ئایین بەهێز و زیندووە، سەد لە سەد ئەو ئایینە لە سیاسەتدا ڕۆڵ دەبینێت، ئەگەر بتەوێت لە جێگایەکی ئاوەهادا قسە لە سێکولاریزم بکەیت، ئەوا دەردەکەوێت تەنها سێکولاریزمی دژگەر دەکرێت بوونی ببێت، واتە سێکولاریزمێک ئامادەی تەنگژە دروستکردنە نەک ئامادەی هەڵکردن و قبوڵکردنە.

لە وڵاتە ئەوروپییەکاندا، حکومەتەکان وورده وورده توانای هەڵکردنیان ***tolerance*** لە بەرامبەر کەمایەتیە ئایینیەکاندا لەدەست دەدەن و سێکولاریزمە هەڵکەرەکەیان دەبێتە سێکولاریزمی دژگەر، لەم ڕووەوە جیاوازی لەگەڵ ئایینەکاندا نییە چونکە سێکولاریزم بڕیار بوو هەرسی ئایینەکان بکات، نەک ئەوەی خۆی ببێتە ئاینێک و ئاینەکانی دیکە بکاتە دەرەوە. مەگەر ئەم دەرد و پەتایە نەبوو دووچاری ئاینەکان بوو؟ بۆ نمونە، دەوڵەتی ئیسلامی مامەڵەیەکی باش لەگەڵ جولەکەکان یاخود مەسیحییەکاندا ناکات و بەیەک چاو سەیریان ناکات و مافگەلێکی تایبەت بە موسڵمانەکان دەدات و بەوانی دیکەی نادات. باشە، ئەگەر سێکولاریزم بەم شێوەیە ڕەفتار بکات و لەگەڵ مرۆڤە نا-سێکولارەکاندا بە

باشی مامەڵە نەکات و هەندێك لە مافەکانیان پێنەدات، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ جێگای یەکەم جارمان..

لە کۆتایی قسەکانیدا، د. سروش پێشبینی کرد کە سێکولاریزم و لیبرالیزم، لە بەرامبەر بەهێزبوونی ئاینەکاندا، لە داهاتوودا ڕووبەڕوی یەك زنجیرە تەحەدای جدی دەبنەوە و گوتی: باوەڕم وایە نە لیبرالیزم و نە سێکولاریزم بەم شێوەیەی ئێستایان نامێننەوە. بەلام و هەزار بەلام، هەرگیز نامهەویت لە قسەکانی پێشوومەوە بگەمە ئەو دەرەنجامەی کە بەرەو نا – هەڵکردن و نالێبوردەیی هەنگاو دەنێین. هەڵکردن *Tolerance* بەهاو فەزیلەتێکی گەورەی مرۆییەو پێویست نییە لە بێگانەکانەوە فێری بین و شاعیری گەورەمان حافز ووتویەتی: "ئاشتی هەردوو جیهان لەم دوو قسەیەدایە: لەگەڵ دۆستاندا نەرم و نیانی و لەگەڵ دوژمنانیش هەڵکردن و لێبوردەیی" لە ئێستا بەدواوە، خۆرئاوا دەبێت تیۆریا بسازێنێت کە چۆن بتوانێت لەگەڵ بەهێزەکاندا هەڵبکات. تا ئەمڕۆ، تیۆریاکانیان لە بەرامبەر هەڵکردنی لاوازەکاندا دەسازاند، بەلام ئێستا تەحەداکە گەورەترە، موسڵمانان دەتوانن لەم تیۆریا سازاندنانەدا بەشداری بکەن و وەڵامی شارستانییانە بۆ ئەم تەحەدایە بدەنەوە.

**سەرچاوە:**

www.drsoroush.com

SARDAM No. 54 2008

# جۆرج تەرابیشی

# و

# لێکشیتاڵکردنی ئایدیۆلۆژیای هاوچەرخی عەرەبی

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

دەکرێت بڵێین ئەو تێزە و لێکدانەوانەی لە کتێبی (نەخۆشکەوتن بە خۆرئاوا)ی "جۆرج تەرابیشی" دا هەن، دەتوانن یارمەتیمان بدەن بۆ تێگەیشتن لە هۆکاری ئەو داخرانە مێژووییەی لە ئێستادا دوچاری هاتوین. ئەگەر زۆربەی زۆری توێژی رۆشنبیرانی ئێمە، توشی پەتای دژایەتیکردنی شارستانیەت و مۆدێرنەی خۆرئاوا هاتبن، ئەی بۆ خەڵکانی ئاسایی چی بڵێین؟ ڕەنگە ئەو میتۆدی دەرونشیکاریەی "تەرابیشی"، بۆ شرۆڤەکردنی هۆکارەکانی پاشەکشەکردنی عەرەب بەکاری هێناوە، زۆر بەلامانەوە پەسەند نەبێت، بەڵام ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. کتێبەکەی ئەو بە هەردوو بەشەکەیەوە[1]، دەکرێت بخوێنرێتەوە، بەبێ ئەوەی تەواوی تێرمەکانی دەرونشیکاری وەکی خۆیان وەربگرین.

"تەرابیشی" وەکی توێژەرێك، مێژوونوسێکی بە توانای مێژوی هزرە و دەزانێت چۆن دەست دەخاتە سەر چەمکە سەرەکیەکانی هەر نوسەر و هەر ئاقارێکی فیکری و فەلسەفی. هاوکات لەبەر ئەوەشی ئاشنایەتیەکی باشی لەگەڵ رۆشنبیریی عەرەبی و بیانیدا هەیە، ئەوا دەتوانێت بیروبۆچونی هەر نوسەرێك کە بیەوێت، تاوتوێ بکات و زۆر لێهاتوانەش خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئاشکرا بکات. لە دووەم بەشی پرۆژەکەیدا، بەمجۆرە سەودا لەگەڵ

"د. حەسەن حەنەفی"دا دەکات. لەدوایدا دێینە سەر باسی ئەمە.

ئەم کتێبەی "تەرابیشی" بە بەرگی یەکەم و دووەمیەوە، پانۆرامایەکی گشتیمان دەربارەی گوتاری روناکبیرانی هاوچەرخی عەرەب و تێزەو بیرو بۆچوونەکانیان بەردەست دەخات. سەرەتاش بەر لەوەی بکەوێتە لێکشیتاڵکردنیان و بەستنەوەیان بەو سیاقە مێژووییەی تیایدا دروستبوون و رەگوڕیشەیان ئاشکرا بکات، گوتار و تێزەو تیورەی ئەو رۆشنبیرانە بەرچاو دەخات. بەم کارەشی خزمەتێك بە خودی روناکبیرانی عەرەب و خوێندکارانی خوێندنی بالاَ و تەنانەت خوێنەری ئاسایش دەکات، کە دەیەوێت بزانێت روناکبیرەکانمان چۆن چۆنی بیردەکەنەوەو بۆچی وەها بیردەکەنەوەو یان بزانێت جیاوازی نێوانیان چییە و... هتد.

هاوکات "تەرابیشی"بۆ زیاتر گەیاندنی مەبەستەکەی، ئەو روناکبیرانە پۆلێن دەکات و دەیانکات بە چەند بەشێکەوە. بۆ نمونە یەکەم شت بە روناکبیرە ئەقلانیە راستەقینەکان دەست پێدەکات، ئەوانەی هیچ سازشێك لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای ئاژاوەگێڕیدا ناکەن، نمونەکانیان وەك: "تەها حسێن" و "فوئاد زەکەریا". لە لاپەڕە 102 بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا دەڵێت: (فوئاد زەکەریا دوایین پارێزەری رێبازی ئەقلانیەتە لە دنیای ئێمەدا). پۆلێکی دیکەی روناکبیران، سەلەفیە تاریکخوازەکانن، لە شێوەی "شێخ محەمەد متوەلی شەعراوی" و کەسانێکی تر کە لە ئەژماردن نایەن. هاوکات سەلەفیەتی رۆشنگەریشمان هەیە کە "تەهتاوی" یەکەمین رابەری بوو، دەکرێت "محەمەد عەممارە"ش (لە قۆناغی سەرەتایدا) لەسەر ئەم خەتە حساب بکرێت، بەر لەوەی هەڵگەڕێتەوەو وەکو "راشد غەنوشی" و کەسانێکی دی ببێتە سەلەفیەکی پەتی. هەروەها سەلەفیەتی مۆدێرنیشمان هەیە، بە شێوازی "مونیر شەفیق" و "وەجیە کەوسەرانی". لێرەدا نابێت سەلەفیەتی چەپڕەویشمان لەیاد بچێت بە شێوازی "حەسەن حەنەفی"، یاخود سەلەفیەتی میللیگەرا بە شێوازی "بورهان غلیون"، یان سەلەفیەتی بەسیاسیکراو بە شێوازی "عیسمەت سەیف دەولە"، یاخود سەلەفیەتی نیشتمانی دوور لە مەزهەبگەرایی، بە شێوازی "تاریق ئەلبشری" و...هتد.

هەموو جۆرەکانی فێندەمێنتالیزم زۆر بە وردی و بە چاکی لێرەدا باسکراون، ئەگەرچی جیاکردنەوەیان لە یەکتری هەندێ جار ئەستەمیشە، جگە لە فێندەمێنتالیزمی تاریکخواز نەبێت کە ئاشکرایە و دژایەتیکردنی بۆ شارستانیەت و مۆدێرنە، راستیەکی حاشاهەڵنەگرە. هەرچۆنێك بێت پرسیاری سەرەکی لێرەدا ئەوەیە: (ئایا گەڕانەوەی رۆشنبیرانی عەرەب بۆ سەلەفیەت واتە بۆ میراتی کۆنی ئایینی، دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری دەرونی – نەخۆش، یاخود هۆکاری کۆمەڵایەتی – مێژویی – سیاسی لە پشتە؟). بێگومان نوسەر ئەگەری یەکەمیان بەراست دەزانێت، بەلاَم بێئەوەی گرنگی هۆکاری دووەمیان فەرامۆش بکات. ئەگەر نسکۆی پێنجی حوزەیرانی 1967 نەبوایە، نە ئەم گەڕانەوە چڕە بۆ رابوردو دەستی پێدەکرد و نە تەرێزکردن لە سەردەمی رێنیسانس و دژایەتیکردنی شارستانیەتی نوێی خۆرئاوا تۆخ دەبووەوە.

بـەلاَم "جـۆرج تەرابیـشی" بـە وردی کـار لـەم مەسـەلەیەدا دەکـات و دووپـاتی دەکاتـەوە کـە ئـەو مەبەسـتی ئـەوە نییـە، رۆشـنبیرانی عـەرەب لەسـەر کلینکـی دەرونـشیکاری رابکێشێت، بەڵکو تـەنها دەیـەوێت ئەوە لەگەڵ گوتارەکانیانـدا بکـات! بـەلاَم داخـۆ ئەمـە کارێکی بەجێیە؟

بە بۆچونی ئەو ئەوەی دوچاری نەخۆشـی نیرۆسی کۆمەلاَیەتی بووە، گوتاری رۆشنبیرییە نـەك رۆشـنبیران خۆیـان. بەلاَم مـن نـازانم چـۆن دەبێـت گوتـار نـەخۆش بێـت، یـاخود چـۆن دەکرێت بەو شێوەیە گوتار لە خاوەنەکەی جیا بکەینـەوە؟ لێرەدا دان بـەوەدا دەنێم کە بەڵگەو بەهانە زۆر ئاڵۆز و دژوارەکانی ئەو لەسەر ئەم مەسـەلەیە، قەناعـەتی تـەواویان پێنـەکردم. پێموایـە پیـسکۆلۆژیای جـەماوەری یـان پیـسکۆلۆژیای دەسـتەجەمعی بـە زاراوەکـەی "گۆسـتاف لۆبـۆن"، زیـاد لـە پیـسکۆلۆژیای تاکەکەسـی "فرۆیـد"، بەسـەر رۆشـنبیرانی عەرەبـدا دەچەسـپێت. مـن کـە ئەمـەش دەڵـێم، دەزانم "فرۆید" بۆ خۆی هەندێ توێژینـەوەی بۆ پیسکۆلۆژیای جەماوەری تەرخانکردبوو، وەکو "جۆرج تەرابیشی"ش باس لەوە دەکات.

رۆشـنبیرانی عـەرەب دوای شکـستی حـوزەیرانی 67، بەرچـەکرداری دەسـتەجەمعیانەیان هـەبوو، کـە جیـاوازی ئـەوتۆی لەگـەڵ پەرچـەکرداری جـەماوەری عەرەبیـدا نـەبوو. پیـسکۆلۆژیای دەسـتەجەمعی پێمـان دەڵێـت، جـەماوەر بـە شـێوەیەکی ناخودئاگایانـە کـار دەکـات. تاکـە کەسـیش هـەر کاتێـك تێکـەڵ بـە جـەماوەر بـوو، بـە شـێوازێك رەفتـار دەکـات جیـاوازە لـەوەی ئەگـەر هـەر خـۆی بـە تـەنها بێـت. (بـۆ زانیـاری زیـاتر لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە، بروانـە کتێبەکـەی گۆسـتاف لۆبـۆن: سـایکۆلۆژیای جـەماوەر، کـە ئێمـە وەرمانگێراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی و لەلایـەن خانەی ساقیەوە چاپکراوە).

کەواتـە ئـەو رۆشـنبیرانەی "تەرابیـشی"، تـاوتوێی گوتـارە ئایدیۆلۆژیـەکانیان دەکـات، تـەواو دژی سـەردەمی رێنیسانـسی عـەرەبی و شارسـتانیەتی مۆدێرنـەن بـە گـشتی،ئەوانەن دوای ئەوەی بوون بە جەماوەرێکی ئاژاوەگێڕ و بێـسەروبەر و تـەواوی ئاگـایی و هۆشـیاری خۆیانیـان لەدەسـت دا و بـوون بـە بەشـێك لـە جـەماوەر، هـیچ خـاڵێکی جیـاوازی و لێکجیاکـەرەوە لـە نێـوان ئـەوان و جـەماوەردا نـەماوە. لەبەرئـەوەی جـەماوەر لـە خۆرئـاواو کۆلۆنیـالیزم و ئیمپریـالیزم داخ لـە دڵ بـوو، ئـەوانیش بـە هەڵـچون و کـەفوکوڵێکی زۆرەوە هەڵوێـستیان لـە خۆرئـاوا وەرگـرت و هـەموو رۆحێکـی رەخنـەیی و مـەیلێکی ئـەقلاَنی دروسـتیان لەدەسـت دا. کەواتـە ئیتر پێویـست بـەو زاراوەگەلـە بێـشومارەی دەرونـشیکاری ناکـات کـە زۆربـەی تایبەتـە بـە سێکس، وەك: (ڤـالوس و خەسـاندن و سروشـتی کـۆمی و... هتـد)، لـە پێنـاو حـاڵیبوون لـەو پەرچـە کردارەی لە دوای شکستی پێنجی حوزەیراندا دروست بوو.

پێموایـە ئـەم کتێبـە ئەگـەر ئەم زاراوانەشـی تێدانەبوایـە، هیـچی لـە نرخـی خـۆی کـەم نـەدەکرد. چـونکە توانـای زۆری زانـستی و فەلـسەفی "جـۆرج تەرابیـشی"، بـەس بـوون بۆئەوەی وەلاَمی پڕاوپڕی نەیارەکانی بداتەوە و ئایـدیۆلۆژیای عـەرەبیش سـەر لەبـەر شـیتاڵ بکـات. ئەمـەش بـە ئاشـکرا لـە زۆربـەی زۆری

بەشـەکانی کتێبەکەیـدا دەبیـنین، بـە تایبـەت کاتێك دێتە سەر باسکردنی بۆچوونە ناکۆك و دژ بـە یەکـەکانی "د.حەسـەن حەنـەفی". ئـەو بۆچـــونە نـــاکۆك و دژبەیەکانـــەی ئـــەویش بـــەرەنجامی نەخۆشـــیەکی دەرونـــی یـــاخود نیرڤۆســـیەکی دەســـتەجەمعی نییـــە، بـــەڵکو پەیوەندی بە بارودۆخێکی مێژویی تایبەتیەوە هەیە. لەبیرمە کاتێك "حەسەن حەنەفی"م بینی، بـە دەنگـی بـەرز بـانگی لێکـردم (تەنانـەت بەرلـەوەی سلاَویـشم لێبکـات)، وتـی: (مـن وەك ئـەرکۆنی بـرادەرت نـیم! ئـەو ئـەتوانێت چـۆن حـەزی پێیـەتی و چـۆنی ئـەوێت، کەلـەپوری ئیـسلامی شـرۆڤە بکـات و هەڵیبوەشـێنێت، چـــونکە ئـــەو لەســـەر کـــەناری رووبـــاری سین دانیـشتووە و ترسـی هـیچ شـتێکی نییـە. بەلاَم مـن لەسـەر کەناری ڕووبـاری نیل دەژیـم و شـەقام و فێندەمێنتالـستە تەقلیدیـەکانیش لـە هـــەموو لایەکـــەوە تـــەوقیان داوم). پێموایـــە هەقیـەتی کـە وا دەڵێـت و قـسەکەی لـە جێـی خۆیدایە.

ئـەو ناکۆکیـە گەورەیـەی "حەسـەن حەنـەفی" تێکـەوتووە، بـە ناچـاری بـووە، لەبەرئـەوەی ویـــستویەتی خـــۆی لـــەو بەلاَیـــە لابـــدات. "تەرابیشی"یـش دوای ئـەوەی لـە ئـەژمارکردنی ناکۆکیـە زۆرو زەوەنـدەکانی دەبێتـەوە، بەوپـەڕی زیرەکـی و ئەمانەتـەوە بـاس لـەم حاڵەتـەی "حەسەن حەنەفی" دەکات. ئیتر کەواتـە لێرەدا چ پێویـست بـە بـەکارهێنانی میتـۆدی پزیـشکی دەرونـــی دەکـــات؟ مەســـەلە سیاســـی و کۆمەلاَیـــەتی و مێژووییـــەکان، لەســـەرو هەمووانـەوەن. مـن بـۆ خـۆم ئەگـەر لـە ولاَتـانی عەرەبیدا بژیامایە، هەرگیز نەمدەتوانی چارەکی ئەو شتانە بنوسم کە لێرە لـە پاریس نوسیومن.

تەنانەت نەشم دەوێرا ئەو شتانە وەربگێڕم کە تا ئێستا وەرمگێڕاون.

دەبێت ئـەوە بـزانین ڕۆشـنبیر مەحکومـە بـەو ژینگـەو هەلومەرجـە مێژووییـەی تیایـدا دەژی. هـەر لەبەرئەوەشـە رۆشـنبیرانی ئێمـە روو لـە دەرەوە دەکـەن، بـۆ ئـەوەی بـە ئـازادی بـیر بکەنـەوەو وا بکـەن رووبـەری ئـەو شـتانەی ئەستەمە بیریان لێبکرێتەوە، بەرتەسك بکەنەوە. لـە کۆنـدا سۆسیۆلۆژیـستی فەرەنـسی "ئـەمیل دۆرکهایم" دەیوت: (کۆمەڵگە خوایە یاخود خوا کۆمەڵگەیـە). کـاتێکیش کۆمەڵگـە حەقیقەتـە سۆسـیۆلۆژیە قـورس و گرانـەکانی خـۆی فـەرز دەکات، وەی بە حاڵی ئەوەی دژایەتی دەکات و گوێی پێنادات.

لـەم مـاوەی دوایـدا سـەردانێکی ولاَتـی مەراکیشم کرد و لە شاری (صویرە)دا، چاوم بە خوێنـدکارێکی ئـەو ولاَتـە کـەوت کـە فەلـسەفە دەخوێنێـت و حـەزی پێیـەتی. دەربـارەی چـەند مەســـەلەیەکی رۆشـــنبیری عـــەرەبی کەوتینـــە گفتوگـۆکردن. لـێم پرسـی: (لێـرە لێکۆڵینـەوەی ڕەخنـــەیی لەســـەر کەلـــەپووری ئیـــسلامی دەکرێـت؟). حەپەسـاو بـە شڵەژانێکەوە سـەیری کردم و پاشان وەلاَمی دامەوەو وتی: (مەبەستت چ لێکۆڵینەوەیەکـە؟ رەخنـە لـە ئـایین ناگیرێـت. قورئـان و سـونە لەسـەرو رەخنـەو مێـژووەوەن و هـیچ میتـۆدێکی ئینسانیان بەسـەردا پراکتیـزە ناکرێـت). ئـەم وەلاَمدانەوەیـەیم پـێ سـەیر بـوو. زانـیم بـە کـەڵکی مـشتومڕ و گفتوگـۆ نایـەت و هەرواشـم کـرد. بێدەنگ بووم و کۆتـایم پێهێنـا، چونکە نەمەویست توشی شۆکی بکەم و باوەڕی بـەو شـتانە لـەق بکـەم کـە ملیۆنـەها خـەڵکی موسـڵمان قەناعـەتی تـەواویان پێـی هەیـە. ئـەو کـات زانیم مرۆڤ لـە ئەوروپادا بـژی چ مانایـەکی

هەیە. بۆیە دەبێت سەروەختێك سەفەری دەرەوە دەكەم، ئەوەم لە بیر نەچێت كە من ماوەی سی ساڵە لە خۆرئاوا دەژیم. لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر نەهاتمایە بۆ ئەوروپا، منیش ئاوا وەكی ئەو كوڕە باشە بیرم دەكردەوە. ژیان لە ئەوروپا، واتە بوونی فەزایەكی رۆشنبیری ئازاد، فەزایەك بواری ئەوەت بۆ دەرەخسێنێ باس لە هەموو شتێك بكەیت، تەنانەت مەسەلەی خوا خۆشی، واتە مەسەلەی بون و نەبونیشی! ئەمە و سەرەڕای مەسەلەگەلێكی دی كە پەیوەندیان بە ئایین و موقەدەسەوە هەیە.

ئەو ناكۆكی و دژایەتیانەشی لە بۆچونەكانی "حەسەن حەنەفی"دا هەن و "تەرابیشی" بە درێژایی بەشی دووەمی كتێبەكەی باسی لێدەكات، هەر بە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ شێزوفرینیای كەسێتی یاخود بۆ نیرڤۆسی فەردی و دەستەجەمعی، بەڵكو پەیوەندی بە ستراتیژیەتێكی بە ئاگا و ناخود ئاگاوە هەیە كە نوسەر كاری پێدەكات.

ئەو دەیەوێت (واتە حەسەن حەنەفی) هەردوو جەماوەرەكە لە میسر و وڵاتانی عەرەبیدا، رازی بكات: جەماوەری ئیخوان موسلمین و جەماوەری ماركسی و لیبرالی و مۆدێرنەكان[2]. هەروەها دەیەوێت خۆی لە بەلای شەڕی جەماوەری ئیخوان موسلمین بپارێزێت، كە بە ژمارە زۆرترن و توانای زۆری سەركوتكردن و دەست وەشاندنیان هەیە. "تەرابیشی" لە دوا لاپەڕەكانی كتێبەكەیدا ئەمانەی زۆر بە وردی باسكردووە.

شایەنی باسە سەروەختێك بیریارانی ئەوروپا رەخنەیان لە كەلەپووری مەسیحی دەگرت، رێوشوێنی زۆریان دەگرتە بەر، بۆ ئەوەی خۆیان لە ڕق و تووڕەیی ئۆردوی ئسوڵیەكان بپارێزن. بۆ نمونە "سپینۆزا" كتێبە رەخنەییەكانی بەناوی خۆیەوە بڵاو نەدەكردەوە، تەنانەت دوایین كتێبی لەسەر داوای خۆی لە دوای مردنی بڵاوكرایەوە. هەروەها كەسێكی وەك "ڤۆڵتێر" چەندین كتێبی بڵاوكردۆتەوە، بەبێ ئەوەی ناوی خۆی لەسەر بێت. تەنانەت كار دەگاتە ئەوەی كڵێسایەكی بچوك لە كۆشكەكەیدا دروست دەكات و ڕۆژانی یەكشەممە تیایدا وەعزی ئیمانداران دەدات، بۆ ئەوەی پیاوانی كڵێسا وازی لێبێنن و دەستبەرداری ببن. چونكە بەرگوێی كەوتبوو كە كڵێسا چەند كەسێكیان ناردووە بۆ شوێنی نیشتەجێبونی لەسەر سنوری سویسرا، بۆ ئەوەی لە ناوی بەرن و بیكوژن.

مەسەلەی كەلەپووری ئایینی ترسناكە، بگرە زیاد لە پێویست ترسناكە. رەنگە لەم روەشەوە ئەزموونی ئەوروپا لەگەڵ فێندەمێنتالیزمی توندڕەوی مەسیحیدا، چاكترین نموونەیەك بێت.من كە ئەم قسانە دەكەم بۆئەوە نیە پاساو بۆ رۆشنبیرانی خۆمان بهێنمەوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ تەوژمی فێندەمێنتالیزمدا رێدەكەن و دەستبەرداری پێگە پێشكەوتنخوازیەكانی پێشتری خۆیان دەبن و تەرێز لە سەردەمی رێنسانس دەكەن. نەخێر ئەوەی من دەمەوێت، تەنها ئەوەیە لە هۆكاری ئەم دیاردە سەیرە حاڵی ببم. من لەگەڵ ئەو كۆتاییە قەشەنگ و بەنرخەدام كە "تەرابیشی" بەشی یەكەمی كتێبەكەی پێ قفڵ داوەو ناونیشانی ئەو بەشەش ئەمەیە: لە غەریزەدەییەوە بۆ مۆدێرنە. لە پێنج خاڵی گرنگدا ئەو پرۆژە گشتیەی رونكردۆتەوە كە پێویستە رۆشنبیری عەرەبی پەیڕەوی بكات، ئەویش لەپێناو دەرچوون لە

دۆخی کاڵفامی و نەزانی و گەیشتن بە قۆناغی کامڵی، وەکی "کانت" لە پێناسەکردنی بۆ رۆشنگەریدا دەڵێت. هاوکات بۆئەوەی دەستبەرداری بەکارهێنانی کەلەپوور بێت، وەك ئامرازێکی کاراو کوشندە بۆ دژایەتیکردنی مۆدێرنە و شارستانیەت.

وەلامدانەوەی ئەو شکست و دۆڕاندنەی لە بەرامبەر ئیسرائیلدا دووچاری هاتین، بەوە نابێت خۆمان بخەینە باوەشی کەلەپووری کۆنەوەو دەرگاش بە ڕوی جیهانی مۆدێرندا دابخەین، بەڵکو بەوە دەبێت ڕێگایەك بۆ هەماهەنگی کردنی ژیاری لەگەڵ مۆدێرنەدا بدۆزینەوە. پێموایە لێرەدا ئەو قسانەی "تەرابیشی" لەجێی خۆیدایەتی کە دەڵێت: (جیهان لە ئەمڕۆدا زیاتر بەرەو ئەوە دەچێت ببێتە جیهانێکی یەك شارستانیەت و فرە کلتوری. تا دوێنێ چەندین شارستانیەتی جیاجیامان هەبوو، بەڵام لەمڕۆدا ئەوەی هەیە یەك شارستانیەتە، ئەویش شارستانیەتێکی جیهانیە. فرەیی لە دنیای ئەمڕۆدا تەنها لە کلتوردایە، ئەویش کلتوری نەتەوایەتیە). (بەرگی یەکەم، ل 174). ئەم بۆچونە پێمان دەڵێت: (کلتوری عەرەبی و هندی و یابانی و چینی و ڕوسی و فەرەنسی و ئەمریکی و.. هتد) هەیە، بەڵام لە بەرامبەر ئەمەدا تەنها یەك شارستانیەتی یۆنیڤێرسالی هەیە بۆ هەموان. بۆ نمونە یەك زانستی فیزیا و کیمیا و گەردون و بایۆلۆژیا، لە تەواوی زانکۆکانی جیهاندا هەیە. شتێك نییە ناوی زانستی فیزیای ئیسلامی یان ماتماتیکی مەسیحی بێت! هەروەها شتێك نییە ناوی پیسکۆلۆژیای ئیسلامی بێت، وەکی هەندێك دەمارگیری توندڕەو باسی دەکەن. ئەوەی هەیە یەك پیسکۆلۆژیایە و بەسەر تەواوی مرۆڤایەتیدا پراکتیزە دەبێت. ئەم قسەیە بۆ تەواوی زانستەکانی دیکەش ڕاستە. بەڵام ئەوەی هەیە ئەوەیە دەتوانین بە زمانی جیاجیای وەك عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵەمانی و ڕوسی و... هتد، بگەینە ئەو زانستانە. سەرەڕای ئەوە، بەها سەرەکیەکانی شارستانیەتی مۆدێرن وەکی ڕێگەدان بە پلورالیزمی ئایینی و سیاسی و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و هاولاتی، لە ئێستادا بوونەتە بەهاگەلێکی یۆنیڤێرسالی، ئەگەرچی هەمووان وەك یەك کاری پێناکەن و لەخەمی چەسپاندنیدا نین.

دوای ئەوەی ئەم دوو کتێبەی "جۆرج تەرابیشی"م خوێندەوە، پرسیارێکم لە خۆم کرد کە بۆچی روناکبیرانی نەتەوەکانی دی هەمان ئەو هەڵوێستە نیرڤۆسیەی رۆشنبیرانی ئێمەیان نەبوو لە شارستانیەتی خۆرئاوا؟ ئەوەندەی من بزانم روناکبیرانی روسیا و یابان و هند و چین، دوچاری هەمان ئەو شالاوە کلتوریە بوون کە ئێمە ڕووبەڕووی بوینەوە، کەچی ئەو ئەنگێزە دوژمنکارانەیان تێدا نییە وەکی ئەوەی لای "مونیر شەفیق" و "محەمەد عەممارە" دەیبینین، یاخود لای فێندەمێنتالیستەکانی وەك "ئەنوەر جوندی" و "ڕاشد غەنوشی" و "محەمەد متوەلی شەعراوی" و دەیانی دیکەی وەك ئەوان هەیە.

بێگومان رۆشنبیرانی نەتەوەکانی دی لە ئاست شارستانیەتی خۆرئاوادا، بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان زۆر خوێن گەرمانە داکۆکیان لێدەکرد و بەشەکەی دیکەشیان دەیانویست پابەندی کلتور و مێژوی نەتەوەی خۆیان بن، بەڵام ئەم بەشەیان نەیانگەیاندە ئاستی دوژمنکاری و دژایەتی بێحەد و حسابی

شارستانیەتی خۆرئاوا، وەکی ئەوەی ئاقاری سەلەفی رۆشنبیرانی ئێمە کردیان. هەندێك ئەم حاڵەتە بەوە تەفسیر دەکەن کە خۆرئاوا هیچ ئیسرائیلێکی دیکەی لەناو چین و یابان و ڕوسیا و هندستاندا دروست نەکردووە، تا ئەو نەتەوانە بە ڕادەی عەرەب لە خۆرئاوا داخ لەدڵ بن. بەڵام خۆ هندستان ئیسرائیلی خۆیی هەیە (کە پاکستانە)، پاکستانیش بە هاندانی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی لە هندستان جوێ بووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا رۆشنبیرانی هندۆسی ئەو ڕق و کینە زۆرەیان لە کلتوری خۆرئاوا و شارستانیەتی ئەوروپی نییە. ئەگەرچی کەلەپوری ڕوحی و ئایینی هندستان زۆر کۆنە و ڕەگوڕیشەی بە ناخی مێژودا ڕۆچووە.

ڕەنگە هۆکاری ئەمە شتێکی دیکە بێت. بۆ نمونە عەرەب بەتایبەتی و موسڵمانان بە گشتی، پێیان وایە لە ڕووی ئەنتۆلۆژی و تیۆلۆژییەوە، ئیسلام لە مەسیحیەت و لە تەواوی ئایینەکانی دیکەی سەر ڕوی زەوی ڕەسەنتر و کامڵترە. هەروەها پێیان وایە ئیسلام نەك هەر چاکترین ئایینە و لەسەرو هەموو ئایینەکانی دیکەوەیە، بەڵکو تاکە ئایینێکی ڕاست و دروستە و پەسەندترین ئایینە بەلای یەزدانەوە. کەواتە چۆن دەبێت نەتەوەیەك خاوەنی حەقیقەتی ڕەهای ئیلاهی بێت، زانست لە دوژمنە ئەزەلیەکەیەوە وەربگرێت کە ئەویش نەتەوە مەسیحیەکانی ئەوروپان؟!

ڕاستە ئەو نەتەوانە مەسیحی نەماون و بوونەتە نەتەوەگەلێکی عەلمانی، بەڵام موسڵمانی تەقلیدی هەر بە چاوی مەسیحی سەیریان دەکات و ئەمەش شەڕی خاچ پەرستانی بیر دێنێتەوە کە هەزار ساڵ لەمەوبەر کۆتایی هات! لەبەرئەوە زۆربەی زۆری ئەو رۆشنبیرانەی "جۆرج تەرابیشی" لە دوو بەرگی ئەم کتێبەدا باسی کردوون، بەلایانەوە پەسەندە تەنها ئامێر و ئامرازە تەکنۆلۆژیەکانی خۆرئاوا وەربگیرێت، بەڵام نابێت قەرەی جەوهەر و ناوەڕۆکی فەلسەفە و زانستی ئەو شارستانیەتە بکەوین. واتە ئەوەی ئەوان دەیانەوێت دیوی دەرەوەی شتەکانە، نەك جەوهەر و ناوەڕۆکیان. ئەو کۆسپە گەورەشی ڕێگرە لەبەردەم بەرەو پێشچوونی عەرەبدا ئەمەیە، داخرانی مێژویش لێرەدا زۆر بە زەقی ئاشکرا دەبێت. مادامەکی ئێمە ناتوانین ئەو کۆت و بەندانەی کەلەپوور بشکێنین کە سەدان ساڵە لە دەست و پێماندایە، ئەوا هەر بەو حاڵەوە دەمێنینەوە و رزگاربوونمان ئەستەم دەبێت. شکاندنی ئەو کۆت و بەندانە، باجی گەورەی هەیە، ئەویش داماڵینی قودسیەتە لە کەلەپوور، داماڵینی قودسیەتیش لە کەلەپوور بۆ ئەوەیە حەقیقەتی لەناو مێژوودا بخوێنینەوە و وەك بەرەنجامێکی مێژوو کرد سەیری بکەین[3]. ئەوروپاییەکان ئەم کارەیان کرد و ئەمەش بووە مایەی ئەوەی بەرەو پێش بچن و بۆڕی تەواوی میللەتانی دنیا بدەنەوە. ئەمەش ئەو پرۆسەیە رۆشنبیرانی ئێمە ناچنە ژێر باری و لێیتۆقیوون. تۆقیون لەوەی تاوانی کوشتنی باوك – کەلەپوور ئەنجام بدەن. لێرەدا دەرونشیکاری دەتوانێت بێتە ناو مەسەلەکەوەو یارمەتیمان بدات لە تێگەیشتنی کێشەکاندا. ئەو شیکاریە دەرونیانەی "تەرابیشی" لە کتێبەکەیدا دەیکات هەڵە نین، بگرە سەد دەرسەد ڕاستن و لە جێی خۆیاندان. بەڵام هەر هەموویان نا، چونکە هەندێ جار دەبینین لە بەکارهێنانی ئەو میتۆدە دا زیاد لە پێویست پرکێشی و زیادەڕۆیی کراوە.

## گوناهبارکردنی سەردەمی ڕێنیسانس، وەك سەردەمی کریگرتەیی بۆ خۆرئاوا

دوای ئـەو دووره پەرێزییـەی چـەندین ساڵە وەکـی پـەتا دووچـاری بـووین، هەنـدێ لـە رونـاکبیرانی ئێمـە کەوتنـە داوی کێـشە و ململانێی مەزهـەبی و خێڵەکیـەوە. لـە ڕاسـتیدا ئەمـەش شـتێکی چـاوەڕوانکراو بـوو، چـونکە پاشمـاوەی مێـژوی کـۆن لـە دوای سـەردەمی ڕێنیسانسەوە بەیەکجاری لانەچوو، هەروەها لە قۆنـاغی تـەوژمی ناسیۆنالـستی و مارکسیزمیشدا هەر مایەوە، ئەگەرچی ئێمە بۆ ماوەیەك پێمان وابوو، بەسەرچووەو ئاوا بووە. بـەلاّم زۆری نەخایانـد هـەموو ئـەو چـەپێنراوە کۆنـە، بەیـەکجار سـەری هەڵدایـەوەو گەڕایـەوە. لەم نێوەندەشدا ئەوانەی بوونە کۆچی قوربانی، مەسـیحیەکانی ولاّتـانی عـەرەبی بـوون. وەکـی ئاشکرایە کاتێك نەتەوەیـەك لەبـەردەم هێزێکـی دەرەکیـدا دوچـاری شکـست دێـت، ئـەوا کەمینەیـەك دەکاتـە کۆچـی قوربـانی. ئەمـەش ڕێسایەکی ئەنسرۆپۆلۆژی بـاوە لـەناو هـەموو نەتەوەیەکدا.

بەمجۆرە فێندەمێنتالیستە ئیسلامیەکان (لە دوایـشدا کـە مارکسیـست و ناسیۆنالیـستەکان پەیوەنـدییان پێـوەکردن)، دەسـتیانکرد بـە تاوانبـارکردنی ئـەو روناکبیرانـەی مەسـیحین، چـونکە پێیـان وابـوو ئـەوان هۆکـاری ئـەو ڕێنیسانـسە گومڕایـەن کـە پـاکی و بێگـەردی عـەرەب و ئیسلامی لەکەدار کردووە! لەمبارەیە "تەرابیشی" دەڵێت: (مونیر شـەفیق سـەرکۆنەی سـەردەمی ڕێنیـسانس دەکـات، بـەو پێیـەی لـەو سـەردەمەدا غـەربزەدەیی فیکـری و ژیـاری شـوێنی ئیـسلام دەگرنـەوە. تەنانـەت گومـان لەسـەر ناوەکـەش پەیـدا دەکـات: ریفـۆرم و ڕێنیـسانس دەبنـە ناوێـك بـۆ خۆرئـاواخوازی و تەبـەنیکردنی شارسـتانیەتی ئـەوروپایی و دەسـتبەرداربوون و دژایـەتیکردنی ئیسلام بـە هـەموو شـێوەیەك). (بـەرگی یەکـەم، ل 102-103). هاوکات "مونیر شەفیق" لە رەخنەکانیدا دەیگەیەنێتـە ئـەوەی پـەلاماری ڕێنیسانـسی ئـەوروپی بـدات و لەمبارەیەشـەوە قسەگەلێکی نابـەجێ دەکـات و دەڵێـت: (ڕێنیسانـسی ئـەوروپایی سـەردەمی نوچـدان و داوەشـان و تـاریکی و سـتەمکاریە، سـەردەمی تـاوان و ئەنجامدانی هەموو نابەجێییەکە!).

کاتێك گوێبیستی ئەم قسانە دەبین، سەرەتا وا دەزانین نوسـەرەکەی سـەرکۆنەی سـەدەکانی ناوەڕاسـت و دادگاکـانی پـشکنین دەکـات، هەرگیز ئەوەمان بە بیردا نایەت باس لە یەکێك لە جوانترین و مەزنترین سەردەمە مێژووییەکان بکـات، کـە ئـەویش سـەردەمی ڕێنیسانـسی ئەوروپییـە. سـەردەمێك کـە لـە "دانـتی" و پەترارك"ەوە درێژ دەبێتەوە، تا "ئیراسمۆس" و "تۆمـاس مـۆر" و "مۆنتـاین" و "ڕابلـێ" و "لیۆنـاردۆ داڤنـشی" و "ڕافائێـل" و "کۆپـەرنیکۆس" و "میکائیـل ئـەنجیلۆ" و "مارسـێل منیـشان" و "بیـك میرانـدۆلی" و.. هتـد. قۆناغێـك بـەر لـە ئێـستا ناسیۆنالـست و مارکسیـستە عەرەبـەکان، دەیانویـست بـاز بەسـەر ئیـسلامدا بـدەن، ئەمـەش بـۆ خـۆی کـارێکی بـەجێ نـەبوو. ئـەوان دەبـوو لـە بـری ئـەوە، ڕووبـەڕووی کەلـەپوری ئـاینی بونایەتـەوەو لێکدانەوەیـەکی تـازە و رۆشـنگەرانەیان لەمـەڕ کەلـەپوری ئیـسلامی پێـشکەشکردایە، بـۆ ئـەوەی بـەرەنگاری ئەو لێکدانـەوە تەقلیدیـە ببوایەتـەوە کـە سـەدان

ساڵە ڕەگی داکوتیووەو لەئارەدایە. ئەوان لەبەرئەوەی لە ئاست ئەم کارەدا دەستەوستان بوون، بۆیە دەبینین کەلەپوور بەو هەموو توندوتیژی و بێئامانیەوە دێتەوە کایەکە، ئەم پرۆسەیەش لە شۆڕشەکەی "خومەینی"یەوە بەردەوامە تا ئەمڕۆ.

بۆیە دەڵێم تەقینەوەی ئەم چەپێنراوە مەزهەبیانە لە خۆرهەلاتی عەرەبیدا، شتێکی چاوەڕواننکراوو پێویستیش بوو، گەر بێتو بە قوڵی و لە چوارچێوەی مێژوی ماوە درێژدا لە کێشەکەمان ڕوانی. ئێمە ناتوانین لە کەلەپوری ئاینی و مەزهەبگەرایی قوتار ببین، گەر هاتوو ئەو شتانە بە پەردەیەکی ڕوکەشانەی مارکسیزمو ناسیۆنالیزم و ئایدیۆلۆژیای پێشکەوتنخوازی، داپۆشرابوون و چەپێنرابوون.

ئێمە ئەو کاتە لەمانە رزگارمان دەبێت، کە بتەقنەوەو تەواو خاڵی ببنەوە. ئەوەی ئێستا ڕوو دەدات ئەوەیە. من وتومە و دەیڵێم و دەیڵێمەوە کە ئەم تەوژمەی فێندەمێنتالیزم لە ئێستادا، نامانترسێنێت و بگرە قۆناغێکە پێویستە پێیدا تێپەڕێن، بەر لەوەی بگەین بە سەردەمی رۆشنگەری و حەقیقەت. ئەڵبەتە جێی داخە چەندین کەسایەتی مەزنی ئەدەبی و رۆشنبیریی وەك: "شبلی شومێل و یەعقوب سەڕوف و فەرەح ئەنتوان و سەلامە موسا و جوبران خەلیل جوبران و میخائیل نەعیمە و... هتد"، تۆمەتبار بکرێن. لە کاتێکدا ئەمانە پۆلێك روناکبیر و منەوەر بوون و لە خەمی نوێکردنەوەی ئەدەب و زمان و رەخنە و تەواوی کلتوری ئێمەدا بوون. من بۆ خۆم کاتێك ئەو شتانەم لە کتێبەکەی "جۆرج تەرابیشی"دا خوێندەوە، لە ناخەوە برینداز و دڵگران بووم.

بەلاّم چی بکەین؟ لەناو هەموو نەتەوەیەکدا کەمینەیەکی توندڕەوو دەمارگیر هەن، پێیان دەڵێن ڕاستڕەوە پەڕگیرەکان. ئەمانە لە یەککاتدا وەکو یەك دەمارگیری نەتەوەیی و ئاینیین. فەرەنسیەکان ئەگەرچی بە درێژایی دوو سەدەی رابردوو، ئەزمونی ئەو هەموو شۆڕشە فیکری و سیاسیە ئازادیخوازانەیان کردووە، بەلاّم تا هەنوکەش باڵێکی ڕاستڕەوی پەڕگیری شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستیان تێدایە. ئەڵبەتە ئەم باڵە بەراورد بە گەلی فەرەنسی کە زۆربەیان ڕۆشنگەرن کەمینەن، بەلاّم بوونیان هەیە. وەکی ئاشکرایە یەکێك لە سەرکردەکانی ئەم باڵە بەناوی "شارل مۆراس" لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، "ژان ژاك ڕۆسۆ"ی پرۆتستانتی بە تێکدانی فەرەنسای کاتۆلیکی تاوانبار دەکرد!! چونکە ئەویان بە بەرپرسیاری بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسی و دابەشبونی گەلی فەرەنسایان بۆ پاشایەتی و کۆماری و هەلاّیسانی شەڕی ناوخۆیی دەزانی. کەواتە جیاوازی ئەو پیاوە لەگەڵ "مونیر شەفیق"دا چییە، کاتێك گەورە بیریارانی لوبنان و میسر و عەرەبە مەسیحیەکان بەوە تاوانبار دەکات کە هۆکاری تێکدان و شێواندنی ئیسلامن؟ تەنانەت کار دەگاتە ئەوەشی ئیمام "محەمەد عەبدە" بە بەکرێگیراوی بەریتانیا بدەنە قەڵەم! ئەم کارەش ئەو فێندەمێنتالیستە تازانە دەیکەن کە لە سەردەمی ڕێنیسانس و دەستکەوتەکانی هەڵگەڕاونەتەوە. لێرەدا وشەی (هەڵگەڕانەوە)م بەدڵە، لەبەرئەوەی "تەرابیشی" بە شێوەیەکی دروست بەکاری دێنێت. من پێموایە ئەو یەکەم کەسە ئەم وشەیەی بە پێچەوانەی مانا لاهوتیەکەیەوە بەکارهێنابێت. بەڵێ

هەڵگەڕانەوەیـــەك لـــە بـــەهاكانی پێـــشكەوتن و ڕێنیسانس و ڕۆشنگەری، لەگۆڕێدایەو هێندەی نـەماوە تـەواوی روناكبیران بگرێتـەوە.مـن لـەوە تێناگـەم ئـەم ملدانـە بـە تـەوژمی فێندەمێنتالیزم بۆچی؟ لێرەدا پرسیارەكە ئەوەیە: (ئایا دەبێت رونـاكبیر مـل بـۆ تـەوژمی میللیگـەرایی بـدات، یـاخود دەبێت بـەپێی توانـا بـەرخورد بكـات و خۆی نەدات بەدەستەوە؟).

چـەند رونـاكبیرێكی كـەم توانیـان مـل بـەو تەوژمـــە نـــەدەن و دەســـتبەرداری خـــەونی پێـــشكەوتنخوازانەی خۆیـــان نـــەبن. قـــسەكانی "جـــۆرج تەرابیـــشی" ئـــەوە دەگەیـــەنێت و پێشموایە قسەكانی لەجێی خۆیدایەتی، چونكە لێكدانەوەكانی بەجێن و هەمیشەش بە بەڵگەی پێویست دەیانسەلمێنێت.

من لەوە تێدەگەم هەندێ روناكبیر بگەڕێنەوە سەر كەلەپووری ئایینی خۆیان، دوای ئەوەی بۆ ماوەیـــەك قۆنـــاغی ناســـری و بەعـــسیزم و ماركسیزم، ئەو كەلەپوورەی فەرامۆش كردبوو.. چـونكە هەمیـشە تینویەتیـەكی رەوا هەیـە بـۆ دەرگیربوون بە شوناسی مێژوییەوە. بەڵام داخۆ دوای ئـەوەی لـەم هـەموو گەڕانـەوە سـۆزدارییە تێربـووین، جێـی خـۆی نییـە هەنـدێ پرسـیاری رەخنەیی لە كەلـەپوورمان بكـەین، وەكـی ئـەوەی هـەموو گـەورە رونـاكبیرانی دنیـا لـەناو سـەرجەم كەلـــەپووره ئینـــسانیەكانی دیكـــەدا دەیكـــەن؟ بۆچـی دەبێـت ئێمـە بـە شـێوازێكی منداڵانـە دەرگـیری كەلـەپووری خۆمـان بـین؟ ئایـا نابێـت لـەنێوان دژایـەتیكردنی سیاسـەتی خۆرئـاواو ئیسرائیل، لەگەڵ دژایەتیكردنی شارستانیەتی خۆرئاوادا جیاوازی بكەین؟

خـــــــودی فەیلەســـــــوفانی خۆرئـــــــاوا خۆشـــیان، لەســـەرو هەمووشـــیانەوە "یـــۆرگن هاپرماس"، دەڵێن شارستانیەتی خۆرئاوا دوو روی هەیە:

رویـەكی ئـازادیخوازی مرۆڤانـەی قەشـەنگ، لەگـەڵ سـیمایەكی پـاوانخوازی كـە خواسـتی هەژموونگـــەری و خۆســـەپاندنی هەیـــە. ئێمـــە نابێـت ئـەم دوانـە تێكـەڵی یـەكتر بكـەین، بـۆ نموونـە وەكـی ئـەوەی قوتابخانـەی فرانكفـۆرت كـــردی، یـــاخود وەكـــی ئـــەوەی لـــە ئێـــستادا ئایدۆلۆژیـستە عەرەبـەكان دەیكـەن، ئەگەرچـی ئـــەوەی ئـــەمان زۆر بـــەو ژیـــری و قوڵیـــەی فرانكفۆرتیەكان نییە.

لەبەرئـەوە "جـۆرج تەرابیـشی" هۆشـداریمان دەداتـێ و دەڵێـت: (ئەمـە مانـای وایـە خۆمـان لـە سەنگەری دژ بە شارستانیەت دابنێین و بەمـەش دەبێـــت بـــەم دوو چارەنووســـە رازی بـــین: هەڵخلیـــسكان بـــۆ نـــاو بەربەریـــەت یـــان شیزۆفرینیا و دابڕان لە واقیع. هەرچۆنێك بێت، هەڵوێستی ئەو بەشـەی ئەنتلجنسیای عـەرەبی كە داوای دابڕان لەگەڵ شارستانیەتی مۆدێرندا دەكـــات، هـــەر لەبـــەر ئـــەوەی رەگوڕیـــشەی خۆرئاواییە، لە رووە نائەقڵانیەكەیدا هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی فلۆرنسامان وەبیر دێنێتـەوە كـە كـاتی خـۆی رێگـەیان بـە بازرگانـەكانی شـارەكە نـەدەدا سـستمی ژمـارەیی عـەرەبی بـەكاربهێنن، لەبەرئـەوەی ئـەوە بەرهـەمی كافرانـە، لەبەرامبـەر ئەمەشـدا ناچـاریانكردن لەسـەر بـەكارهێنانی ژمـارەی ڕۆمـانی بـەردەوام بـن، هەرچـەندە لـە ئالۆێردەكانیانـــدا كێـــشەو گرفتـــی زۆری بـــۆ دروسـت دەكـردن). (بـەرگی یەكـەم، ل 176). بـەمجۆرە دەبیـنین داخـران بەسـەر خـوددا كـە هەنـدێ لـە فێندەمێنتالیستە نوێیـەكان داوامـان لێدەكەن، زیاتر زیان بە خۆمان دەگەیەنێت، وەك لەوەی زیان لە خۆرئاوا بدات. هاوكات ئەم كارە

**دواکــەوتویمان زیــاتر دەکــات و تــا ئەبــەد رێ لەبەروپێشچوونمان دەگرێت.**

**مایــەی خۆشــبەختییە "جــۆرج تەرابیــشی" هــیچ سازشــێك لەگــەڵ ئــەم تەوژمــە ئــسوڵیەدا ناکات، ســەرەڕای ئــەو هــەموو هێزو جــەماوەرەی لە شەقامی عەرەبیدا هەیــەتی. "تەرابیشی" لــەو کەســــە کەمانەیــــە ئــــەم هەڵوێــــستە بوێرانــــەی نوانــــدوە، لەگــــەڵ "فوئــــاد زەکــــەریا" و چــــەند کەسانێکی دیکە.**

## پەراوێز:

1-یەکەم: المرض بالغرب والتحليل النفسي لعصاب جماعي عربي، دووەم: ازدواجية العقل: دراسة تحليلية نفسية لكتابات حسن حنفي، دمشق 2005.

2-حەســەن حەنــەفی لــە دوا چاوپێکەوتنیدا لەگــەڵ رۆژنامــەی (البيــان)ی ئیماراتیــدا ئەمــە روندەکاتــەوە و دەڵێــت: (ئیخوانــەکان پێیــان وابــوو کۆمۆنیــستم و کۆمۆنیستەکانیش بــە ئیخوان موسلیمینیان دەزانیم).. بەرواری (2005/8/30).

3-کێ دەوێرێت وا بکات؟ ئەمە بــە هەڵگەڕانــەوە لــە ئــایین و پێــشێلکردنی پیرۆزیــەکان حــساب دەکرێــت و سزای هەڵگەڕانەوەیش لە ئایین کوشتنە.

## سەرچاوە:

هاشــم صــالح- الانــسداد التــأريخی- دار الــساقي، بيروت- الطبعة الاولى، 2007

# چەمکی بەشداریکردنی سیاسی

د. السید علیوه و مونا مەحمود

لە عەرەبییەوە: کنێر عەبدوڵڵا

هەتا سەردەمی نوێ بەشداریکردنی سیاسی تەنیا بۆ دەوڵەمەندو ناوداران بوو و زۆربەی خەڵکی ئاسایی بێبەش بوون لە بەشداریکردن. لە سەردەمی ڕێنسانسەوە هەتا سەدەی حەڤدەیەم ڕووکردنە بەشداریکردنی سیاسی ڕووی لە زیادبوون کردو ئەو بەشداریکردنە لە ماوەی شۆڕشی پیشەسازی (لە هەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدەیەمدا) گەیشتە پۆپە، بیگومان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانە:

1- پیشەسازیکردن و پەرەسەندنی شارەکان و زۆربوونی خوێندن کە بووە هۆی سەرهەڵدانی چەندین هێزی کۆمەڵایەتیی نوێ (کرێکاران، بازرگانەکان و خاوەن پیشە ئازادەکان) کە توانای دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان بەدەستهێناو داوای بەشێك لە دەسەڵاتی سیاسیان کرد.

2- سەرهەڵدانی ئەو بانگەوازانەی ڕۆشنبیران: فەیلەسووف و نووسەر و ڕۆژنامەنووسەکانی، ئاڵاکەیان بەرزکردەوەو خوازیاری بەهاکانی یەکسانی، ئازادی و بەرژەوەندیی گشتی بوون، بەشیوەیەك کە بووە هۆی ئەوەی بەشداریکردنی فراوان لە کاری سیاسیدا پەرەبستێنێ.

3- گەشەکردنی ئامرازەکانی گواستنەوەو هاتوچۆو پەیوەندیکردن کە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی خێراو تاڕادەیەك ئاسانی بیروڕا نوێکان سەبارەت بە دیموکراسی و بەشداریکردن.

4- ململانێ لەنێوان سەرکردە سیاسییەکاندا، چونکە لە سایەی کێبڕکێ لەپێناو دەسەڵاتدا، هێزە ململانێکارەکان تێدەکۆشن بۆ بەدەستهێنانی لایەنگیریی میللی، ئەمەش بۆ خۆی ڕەوایەتی دەداتە بیرۆکەی بەشداریکردنی جەماوەریانە.

5- زۆربوونی دەستێوەردانی حکومی لە کاروبارە کۆمەڵایەتی، ئابوری و ڕۆشنبیرییەکان،

کــە بەهۆیـــەوە ژیـــانی ڕۆژانـــەی تاکـــەکان بڕیاردەرانــە پــشت بــە کارەکــانی حکومــەت ببەستێت. لێرەشدا بەبێ بوونی مافی یاسایی بەشداریکردنی سیاسی، تاکەکان بێدەسەڵات دەبن لەئاست ڕووبەڕووبوونەوەی حکومەتدا، ئەمەش زیان بە بەرژەوەندییەکانی دەگەیەنێت. لێرەوە داواکردنی بەخشینی مافە سیاسییەکان بە تاکەکانو ڕەخساندنی زەمینەی توانای کارپێکردنی چالاکانەیان هاتەئاراوە بەمەبەستی سنووردانان بۆ دەسەڵاتو دەستڕۆیشتنی حکومەت.

بەشداریکردن ناوی جیاواز لەخۆدەگرێت، هەندێك بە بەشداریکردنی جەماوەری ناویدەبەن، هەندێکی دیکە بە بەشداریکردنی میللی یان گشتی ناوزەدی دەکەن. وێڕای جیاوازیی ئەو ناولێنانانە، هەموویان بەدەوری یەك مانادا دەخولێنەوە، ئەوەش بەشداریکردنی هەر تاکێکی کۆمەڵگەیە لە گشت کاروبارەکانو هەموو ئاستەکاندا، هەروەها لە گشت بوارەکانی ژیانی سیاسی، ئابوریو کۆمەڵایەتیو ئەوانی دیکەدا. واتە بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی جەماوەر لە کاروبارەکانی کۆمەڵگەدا، نەك لە ڕێی بەشداریکردنی نوێنەرایەتییەوە، وەك نوێنەرانی میللەت یان ئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکان، کە بە بەشداریکردنی ناڕاستەوخۆ دادەنرێن. دەشێت لە ڕێگەی باسکردنی ئەم تەوەرانەی خوارەوە بەشداریکردنی سیاسی تاوتوێ بکەین:

**یەکەم: پێناسەی بەشداریکردنی سیاسی:**

بۆ نزیکبوونەوە لە چەمکی بەشداریکردنی سیاسی پێویستە بەشداریکردن بەشێوەیەکی گشتی ڕوونبکرێتەوە، وەك دەستپێکێك بۆ خستنەڕووی چەمکی بەشداریکردنی سیاسی، چونکە دەشێت بەشداریکردن مانای ئەنجامدانی هەر کارێکی خۆبەخش بێت لەلایەن هاووڵاتییەوە، بە مەبەستی کاریگەری خستنە سەر هەڵبژاردنی سیاسەتە گشتییەکانو بەڕێوەبردنی کاروبارە گشتییەکان یان هەڵبژاردنی سەرکردە سیاسیەکان لەسەر هەر ئاستێکی حکومی، ناوخۆیی یان نەتەوەیی. هەندێکی دیکە هەن کە بەشداریکردن بەوە پێناسە دەکەن کە پرۆسەیەکە هەموو شێوەکانی بەشداریکردن لەخۆدەگرێت یان بەشداریکردنی هاووڵاتیانە لە ئاراستەکردنی کاری دامودەزگاکانی حکومەت یان دامودەزگاکانی حوکمڕانیی ناوچەیی یاخود دەستکردن بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی کۆمەڵگە دەیان خوازێت، جا ئەوانە خاوەن سروشتی ڕاوێژکاری بن یان بەدواداچوونو جێبەجێکردنو چاودێری کردنو بەشداریکردنەکە ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ. هەروەها دەشێت لای هەندێك مانای ئەو کۆششە خۆبەخشە ڕێکخراوانە بێت کە پەیوەندی بە پرۆسەکانی هەڵبژاردنی سەرکردایەتیە سیاسییەکان، سیاسەتسازیو پلاندانانەوە هەیە، هەروەها پەیوەندیی بە جێبەجێکردنی بەرنامەو پرۆژەکانەوە هەیە، جا ئەوە لەسەر ئاستی خزمەتگوزاری بێت یان بەرهەمهێنان، ناوخۆیی بێت یان نەتەوەیی. هەروەها بەشداریکردن مانای بەشداربوونی هاووڵاتیانە بەم یان بەو پلەیە لە ئامادەکردنو جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی پەرەپێدانی ناوچەییدا، جا ئەوە بە کۆششی تایبەتیان بێت یان بە هاوکاریکردن بێت لەگەڵ دامودەزگا حکومییە ناوەندیو ناوخۆییەکاندا.

جگـە لەوانـە، بەشـداریکردن دەشـێت ئـەو کۆششە هاوبەشە حکومی و ئەهلیانەی گشت ئاسـتەکان بگرێتـەوە کـە بـۆ گۆشـکردنی ئـەو سـامانانەی بوونیـان هەیـە یـان دەکرێـت بدۆزرێنەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێداویستییە گرنگـەکان، ئەمـەش بـەپێی پلانگـەلی داڕێـژراو و لـە سـنووری سیاسـەتێکی کۆمەلایەتیـدا بـۆ هـەمووان. دەشـێت بەشـداریکردنی جـەماوەری دابەشـبکەین بەسـەر سـێ جـۆری سـەرەکیدا: بەشـداریکردنی کۆمەلایـەتی، ئـابووریو سیاسی. ئەگەرچی لـە واقیعی کردەییدا چەند ئاستەنگێك لەئارادایە بۆ لێك جیاکردنەوەی ئەو جۆرانـە، لەبـەر پەیوەنـدیی تونـدوتۆڵو تێکهەڵکێـشیی بـەهێزی نێـوان ئـەو جۆرانـەو کاریگـەریی هـەر جۆرێـك لەسەر دوو جۆرەکـەی دیکەو کەوتنە ژێر کاریگەریی گەورەیانەوە.

1- **بەشـداریکردنی کۆمەلایـەتی:** ئـەو چالاکیانەیە کە ئامانجی زاڵبوونە بەسەر هەندێ لە کێشە کردەییە ڕۆژانەکانداو بەشداری دەکات لە بەدیهێنانی برێك هاوکاریو هاریکاریی نێوان تاکـەکانی کۆمەڵگـە، ئـەوەش لـە دوو بـواری بنـچینەییدا:یەکـەم/ کۆشـشە خۆبەخـشەکانی وەك: بنیادنـانی مزگـەوت، قوتابخانـەو نەخۆشخانەکان بە بەشداریکردن بە پارەو زەوی لـە کـاتی دروسـتکردنیدا. دووەم/ چارەسـەرکردنی کێـشە ڕۆژانەییـەکانو ئـەو ناکۆکیانـەی دەشـێت لـەنێوان تـاك یـان گرووپـەکانی کۆمەڵگـەدا سـەرهەڵدەدەن. بەوپێیـەی بەشـداریکردنی کۆمەلایـەتی دیاردەیەکی کۆمەلایەتیە، ئەنجامی کارلێکردنی تاكو مامەڵەکردنی لەگەڵ تاکەکان، گرووپەکان، ڕێکخراوەکـانو دامـەزراوەکانی کۆمەڵگـە سـەرهەڵدەدات. ڕادەی بەپیرەوچـوونی هاوولاتیانیش بۆ ئەو هەستوسۆزانە جیاوازە، ئەمـەش بـەپێی چـەند هۆکارێـك، هەنـدێکیان دەروونین، وەك خەسڵەتەکانو توانا دەروونیو ئەقڵییـەکانی هـاوولاتی، هەنـدێکی دیکەشـیان کۆمەلایـەتین، وەك بـارودۆخی پێگەیانـدنی کۆمەلایـەتی. هـەروەها بەشـداریکردن ملکەچـی بـارودۆخ و هۆکـارە ئـابووری، سیاسـیو پەروەردەییـەکانی کەسـایەتی تاکەکـەسو کۆمەڵگەکەیەتی.

2- **بەشداریکردنی ئابووری:** بەشداریکردنی جەماوەرە لە پرۆژەکانی پەرەپێدانی ئابووریدا، ئـەوەش بـە بەشـداریکردنیان لـە بڕیارسـازیی پرۆژەکـانو دابینکردنـی پـارە بۆیـانو جێبەجێکردنیاندا. هەروەها دەشێت مانای ئەو چالاکیانە بێت کە جەماوەر ئەنجامیان دەدەن بۆ پـشتیوانیکردنی ئـابووریی نەتـەوەیی، وەك باجـدانو میرانـەدانو ئـەوانی تـر، لەگـەڵ کـۆنترۆڵکردنی خەرجییـەکان لەلایـەن تاکـەوە، بەشـێوەیەك کـە خەرجییـەکانی لەسـنووری داهاتەکانیدا بێتو هەمیشە پارەی لێ زیادبێت بـۆ پـشتیوانیکردنی ئـابووریی نیـشتمانی بەکاربهێنی، لەگەڵ بوونی ئاستێکی هۆشمەندی کە وای لێ دەکات بایگۆتی ئەو بازرگانانە بکات کـە زیادەڕۆن لـە بەرزکردنەوەی نرخەکانـدا یـان هەنـدێك کـالای دیـاریکراو لـە بەکاربـەران دەشارنەوە.

3- **بەشـداریکردنی سیاسـی:** مانـای ئـەو چـالاکیە خۆبەخـشتانەیە کـە هاوولاتیـان ئەنجامیـدەدەن بـە ئامـانجی کاریگـەری دروسـتکردنی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ لـە پرۆسـەی هەڵبـژاردنی حوکمڕانەکانـداو کاریگـەری خـستنە سـەر ئـەو بڕیارانـەی دەریدەکەنو ئەو سیاسەتانەی پێڕەوی دەکەن.

هەروەها دەشێت بەشداریکردنی سیاسی مانای ئەو پرۆسەیە بێت کە بەهۆیەوە تاك ڕۆڵیك ببینێ لە ژیانی سیاسیی کۆمەڵگەکەیداو دەرفەتی ئەوەی هەبێت بەشداری بکات لە گفتوگۆکردن دەربارەی ئامانجە گشتییەکانی کۆمەڵگەکەو دیاریکردنی باشترین شێوازدا بۆ هێنانەدیان. دەکرێت ئەم بەشداریکردنە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ڕێی چالاکییە سیاسییە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکانەوە ئەنجام بدرێت. هەندێك پێیانوایە دەکرێت چالاکیەکانی بەشداریکردن بکرێنە دوو گرووپەوە:

1- **چالاکییە تەقلیدییەکان یان ئاساییەکان:** کە ئەمانە دەگرێتەوە: دەنگدان، بەدواداچوونی مەسەلە سیاسییەکان، گفتوگۆکردنی سیاسی لەگەڵ کەسانی دیکە، ئامادەبوون لە سمینارات و کۆنگرە گشتییەکاندا، بەشداریکردن لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا بە پارەو پڕوپاگەندەکردن، بوونە ئەندامی گرووپەکانی بەرژەوەندی، ئەندامبوون لە پارتەکانداو پەیوەندیکردن لەگەڵ لێپرسراوەکاندا، پاڵاوتن بۆ پۆستە گشتییەکان و بەدەستهێنانی پلەکارە سیاسییەکان. لێرەدا دەنگدان باوترین شێوازی بەشداریکردنی سیاسییە، چونکە زۆربەی سیستەمە دیموکراتی و نادیموکراتیەکان وەك یەك پێی ئاشنان، لەگەڵ بوونی جیاوازی دەربارەی دەلالەت و ڕادەی کاریگەریێتی، چونکە سەرەتا ئەوە شێوازێکە بۆ لێك جیاکردنەوەی کاندیدەکان و هەڵبژاردنی ئەوانەی پۆستە سیاسییەکان بەڕادەیەکی ئازادانەتر بەدەستدێنن، بەلام ئەمە لە ڕژێمە دەسەڵاتخوازەکاندا بەهەمان شێوە نییە، چونکە لەو ڕژێمانەدا هەڵبژاردنەکان ئامرازێکن بەدەست ئەوانەی لە دەسەڵاتدان و بەکاریدێنن بۆ پڕوپاگەندەکردن و بەدەستهێنانی لایەنگیری و ڕەوایەتی، نەك وەك ئامرازێك بۆ هەڵبژاردنی سیاسیی هۆشمەندانەو کاریگەریخستنە سەر کاروبارەکانی حوکمڕانی و سیاسەت لەلایەن جەماوەرەوە. بۆیە دەشێت بەشداری نەکردن لە دەنگداندا جۆرێك بێت لە دەربڕینی ناڕەزایی بێدەنگانە.

2- **چالاکییە ناتەقلیدییەکان:** هەندێك لەوانە یاسایین، وەك سکالاکردن، هەندێکی دیکەیان یاساییە لە هەندێ وڵات و نایاساییە لە وڵاتەکانی دیکە، وەك: خۆپیشاندان، مانگرتن و هەڵسوکەوتە نێگەتیڤەکان. بێگومان بەشداریکردنی سیاسی یەکێکە لە شێوەکانی فێرکردنی هاووڵاتیان، چونکە هاووڵاتیان لە ڕێگەیەوە لە ماف و ئەرکەکانی خۆیان دەگەن. ئەمەش بۆخۆی دەبێتە هۆی ئەوەی هاووڵاتیان بەتەواوی ئاشنای ماف و ئەرکەکان بن و بەفراوانی دەرکیان پێ بکەن و واقعبینانەترو نەرمونیانتر داخوازییەکانی خۆیان بخەنەڕوو. بەوپێیەی بەشداریکردنی سیاسی گرێدراوی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتیە کە لەسەر بناغەی هاوسەنگیی نێوان ئەرك و مافەکان بنیاتدەنرێت. بۆیە بە یەکێك لە خەسڵەتەکانی سیستمە دیموکراتیەکان دادەنرێت، کە پێگەیشتن و گەشەکردنی دیموکراسی پشتئەستووردەبێت بە ڕادەی بەرفراوانی بەشداریکردن و دانانی بە مافێك کە هەر مرۆڤیکی ناو کۆمەڵگە بۆی هەبێت پیادەی بکات. هەروەها بەشداریکردن دەبێتە هۆی جێگیربوونی ئارامی و ڕێکوپێکی زیاتر لە کۆمەڵگەدا. ئەمەش هەستکردن بە ڕەوایەتی سیستەمەکە قوڵترو فراوانتر دەکات. چونکە

بەشداریکردن مافێکی دیموکراسی بە جەماوەر دەبەخشێ و دەتوانن کاتی کەمتەرخەمی نواندن لە بەرپرسان بپرسنەوە. لەبەرئەوەی ئەو هاوولاتیانەی ئاگایان لە ڕەوتی کاروبارەکانە، دەتوانن حوکمبدەن بەسەر ڕادەی باشیی ڕاییکردنی کارەکانی حکومەتدا. ئەمە وێڕای ئەوەی بەشداریکردن پشتگیریی پەیوەندییەکانی نێوان تاک و کۆمەڵگەکەی دەکات، ئەمەش بەپێی پێویست ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر هەستکردنی بەئینتیمابوونی بۆ نیشتمانەکەی. هەروەها بەشداریکردن وا لە جەماوەر دەکات زیاتر درک بە قەبارەی ئەو کێشانە بکەن کە پەیوەندییان بە کۆمەڵگەکەیانەوە هەیە و بەو توانایانەی لەبەردەمیاندایە. بەوجۆرەش دەروازەیەکی بنیاتنەرانە بەڕووی هاوکاریکردنی جەماوەر و دامەزراوە حکومییەکاندا دەکاتەوە.

بەشداریکردنی ڕاستەقینە زۆرجار مانای دەوڵەمەندکردنی بیری حکومەتە بەزۆرێك بیروڕای چاکی جەماوەریی کە نەکەوتونەتە ژێر کاریگەریی نەریتە بیروکراتیەکان و سنوور بۆ دانانەکانی. هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی جەماوەر خۆیان لە کۆمەڵەی ئەهلیدا ڕێکبخەن بۆ پشتگیریکردنی دەستە حکومییەکان بۆ بەپیرەوچوونی تێکڕای پێداویستییە گشتییەکانی جەماوەر.

بەشداریکردن لە ڕێی دەستە خۆبەخشەکانەوە، هەندێ جار دەبێتە هۆی کردنەوەی چەندین کایە بۆ خزمەتگوزاریی و چالاکییەکان. بەمەش، وێڕای هاوبەشیکردنی مادی و مەعنەوی، سەرنج بۆ کایە نوێکان ڕادەکێشێت. هەروەها بەشداریکردن هۆشمەندیی گشتیی جەماوەر بەرزدەکاتەوە، بۆ ناچارکردنی ئەوانەی جڵەویدەکەن، بەردەوام ڕەهەندەکانی خزمەتگوزاریی و پرۆژەکان شیبکەنەوە، بەمەبەستی هاندانی جەماوەر بۆ بەشداریکردن تیایاندا. وێڕای ئەوەی، بەشداریکردن هاوولاتیان وا ڕادەهێنێت کە خەمخۆری سامانی گشتی بن. چونکە خەم نەخۆری بۆ سامانی گشتی کێشەیەکە زۆربەی ولاتە گەشەسەندوەکان بەدەستییەوە دەناڵێنن، لەبەرئەوەی ئەو سامانە لەلایەن هاوولاتیانەوە بەهەدەر دەچێت و خراپ بەکاردەهێنرێت، ئەمەش دەگەڕێتە بۆ ئەو تێڕوانینەیان کە سامانی گشتی لە ڕاستیدا لە سامانی تایبەتیانەوە سەرچاوەدەگرێت. هەروەها خراپ بەکارهێنانی شوێنە گشتییەکان یان بایەخ نەدان بە پاراستن و چاکردنیان بەپێویست دەبێتە هۆی کورتبوونی تەمەنی گریمانەییان. سەرەنجامیش دەبێت گرانی باری تێچوی پاراستن، چاکردنەوە، نوێکردنەوەو بنیاتنانەوەی ئەو بەشانە بگرنە ئەستۆ. جا ئەگەر هاوولاتیان بەشداربوون لە دامەزراندنی ئەو شوێنانەدا، ئەوا لە ڕوانگەی ئەوانەوە بەهاکەی یەکسان دەبێت بە بەهای سامانی تایبەتی خۆیان، بۆیە وریادەبن بەرامبەر بەوەی چاك بەکاریان بهێنن.

سەرەڕای ئەوە، بەشداریکردنی هاوولاتیان لە گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی لە بڕیارسازیدا، ئاسانکاری زۆر دەکات بۆ پرۆسەی جێبەجێکردنی پلان و بەرنامەکان، چونکە ڕەزایبوونی هاوولاتیان لە هەر پرۆژەیەکی بنیاتنراو یان نوێ و کارکردن بۆ سەرخستنی ئەو پرۆژانە مەیسەرنابێت، ئەگەر هاوولاتیان بەشدارنەبن لە پلاندانان بۆ ئەو پرۆژانە، پشتئەستوور بە ئاشنابوونی

تەواویان و دەرککردنیان بە گرنگی و سودەکانی ئەو پرۆژانە. هەروەها لە ڕێی بەشداریکردنی جەماوەرەوە دەشێت گشت ئامانجەکانی کۆمەڵگە بە شێوەیەك بێنەدی لایەنی زۆری سودەکان مسۆگەردەکات و بەشێوازێك کە گونجاو بێت لەگەڵ پێداویستی، ئارەزوو و تواناکانی جەماوەردا. بێجگە لەوانە، بەشداریکردن زیاتردەکات و پەیوەندیی جەماوەر بە ڕژێم و ئامانجەکانیەوە زۆرتر دەکات و ڕادەی لایەنداریێتی، کاریگەریی و بەرپرسیاریێتی بەرزدەکاتەوە، بەرەو بەچالاکی دەدات، ئاستی کارڕاییکردن بەرزدەکاتەوە، سازانی کۆمەلایەتی دێنێتەدی، جۆرەکانی خراپ بەکاربردنی دەسەڵات و نامۆبوون لەناودەبات و یەکسانی و ئازادی دەستەبەردەکات.

گرنگی بەشداریکردن لەوەدایە کە بەشداریکردن پرۆسەیەکە بۆ گواستنەوەو گەیاندنی پێداویستیەکانی هاوولاتیان بە حکومەت، هاوکات ئامانجی کاریگەریخستنە سەر ڕەوشتی حوکمڕانەکانە، ئەمەش بە گەیاندنی زانیارییەکان دەربارەی ئەو ئەولەویاتانەی بەلای جەماوەرەوە باشن، هەروەها لە ڕێگەی فشارخستنە سەر ئەو حوکمڕانانەوە بۆ کارکردن بەپێی ئەو ئەولەویاتانە. بەمەش دەرفەتی بەشداریکردن بەرفراوان دەبێت و پرۆسەکانی خراپ بەکاربردنی دەسەلات و هەستکردن بە نامۆبوون لای جەماوەر کەمدەبێتەوە، بەهاکانی یەکسانی و ئازادیش دەستەبەردەبن. سەرەنجامیش ئارامیی گشتی لە کۆمەڵگەدا جێگیردەبێت، ئەمەش یاریدەدەردەبێت بۆ ئامادەکردنی مەرجە کۆمەلایەتی، ڕۆشنبیری و سیاسییەکان بۆ سەرکەوتنی پلانە جۆربەجۆرەکانی گەشەپێدان.

بەشداریکردن یەکێکە لە پرنسیپە بنچینەییەکانی پەرەپێدانی کۆمەڵگە، چونکە پەرەپێدانی ڕاستەقینەی سەرکەوتوو، بەبێ بەشداریکردن نایەتەدی. هەروەها بەشداریکردن باشترین ئامرازە بۆ پشتگیریکردن و پەرەپێدانی کەسایەتی دیموکراتخوازانە لەسەر ئاستی تاك، گرووپ و کۆمەڵگە. لەهەمان کاتدا سادەترین مافی هاوولاتیە و مافێکی بنەڕەتیە دەبێت هەر هاوولاتیەك لە کۆمەلگەکەیدا هەیبێت. چونکە مافی خۆیەتی حوکمڕانی خۆی هەڵبژێریٚ و ئەو نوێنەرانەی خۆی هەڵبژێرێت کە چاودێری حوکمڕانەکان دەکەن و بەشێوەیەك ئاڕاستەیان بکەن کە لە بەرژەوەندیی میللەتدایە.

هەروەها لەڕێگەی بەشداریکردنەوە، دەشێت تاك ڕۆڵ ببینێ لە ژیانی سیاسی، کۆمەلایەتی و ئابووریی کۆمەڵگەکەیدا، بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجەکانی پەرەپێدانی هەمەلایەن، هەتا دەرفەت بۆ هەر هاوولاتیەك برەخسینێ بۆ ئەوەی بەشداربێت لە دەستنیشانکردنی ئەو ئامانجانەدا و ڕۆڵی هەبێت لە دیاریکردن و ناسینی باشترین ئامراز و شێوازەکان بۆ بەدیهینانیان، بەمەرجێك بەشداربوونی هاوولاتیان لەو کۆششانەدا بەخواست و ئارەزووی خۆیان بێت و بەدووربن لە فشار یان ناچارکردنی دەسەلاتداران. لەم بارەشدا دەشێت بوترێت، ئەم بەشداریکردنە هەستی بەرپرسیاریێتی کۆمەلایەتی لای هاوولاتیان بەرامبەر بە کۆمەڵگەکەیان و ئەو کێشە هاوبەشانە بەرزدەکاتەوە کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوەو ئارەزووی ئەوەیان تیادا دەچێنێ ئامانجە

ویستراوەکانیان بکەنە واقعێکی هەستپێکراو.

**دووەم: شێوازو ئاستەکانی بەشداریکردن:**

ئەگەر بەشداریکردنی سیاسی بەشێوەیەکی گشتی، ئەو چالاکییە ویستخوازو خۆبەخشانە بێت کە هاووڵاتییان لە ڕێگەیانەوە بەشداریدەکەن لە ژیانی گشتیدا، ئەوا ئەم ئاستانەی بەشداریکردنی هاووڵاتیان لە ژیانی گشتیدا، لە دەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکەو لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دیکە لەهەمان دەوڵەتدا جیاوازە.. ئەوەش گرێدراوی ڕادەی ڕەخسانی ئەو بارودۆخانەیە کە ڕێگە بە بەشداریکردن دەدات یان ئاستەنگی بۆ دروستدەکات، هەروەها گرێدراوی ڕادەی بەپیرەوەچوونی هاووڵاتیانە بۆ بەشداربوون لە کاری گشتیدا.

$1$-**چوار ئاستی بەشداریکردن:**

**ا- ئاستی باڵا:** کە ئەنجامدەرانی چالاکییە سیاسیەکان دەگرێتەوە

ئەم ئاستە ئەوانە دەگرێتەوە کە سێ لە شەش مەرجیان تێدا بەدیدەکرێت: ئەندامێتی ڕێکخراوێکی سیاسی، پیتاکدان بە ڕێکخراو یان کاندیدێك، ئامادەبوونی بەردەوامی کۆبوونەوە سیاسیەکان، بەشداریکردن لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا، ئاراستەکردنی نامە دەربارەی مەسەلەگەلی سیاسیە بۆ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی و پلەکارە سیاسیەکان یان ڕۆژنامەگەری، ئاخاوتن دەربارەی سیاسەت لەگەڵ کەسانی دەرەوەی بازنەی تەسکی دەوروبەری تاك.

**ب- ئاستی دووەم:** ئەوانەی بایەخ بە چالاکیی سیاسی دەدەن:

ئەم ئاستە ئەوانە دەگرێتەوە کە لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگدەدەن و بە شێوەیەکی گشتی ئاگاداری ئەوەن کە لە گۆڕەپانی سیاسیدا ڕوودەدات.

**ج- ئاستی سێیەم:** ئەوانەی لە کاری سیاسیدا کەنارگیرن:

ئەوانە دەگرێتەوە کە بایەخ بە مەسەلە سیاسییەکان نادەن، مەیلی ئەوەیان نییە بایەخ بە کاری سیاسی بدەن و هیچ کات و سامانێکی بۆ تەرخان ناکەن، ئەگەرچی هەندێکیان لە کاتی قەیرانەکاندا ناچاردەبن بەم یان بەو ڕادەیە بەشداری بکەن، هەروەها ئەو کاتەی هەستدەکەن بەرژەوەندییە ڕاستەوخۆکانیان هەڕەشەلێکراوە یان بارودۆخی ژیانیان ڕوو لە خراپبوونە.

**د- ئاستی چوارەم: توندڕەوە سیاسییەکان**

ئەوانەن کە لە دەرەوەی چوارچێوە ڕەوا دامەزراوەکان کاردەکەن و پەنا بۆ شێوازەکانی توندوتیژی دەبەن. هەروەها ئەو تاکەی دوژمنی کۆمەڵە بەگشتی و سیستەمی سیاسیە بەتایبەتی و لە گشت شێوازەکانی بەشداریکردن دەتەکێتەوەو دەچێتە ڕیزی بێباکەکانەوە، یان ڕوودەکاتە شێوەگەلی بەشداریکردن کە توندڕەوو توندوتیژانەن.

$2$-**چوار قۆناغی بەشداریکردن:**

**ا- بایەخدانی سیاسی:** ئەم جۆرە بریتیە لە تەنیا بایەخدان یان بەدواداچوونی بایەخدانە بە مەسەلە گشتییەکان لە ماوەگەلی جۆربەجۆردا کە دەشێت کورت یان درێژ بن، ئەمە وێڕای بەدواداچوونی ڕووداوە سیاسییەکان، کە هەندێك تاك ئارەزووی بەشداریکردنیان دەبێت لە گفتوگۆ سیاسییەکان لەگەڵ تاکەکانی خیزانەکانیان یان هاوڕێکانیان لەسەر کار،

ئەمەش لە ماوەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن یان کاتی قەیرانەکان ڕوو لە زیادبوونە.

**ب- مەعریفەی سیاسی:** لێرەدا مەبەست ئاشنابوونە بەو کەسایەتیانەی کە ڕۆڵی سیاسیان هەیە لە کۆمەڵگەدا لەسەر ئاستی ناوچەیی یان نەتەوەیی، وەك ئەندامانی ئەنجومەنی ناوچەیی و ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و کەسایەتیە گشتیەکانی وەك وەزیرەکان.

**ج- دەنگدانی سیاسی:** بەشداریکردنە لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا، بەپشتیوانی و پشتگیریکردنی دارایی لە ڕێگەی پارە سەرفکردنەوە بۆ هەڵمەتەکان و یارمەتیدانی پاڵێوراوەکان یان بەشداریکردن بە دەنگدان.

**د- داواکارییە سیاسیەکان:** بریتیە لە پەیوەندیکردن بە دامودەزگا ڕەسمیەکان و پێشکەشکردنی سکاڵا و هانابۆبردنەکان و بەشداریکردن لە حیزب و کۆمەڵە خۆبەخشەکاندا.

بەشداریکردن لە گشت سیستەمە سیاسییە جیاوازەکاندا هەیە، ئەگەرچی لە سایەی سیستەمە دیموکراتیەکاندا روونتر و ڕاشکاوانەتر تەعبیر لە خۆی دەکات. مەبەست ئەو سیستەمە دیموکراتیانەیە کە ڕووبەری ئازادی و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ فراواندەکەن، دەرفەتی خۆهەڵبژاردنی ئازادانە و پێشبڕکێخوازانە دەڕەخسێنن، سەرەنجامیش بەشداریکردنێکی چالاکانەی زۆری هاووڵاتیان لە ژیانی سیاسیدا دەستەبەردەبێت. لێرەشدا بەڕادەی بەشداریکردنی زۆری بەرگریکاران، بەشداربوونی ڕاستەقینە لە بڕیارسازیدا دێتەئاراوە و ئەمەش وادەکات ئەو بڕیارانە پەیوەندیی زیاتریان بە پێداویستیە ڕاستەقینەکانی بەشداربوانەوە هەبێت و زیاتر لەلایەن ئەوانەوە قبوڵکراوبن. بەدەربڕینێکی تر، هەتا ئاستی بەشداریکردن لە زیادبووندا بێت، ئاستی ڕەوایەتی لەزیادبووندا دەبێت.

بەگشتی خاڵی سەرەکی لەم بابەتەدا ئەوەیە داخۆ گەورەترین بەشداریکردنی سیاسی دەبێتە هۆی چەسپاندنی ڕەوایەتی سیستەم، چونکە تێڕوانینی بەرامبەریش شایانی گفتوگۆیەکی فراوانە. بەپێی ڕای دووەم، بەشداریکردن دەبێتە هۆی هێنانەئارای چەندین ئاڵۆزی لە پڕۆسەی بڕیارسازیداو چەندین سەرسمدان کە دەبنە مایەی کەمکردنەوەی لێهاتوویی بڕیارەکان و هێنانەخوارەوەی ڕەوایەتی ئەوانەی بڕیارسازبوون. هەروەها خاوەنی ئەم تێروانینە پێیانوایە بەشداریکردنی زیادەڕۆیانە دەشێت بارودۆخێك بخوڵقێنێت کە ڕەزامەندبوون یان ناکۆکی بخاتەوە، ئەمەش ئەوەیە کە لە شێوەکانی تری بەشداریکردندا دەرناکەوێت، ئەگەر دەریشکەوت ئەوا ئەو بنەما و ئامرازانە مەیسەرنابن کە پڕۆسەی پێکهێنان یان تەعبیرلێکردن ئاسان دەکەن. بۆیە هەندێك دەگەنە ئەوەی بڵێن، بەشداریکردن بەڕادەی بەکردەوە کاریگەریخستنە سەر حکومەتەکان گرنگە، نەك تەنیا ڕووکردنە سندوقەکانی دەنگدان.

لەلایەکی دیکەوە، کەمینەیەکی خەڵکانی چالاك دەتوانێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بیروڕا لەگەل نوێنەرەکانی ئاڵوگۆڕبکات لە ڕێگەی نامەوە، زۆرجاریش ئەو چالاکیانە لە چوارچێوەیەکدا ڕوودەدات کە پێی دەوترێت گرووپەکانی بەرژەوەندی یان فشاری ڕێکخراو یاخود ڕێکخراوە تایبەتەکانی حیزبە سیاسیەکان.

**سێیەم: ڕادەی بەشداریکردنی سیاسی:**

ڕادەی بەشداریکردنی هاووڵاتیان لە کاری سیاسیدا بە پلەی یەکەم گرێدراوی بایەخەکانی هاووڵاتیان و کەشی سیاسیە لە ڕووی فیکری، مادی و کۆمەڵایەتیەوە کە لە کۆمەڵگەدا باون. لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا بەشداریکردن ئەرکێکی شارستانیانەی سەر شانی هاووڵاتیانەو هەتا بەشداریکردن ڕوو لە زیادبوون بێت، ئەوە نیشانەی دروستی و سەلامەتیی کەشی سیاسیە، ئەمە وێڕای ئەوەی بەشداریکردن باشترین ئامرازە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە تاکەکەسیەکان.

لە هەندێك کۆمەڵگەدا، بەرزترین ڕادەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندایە، سەرەڕای دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکان تا ڕادەیەکی زۆر لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە. هەروەها ڕادەی بەشداریکردن بەپێی خوێندن، پیشە، ڕەگەز، تەمەن، ئاین، شوێنی نیشتەجێبوون، کەسایەتی و دەوروبەری ڕۆشنبیری جیاوازە. چونکە هەتا ئاستی خوێندن بەرزبێت، بەشداریکردن زۆردەبێت. هەروەها بەشداربووانی پیاوان لە ژنان زیاترن و بەشداربوانی شارنشین زیاترن لە بەشداربووانی گوندنشین. ئەمە جگە لەوەی بەشداریکردن لەنێو ئەندامانی کۆمەڵەو ڕێکخراوە جۆربەجۆرەکاندا زیاترە.

بێگومان ئەو خەسڵەتانە جێگیرنین و ڕێسایەکی گشتیش پێکناهێنن. بۆ نموونە، پیاوێکی سەر بە چینی کرێکار دەشێت دوای خوێندنی دواناوەندی نەگاتە خوێندنی بالاْ، بەلاْم دەشێت ببێتە ئەندامی سەندیکایەکی کرێکاری. هاوشێوەی ئەوە، دەشێت ژنێکی سەر بە چینی ناوەڕاست پاش قۆناغی دواناوەندی خوێندنی تریشی تەواوکردبێت، بەلاْم نەبووبێتە ئەندامی سەندیکایەکی کرێکاری. لە هەردوو نموونەکەدا دەشێت ئەو سیمایانە ناکۆکبن، بۆیە سەختە شێوازێکی دیاریکراو پێکبێت کە بایەخ و گرنگیی ڕێژەیی هەریەکێکیان ڕوونبکاتەوە. سەرەڕای ئەوە، هەندێك بەڵگە هەن دەربارەی ئەوەی، ئەو تاکانەی دووچاری چەند فشارێکی بەهێز دەبن، زیاتر ڕوودەکەنە بەشداریکردن لە سیاسەتدا.

بەشێوەیەکی گشتی، ئاستەکانی بەشداریکردن ئەنجامی زیادبوونی خواستی کاریگەریخستنە سەر دەسەڵاتدارانی سیاسی زۆردەبێت و دوایش هەوڵی بەکارهێنانی ڕێگەی ناتەقلیدی بۆ کاریگەریخستنە سەر سیاسەتی گشتی دێتەئاراوە، بەشێوەی ئەوەی پێیدەوترێت بزووتنەوە کۆمەڵایەتیە تازەکان. ئەمانەش جۆرێکن لە گرووپەکانی فشار یان بەرژەوەندی، بەلاْم گوزارشت لە بایەخە جۆربەجۆرەکان دەکەن و بەشێوازێك کاردەکەن کە جیاوازە لەو گرووپانەی گرێدراوی گرووپەکانی فشارن، وەك کۆمەڵە و دامەزراوە ئەهلییەکان.

**چوارەم: خەسڵەتەکانی بەشداریکردنی سیاسی**

بەشداریکردنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری خاوەن کۆمەڵێك سیفەت و خەسڵەتی گرنگە، وەك:

1-بەشداریکردن ڕەفتارێکی خۆبەخشانەو چالاکییەکی ئیرادەگەرانەیە، بەوپێیەی هاووڵاتیان ئەنجامی هەستکردنیان بە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی بەرامبەر بە مەسەلەو ئامانجەکان، کۆششە خۆبەخشەکانی خۆیان پێشکەشدەکەن.

2- بەشـداریکردن ڕەفتـاریکی وەرگـیراوە نـەك ڕەوشـتیکی خۆڕسـك کـە لەگـەڵ مرۆڤدا لەدایکدەبێت یان بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە، بەڵکو پرۆسەیەکی وەرگیراوە، تاك لە ماوەی ژیـان یـان لـە ڕێگـەی کـارلێککردنی لەگەڵ تاکەکانو دامەزراوەکانی ناو کۆمەڵگەدا فێری دەبێت.

3- بەشـداریکردن ڕەفتـاریکی بـاشو واقعییە، بەواتای ئەوەی تەرجەمەدەکرێت بۆ چەندین کـاری بـەکردەوەو پراکتیکـی کـە پەیوەنـدیی تۆکمـەیان بـە ژیـانو واقعـی جەماوەرەوە هەیە، چونکە بەشداریکردن تەنیا بیرۆکەیەکی ڕووت نییە کە بە ئاسمانەوە بێتو نەێتە خوارەوە بۆ ئاستی جێبەجێکردن.

4- بەشداریکردن پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی هەمەلایەن، کاملو فرەلایەنو ڕەهەندە ئامانجی بەشدارپێکردنی هەر تاکێکی کۆمەڵگەیە لەهەر قۆنـاغیکی پەرەپێدانـدا. واتـە لـە زانـین، تێگەیشتن، پلاندان، جێبەجێکردن، بەڕێوەبردن، بەشداریکردن، هەڵسەنگاندن، پێشکەشکردنی دەستپێـشخەریو بەشـداریکردن لـە بەرهەمهێنانو قازانجەکاندا.

5- بەشـداریکردن تـەنیا لـە بوارێـك یـان چالاکیەکی فراوانی ژیانـدا قـەتیس ناکرێـت، بـەڵکو بەشـداریکردن بـواری جۆربـەجۆری ئابوری، سیاسیو کۆمەڵایەتی هەیە کە دەشێت تـاك لـە یـەکێك یـان هـەموویان لـە یـەك کاتـدا بەشداربێت.

6- بەشـداریکردنی جـەماوەری تـەنیا شـوێنێکی دیـاریکراو ناگرێتـەوەو خـۆی نابەسـتێتەوە بـە سـنورێکی جـوگرافی دیاریکراوەوە، چونکە دەشێت لەسەر ئاستی ناوچەیی، هەرێمی یان نیشتیمانی بێت.

7- بەشـداریکردن هاوکـات مـافو ئەرکـە، چونکە مـافی هـەر تـاکێکی کۆمەڵگەیـەو ئـەركو بەرپرسیارێتیەتی لە هەمان کاتدا، مافی هەر هاوولاتیەکە بەشداری بکات لە گفتوگۆی ئەو مەسـەلانەدا کـە بـە لایـەوە گـرنگن، کەسێك هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی لە پەرلەماندا نوێنەرایەتی بکـات، خـۆی کاندیـدبکات ئەگـەر توانـای سەرکردایەتیکردنی جەماوەری هەبوو و توانی لـە ئەنجومـەنی نوینەرایەتیـدا گوزارشـت لـە خواستەکانیان بکات . بەوپێیەی بەشداریکردن دۆخی ڕاستو دروستی دیموکراسیە، چونکە دیموکراسی بەبێ بەشداریکردن بوونی نابێت. هـەروەها بەشـداریکردن ئـەرکێکی سەرشـانی هـەر هاوولاتیەکـە، چـونکە پێویـستە ئـەركو بەرپرسـیارێتیە کۆمەڵایەتیـەکانی بەرامبـەر بـە مەسـەلەکانی کۆمەڵگەکـەی جێبـەجێبکات، بـۆ هێنانەدیی گۆڕانکاری پێویست ڕووەو ئاڕاستەی پەرەپێدان لە کۆمەڵگەدا.

8- بەشداریکردن هاوکات ئامانجو ئامڕازە، ئامانجـە لەبەرئـەوەی ژیـانی دیموکراتیانـەی دروسـت بەشـداریکردنی جـەماوەریی لـە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتیدا پێویستە، ئەمەش مانای گـۆڕینی ئاکـارو ڕۆشـنبیریی هاوولاتیانە ڕووەو هەستکردن بە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی، هـەروەها ئامڕازە بـۆ تواناسازکردنی جەماوەر بۆ ڕۆڵبینینی تەوەری بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵگە ڕووەو پێـشکەوتن، خۆشـگوزەرانیو بەشـداریکردن لـە خـستنەگەڕی خێراتـری ڕەوڕەوەی پەرەپێدان.

9- بەشـداریکردن بـیروڕای دەسـتەجەمعی جـەماوەر یەکـدەخات، چـونکە دەبێتـە هـۆی خەملانـدنی بیروڕایـەك ڕووەو هەسـتکردن بـە یـەکبوونی ئامـانج، چارەنووسـی هاوبـەشو

ئـارەزووی کۆشـشکردن بـۆ پـشتیوانیکردنی حکومەت و سوککردنی باری شانی.

**پێنجەم: پاڵنەرەکانی بەشداریکردن:**

تاکـەکان هەوڵــدەدەن لـە ڕوانگــەی چــەند پاڵنەرێکـەوە، کـە هەنـدێکیان پەیوەنـدیان بـە کۆمەڵگــەوە هەیــەو ئــەوانی دیکـە بـە تـاک و پێداویـستیەکانیەوە، بەشـداری بکـەن لـە بـوارو کایــە سیاســی، ئــابوریی و کۆمەڵایەتیــە جۆربەجۆرەکاندا. لێرەشدا دەتوانین باسی دوو جۆر پاڵنەر بکەین:

1-**پاڵنــەرە گــشتییەکان:** خـۆی لەمانـەدا دەبینێتەوە:

– هەستکردن بەوەی بەشداریکردن ئەرکی ســەر شــانی تــاک و دەروەســتبوونیەتی بــەو کۆمەڵگەیـــەوە کـــە تیایـــدا دەژی، بۆیـــە پێویـستدەکات جـەماوەر چـالاکانە بەشـداری بکەن لە ژیانی گشتیی کۆمەڵگەداو تەعبیر لە تێڕوانین، بیروڕاو ئارەزوەکانیـان بکـەن، ئەمـەش بڕیارســـازی، یاســـادانان و داڕشـــتنی سیاســەتەکان و بەشــداریکردن لــەو بەرنامــەو سیاســەتانەی گەرەکــە بــۆ بەپیرەوەچــوونی پێداویستییەکانی هاوولاتیان دەهێنرێنەئاراوە.

– خۆشەویـــستی کـــارکردنی گـــشتی و ئارەزووی بەشداریکردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا لـە گەشـەپێدانی کۆمەڵگـەو چاککردنی ئاستی خزمەتگوزارییـەکان تیایـدا لـەرێی کارکردنـەوە لــەو بــوارە جۆربەجۆرانــەی کــە ئامانجیــان چاککردنی ڕووی ژیانە لەسەر خاکی نیشتمان.

– ئـارەزووی گێڕانـی رۆڵێکـی تـەوەریی و کاریگەر لـە چالاکییە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگە بـە شـێوەیەك کـە کاربکەنـە سـەر ئیـستاو داهاتوویـان و هەسـتی گرنگیبـوونی ڕۆڵیـان پـێ ببەخــــشێ و ڕەنگدانـــــەوەیان لەســـــەر پشتگیریکردنی ڕەوتی پەرەپێدان هەبێت.

– ئـارەزووی بـەهێزکردنی پەیوەندییـەکانی نێـوان زوربـەی توێـژو گرووپـەکانی کۆمەڵگـە، بەمەبەسـتی هێنانـەدی جۆرێـك لـە یـەکتری تـەواوکردن و کـارلێککردنی نێـوان ئـەو توێژانـە، بەشێوەیەك کە بەرژەوەندییە گشتییەکانی ئەو توێژو گرووپانە بێنەدی.

– ئـەو قورسـاییانەی خراونەتـە سەرشـانی حکومـەت بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی پێویستە بهێنرێنەدی.

– رازیبـــوون یـــان ڕازی نـــەبوون لـــەو سیاســەتانەی بونیــان هەیــە، چــونکە هەنـدێك لێکۆڵینـەوە سـەلماندویانە کـە بەشـداریکردنی جـــەماوەر بـــە زیـــادبوونی ڕازیبـــوون لـــەو سیاســـەتانە ڕوو لـــە زیـــادبوون دەکـــات و پێچەوانەکەیـشی ڕاسـتەو ئەوانـەی بایـەخ بـە کێشە گشتییەکان دەدەن، ئەوانەن کە زیاتر لە کۆمەڵگە ڕازین.

– هۆکارەکـــــانی پـــــەروەردەکردنی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی لـە چوارچێوەی خێـزان، قوتابخانـــە، یانـــە، دامـــەزراوە ئـــاینی و خۆبەخـشەکان، پارتــەکان یــان ئامرازەکــانی پێکگەیشتن کە پەرە بە بەهای بەشداریکردن لە تاکــدا دەدات و وای لێــدەکات هاوولاتییـــەکی بەشداریخوازبێت.

– دەســتەبەربوونی زامنکارییــە یاســایی و دەســـتورییەکان کـــە ئاســـایش، ئـــارامی و کەشـوهەوای دیموکراسـی ڕاسـت و دروسـت بـۆ هاوولاتیان مسۆگەردەکەن، هەروەها سـەروەریی یاساو ئازادیی بیروڕاو دەربڕین بەشێوەیەك کە تـــەبابێت لەگـــەڵ بەرژەوەندییـــە باڵاکـــانی کۆمەڵگەدا.

- فێرکارییەکانی ئایین لە ڕێگەی قورئانو ئەحادیسەکانی پێغەمبەرەوە کە هانی هاریکاریکردن، یەکتر تەواوکردنو بەشداریکردن دەدەن...

2-**پاڵنەرە تایبەتەکان**: خۆی لەماندا دەبینێتەوە:

- هەوڵدان بۆ کاریگەریخستنە سەر سیاسەتسازیی گشتی بەشێوەیەك کە تەبابێت لەگەڵ پێداویستییە کردەییەکانو ئارەزووە تایبەتیەکانی تاکەکانی کۆمەڵگە کە بەقازانج بۆیان دەگەڕێتەوە.

- هێنانەدی شوێنگەی جیاکارە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەداو بەدەستهێنانی ناوبانگی، ڕێز و پێزانین.

- تێرکردنی پێداویستی بۆ بەشداریکردن، چونکە پێداویستییەکانی مرۆڤ دابەشدەبن بەسەر پێنج ئاستدا: پێداویستییە بنچینەییەکانی وەك خواردنو پۆشاك، پێداویستی ئاسایشو دڵنیابوون، بەشداریکردن، سۆزداریی و پێزانینو هێنانەدیی خود.

- هێنانەدیی بەرژەوەندییە کەسایەتییەکان کە بریتین لە دەسەڵاتخوازی، پایەداربوونو دەسەڵاتداریێتی، هێنانەدی بەرژەوەندیی مادديو بەرژەوەندییە کەسایەتییەکانی دیکە.

**شەشەم: دەستنیشانکەرەکانی بەشداریکردنی سیاسی:**

بەشداریکردنی تاکەکان لە ژیانی گشتیدا گرێدراوی کۆمەڵێك گۆڕانکارییە، گرنگترینیان ئەو کاریگەرییە سیاسیانەیە کە تووشیان دەبێت، خەسڵەتەکانی پێشینەی کۆمەڵایەتی، ڕادەی دابینبوونو کاریگەریی کەناڵە دامەزراوەییەکان بۆ گوزارشتکردن و کاری سیاسی، ئەمە جگە لەو دەستنیشانکەرانەی دەکرێت بەم جۆرە تاوتوێیان بکەین:

1-**هۆشکەرە سیاسیەکان**:

کاتێك مرۆڤ کاریگەرییە سیاسییەکانی دەکەوێتە سەر، ئەگەری بەشداریکردنی لە ژیانی گشتیدا زۆرتردەبێت، بەڵام کەوتنە ژێر کاریگەریی هۆشکەرە سیاسییەکان بەپێویست بەشداریکردن ناوخولقێنێ. هۆشکەرەکان لەلایەن ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەری، هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن، کۆبوونەوەو گفتوگۆ گشتییەکانەوە ئاڕاستەدەکرێن. لێرەشدا ئەگەرچی ئەوانە بۆ جەماوەرێکی فراوان دەستەبەرکراوە، بەڵام ڕادەی کەوتنە ژێر کاریگەریانەوە گرێدراوی کۆمەڵێك هۆکارە، وەك ئینتمای چینایەتی، شوێنی نیشتەجێبوونو باری خوێندن، ئەمە وێڕای مەیلە تاکەکەسیەکان. بەوپێیەی کەسی پۆزەتیڤ زیاتر پێشوازی لە هۆشکەرە سیاسییەکان دەکات، بەڵکو کۆششیان بۆ دەکات، بە پێچەوانەی کەسی نێگەتیڤەوە کە چەند بۆی بکرێت خۆی لێیان بەدووردەگرێت.

2-**گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیەکان**:

قەبارەو ڕادەی بەشداریکردنی سیاسی گرێدراوی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە جۆربەجۆرەکانە، وەك خوێندن، داهات، پیشە، ڕەگەز، تەمەنو هۆکارەکانی دیکە، چونکە داهات پەیوەندییەکی چاکی بە بەشداریکردنەوە هەیەو کەسانی خاوەن داهاتی مامناوەندی زیاتر بەشداریدەکەن لەوانەی کە داهاتێکی کەمیان هەیە، کەسانی خاوەن داهاتی بەرز زیاتر بەشداریدەکەن لەوانەی داهاتیان مامناوەندییە. هەروەها ئاستی بەشداریکردن

بـــەپێی بەرزبونـــەوەی ئاســـتی خوێنـــدن زیاددەکـات، چـونکە نەخوێنـدەواری لـە وڵاتـە گەشەسـەندوەکاندا بـە یـەکێك لـە ڕێگرییـەکانی بـەردەمی بەشـداریکردن دادەنرێت. لەبەرئـەوەی مرۆڤـی خوێنـدەوار هۆشمەنـدترو بـەئاگاترن بەرامبـەر بـە مەسـەلە سیاسـییەکان، هـەروەها هەســـتیارترن بەرامبـــەر بـــە توانـــای کاریگەریخـــستنە ســـەر بڕیارســـازیو بەشـداریکردن لــە گفتوکــۆ سیاســییەکانداو دروســتکردنی بـیروڕا سـەبارەت بـە بابـەت و مەسەلە جۆربەجۆرەکان. هەروەها ئەو کەسانەی خـاوەن پلـەکارێکی بـەرزن مـەیلی زیاتریـان بـۆ بەشداریکردن هەیە تاوەکو ئەوانەی پلەکارێکی نزمیان هەیە، ئەگەرچی جیاوازی هەیە لە نێوان کۆمەڵگەیـــەك‌و ئـــەوی دیکـــەو پیـــشەیەك‌و پیـــشەیەکی تـــر. هـــەروەها قـــەبارەو ڕادەی بەشـــداریکردنی سیاســـی دەکەوێتـــە ژێـــر کاریگـەریی ڕەگـەزەوە، چـونکە ڕەچـاودەکرێت ژنـان بـە شـێوەیەکی گـشتی کـەمتر لـە پیـاوان مەیلی بەشداریکردنیان هەیە، بەڵام گەشەکردنی ئـابووریو کۆمەڵایـەتی بەبـەردەوام کاردەکاتـە سـەر تەسـککردنەوەی ئـەو کەلێنـەی نێـوان ڕەگەزەکان تایبەت بە بەشداریکردنی سیاسی. ئەمەش مانای سەربەخۆیبوونی ژنان لە پیاوان ســـەبارەت بـــە دیـــاریکردنی هەڵوێـــستە سیاسییەکان ناگەیەنێت، چونکە هێشتا زۆرجار ژنەهاوسەر لە کاتی دەنگدانو ئینتمای حزبیدا پاشـکۆی مێردەکانیـانن. وێـڕای هۆکارەکـانی پێـــشەوە، بەشـــداریکردن دەکەوێتـــە ژێـــر کاریگـەریی هۆکـاری تەمەنـەوە، چـونکە ڕادەی بەشداریکردن بەپێی چوونە تەمەنەوە وردەوردە بەرزدەبێتـەوەو لـە چـل‌و پـەنجاکانی تەمەنـدا دەگاتـە لوتکـە، ئینجا وردەوردە پـاش تەمـەنی شەست دێتەخوارەوە. جا ئەگەر ئەو هۆکارانـە هەمیشە ڕێسایەك پێکنەهێنن بـۆ داوەریکردن، ئـــەوە لەبـــەر ئەوەیـــە کـــە گۆڕانکارییـــە کۆمەڵایەتیەکان لە تاکێکەوە بۆ ئەوی دیکەو لـە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە.

$3-$**چوارچێوەی سیاسی:**

بەشـــداریکردن گرێـــدراوی توخمـــەکانی چوارچێوەی سیاسییە کە بریتین لـە تێڕوانینی سەرۆکایەتی دەربـارەی ڕۆڵـی هـاووڵاتی‌و ڕادەی بـــوونی ئـــازادی بـــۆ ڕێکخـــستنە حیزبـــی‌و میللییـــەکان، ئەنجومـــەنی نوێنەرایـــەتیکردنی هەڵبـژێراوو سروشـتی سیـستەمی ڕاگەیانـدن. چـــونکە ئـــەو بەشـــداریکردنەی کۆمەڵگـــە خۆرئاواییـەکان هەیانـە، ڕێژەییانـە دەگەڕێتـەوە بـــۆ بـــوونی چوارچـــێوەیەکی دەســـتووری‌و دامـــەزراوەیی گونجـــاو، وەك: دەســـتوورو خۆهەڵبژاردنـەکان، فرەحیزبـی، گرووپـەکانی بەرژەوەندی، ئازادیی ڕۆژنامەگەریی، پەرلەمان‌و دامودەزگاکانی حوکمڕانی ناوچەیی...هتد. لـە دەوڵەتـە کۆمونیستەکاندا، باڵادەستیی حیـزب دەبێتـە هـۆی چالاککردنی ڕۆڵـی هاووڵاتیـان لـە سیاسـەت‌و هەڵبـژاردنی سـەرکردەکاندا، کەچـی ڕێـژەی ئەوانـەی بەشـداریی چـالاکیی سیاسـی دەکـەن دەشـێت ئـەوەی وڵاتـە خۆرئاواییـە دیموکراسییەکان تێپەڕێنێت.. بەڵام لە دەوڵەتە گەشەســـەندوەکاندا بەشـــێوەیەکی گـــشتی، قـــەیرانی بەشـــداریکردن لەئارادایـــە، ئـــەوەش ڕێژەییانە دەگەڕێتەوە بۆ شێواویو کەموکوڕیی بنیاتنـانی سیاسـی، چـونکە هەنـدێك دەوڵـەت دەستووری نییەو هەندێکی دیکەش ئەنجومـەنی نوێنەرایـــەتی نییـــە، ئەگـــەر هەشـــبن، ئـــەوا ڕواڵەتکارانەیـە. ئـەو دەوڵەتانـەش هەمـەجۆرن، هەیانە تاکحزبی پێڕەودەکات، هەیانە فرەحزبی

بەکاردەبات و هەشیانە لە بنەڕەتدا کار بە سیستەمی حیزبی ناکات. ئەو ئاستە نزمەی دامەزراوەبوونی سیاسی هاوشانی گۆڕانێکی ئابووریی کۆمەڵایەتی شکۆدارەو دەشێت ئەو کەلێنەی نێوانیان سەرچاوەی بنچینەیی بێت بۆ نائارامیی سیاسی کە زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی گەشەسەندوو پێوەی دەناڵێنن.

## حەوتەم: پێداویستییەکانی بەشداریکردنی سیاسی چالاکانە:

بەشداریکردن پێویستی بە گرنگیی دابینکردنی کۆمەڵێك هۆکار هەیە کە چالاکیی زیاددەکەن و مانەوەو بەردەوامبوونی مسۆگەردەکەن و یارمەتیدەدەن بۆ هێنانەدیی ئامانجەکانی بەشێوەیەك کە تەکان بە ئاڕاستەکانی پەرەپێدانی هەمەلایەن دەدات.

گرنگترینی ئەو پێداویستیانە:

1–پێویستیی زامنکردنی دەستەبەرکردنی پێداویستییەکان و داخوازییە بنچینەییەکانی جەماوەر، وەك خواردن، پۆشاك، خانوبەرەی شیاو، تەندروستی، خوێندن، دەرفەتی کارکردن، ئازادیی دەربڕین و پێداویستییەکانی دیکە کە تێربوونی ماددی و دەروونی مرۆڤ دێنێتەدی و بڕێك ئامادەیی بۆ بەشداریکردن لە ژیانی گشتی نێو نیشتمانەکەیدا بۆ دەڕەخسێنێت.

2–بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشمەندیی جەماوەر دەربارەی ڕەهەندەکانی هەلومەرجە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان کە کۆمەڵگە پیایدا تێدەپەڕێت. ئەو هۆشمەندییەش یان لە ڕێگەی هەوڵی تاکەکانەوەیە بۆ گەیشتن بەو برە پێویستە مەعریفەیەی بەدەستدێت، یاخود لە ڕێگەی ئامڕازە جۆربەجۆرەکانی پێکهێنانی ڕای گشتیەوە لە نێو کۆمەڵگەدا، وەك ئەو دامەزراوە حکومیانەی کاردەکەن لە بواری ڕاگەیاندن، ڕۆشنبیری و خوێندندا و دامەزراوە ناحکومیەکانی وەك سەندیکا پیشەیی و کرێکارییەکان، کۆمەڵە تایبەتیەکان، یەکێتیەکان و پارتە سیاسییەکان.

3–هەستکردن بە ئینتمابوون بۆ نیشتمان و هەستکردنی هاووڵاتیان بەوەی بەشداریکردنیان لە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوریی کۆمەڵگەدا ئەرکێکە ئەندامێتی بۆ ئەو نیشتمانە دەیسەپێنێت.

4–باوەڕبوون بە سوودبەخشی بەشداریکردن: چونکە هەستکردنی هاووڵاتیان بە گرنگی و کاریگەریی ئەو بەشداریکردنەو خێرایی بەپیرەوەچوونی لێپرسراوان، هەستی گرنگیی بەشداریکردن و قازانجی ڕاستەوخۆی بۆ چاککردنی وێنەی ژیانی خۆی و کەسانی دیکەی نێو کۆمەڵگەی تێدا قوڵدەکاتەوە.

5–ڕوونبوونی سیاسەتە گشتییە ڕاگەیەندراوەکان، ئەوەش لە ڕێگەی ڕاگەیاندنی باشی پلان و ئامانجەکان و ڕادەی گونجانی لەگەڵ پێداویستییەکانی هاووڵاتیانەوە دەستەبەردەبێت.

6–باوەڕبوون و بڕوای سەرکردایەتی سیاسی بەگرنگیی بەشداریکردنی جەماوەر لە دروستکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتە گشتیەکاندا، لە ڕێگەی ڕەخساندنی ئازادیی سیاسی و دەرفەت ڕەخساندن بۆ جەماوەر بۆ تەعبیرکردن لە خەون، داخوازییەکانیان، ڕاوبۆچوونیان دەربارەی مەسەلەکانی کۆمەڵگەکانیان و کێشەکانیان، گفتوگۆکردن لەسەر ڕاگەیاندننامەکانی لێپرسراوان و یاسا گشتییەکانی جا لەنێو پەرلەماندا بێت یان لە

ڕێــی ڕۆژنامــەو کــۆڕە گــشتییەکانەوە بێــت، لەســـایەی کەشـــوهەوای زامنکـــراوداو بـــەبێ ڕووبەڕووبوونـەوەیان بـۆ هـیچ لێپێـچینەوەیەکی یاسایی .

7-بـــوونی ئـــەو تەشـــریعاتانەی کـــە بەشداریکردن زامندەکەن و دەپارێزن و جەختی لەســـەردەکەنەوە. هـــەروەها ئـــامرازو شـــێوازە جۆربـــــەجۆرەکان بـــــۆ خـــــستنەڕوو و پێشکەشکردنی بیروڕاو تێڕوانین و پێشنیارەکان بە شـێوەیەکی تـەواو ڕوون و ئازادییـەکی تـەواو. ئەمـەش بـە دابینکردنـی ئـەو ئـامرازو شـێوازو کەرەسـتانەی یارمەتیـدەرن بـۆ گەیانـدنی ئـەو بیروڕایانـــەو زامنکـــەری گەیـــشتنی ئـــەو بەشداریکردنانەن بە بڕیارساز.

8-بـــوونی بەرنامەگـــەلی ڕاهێنەرانـــە بـــۆ ئەوانەی لە پێگەی بەرپرسیارێتیدان، جا ئەوانە لـــە حکومەتـــدا بـــن یـــان لـــە دامـــەزراوە ناحکومییـــەکانی کۆمەڵگـەدا، بـۆ ڕاهێنانیـــان لەســـەر بـــەهرەکانی گـــوێگرتن و ڕێزگرتنـــی بیروڕای جەماوەر، هـەروەها لەسەر شێوازەکانی وروژانـدنی بایەخـدانی جـەماوەرو پەرەپێـدانی تواناکانی بەشداریکردنیان.

9-بـوونی پێـشەنگی سەرڕاسـت لـە گـشت شـوێنەکانی کارکردنـدا، ئەمـەش پێویـستی بـە وردبـینی هەیـە لـە هەڵبـژاردنی سـەرکردەکانداو جـەختکردن لەســەر دانــانی کەســی شــیاو بــۆ شـــوێنی گونجـــاو. چـــونکە ئـــەو پێـــشەنگە سەرڕاستە پێویستە هاندەربێت نەك ڕوخێنەر بۆ بەشـداریکردن، هــەروەها دەبێــت بــاوەڕی بــە تواناکـان و ڕۆڵـی گـەنجان هـەبێت لـە پرۆسـەی پەرەپێداندا.

10-ناناوەندێتی لە کارگێڕیدا: بەشێوەیەك کـــە دەرفـــەتی فـــراوان لەبـــەردەم جـــەماوەردا برەخسێنێت بۆ بەشداریکردن لـە بەڕێوەبردنی کاروبارەکـانی ژیـانی خۆیـدا، دەرگـاش بـەڕووی هـەموو ئـەو کۆشش و بەشداریانەدا بکاتـەوە کـە جەماوەر پێشکەشی دەکات.

11-زیـادبوونی ڕێکخـراوە خۆبەخـشەکان و بەرزکردنـــەوەی ئاســـتی کارامـــەبوونیان هـــەتا بتـوانن زۆرتـرین ڕووبـەری شـیاو بگرێتـەوەو لـە زۆربـەی شـوێن و چالاکیەکاندا بوونیـان هـەبێت. هـەروەها ڕۆڵێکـی چالاکیان هـەبێت لـە ڕێگـەی بەخشینی دەستڕۆیشتنی زیاتر، بەشێوەیەك کە وایـان لـێ بێـت کاریگـەریی زیاتریـان هـەبێت لـە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا.

12-بـــەهێزکردنی ڕۆڵـــی دامـــەزراوەکانی پـەروەردەکردنی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی، وەك: خێـزان، قوتابخانـە، زانکـۆ، دامـەزراوە ئـایینی و حیزبیەکان و ئامرازەکـانی پێکگەیشتن و ئەوانی دیکـەو هانـدانیان بـۆ چەسـپاندنی بـەهاکانی بەشداریکردن لای جەماوەر.

13-گرنگیـــی پابەنـــدبوونی ئامرازەکـــانی پێکگەیـشتن بـە ڕاسـتگۆیی و بابـەتیبوون لـە چارەسـەرکردنی مەسـەلە، کارەسـات و کێـشە جۆربەجۆرەکانداو دەرفەت ڕەخساندن لەبەردەم گـشت تێـڕوانین، ئاڕاسـتەو بیروڕاکانـدا بـۆ گوزارشتکردن لە خۆیان، بەبێ گوێدانە ئینتمای حزبی و پیشەییەکانیان.

**هەشتەم: ناسەوارە باشەکانی بەشداریکردنی سیاسی:**

بەشـداریکردن کاریگـەریی دەبێـت لەسـەر تاکـەکان و سیاسـەتی گـشتیی دەوڵـەت. لەسـەر ئاستی تاك، بەشداریکردن هەستی شکۆمەندی، بـەهاو بایـەخی سیاسـیی تێـدا پەرەپێـدەدات و هەریەکێك لە حوکمڕان و حوکمکراو بەرامبەر بە

ئەركو بەرپرسیارێتی وریادەكاتەوە، هەروەها ئاستی هۆشمەندیی سیاسی بەرزدەكاتەوەو یارمەتیدەردەبێت بۆ خولقاندنی هاوولاتییەكی دەروەست كە بە كۆڵەكەیەكی هێزو تەندروستیی جەستەی سیاسی دادەنرێت. لەسەر ئاستی سیاسەتی گشتی، بەشداریكردن مەزنترین چاكە بۆ زۆرترین ژمارەی تاكەكان بەدەستدێنێت، چونكە وادەكات فەرمانڕەوا بەپیر داخوازییەكانی هاوولاتیانەوە بچێتو بەشداربێت لە دابەشكردنەوەی سامانەكانی كۆمەڵگەدا بەشێوەیەكی دادپەروەرانەتر، هەروەها زیادبوونی ژمارەی بەشداربوان دەبێتە هۆی دادوەریی ئابووریی و كۆمەڵایەتیی زیاتر، لە ڕێگەی سەرلەنوێ دابەشكردنەوەی داهاتو سامانەوە لەلایەن حكومەتەوە.

**نۆیەم: ڕۆڵی بەشداریكردنی سیاسی لە پەرەسەندندا:**

پەرەپێدان بەوە پێناسەدەكرێت كە یەكخستنی كۆششی گشت هاوولاتیانە لەگەڵ كۆششە حكومیەكاندا بۆ چاككردنی بارودۆخی سیاسی، كۆمەڵایەتی، سیاسی و ڕۆشنبیریی جەماوەرو گرێدانەوەیان بەبارودۆخی كۆمەڵگەكەیانو شێوەی ژیان تیایدا، هەروەها تواناسازكردنیان بۆ بەشداریكردن لە بەدیهێنانی پێشكەوتنو گەشەكردنی كۆمەڵگەكەیاندا، پەیوەندییەكی پتەوو كاریگەرییەكی دوولایەنە هەیە لەنێوان بەشداریكردنو پەرەپێداندا، چونكە پەرەپێدان دەرفەتی گەورەتر دەڕەخسێنێت بۆ فراوانكردنی بوارەكانی بەشداریكردن، هەروەها هاندان بۆ بەشداریكردن دەخولقێنێت، لەكاتێكدا بەشداریكردن ڕێگەدەدات بەوەی جەماوەر فشاربخەنە سەر بڕیارساز بۆ پێڕەویكردنی ئەو سیاسەتانەی لە بەرژەوەندی مەسەلەكانی پەرەسەندندان. هەمیشە بەشداریكردنی سیاسی گرێدراوی بوونی سیستەمێكی سیاسییە كە ئاشنایە بە پلەیەكی بەرزی بەشداریكردن لە دامەزراوە جۆربەجۆرەكاندا، چونكە ئەو كۆمەڵگەیەی دامەزراوە كۆمەڵایەتیو ئابوورییەكانی لەسەر بناغەی دەسەڵاتخوازی بەڕێوەدەبرێت ڕێگەنادات بە بەشداریكردنی تاكەكانی كۆمەڵگەكەیو هانی بەشداریكردنی سیاسیش نادات. ئەو كۆمەڵگەیەش كە دامەزراوە جۆربەجۆرە كۆمەڵایەتیو ئابوورییەكانی لەسەر بنەما دیموكراتییەكان بەڕێوەدەچێت، دەركەوتنی سیستەمی سیاسیی دیموكراتیانە بە واتا ڕاستەقینەكەی دەسەپێنێتو پشت بە فرەحزبی دەبەستێتو ئارامیی سیاسیش مسۆگەردەكات. بێگومان حكومەتەكان، بە تایبەتی لە ولاتە گەشەسەندووەكاندا، زۆرێك بەرپرسیارێتی گەورە لەسەر ئاستی نەتەوەیی دەكەوێتە ئەستۆیانو قورسایی زۆرو ئەركی زۆر گەورەی كۆمەڵگەی لەئەستۆیە، ئەمەش بۆ فراوانكردنی پلانو بەرنامەكانی پەرەپێدانی هەمەلایەن. لە بەرامبەر ئەوەش جەماوەر ناچاردەبێت هەندێك قورسایی لەكۆڵی حكومەت بكاتەوەو گشت تواناو نارەزاییەكانی خۆی بەكاربهێنێت بۆ یارمەتیدانی حكومەتو بەپێی توانا هەوڵی بەشداریكردن بدات، بێ گوێدانە هەر كۆسپێك كە لەو بارەیەوە دێتە ڕێی، چونكە لە كۆمەڵگە پێشكەوتووەكاندا خوێنی زۆر لەپێناوی دیموكراسیدا ڕژاوەو بە بڕیارێكی سەرووتر نەسەپێنراو ئازادی ڕۆژێك لە ڕۆژان نەبەخشراوە. بۆ ئەوەی كۆششەكانی

پەرەپێدانیش بەرهەمبدەن، پێویستە گوزارشت لە بایەخدانەکان و مەسەلەکان و پێداویستیە کردەییەکانی جەماوەر بکات. چونکە جەماوەر ئامانجی پەرەپێدانەو ئامرازی جێبەجێکردنی بەرنامەکانین و بێ بەشداریکردنیان حکومەت ناتوانێت بیرۆکەی پەرەپێدان بخاتەڕوو یان هەوڵی جێبەجێکردنی بدات. بەوپێیەی مرۆڤ پلانڕێژە بۆ پەرەپێدان و ئامانج و جێبەجێکەری بەرنامەکانێتی. لێرەوە درککردنی مرۆڤ بە پێداویستیە کردەییەکان و هۆشمەندیی بەرامبەر بە مەسەلەکانی کۆمەڵگەکەی و خواستی گۆڕینی بارودۆخی ئاستەنگ بۆ پەرەپێدان هانیدەدات بۆ باوەڕبوون بە سوودبەخشیی پەرەپێدان و خستنەگەڕی تواناکان بۆ سەرکەوتنی ئامانج و پلانەکانی. هەروەها بەدواداچوونی جەماوەر بۆ بڕیارەکان و پرۆژە حکومییەکان و دروستکردنی ڕای گشتی لەو بارەیەوە، بە مەبەستی ئاشکراکردنی لایەنەکانی کەموکورییەکان تیایدا، بەشداردەبێت لە ڕاستکردنەوەی سیاسەتەکانداو ئەوپەڕی سوود مسۆگەردەکات بۆی، لەبەر ڕۆشنایی ئەو توانایانەی لەبەردەستدان.

**سەرچاوە:**

السياسة موسوعة الشباب، سايدی مرکز الدراسات السياسية و الاستراتيجية.

فایلی ژمارە

# سینەما



- سینەما چییە؟
- شارستانیەتی وێنە لە ئیمپریشینیزمەوە بۆ سینەما
- سینەما، زمانی هاوبەشی جیهانی هاوچەرخە
- پییرپاولۆ پازۆلینی لە ژێر ئاڵای رامبۆدا
- پەیوەندی وێنە و دەنگ
- هۆلیود و جیهان
- سینەما پانتایی، زەمەن، وێنەی مۆنتاژکراو
- زاراوە هونەرییەکان
- رەوتی مێژوویی موزیکی فیلم
- یەڵماز گوینای دیدارێك لە زیندان
- فیلم و فەلسفە
- ئێمەی ترساو لە هەموو شت
- لە هونەری ئەکتەرەوە لەلای ستانسلافسکی بەرەو پێرفۆرمانکار لەلای کرۆتۆفسکی
- ئەو دە فیلمەی لەیادەوەری ئۆسکاردا بەنەمری ماونەتەوە

# سینەما چییە؟

مێهناز نەزەری

لە فارسییەوە: ئاریا ئەحمەدی

سینەما لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە بە مانای جوڵە، بەڵام لە زاراوەدا، سینەما بەمانای تەکنۆلۆژیاو هونەرێك دێت، کە بەهاوکاری زنجیرەیەك وێنەی لە حاڵی جووڵە و هەژاندا، پەیامێك بە لایەنی بەرامبەر واتە بینەر دەگەیەنێت.

سینەما دوایین هونەر یاخود بە دەربڕینێکی دیکە، حەوتەمین هونەرە. ئەو شەش هونەرەکەی دیکەش بریتین لە:

شانۆ، نیگارکێشی، پەیکەرسازی، بیناسازی، مۆسیقاو سەما. لەم نێوەشدا، سینەما تەنها هونەرێکە، کە نەك تەنها شەش هونەرەکەی دیکەی لە خزمەت گرتووە، بەڵکو بە شێوازێکیش توانیویێتی ئەو شەش هونەرەش سەر بخات. سینەما هەروەها پیشەو هونەرو تەکنیکیشی لە خزمەتدا گرتووەو لە دەقی خۆیدا جێی کردۆتەوە.

**بایەخی سینەما:**

هێشتا سینەما خولە سەرەتاییەکانی خۆی دەپێوێ، کە لینین (یەکێك لەدامەزرێنەران و سەرکردەکانی سیستەمی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەتی جاران) دەربارەی سینەماوە ڕایگەیاند:

"ئەگەر سینەما لەگەڵ ئێمەدا بێت و هەموو لەشکری دنیاش دژمان بن، ئەوا دواجار ئێمە سەردەکەوین".

هەر ئەم رستەیە کە لەزاری سیاسەتمەدارێك گوازراوەتەوە، بە باشی پیشاندەری بایەخ و دەسەڵاتی سینەمایە. سینەما ئامێرێکی باشە بۆ پروپاگەندە و خستنەڕووی ڕوانگەکان و هزرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت هزرە ئابووریەکان. هەر لەم ڕووەوەیە، کە هەندێك جار سینەما لایەنی بەرامبەری واتە بینەر بەرەو چەواشەکردن دەبات و لە بازنەی پڕوپاگەندەی بەرفراونیدا دیلی دەکات.

بەڵام سەرباری ئەمەش، سینەما خزمەتێکی زۆرو شیاوی بە زانستە جیاجیاکان کردووە، هەر لە زانستی پزیشکی و ئەلەکترۆنیکی و جوغرافیاوە بگرە، هەتا دەگاتە زانستی فیزیاو کیمیاو مێژوو. سینەما ئەو ئامێرە بیستراوو دیتراوە سەرنجڕاکێشە،گەورەترین کاریگەری هەیە لە دروستکردنی خەون و خەیاڵ و، خولقاندنی کەسایەتی خۆشویستراو یان کەسایەتی سۆزبزوێن یاخود کەسایەتی ڕقهەستێندا. دواجار، سینەما گەورەترین کاریگەریی لە خولقاندنی هەستی قوڵی مرۆڤدا هەیە لە عەشق و سۆزەوە بگرە تا دەگاتە ڕق و ترس.



ئیدی سینەما ئامرازێکی سانا بۆ سەرگەرمی و سەرقاڵکردن نییە. سینەما هەنگاوی زۆر زیاتری بۆ پێشەوە هەڵگرتووەو ئەزموون پیشانی داوە، کە ڕەچاونەکردنی سینەما لە لایەن بینەرانی ئاسایی یاخود، سیاسەتداڕێژەرانی کۆمەڵایەتی و کولتوری و سیاسیەکانی کۆمەڵگا جیاجیاکاندا، کارێکی ناعەقڵانییە.

**کەش (فەزا)ی سینەمایی:**

کەشی سینەمایی هەمان کەش و بازنەیە، کە لە فیلمدا دەخولقێت و پەیوەندی بە دنیای دیتراو یان (جیهانی عەینی)یەوە نییە. دەتوانرێت کەشی سینەمایی بەم شێوازانەی خوارەوە لە کەشی راستەقینە جیابکرێتەوە:

1) کەشی سینەمایی، دوو ڕەهەندییەو وێنەگەلێك دەخولقێنێت کە (دەتوانین لە ڕووی زاراوەییەوە بڵێین) قوڵایی و ناخیان نییە. ئەم کەشە، کاریگەری لەسەر تێگەیشتنی ئێمە لە قەبارەکان و بەشەکان و پەیوەندی شتەکان پێکەوە دادەنێت. هەر بەم هۆیەشەوەیە، کە فیلم سازەکان لە تێکەڵبەندی چوارچێوە، بەکارهێنانی زوومە تایبەتەکان، تۆمارکردن و جوڵەی کامێراگەلێکی جۆراوجۆردا کەڵکوەردەگرن، بۆ ئەوەی بە چەشنێك ئەم ئاڵۆزیانە قەرەبوبکەنەوەو، کەشێکی هاوچەشنی، کەشی راستەقینەو جێی پەسەندی بینەر پێکبهێنن.

2) تۆمارکردنی دیمەنەکان لەگۆشە جیاوازەکاندا، دەتوانێت کەشێکی نویٚ و تاکانە بخولقێنێت و ئەزموونێکی نوێش بێت بۆ بینەر.

3) کەشی راستەقینەو دیتراو، بۆ ئێمە بەردەوامەو هیچ جۆرە پچڕان و لێبوونەوەیەکی تیادا نییە. بەڵام ڕێکخستن و تۆمارکردن دەتوانێت لە کەشێکی سینەماییدا، بەرەو پێش‌و پاشەوەمان ببات. ئێمە دەتوانین لەم کەشەداو بیٚ هیچ جۆرە جوڵەیەك، دیمەنێك لە گۆشەو مەودا جۆراوجۆرەکاندا ببینین. تۆمارکردنێکی وەها، دیمەنی کەشەکە (پرێسپکتیڤ *prespective* هونەری وێناکردنی شتەکان و دیمەنەکان) لەناودەبات یاخود هەڵیدەگەڕێنێتەوە.

4) لە سینەمادا، دەتوانرێت بە دیکۆرگەلێگی جۆراوجۆرو کەڵکوەرگرتن لە داڕشتنی دیمەنگەلێکی ئاڵۆزوو ئەمڕۆیانەدا، لە

ڕێــی گرافیکگــەلی کۆمپیوتــەری، کەشــێکی سەیروســـەمەرە بخولقێنرێـــت و بـــەجۆرێك سەرنجی بینەر ڕابکێشێت، کە کۆی شتەکان بە سروشتی و پەسەندکراو بۆی دەرکەون. ئەمە لەکاتێکـدا، کــە بینــەر هــەرگیز ئــەزموونێکی وەهــای لــە دنیــای راســتەقینەدا نــەبووەو وێدەچێت هەرگیزیش نەیبێت.

**کاتی سینەمایی:**

بەدوایەکــداهاتنی کــات و ڕووداوگــەلێکی مێژوویی لـە فیلمـدا، پەیوەنـدی بە تێپەربوونی کـات لـە دنیـای ڕاسـتەقینەدا نییـە. لەکاتێکـدا بینەر لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا، لەگەڵ ڕەوتێکـی بێبەزەییانـــەی چـــرکەکان و کاتـــژمێرەکان و ڕۆژەکانــدا ســەروکاری هەیــە، ســینەما ئــەم توانایـەی تێدایـە کـە بـەم شـێوازانەی خـوارەوە، ئـەو ڕەوتـە لۆژیکیـە بـشێوێنێت یـان تەنانـەت ڕەوتێکی زەمەنی نوێ بخولقێنێت:

1) هاوکــــــات پیــــــشاندانی ڕووداوە جۆراوجۆرەکــان کــە لــە کــات و ســـەردەمە جیاجیاکاندا ڕوویانداوە، بە چەشنێك کە لەیەك کاتدا بەرچاو بکەون.

2) ســـڕینەوەی کاتـــە ناگرنگـــەکان لـــە دیمەنـەکان و سکانسەکاندا (بەشـەکانی فیلمێك کـە پەیوەنـدی بـە دیمەنێکـەوە هـەبێت). لـەم کاتـەدا هـیچ ڕووداوێك کە بە کەڵکی سینەماوە بێت، ڕوونادات. بۆ نمونە لە دیمەنێکدا، ئێمە دەسپێکی وەگەڕکەوتنی ئۆتۆمبیلێك بۆ گەیشتن بــە شــوێنی مەبەســت دەبیــنین. لــە دیمــەنی دواتـردا، بە بێئـەوەی چاومان بە وەگەڕکـەوتنی ئۆتۆمبیلەکـە لـە ئاراسـتەی خۆیـدا بکـەوێت، ئۆتۆمبیلەکە لە شوێنی مەبەست و دیاریکراوی خۆیدا دەبینین.

3) بەپێــچەوانەی ئــەوەی لەمــەڕ خــاڵی ســەرەوە (خــاڵی 2) باسمــانکرد، هەنــدێکجار کاتی ڕاستەقینە بەرفراوان و زۆر دەکرێت. ئەم کـارە، لەسـەر دیمەنـە گـرنگ و هەسـتیارەکاندا ئــەنجام دەدرێــت. بــۆ ئــەم مەبەســـتەش، دیمەنگــەلێك کــە لــە چــەند گۆشــەو مــەودای جۆراوجۆردا لە تاکە ڕووداوێکەوە وەرگیراوە، لە تەنیشت یەکەوە پیشان دەدرێن و بەم شێوەیە، کاتی ڕاستەقینەی ڕووداوەکە زیاد دەکەن.

4) فروانکــردن یــاخود کورتکردنـــەوەی هەست و تێگەیـشتنی (کـات)ی بینـەر، لـە ڕێـی پچڕانی خێراو بزووتنی کامێرادا.

5) پێشڤەچوون یاخود گەڕانـەوە لەکاتـدا، ئەویش لە ڕێی فلاش باك (***back flash***) یاخود فلاش فۆروارد(***forward flash***)دا.

6) تێکــەڵکردنی دیمــەنی دوو ڕووداوی جۆراوجـۆر لـە دوو کـاتی جیـاوازدا، بـۆ ئـەوەی هەست و تێگەیشتنی ناکۆك بخولقێنێت.

دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکـەین، کە گشت ئەم یاسـایانە بـە شـێوازی ناخودئاگـا، بەدرێـژایی مێــژووی ســینەما لــە مێــشکی بینــەردا جێــی گرتــووەو بــە چەشــنێك، ســینەما بینــەری بــۆ پێکهێنـــانی پەیوەنـــدی لەگـــەڵ خۆیـــدا ڕێکخستووەو فێری کردووە. لەکاتێکدا یەکەمین بینـــەرانی ســـینەما، توانـــای تێگەیـــشتنی بچووکترین ئاڵۆزی کات و شوێنی فیلمەکانیان نـەبووە، بینـەری ئـەمڕۆ، توانـای تێگەیـشتن و قبـــوڵکردنی ئـــاڵۆزترین ڕیکخـــستنەکانی سینەمایی هەیە.

**سەرچاوە:**

دانشنامەی رشد

# شارستانیەتی وێنە لە ئیمپریشینیزمەوە بۆ سینەما

د. شاهۆ سەعید

هەمیشە لەنێوان وێنەو كلێشە، خەیاڵو گوزارشت، یاخیبوونی هونەریو پابەندبوونی رەخنەییدا..، دانوستانو لێكگەیشتنی كاتیو ململانێو ناكۆكیی بەردەوام هەبووە. هۆی بەردەوامبوونی ئەو ململانێو ناكۆكییە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئاماژەی هونەری، كە هەمیشە ئەداتیو ناراستەوخۆیە، پێویستی بەنێوەندیی بینراو، یان وتراو، یان نوسراو هەیە بە مەبەستی بەرجەستەكردنی واتای وێنەییو چێژی ئیستاتیكی لە زەینی مرۆییدا.

مرۆڤ، بەحوكمی پێوەرە رەخنەییو ئیستاتیكیەكان، بەئەندازەیەك هۆگری ئاماژە هونەریو ئەدەبیەكان بووە، ئەوەی لەبیرچۆتەوە كە ئەو ئاماژانە، لە بنەڕەتدا غایەت نەبوون، بەڵكو ئامرازگەلێك بوون بۆ بەرجەستەكردنی چێژی ئیستاتیكی. هەربۆیە هونەرمەندە ئیمپریشنیستەكان، لە سەرەتای دەركەوتنیانەوە، هەوڵیاندا لە تابلۆكانیاندا لەو چێژە ئیستاتیكییەوە دەست پێبكەن كە لە زەینی بینەردا دروستدەبێ، تەنانەت گەر لەسەر حسابی فۆرمو پێوەرە رەخنەییەكانیش بێ. پاشان، هاوزەمان لەگەڵ پێشكەوتنە گەورەكانی بواری دەرهێنانو تەكنەلۆجیای سینەماییدا، ئاسۆی دەربازبوون لەو كێشەیە لە هەموو كات زیاتر بەرەو كرانەوە كشا، چونكە سینەما هونەرێكە جگە لەوەی توانای بەرجەستەكردنی خەیاڵو دنیابینیە زۆر تایبەتەكانی هەیە، توانیویشیەتی درزێك بخاتە نێو ئەو جیاكارییە كۆنكرێتییەی كە لە نێوان ژانرە هونەریو ئەدەبیەكاندا هەیەو دیاردەیەكی ئیستاتیكیی فرە ژانرە دروست بكا، كە لەناویدا هونەرە بیستراوو بینراوو نوسراوەكان، هەموویان پێكەوە، پێویستیان بەیەكترەو هیچ كامیان بێ ئەوی تر توانای بەرهەمهێنانی جوانیی فرە ڕەهەندی نیە.

جوانی، وەك بارگەیەكی هێمائامێزی مرۆیی، بەئەندازەیەك هەستیارە كە زۆرجار بەرگەی دابەشبوون و كۆت و پێودانگە رەخنەیی و ئیستاتیكیەكان ناگرێ، بەڵام هەر دەبوو لەگەڵ یەكەمین ئەفراندن و یەكەمین دەركەوتنی سادەی هونەردا، یەكەمین سنوری نێوان ژانرە هونەریەكان و سەرەتاییترین ئیلمێنتی دەسەڵاتی رەخنەیی لەدایك ببێ. دەبوو، بۆ نمونە، نیگار وەك هونەرێكی رووتەختی سەر تابلۆ..، لە پەیكەر، وەك هونەرێكی بەرجەستەی نێو بۆشایی، جیاببێتەوە. دەبوو حیكایەت، وەك هونەرێكی گێڕدراوە كە لە تەونی وشەو زمان پێكدێ..، لە موزیك، وەك هونەرێكی ژەندراو كە ئیلمێنتەكانی نۆتەو ریتمن، جیابكرێتەوە. واتە هەرچەندە مرۆڤ بۆ پەیبردن بە جوانی بوونەوەرێكی ئەفرێنەرە، بەڵام لە هەمان كاتدا بوونەوەرێكی پەرتكەری دەسەڵاتگەرە، كە هەمیشە خوازیاری دابەشكردن و كلێشەبەندی و دروستكردنی سنورو چوارچێوەیە.

تۆ بڵێی رۆژێك لە رۆژان جوانی بچێتەوە دۆخی رەهای خۆی، كە مرۆڤ وەك ئەزموونێكی فینۆمینۆلۆجی، بێ هیچ نێوەند و كلێشەو پێودانگێكی رەخنەیی، پراكتیزەی بكا؟ تۆ بڵێی رۆژێك دابێ پێشبینیەكەی "هیگڵ" بێتەدی، كاتێ زەنگی مەرگی هونەرو ئاوابوونی ژانرە تەقلیدییەكانی لێداو پێیوابوو هونەر بە چەند قۆناغێكی كرانەوەی مەزندا تێدەپەڕێ، تا لەگەڵ رۆحی رەهادا یەكدێتەوە؟ لە راڤەكردنی ئەو پێشبینییەدا هەندێ لێكۆڵیار دۆخی میدیالۆجیی جاڵجاڵۆك–ئاسای رۆژگاری ئەمڕۆمان، كە سەراپای ئاسمان و زەمینی مرۆیی تەنیوە، بە دیمەنێكی سەرەتایی دەركەوتنی ئەو رۆحە رەهایە دەبینن؟ بەڵام "جیانی فاتیمۆ" دەربارەی ئەو نزیككارییە پێی وایە ئەوەی ئەمڕۆ لە بواری راگەیاندندا بەدیدەكرێ دیمەنە راستەقینەكەی رۆحی رەها نیە، بەڵكو دیمەنە كاریكاتێریەكەیەتی، چونكە ئەوەی مرۆڤی سەرسامكردووە تەكنەلۆجیای بەرهەمهێنانی گوتارە نەك خودی گوتار[1]. هەمان ئایرۆنی بۆ سینەماش دەستدەدا، چونكە لەپشت كۆمپانیا و ستۆدیۆ گەورەكانی بەرهەمهێنانی فیلمەوە لۆجیكی بازاڕو بەكاڵاكردنی چێژی گشتی بە پلەی یەكەم ئامادەیە، نەك ئەنگێزەی جوانییەك، كە وەك هیگڵ خەونی پێوەدەبینی، رۆحی مرۆیی لە دۆخی رەهابوونیدا بەرهەمی بێنێ. بەڵام ئایا ئەم ئەڵقەیەی بەرجەستەبوونی جوانی، لە دیمەنە جیهانیە بەرفراوانەكەیدا، ئەڵقەی گەورەترو رەهاتری بەدوادادێ؟

مرۆڤی سەردەم گرفتاری دەستی دوو كێشەی هونەرییە: لە لایەكەوە خوازیارە درێژە بەو كەلەپورە هونەرییە مۆدێرنە بدا كە دابەشكراوە بەسەر ژانرو پسپۆڕییە جیاوازدا، بەڵام ئەوەش پێویستی بە حەوسەڵەیەكی زۆرو، رۆژوگرتنێكی بەردەوامە، بۆ پارێزكردن لە فریوی چێژە سادەكان. لە لایەكی تریشەوە خوازیاری یەكخستنی دیمەنە پەرتەكانی جوانییە، وەك لە میدیای بینراو (مەرئی)دا بەرجەستە دەبێ، بەڵام ئەوەش داخوازییەكی میللییە بەپلەی یەكەم و زیاتر مرۆڤ دەكاتە بوونەوەرێكی بەرخۆرو سەرفكەری بەرهەمە هونەریەكان لەپاڵ كاڵا مادییەكاندا.

لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا فیلم و بەرنامەی تەلەفزیۆنی، بە هەموو جۆرە بەرزو نزمەكانیەوە، خەریكە جێگای گێڕانەوەی

تەقلیـدیی دەگرێتــەوە، کــە پێــشتر ئــەدەب و ڕۆژنامــەوانی چــاپکراو، یــان وەك "مارشــاڵ ماکلۆهــان" ووتــی، مــۆدێرنیزمی گــۆتێنبێرگ گوزارشــتی لێـدەکرد[2]. ئێــستا تیــشکەوێنەو زانیارییــە ئەلیکترۆنیــەکان، وەك یــەکێك لــە نوسـەران دەڵـێ، "تـەنها بەشـێك نییـە لـە ژیـانی نوێ، بەڵکو خودی ژیانی نوێیە"[3]. هەرچەندە زۆر کـەس ئـەم دۆخـە، لـەڕووی ڕەخنەییـەوە، بـە درێژبوونـەوەی جوانناسـی مۆدێرن دەبیـنن، کـە تــــازەیی و لادان لــــە پێـــوەرە هونەرییـــــە پێشوەختەکانی کردبووە پێـوەری سـەرەکی هـەر داهێنـانێکی هونـەری. بـەڵام هــەرگیز تیـۆرەی ڕەخنــــەیی مــــۆدێرن پێــــشبینی ئــــەوەی نەکردبوو تەکنەلۆجیای بەرهــــــــــەمهێنانی تیــــشکەوێنە بگاتــــە ئاســــتێك توانــــای بزوانــــدنی چــــێژو جێگرتنـەوەی بەشـێکی زۆری ژانرەکـانی تـری هــەبێ، بــێ ئــەوەی پێویستی بـە زەمینـەی ڕەخنەیی و ئیستاتیکی پێشوەخت هەبێ.

هەنـدێك لـە بیریـاران ئـەم دۆخـە بـە قـەیرانی مۆدێرنیزم لـە قەڵـەم دەدەن، کە تیایدا وێنـەکان هێنــدە بــەخێرایی تێدەپــەڕن، کــەس توانــای ڕاگرتنیانی نیە تا لێیان وردبێتەوە و تەفسیریان بکـا. هەنـدێکیش بـە سـەرەتای قۆنـاغی پـاش مـۆدێرنیزم لــە قەڵــەمی دەدەن، کــە ســەردەمی هاتنەقـسەی وێنەیـە، بـەجۆرێك ئیـستاتیکای مۆدێرن لە پێگە ترانسندنتاڵەکەیەوە پێشبینی نەکردووە و حسابی بۆ نەکردووە. لێرەوە "هانز جۆرج گادامێر" ڕەخنـە لـە جوانناسیی مـۆدێرن دەگــرێ بــەوەی جوانناســییەکی ئەبــستراکت و پەرتکەرە، چ لەسەر ئاستی ژانرەکان کە سنوری کـۆنکرێتی خـستۆتە نێـوان شـیعرو موزیـك و چــیرۆك و هتــد..، چ لەســـەر ئاســـتی غــروری داهێنــەرەکان، کــە دوور لــە ڕۆحــی تــیم، زۆر خۆپەرست و نێرسیسیانە لە هـەوڵی سـەلماندنی شوناســی زۆر شەخــسیی خۆیانــدا بــوون[4].

"گادامێر" پێیوایـە لـە بـواری هونـەری بینـراودا جوانناسـی مـۆدێرن بەشـێوازێکی ئەنـدازەیی لـە وێنەو فیگەرەکانی ڕوانیوە، بەجۆرێك ڕوانگـەی ڕاســـتەهێڵی کردۆتـــە تاقـە پێـوەری هونـەری وێنەکێـــــشان و وەك بەرهـــەمێکی مـــەزنی پێشکەوتنی هونـەری و زانـــستی ئـــەژماری کــردووە. بــەڵام بــەڕای وی ڕوانگــــــــــەی تەکنـــەلۆجی تـــەنها دەلاقەیەکی زۆر بچووك دەخاتـە سەرپـشت بـۆ پەیبردن بە جوانیەکان، لە کاتێکدا بەهرەی بینین و وێناکردن لە مرۆڤدا توانای ڕۆشنکردنەوەی زۆر ناوچەی نەبینراو و نـــەدۆزراوەی تـــری هەیــــە، کــــە تیـــشکۆی ئەندازەیی و ڕاستەهێڵی پەی پێنابا[5].



"مــــارتن هایدیگــــەر"، لـــە دیـــدێکی فینۆمینۆلــۆجیی بوونگەرییـــەوە، بـــاس لـــە نیگـەرانیی مرۆڤـی مـۆدێرن دەکـا کـە توانـای کۆکردنەوە و پێکەوەگرێدانی وێنـەکانی نـەماوە، چـونکە (بـوون Being)ی دابەشـکردووە بەسـەر

چەندین لقەبوونی بچووکدا. مرۆڤ، هەرچەندە لە بنەڕەتدا (نزیکترین) بوونەوەر بووە لە بوونەوە، "بەڵام لە چەرخی ئێستادا بووەتە (دوورترین). مرۆڤی مۆدێرن پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ (بوون)دا، بە هەموو دەوڵەمەندیو ناوچە پاکیزەکانیەوە، لەدەستداوە. جۆرێکی تر لە پەیوەندیی لەگەڵ بوونەوەرە هەندەکی (جزئی)یەکاندا دامەزراندووە. مرۆڤ بووەتە بوونەوەرێکی بێ ڕەگ، نامۆ بەخۆیو جیهان، بەناو بۆشاییەکی نیهلیستیدا جووڵەدەکا"[6].

بەڵام تەنانەت هایدیگەریش بەردەوامی بەهەمان ئەو دۆخی پەرتبوونەی جوانی دەدا کاتێ پێشنیازدەکا لەڕێگەی شیعرەوە سەرلەنوێ بوون بدۆزرێتەوە، چونکە بەڕای وی کاتێك مرۆڤ دەبێتە بوونەوەرێکی شیعری، ئیتر پەیوەندییە ساختەکانی لەگەڵ بوونی بەشەکیدا بۆ ئاشکرادەبێ، لە نیگەرانییەکی قووڵدا هەست بە حەقیقەتی دۆخی نیهلیستی ڕەهای خۆی دەکا. تەنها لەو دۆخی نیگەرانییە قووڵەشدا دەزوولەکانی کەینونەی دەوڵەمەندو پاکیزە دەبینێتەوە.

ئایا شیعر، وەك ژانرێك کە تەونی خۆی لە زمان دەچنێ، چ ڕووبەرێکی ناوچە بزرەکانی بوون لە دنیای ئاماژە وێنەییەکاندا دەبینێتەوە؟ "پۆل ریکۆر" لە وەڵامی پرسیارێکی لەمجۆرەدا، سەرباری سەرسامیی پێشوەختی بە میتۆدی هەریەك لە هایدیگەرو گادامێر، پێیوایە شوناسی شیعریی تاکە شوناسی باڵای مرۆڤ نییە، بەڵکو شوناسی حیکایەتخوانی ڕەسەنترە. مرۆڤ، لەڕێگەی ژیان خۆیەوە ژیان ناناسێ.. بەڵکو لەڕێگەی ئەو حیکایەتانەوە پەی پێدەبا کە لە هەناویدان. گوتاری شیعری، هەرچەندە گوزارشت لە ئیرادەیەکی باڵای جوانناسی مرۆڤ دەکا، بەڵام وەك گوتارێکی خودگەری باڵاخواز دەمێنێتەوە، هەرچی گوتاری حیکایەتخوانییە گوتارێکی کۆمەڵایەتیو ئاسۆییە. شیعر جوانییەکی خودگەری پەتییە لە دەرەوەی پێشمەرجە ئیستاتیکیەکانی نێوکۆ (سیاق *context*)، بەتایبەتی نێوکۆی کات. بەڵام حیکایەت جوانییەکە وابەستەی نێوکۆی کۆمەڵایەتیو مێژووییە، پێویستی بە پێشمەرجەکانی چنینو دیالۆگی نێوان مرۆڤەکانە لەناو کاتدا[7].

"والتەر بنیامین"، کە هەندێك بە پێشەنگی ئیستاتیکای وێنەیی پاش مۆدێرنیزم لەقەڵەمی دەدەن، بەپێچەوانەوە، وای دەبینێ ئەوەی مانا دەبەخشێ بە حیکایەتەکان وێنەکانە، چ ئەوانەی ڕاستەوخۆن چ ئەوانەی لە خەیاڵو یادەوەریماندا هەڵمانگرتوون، حیکایەت لەو شارستانیەتانەدا گەورەیە کە وێنە تیایاندا ئازادە، چونکە "مێژوو لە حیکایەتەکاندا هەڵناگیرێ، بەڵکو بەناو وێنەکاندا پەرشدەبێتەوە"[8]. چەندین جوانناسو ڕەخنەگری تر هەن، هەریەکەیان لە گۆشەنیگایەکی فەلسەفیو چێژێکی ئیستاتیکیی تایبەتەوە، پلەبەندییان لەنێوان هونەرەکاندا دامەزراندووە. بۆ نمونە ڕەخنەگرێکی وەك "ڕۆبێرت شۆلز" لەناو هونەرەکاندا موزیکی پێ گرنگترو باڵاترە، چونکە لە هەموویان پاکیزەترو ئەبستراکتترە، موزیك لای وی "کاملترین هونەرە، چونکە ئاماژەی ڕاستەوخۆ بۆ هیچ شتێك ناکا، هیچ شتێك ناسەلمێنێو بەرگریش لە هیچ شتێك ناکا"[9].

لە سەروبەندی ئەم ململانێیەی نێوان ژانرو دەرکەوتە جیاوازەکانی جوانیدا، کە

هەریەکەیان داهێنەرو تیۆرسازی خۆی هەیە، "ئیمبێرتۆ ئیکۆ" لە دیدێکی سیمانتیکی هیرمینیۆتیکییەوە، هەوڵدەدا ئەفسانەی سنوربەندیی نێوان هونەرەکان هەڵبوەشێنێتەوە، تەنانەت سنورە لۆجیکیو ئەقڵانیەکانیش، چونکە بەو ئەندازەیەی ئەو سنوربەندییە خزمەتی مرۆڤی کردووە، چەندین کێشەو کۆسپیشی بۆ دروستکردووە. میحنەتی مرۆڤی مۆدێرن بریتییە لە گەڕانی بەردەوامو بێهوودە بەشوێن ماناکانی جوانیو دابەشکردنو پۆلێنکردنیدا، چونکە ئەقڵانیەتی لۆجیکی لە بنەڕەتەوە هەوڵیداوە سنور لەنێوان وتەزاو مانا و پێناسەکاندا دروست بکاو، ئەنجامەکان بباتەوە سەر هۆکارەکان. بەلام رەگوڕیشەی ئەم ئەقلانیەتە لۆجیکییە، بەڕای "ئیکۆ"، بە تەنها ناچێتەوە سەر خولیا مەعریفیەکانی مرۆڤ، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە پاساوی سیاسیو ئابوریو، هەندێ جاریش پاساوی ئەفسانەیی، خۆی هەبووە[10]. مرۆڤ لەکۆنەوە شەیدای دروستکردنی سنورە، بەلام سەرەتا سنور پێداویستیەکی ئابوریی سیاسی بوو، بۆ جیاکردنەوەی موڵکومالو زەویی کشتوکاڵیو قەڵەمڕەوی دەسەلاتدارەکان. دواتر ئەم سنوربەندییە، وەك پێداویستییەکی ژیان، پاساوی مەعریفی بۆ دۆزرایەوە تا پێگەیەکی قایمی لە زەینو ئەقڵی مرۆڤدا داگیرکرد، بووە هەوێنی یاسای پێناسەو چەمکسازیو پۆلێنکاری، کە یاسایەکی لۆجیکییەو لەڕێگایەوە مرۆڤ هەوڵدەدا پێناسەی تایبەت ببەخشێتە هەموو دیاردە مادیو رەمزییەکان. ئیدی هەروەك چۆن زەویو کەرەستە مادییەکان دابەشکرانو هەرەیەکەیان خاوەنی خۆی بۆ پەیدا بوو، بەهەمان لۆجیك بەرهەمو کەرەستە رەمزییەکان، تەنانەت ئیستاتیکیەکانیش، دابەشکرانو سنوربەندی خرایە نێوان ژانرو جۆرە ئەدەبیو هونەریەکان.

ساڵی 1855، واتە سەدەو نیوێك لەمەوبەر، هەڵوێستێکی پێشانگای جیهانی لە پاریس پرسیارو گومانی لای هونەرمەندو رەخنەگرە شێوەکارەکان وروژاند سەبارەت بە چارەنوسی ژانرە هونەریەکان، بەتایبەتی هونەری شێوەکاری. لەو پێشانگەیەدا بڕیاردرا لەپاڵ تابلۆو پەیکەرو کارە هونەرییە تەقلیدیەکاندا هۆڵێکی تایبەت بۆ نمایشکردنی وێنەی فۆتۆگراف بکرێتەوە. واتە لەدایکبوونی ئەو ژانرە نوێیە ترسی لای پاسەوانانی ژانرە تەقلیدییەکان، بەتایبەتی نیگارکێشی، دروستکرد، چونکە پێدەچوو فۆتۆگراف ببێتە رکابەرێکی بەهێزی نیگاری سەر تابلۆ. ترسێك هاتەگۆڕێ کە دەشێ فۆتۆگراف کێشە بۆ سنوربەندیو پێناسەی تایبەتی ژانرەکان دروست بکا. ئەو رووداوە یەکەمین درزی خستە نێو غروری ئیستاتیکیی مرۆڤی مۆدێرنەوە، هەربۆیە رەخنەگرێکی وەك "رۆبێرت رای" بە یەکێك لە چرکە سەرەتاییەکانی چاخی پۆست مۆدێرن لە قەڵەمی دەدا[11].

هونەری فۆتۆگراف تەنها کێشەی بۆ هونەری شێوەکاری دروست نەکرد، بەڵکو کێشەی بۆ ئەو پۆلێنکردنە تەقلیدییەش دروستکرد کە لەنێوان هونەرە شوێنگرو هونەرە کاتگرەکاندا (الفنون المكانية والفنون الزمانية) هەبوو، بەو پێیەی هونەرەکانی وەك پەیکەرو نیگارو سیرامیك، بەیەك جار، شوێنێکی دیاریکراو داگیردەکەن..، بەلام هونەرەکانی وەك موزیكو حیکایەتو دراما لەناو کاتدا، سات لەدوای سات، نمایش دەکرێن. تەکنەلۆجیای فۆتۆگراف

توانی جوولە بخاتە ئەزموونی ژیانی مرۆیی و زیندوێتی زیاتر ببەخشێتە ئەو وێنانەی کە دەشێ لە شوێندا هاوشێوە بن، بەڵام لە کاتدا جیاواز بوون. سینەما لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە دەشێ لەرێگای دووبارەکردنەوەی چەند وێنەیەکی جیاوازو جێگیرەوە (لە شوێندا) رەهەندێکی زەمەنی ببەخشرێتە وێنەی بینراوو، هونەرە شوێنگرو کاتگرەکان پێکەوە کۆبکرێنەوە. لە سینەماو سەردەمی تیشکە وێنەدا چیتر وێنەی جێگیر نامێنێتەوە، چیتر دیمەنێك لە دیمەنەکان ئۆرجناڵ و ئەوانی تر لاوەکی نین، بەڵکو ئەوەی بایەخ دەبەخشێتە کۆی کارە هونەرییەکە، نە وێنەیە بەتەنها، نە موزێك و سترێسی وشەکانە، نە چنینی سیناریۆکەیە..، بەڵکو کۆنتێکستێکی پڕ جوولەی پێکهاتە جیاوازەکانە، کە هەموویان بە تەنها لاوەکین و پێکەوە جەوهەرین.

ئیمپریشنیزم *Impressionism*، وەك رێچکەیەکی هونەری و روانینێکی ئیستاتیکی دنیای نوێ، کاتێ سەریهەڵدا کە فۆتۆگراف دەیتوانی ئەزموونی ژیان، لەرووی فۆرمەوە، زیندووتر بگوازێتەوە تا هونەری نیگارکێشان. بۆیە خولیای بەرجەستەکردنی جوولە لە هونەری شێوەکاریدا خولیای هونەرمەندە ئیمپریشنیستەکان بوو کە هەولیان دەدا ئەزموونی ژیان، بەو شێوەیەی کە مرۆڤ هەستی پێدەکا دەکا، نەك بەو جۆرەی بیری لێدەکاتەوە، بگوازنەوە ناو تابلۆ. بەڵام ئەو هەوڵەی ئەوان، ئەمجارەیان، لەسەر حسابی فۆرم بوو، چونکە گەر هونەری فۆتۆگراف توانیبێتی پابەندبوونی تەواو بە فۆرمەوە بکاتە ئامرازی بەرجەستەکردنی دیمەنە بزۆکەکانی ژیان..، ئەوا ئیمپریشنیزم، بەپێچەوانەوە، هەوڵیدا لەرێگەی تێکشکاندنی فۆرمەوە جوولە ببەخشێتە هەموو دیاردەو شتەکان، تەنانەت شتە بێ گیان و وێنە بێدەنگەکانیش *still life*، بۆ نمونە کاتێك "پۆڵ سیزان" دیمەنی سەبەتەیەك سێو، لە شوێنێکی جێگیرو ئارامدا، دەکێشێ، هەوڵدەدا توخمە ریالیستەکانی ئەو دیمەنە تێك بشکێنێ و جوولە بخاتە قەوارەی شتە بێگیان و جێگیرەکانەوە. سەرباری ئەوەش بۆ یەکەمین جار سیزان هەوڵدەدا تابلۆ لە دیکتاتۆریەتی کڵێشەو پێوەرەکانی ژانری داخراو دەربازبکا، لەبەر ئەوەشی هەندێك هونەرمەند و لێکۆڵیار بە پێشەنگی پۆستـ ئیمپریشنیزم لە قەڵەمی دەدەن[12].

شێوەکارانی رێچکەی هونەری دیدەیی *Optical*، کە رێچکەیەکی پۆستـ مۆدێرنە، گەشەیاندا بە هەمان تەکنیك و دنیابینی بەو پێیەی ئەو خێرایی و جوولەیەی، کە لە چاخی ئەمڕۆماندا دنیای تەنیوە، لە ئاستێکدایە هونەرمەندان ناچاردەکا جوولە ببەخشنە هەموو ئەو هونەرانەی کە پێشتر وەك هونەری جێگیر ناسراون، لەبابەتی وێنەو گرافیك و تەنانەت تەلارسازیش، بگرە لەوەش زیاتر چیتر ئەو پۆلێنکارییە قبوڵ ناکرێ کە خراوەتە نێوان ژانرە هونەرییەکان. ڤیکتۆر ڤاساریلی *Victor Vasalrely* وەك یەکێك لە پێشەنگەکانی ئەو رێچکەیە پێیوایە دروستکردنی جوولە لە هونەری شێوەکاریدا فیکرو زەینی بینەر دەبزوێنێ، وادەکا هونەر تەنها لەسەر رووتەخت و لەناو بۆشاییدا بەبێدەنگی و وەستاوی نمایش نەکرێ، بەڵکو لەگەڵ رۆحی سەردەمی خێرایی و لەتەك بیرکردنەوەی بزۆکی مرۆڤدا بگونجێ[13].

گەر لەڕووی مێژوییەوە، تەکنەلۆجیای فۆتۆگراف زیاتر هەوڵی وێنەگرتنەوەی واقعی دابێ..، ئەوە هونەری شێوەکاری هەوڵیداوە زیاتر خۆی لە کۆپیکردنەوەی واقع لابدا، بەئەندازەیەك لەپاش ئیمپریشنیستەکانەوە چەندین رێچکەی تری وەك کوبیزم، ئێکسپریشنیزم، سوریالیزم و هونەری میتافیزیکی و ئەبستراکت هاتنەئاراوە کە سەرلەبەری پەیوەندیی نێوان هونەرو ئەزموونی باوی مرۆڤیان هەڵوەشاندەوە. هاوزەمان لە هونەری دراماشدا، لە پەرچەکردارێکی هاوشێوەدا بەڕووی سینەماو پاشانیش بەڕووی تەلەفزیۆندا، چەندین رێچکەی عەبەسی و هیچگەری و ئەزمونگەری هاتنەئاراوە. ئەو رێچکانە، بەجۆرێك لە جۆرەکان، هەستیان بەکاڵبوونەوەی پەیوەندیی نێوان هونەرە کۆنەکان و جەماوەری تەقلیدی دەکرد، بۆیە دەبوو ئەو جەماوەرە تەلاق بدەن و ببنە هونەری دەستەبژێری خەڵك (نوخبە). ئیدی وردە.. وردە.. هەموو زمانێکی ئاسایی پەیوەندیی مرۆییان لەبەین برد.. بۆ ئەوەی زیاتریش نوخبەوی بن، دەبوو زمانی هونەر ئاڵۆزترو تەمومژاویتر بکەن[14]. "میرسیا ئیلیاد" راڤەیەکی میتۆلۆجی بۆ سەرهەڵدانی ئەو رێچکە شێتانە لە هونەری مۆدێرندا پێشکەش دەکا، کە تیایاندا مرۆڤی ئەقڵانی هەموو توانایەکی تێگەیشتنی لۆجیکی لەدەست دەداو دەچێتە تەونێکی پڕ لە هێماو ئاماژەی بێمانا، دەچێتە دۆخێکی هاوشێوە بەدۆخی مرۆڤی سەرەتایی کە تووشی شۆك دەهات و چێژێکی تایبەتی وەردەگرت لەئاست سرووتە سەیرو سەمەرەکانی سەماو وێنەکێشانی سەر جەستەو مۆزیکی ئەوپەڕی پەتی، تا ئاستی بەکارهێنانی نەشاز، وێنەی بەدەر لە یاساکانی هارمۆنی و ریتمی رەنگ و هێڵ. ئەم دۆخە کۆتایی سەردەمی ئیستاتیکای مۆدێرن و سەرەتای سەردەمێکی ترە، کە هێشتا نایناسین و ناتوانین پێناسەی بکەین، سەردەمێکی رەمەکی و ناهارمۆنییە، تیایدا "هەموو فۆرمەکان دەچنەوە دۆخی هیۆلیی دژە فۆرمی.. کە پێویستی بە ئەفراندنێکی نوێ هەیە، لەبابەتی یەکەمین ئەفراندنی گەردوونی"[15].



له گەرمەی کێبڕکێی نێوان ئامێری وێنەگرتنی تەکنەلۆجی و دیدی مرۆڤی هونەرمەنددا، کە یەکەمیان فۆمەکانی واقع، وەك خۆی و بەشێوەیەکی زانستیانە، کۆپی دەکاتەوە.. دووەمیشیان کۆشش دەکا مانا رەمزی و مەجازییەکان بەرجەستە بکا، کایە ئیستاتیکیەکان زیاتر لێکترازان و دێوانەیی زۆرتریان بەخۆیانەوە بینی. بە ئەندازەیەك هونەرمەندان، تەنها بۆ ئەوەی کاری دەگمەن و ناوازە پێشکەش بکەن، دەبوو دیواری جیاکەرەوەی بەرز لەنێوان خۆیان و هونەری میللیدا هەڵبچنن، بەو پاساوەی ئەوان هەڵگری هەستیاریی تایبەت و چێژی ئیستاتیکی دەستەبژێرن. خەڵك و جەماوەریش کە لەئاست تەکنەلۆجیای فۆتۆگراف و تیشکەوێنەو جوولەی سینەماییدا توشی سەرسامییەکی ساویلکانە ببوون و باوەڕیان بەجوانیەك نەما کە

لێی تێنەگەن. ئەو ململانێیە، لە یەكێك لە دیمەنەكانیدا، لە ململانێی سەردەمی گریكی نێوان ئەفلاتۆن و سۆفیستەكان دەچوو. ئەفلاتۆن بڕوای بە دۆزینەوەی كانگا رەمزیەكانی جوانی راستەقینە هەبوو، بەلآم سۆفیستەكان بڕوایان وابوو جوانی وزەیەكی هەستەكیی ریژەییەو ختوكەی ئارەزوەكانی مرۆڤ دەدا، ئەركی هونەرمەندیش بریتییە لە سەرسامكردنی جەماوەری خەڵك لەرێگەی گەمە ریتۆریكیەكانەوە.

سینەما ئەو هونەرە بوو كە هەر لەسەرەتاوە چواندنە رەمزییەكەی ئەفلاتۆنی، كتومت، بەسەردا جێبەجێ دەبوو، بەتایبەتی سەبارەت بە جوانیی ساختە لە ئەشكەوتی تارماییەكاندا. ئەفلاتۆن دنیای هەستەكی (حسی) مرۆڤ بە ئەشكەوتێك دەچوێنێ، كە هەموو وێنەكان تیایدا خوازراوو ساختەن. لە دەرەوەی ئەشكەوتەكە ئاگرێكی پڕ بڵێسە كەوتۆتەوە كە ناو ئەشكەوتەكەی رووناك كردۆتەوە، لەسەر دیوارە بەردینەكانی چەندین شەبەنگی رەنگاوڕەنگ و بزۆك هاتوچۆ دەكەن كە بینەر واهەست دەكا شتگەلێكی پرشنگداری راستەقینەن، بەلآم لە راستیدا وێنەی وەهمین و عەكسی ئاگرە راستەقینەكەن لە دەرەوە. لە سینەماشدا هەمان دۆخ بەدیدەكرێ، مرۆڤی بینەری سینەما لە هۆڵێكی تاریكی ئەشكەوت ئاسادا چەندین وێنەی بزۆك دەبینێ، واهەست دەكا لە بەردەمییدا نمایشدەكرێن، بەلآم لە راستیدا لە پشتەوەی نمایشدەكرێن و بە گورزە تیشكیەكاندا تێدەپەڕن. ئیتر مرۆڤ لەئاست گەمەی تیشكەوێنەكان و رەنگدانەوەیان لەسەر سكرینی بەرچاویدا تووشی سەرسامییەكی ئەوتۆ دەبێ، هەستیاریی ئیستاتیكی زاتی لەدەست دەداو دەبێتە بوونەوەرێكی وەرگری پاسیڤ[16].

بەلآم فۆتۆگراف و سینەما ئەو دوو ژانرە هونەرییە ئاست نزم و میللییە دەرنەچوون كە هونەرە نەریتییەكان لێیان دەخوێندن لە پێگەیەكی ترانسندنتاڵەوە تەماشایان دەكردن، ژانرە نەریتییەكانیش، وەك رۆمان و دراما و تابلۆو سیمفۆنیا و.. هتد، رۆژ بەڕۆژ نوخبەوی ترو ئۆرستۆكراتی تر بوون، بەجۆرێك سەرەتا موژدەی ئازادكردنی سەرلەبەری مرۆڤایەتییان راگەیاند، بەلآم لەناو نوخبەكانیشدا بەدوای نوخبەی دەستەبژێرتردا دەگەڕان. هەربۆیە بەشێكی زۆری جوانناسانی پاش تازەگەری پێیانوایە پۆست مۆدێرنیزم، لە یەكێك لە دەركەوتنەكانیدا، شۆڕشی هونەری پۆپ و میللییە، شۆڕشی تەقینەوەی ئەو چێژە سادەو خۆڕسكە چەپێنراوەی ناخی مرۆڤی سەردەمە دژی لووت بەرزی و بالآخوازیی مۆدێرنیزم كە "ئیمانوێل كانت" لەرووی فەلسەفییەوە گوزراشتی لێدەكرد[17]. سەدەی بیستەم بەهەمان ئەو ئەندازەیەی سەدەی ململانێی نێوان هونەری پۆپ و هونەری ئۆرستۆكرات، وێنەی بزۆك و وێنەی جێگیر،ماركەی رەسەن و ماركەی بازرگانی، كولتوری دەستپێوەگرتن و كولتوری بەفیڕۆدان بوو.. سەدەی لێكدان و تێكەلآوكردن و ئاشتكردنەوەی ئەو كۆدژیانەش بوو، بەتایبەتی لە كۆتایی نیوەی یەكەمی ئەو سەدەیە بەدواوە كە جۆرێك لە هونەرو چێژی ئیستاتیكی سەری هەڵدا نەدەچۆوە خانەی هونەری مۆدێرنی نەریتییەوە.

هەرچەندە سەردەمی مۆدێرنیزم، بەپێوەری چەندایەتی، سەردەمی بەرهەمهێنانی ژمارەیەكی زۆری كاری هونەری و ئەدەبی بوو،

بەڵام بەپێوەری ئیستاتیکای چێژ سەردەمی دەستپێیوەگرتن و سکهەڵگوشین بوو. جوانی ئەو شتە بوو کە نەدەوترا. لە ڕۆماندا سەردەمی مارسیل بروست و جێمس جۆیس بوو کە هەمیشە ڕووبەرێکیان لەنێوان ئاماژەو واتا، گوزارشت و وێنە، جوانی و چێژدا، دەهێشتەوە. لای شاعیرو نیگارکێشە مۆدێرنیستەکان جوانی هەڵگری مانایەکی پەنهان و هەڵگیردراو بوو کە نەدەبوو بدرکێندرێ، دەبوو هەمیشە سنورێك لەنێوان جوانی و جەماوەرەکەیدا بمێنێتەوە. "کلیمنت گرینبرگ" *Clement Greenbrg* لە نوسینێکدا راشکاوانە داخی دڵی خۆی دژی پێوەرە ئیستاتیکیەکانی مۆدێرنیزم دەردەبڕێ و دەڵێ: "وایان فێرکردووین کە بەرهەمهێنانی هونەر کارێکی گران و زەحمەتە، بەڵام کێشەی راستەقینە لەوەدایە چێژ وەرگرتنیش لەو هونەرە، لەسایەی مۆدێرنیزمدا، کارێکی سەختترە لە بەرهەمهێنانەکەی. مرۆڤ خوازیاری ئەوە بوو ئەو چێژو خۆشییەی پێبگا کە باشترین کاری هونەری مۆدێرن دەیبەخشێ، بەڵام ئەو کارانە هەمیشە لەئاست ناخ و دەروونی مرۆڤەکاندا سەرچاوەی ئاڵۆزی بوون. هونەری مۆدێرن هەمیشە دوژمنی پێوەرەکانی جوانسازی بووەو هەرواش دەمێنێتەوە"[18].

وەرچەرخانی ئیستاتیکای پۆست مۆدێرنیزم وەرچەرخانێکە لە هونەری ئەبستراکتەوە بۆ هونەری پۆپ، لە رۆمانە ئاڵۆزەکانی ئەدیبی فەرەنسی "ئالان رۆب گریێ" وە بۆ چیرۆکە چێژبەخشەکانی ئەدیبی ئەرجەنتینی "لویس بۆرخیس". واتە گەڕانەوە بۆ ئەو شتانەی کە قوتدانیان ئاسانە، یان گەر قسەیەك لە فرۆید قەرزبکەین دەڵێین: هونەری پۆست مۆدێرن گەڕانەوەیە بۆ دیوە چەپێنراوەکەی مۆدێرنیزم، گەڕانەوە بۆ کولتوری جەماوەری و زەوق بزواندن لەڕێگای خەیاڵ و ئەفسانە، فیلمی کارتۆن، چیرۆکی پۆلیسی، رۆمانی زانستی، بەختگرتنەوە و پێشبینیی بورجەکان، گۆرانی و ئاوازی خێراو ئامادەکردنی کاری هونەری بە رۆحیەتێکی منداڵانە لە قوتوو شتە فڕێدراوەکان. مۆدێرنیزم بڕوای بە سەرکوتکردنی چێژە سادەکانی مرۆڤ هەبوو، خەڵکانێکی زۆر درۆیان لەگەڵ خۆیان دەکرد و زۆریان لەخۆیان دەکرد کە خاوەن هەستیاریی ئیستاتیکیی بەرزن و چێژ لە جوانییە سادەکان وەرناگرن، نەبادا تۆمەتی میللی بوون و نەخوێندەواریان بدرێتەپاڵ. بەڵام پۆست مۆدێرنیزم چرکەساتی ئاشتبوونەوەیە لەگەڵ هونەری پۆپ و سەمای وەحشیی خێڵە سەرەتاییەکان و یاخیبوون لە قەیدو مەرجەکانی نوخبەی مۆدێرنیست و نزیککەوتنەوە لەکانگای لەزەت و تێکشکاندنی یاساغە کولتوریەکان.

یاسا و پێوەرە ئیستاتیکیەکانی مۆدێرنیزم تەنها یاسای ئەقڵی و لۆجیکی نەبوون لەناو فیکری مرۆڤدا، بەڵکو تەرجەمەکران بۆ وێنەی ئەقلانی و قەبارەی ئەندازەیی لە هەموو وڵاتە پیشەسازییەکاندا، بەجۆرێك خەریك بوو هەموو شارەکان شوناسی مێژوویی و کولتوریی خۆیان لەدەستدەداو دیزاینی ڕێگاوبان و تەلارو بیناکان لەسەر یەك کۆپیدەکرانەوە. ساڵی 1977 "چارلس جێنکس" بەتەوسەوە وتی: "مۆدێرنیزم سەعات 3:32ی پاشنیوەڕۆی 15 یۆلیۆی 1972 کۆتایی پێهات"..، ئەو ساتەوەختە لای وی رەمزی ڕووداوێکی نوێ بوو لە مێژووی تەلارسازیدا، ڕووداوی راماڵین و روخاندنی پرۆژەی نیشتەجێبوونی *Pruitt-Igoe*، کە تەلارسازی مۆدێرنیست مینۆرۆ

یاماساکی *Minouro Ymasaki* دیزاینی بۆ کێشابوو[19]. تەلارسازیی پۆست مۆدێرن، هەروەك ژانرە ئەدەبی و هونەرییە نوێیەکان، بەشێکی زۆری ئەو پێوەرە ئەندازەییانەی هەڵگرتووە کە لە تەلارسازیی مۆدێرندا پێڕەودەکران. شانبەشانی ئەو پێشکەوتن و تێزە نوێیانەی کە لە بواری گەردوونناسی *Cosmology* و ژینگەناسیدا *Ecology* ئەنجام دەدرێ، وێنەی تەلارو دیزاینی شارەکانیش گۆڕانی بەسەر هاتووە. تەنانەت تەلارسازە نوێیەکان هەوڵدەدەن لەدیدی زمانەوانی و رەخنەی ئەدەبی و هونەرییەوە نزیککاری بۆ بنیات و پێکهاتەی تەلارو خانوبەرە بکەن. ئەڵبەتە گەورەترین کاریگەری لەسەر ئیستاتیکای تەلارسازیی پۆست مۆدێرن هی "جاك دیریدا"یە، بەتایبەتی سەبارەت بە ئەگەری گواستنەوەی ستراتیجی جیاوازی و هەڵوەشاندنەوەی سەنتەر، لە بنیاتی دەقەوە بۆ بنیاتی تەلار[20].

هەمان نزیککاری لەنێوان هونەری سینەما و تەلارسازییشدا لە گۆڕێدایە. بەشێك لە تەلارسازە پۆست مۆدێرنەکان چەمکی سینەماتۆگرافی *Cinematography* بەکاردێنن بۆ بەگەڕخستنی رەگەزەکانی "کات، دیمەنی بزۆك، تیشکەوێنە" لە بنیات و پێکهاتەی تەلاردا. چونکە فەلسەفەی سینەما پێمان دەڵێ هەروەك پڕکردنەوەی بۆشاییە شوێنییەکان (مەکانییەکان) پێویستە بۆشایی نێو کاتیش پڕبکرێتەوە، بەئەندازەی هەستیاریی مرۆڤ بەرامبەر شوێن دەبێ بینەر لەئاست کاتیشدا هەستیار بێ. تەلارسازیی سینەماتۆگرافی پێیوایە لێکچوونێکی رەمزی لەنێوان بینەری تەلارو بینەری فیلمی سینەماییدا هەیە، چونکە کاتێ مرۆڤ دەچێتە ناو فیلمێك وەك ئەوەیە داخڵی تەلارێکی پڕ نهێنی بووبێ، کە کەشفکردنی وردەکارییەکانی پێویستی بە هەستیارییە لەئاست کات و شوێندا پێکەوە[21].

پۆست مۆدێرنیزم، بەپێچەوانەی رێچکە فیکری و هونەرییەکانی سەردەمانی کۆنەوە، بە پاساوی فیکری و زەمینەسازی تیۆریی دەستی پێنەکرد، بەڵکو بەر لەهەرشتێك شۆڕشێك بوو لە ناو وێنەدا. تا ئێستا هیچ مێژوونوسێکی بواری هونەر نازانێ داخۆ چ چرکەساتێك، بەدیاریکراوی، سەرەتای دەستپێکردنی دۆخی پۆست مۆدێرنە؟ نازانێ داخۆ چ فەیلەسوفێك یەکەمین تیۆرسازی فیکریی پۆست مۆدێرنە؟ ناتوانێ بە دیاریکراوی بڵێ ئەو دۆخە، لەسەر ئاستی ئیستاتیکی، لە چ ژانرێکەوە دەستی پێکرد: لە تەلارسازییەوە، یان لە گۆرانی پۆپەوە، یان لە سینەمای دۆگلاس سێرك و نیوڕیالیزمەوە، یان لە تێکەڵاوکردنی هەموو ژانرەکان پێکەوە؟. نازانێ داخۆ پۆست مۆدێرن هاوارێکی سیاسییە بەڕووی ئۆرستۆکراتیەتی مۆدێرنەدا، یان هاوارێکی ئیکۆلۆجییە بەڕووی کولتووری بەفیڕۆدان و بەرخۆری و ژینگەپیسکردندا؟ یان یاخیبوونی کوڕو کچە پڕ ئاماژە جەستەییەکانە، کە هەرچەندە لە بەکارهێنانی وشەدا هەژارن بەڵام لە بەکارهێنانی زمانی جەستەدا داهێنەرن، بەوەش دژی گوتاری ئەقڵانی و لۆجیکیی باوکە قسەزانەکانن؟!

لە شەستەکانی سەدەی رابردوودا، هاوکات لەگەڵ خۆپیشاندانەکانی خوێندکاران لە ئەمریکاو ئەوروپا دژی جەنگ و پاشماوەکانی فاشیزم، چەندین دیاردە لەناو گەنجان و ژنان و توێژە پەراوێزخراوەکاندا سەریانهەڵدا، کە بۆ

جیهانی خۆرئاواش نامۆ بوون. گەنجان بۆ بەرگری کردن لە شوناس و جیاوازی خۆیان، پەنایان بردە بەر کولتوورێکی جیاواز، کە لەڕووی فیکری و لۆجیکیەوە سادەو هەندێ جاریش بێ مانا بوو، بەڵام لەڕووی سیماو دیکۆرەوە تەواو جیاواز بوو. گەنجەکان دەستکاری سیستمی بەها فیکرییەکانیان نەکرد، بەڵکو دەستکاریی سیستمی ئاماژە وێنەییەکانیان کرد، لە شێوازی جل لەبەرکردنەوە تا شێوازی هەڵبژاردنی سیمبول و پاڵەوان. بۆ نمونە: بزووتنەوەی هیپییەکان کە لەو دەیەیەدا لەخۆرئاوا سەری هەڵدا، سەرەتا وەك دیاردەیەکی سەیرو سەمەرەو بێ مانا لەقەڵەم درا. بەڵام دوای دەیان ساڵ، کە ئەو دیاردەیە لەدیدێکی سیمانتیکییەوە دەخوێندرێتەوە، دەکرێ چەندین لێکدانەوەی فیکری و سۆسیۆلۆجی بۆ بکرێ. ئەو بزووتنەوەیە بەدیوێکدا دژی مۆدیلی باوی پاڵەوانی گەنجی پەنجاکان بوو، بەدیوێکی تریشدا گوزارشتکردن بوو لەخواستی گەنجان بۆ یەکسانی زیاتری نێوان دوو رەگەزەکەو دژایەتیکردنی گەشەی خێرای تەکنەلۆجیا، کە دواتر بەجۆرێك لە جۆرەکان بزووتنە ژینگە پارێزەکان و رێکخراوە سەوزەکانی لێکەوتەوە[22]. لە راڤەیەکی دیاردەی خۆپیشاندانەکانی شەست و هەشتی گەنجاندا "هێربێرت مارکیوز" دەڵێ: ئەو گەنجانە کەسیان نەکرد بەباوکی رۆحیی خۆیان، چونکە خۆیان لەبنەڕەتدا "دژی نایەکسانی و ستەم و دڵڕەقی و میراتی فاشیزم بوون"، دژی "جیاوازی نێوان دوو رەگەزەکەو فەوتانی ژینگەو وێرانکردنی بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن بوون"[23]. دیاردەیەکی تر کە لەحەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا لەناو گەنجانی خۆرئاوادا بەگشتی سەریهەڵدا، پەیدابوونی کوڕو کچە سەرتاشراوەکان بوو، کە لەلایەکەوە گوزارشتی لە تێپەڕاندنی کولتووری هیپییەکان دەکرد کە قژیان دەهێشتەوە، لەلایەکی تریشەوە هەڵوێستێکی کردەیی بوو دژی ئەو فەلسەفەو دروشمانەی باسیان لە یەکسانی نێوان کوڕو کچ دەکرد، چونکە گەنجە سەرتاشراوەکان لە ڕەفتارو جلوبەرگ و ماکیاجدا تا ئاستێکی زۆر هەوڵیان دەدا جیاوازییە تەقلیدیەکانی نێوان دوو رەگەزەکە بسڕنەوە، نەك لە رێگەی وتاربێژی و دروشم و موژدەی رۆشنگەرانەوە. واتە هەوڵیان دا ئاماژەی وێنەیی بنێرن بە نەوەی پێش خۆیان و بەزمانێك لەگەڵیان بدوێن کە بۆیان نامۆ، بگرە بێمانا بوو[24].



ساڵی 1971 باری کۆمۆنێر *Barry commoner* کتێبێکی دانا بە ناونیشانی (بازنەی داخراو *The Closing Circle*). کۆمۆنێر لەو کتێبەدا چەند یاسایەکی نوێی بۆ ژینگەپارێزی *Ecology* داڕشت، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە هەموو شتەکانی سەرگۆی زەوی پەیوەندییان بەهەموو شتەکانی تری سەر گۆی زەوییەوە هەیە. هەر دیاردەیەك سروشتی بێ

یان ڕەمزی، بەتەنها و دوور لە دیاردەکانی تر، خۆ بەخۆ توانای مانەوەو بەردەوامبوونی نیە. دەرچـوونی ئـەو کتێبـەش بـە یـەکێك لـە چرکەساتەکانی چاخی پۆست مۆدێرن لەقەڵەم دەدرێ[25]. بەڵام داخۆ ئەو کتێبەی کۆمۆنێر چ پەیوەندییـەکی ڕاسـتەقینەی بـە دۆخـی پۆستمۆدێرنیزمەوە هەیە، بەتایبەتی لە بواری وێنەو هونەردا؟

یـەکێك لـە هۆکـارە سـەرەکیەکانی ئـالوودەبوونی ژینگـە بریتیـە لـە پێڕەوکردنـی کولتـوری بـەفیڕۆدان و بـەرخۆری (استـهلاك) لەلایەن مرۆڤی مۆدێرنەوە، نەك هەر لە بازاڕی کاڵا مادیەکاندا، بەڵکو لە بازاڕی زانیارییەکان و کـاڵا هونـەری و ڕەمزییەکانیـشدا. ئـەو بەرخۆرییەی، کە بۆ نمونە، لە بازاڕی سینەما و تەلـەفزیۆن و دنیـای ئەسـتێرە هونەریـەکان و تەکنـەلۆجیای میـدیا و پەخـشی زانیارییـە گەردوونیەکاندا هەیە.. هیچی کەمتر نیە لەو بەرخۆرییەی کە لە دنیای خواردن و بەرهەمە مادییە ڕاستەوخۆکاندا هەیە، تەنانەت دنیای ریکلام و بەهونەریکردنی پیشەسازیی بەرخۆری ئـەوە دەسـەلمێنێ کـە چ هاوپـەیمانی و بەرژەوەندییەکی هاوبەش لەنێوان بازاڕی کاڵا ڕەمزیـەکان و بـازاڕی کـاڵا مادییەکانـدا هەیـە، چونکە ئەوەی لە بازاڕدا بەها دەبەخشێتە هونەر نرخـە مادییەکەیـەتی، ئـایرۆنیش لەوەدایـە ئـەوەی بـەها دەبەخـشێتە کـاڵا مادییـەکان دیـزایین و ریکلامـە هونەریەکەیـەتی! کەواتـە هەڵپەو برسێتییەك هەیە بۆ ماشینەوەی هەموو شـتێکی تـازە، ئـیتر مـادیی بـێ یـان ڕەمزیـی، پاڵنەری ئەو ماشینەوەیەش چێژی بایۆلۆجی و ئیستاتیکی نیە هێندەی برسێتییەکی ڕۆحییەو هەنـدێ جـاریش چـاولێکەری و سەرسـامبوونی پەتییـە بەرامبـەر هـەر شـتێك کـە تـازە بـێ. سەرباری ئەوەی ڕەخنەگرانی مۆدێرنە پێیانوایە مرۆڤـی مـۆدێرن لـە پراکتیزەکردنـی چـێژدا دەستپێوەگرە، بەڵام لە سەرفکردنی کاڵا مادیی و ڕەمزیەکانـدا بـەفیڕۆدەرە. واتـە کولتـوری بـەفیڕۆدان و بـەرخۆری لـەپێنا و دروسـتکردنی چـێژدا نیـە هێنـدەی لـەپێناو سـەلماندنی دەسـەڵاتی مرۆڤـی چـاخی زانـستدایە کـە سەرداری سروشتەو دەتوانێ هەموو ئەو شتانە ئەزموون بکا کە پێشتر بەخەیاڵدا نەهاتوون.

لـەپاڵ ئـەم کولتوری بەفیڕۆدانـەدا، "ئیمبرتـۆ ئیکۆ" هەڵپەیـەی مرۆڤی سـەردەم بۆ وەرگرتنـی زۆرتـرین زانیـاری و سـەرفکردنی زۆرتـرین مۆدێلی یەك لەدوایەکی پیشەسازیی میدیایی و هونـەری بـە هـەمان هەڵپـەی سـەرفکردنی کـاڵای مـادی دەچـوێنێ..[26]، چـونکە دوای هـەزاران ساڵ برسێتی و قاتوقڕی، ئێستا مرۆڤی کۆمەڵگا خۆشگوزەرانەکان کەوتوون بەسەر چەندین جۆر خواردن و نیعمەتدا و زیاد لە پێداویستی لەش و لەسەر و توانای ئەندامی هەرسکردنەوە بەفیڕۆی دەدەن، ئەوەش چەندین پاشهاتی خراپی لەسەر تەندروسـتی تاکـەکان و تەندروسـتی گـشتیی کۆمەڵگـەو ژینگـەی سروشـتیی بەجێهێـشتووە. بۆیـە ئیکـۆ پێیوایـە لـە بـواری سـەرفکردن و بـەفیڕۆدانی بێـسنوری زانیـاری و بەرهـەمی میـدیای و پیـشەسازیی هونەریـشدا مرۆڤـی سـەردەم توشـی هـەمان قـەیران هـاتووە، چونکە ئـەم مرۆڤـە لـە وەرگرتنـی زانیـاری و ئامـاژە ڕەمزییەکانیـشدا بوونـەوەرێکی پاسـیڤی بەرخۆرە.

سـاڵی 1838، بـۆ یەکـەمین جـار، کولتـوری بـەرخۆری لـە شمەکـە مادیەکانـەوە تەرجەمـەکرا بـۆ بـەرخۆری لـە ریکـلام و چـاپەمەنیدا. لـەو

ساڵەدا ڕۆژنامەی لاپرێس *Lapresse* ی پاریسی بووە یەکەمین ڕۆژنامەی بازرگانی، بەوەش بووە "یەکەمین شمەکی ئیستهلاکی، کە چاپدەکرا بۆ ئەوەی بمرێ، دەکڕدرا بۆ ئەوەی فڕێ بدرێ"[27]. پاش ئەو مێژووەو لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هونەرمەند "مارسیل دوو چامپ"، لە یەکێك لە پێشانگاکانیدا، پاسکیلێکی وەرچەرخاوی لەسەر کورسیەکی سەربەرەوخوار دانا، بەوەش پەیکەرێکی ئامادەی دروستکرد لە پاشماوەی شمەکە بەکارهاتووەکان. لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمداو بەدیاریکراوی ساڵی 1962 هونەرمەند "ئاندی وارهۆڵ *Andy Warhol*" لەسەر داوای هاوڕێکانی بڕیاریدا سنورێك بۆ بەرهەمە تەعبیرییە پەتیەکان دابنێ و یەکەمین تابلۆی خۆی بەناونیشانی "قوتوەکانی سوپی کامبێل *Campbell Soup Cans*" بەرهەم بێنێ. پاشان دەربارەی مەغزای دروستکردنی کاری هونەری لە پاشماوەکانی بازاڕ، "وارهۆڵ" تەفسیرێکی ژینگەپارێزانەی پێشکەشکردو وتی: "من هەمیشە حەزدەکەم کارەکانم لە پاشماوەکان وەربگرم، لەو شتانە بەرهەم بسازێنم کە خەڵکی فڕێیانداوەو هیچ سوودێکیان لێیان نەبینیوە.. گەر تۆ بتوانی شتێکی باش یان بەلانی کەمەوە شتێکی سەرنجڕاکێشی لێ دروست بکەیت، ئەوا ڕەنجەکەت بەفیڕۆ ناچێ وەك ئەوەی لە دروستکردنی شتی نوێدا ڕەنج بەبادەدەی. تۆ هەرچەندە کارەکەت لە کاری خەڵکانی ترەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵام دەیخەیتە بازنەی دووبارە سوودلێوەرگرتن، لەو شمەکانە بەرهەم دەسازێنی کە سەرفکراون، ئەمەش کارێکی زۆر ئابورییە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا"[28].

سوڕی خۆر، بەدوایەکداهاتنی وەرزەکان و شەوو ڕۆژو..، دووبارەبوونەوەی بەردەوامی دیاردە سروشتیەکان..، دەریدەخەن کە سروشت هەمیشە لەڕێگەی ژیاندنەوەی شتە کۆن و مردووەکانەوە خۆی تازەدەکاتەوەو خۆی پاکدەکاتەوە. زاراوەی "دووبارە سوڕانەوە *recycling*" میتافۆرێکە لە بنەڕەتدا لە زانستە سروشتیەکانەوە وەرگیراوە، زۆر بە وردی ئەو سیاسەتە ئابورییە وەسفدەکا کە کولتوری هاوچەرخ پێڕەوی دەکا، چونکە بۆ نمونە جیاوازییەکی ئەوتۆ نیە لەنێوان دەق *text* و دەقی پەراوێزدا *Para text* (لە نێوان ڕەخنەو ئەو نوسینانەی کە لەسەر بەرگی کتێبەکان بڵاودەبنەوە). هەندێ لە پەیمانگاکانی هونەرو ریکلام کار بۆ ئەو سیاسەتە ئابوورییە دەکەن کە وەك پێویستیەکی بازاڕی شمەکە کولتوریەکان هاتوونەتە ئاراوە. ئەو دەزگایانە ریکلام بۆ بەرهەمە کولتوریەکانی خۆیان و دابەشکردنی ئەو بەرهەمانە دەکەن، هەندێ جار لە ڕێگای فریودان و هەندێ جار لە ڕێگای پڕوپاگەندەی چڕوپڕەوە، هەندێ جاریش لە ڕێگای گۆڕانکاری بەردەوام لە تۆڕەکانی دەلالەتی بەرهەمی هونەری و شێوازەکانی گوتاردا[29].

ستۆدیۆکانی هۆلیوۆد نمونەیەکی ئاشکرای بازاڕی بەرهەمهێنان و ریکلامی کالای ڕەمزی و ئیستاتیکین. ئێستا پیشەسازیی وێنەی بزۆك و سیناریۆی پشت سیناریۆکان، چیرۆکی ژیانی واقعی ئەستێرەکان لە پشت چیرۆکی خەیاڵیی فیلمەکانیانەوە، لەتەك پیشەسازی بەرهەمهێنانی کالا مادی و بەرژەوەندییە سیاسییەکاندا ئەزموون دەگۆڕنەوە. زۆرجار پەنادەبرێ بۆ دزەپێکردنی هەواڵی ژیانی

ڕۆژانــەی ئەســتێرەکانی ســینەما، هــەواڵی دواهــەمین بەرهــە نوێیــەکانیان، هــەواڵی پەیوەندییــە ســۆزداری و سێکــسیەکانیان. پــەنادەبرێ بــۆ شـێوازە جیاوازەکـانی ریکـلام و تیــشك خــستنەسەر فیلمــە تــازە بەرهــەمهاتووەکان...، پاشــان ڕەخنــەگری کۆمپانیاکــان لای خۆیانــەوە ئاڕاســتەی خوێندنـەوەی فیلمەکـە بەشـێوەیەك دیاریدەکـەن کە زۆرترین فرۆش مسۆگەر بکا.

ســینەما، بەپێــچەوانەی هونــەری شـێوەکارییەوە، هونــەرێکی دەســتەجەمعییە و پێویــستی بــە ڕۆحیــەتی تیمــە. پێویــستی بەدروســتکردنی نێوکـۆی گەورەیــە، هــەر لــە چرکەساتی بەرهەمهێنانیەوە تا نمایشکردنی لە ســروتی دەســتەجەمعی و تەنانــەت پــاش نمایشکردنیــشی. ڕەنگــە دۆگــلاس ســیرك *Douglas Sirk*، کـە دەرهێنـەرێکی سـینەمایی بەڕەچەڵەك دانمارکییە، یەکەمین کەس بووبێ لە شەســتەکانی ســەدەی بیــستەمدا دەرکــی بــەم ســتراتیجەی کــارکردنی کۆمپانیاکـانی هۆلّیـود کردبێ. سیرك لە پەنجاکاندا زنجیرەیەك فیلمی بۆ کۆمپانیای یونیڤێرساڵ *Universal* دەرهێنا، وەك: خولیایـەکی مـەزن *Magnificent Obsession* (1952)، ئـەوەی ئاسمان دەیبەخشێ *All that Heaven Allows* (1955)، نوسـراوی سـەر "با" *Written on the wind* (1956)، فریــشتە ئالودەکــان *Tarnished Angels* (1957) و لاسـاییکردنەوەی ژیـان *Imitation of Life* (1959). ئـەم کارانـە میلۆدرامـای سـینەمایی گەورە بوون و بودجەی گـەورەیان بۆ تـەرخانکرا. جگـە لـە فیلمـی (لاسـاییکردنەوەی ژیـان) ڕۆك هەدسـۆن *Rock Hudson* ڕۆڵـی پاڵــەوانێتی فیلمـەکانی دەگێـڕا. بـەڵام کـاتێ نمایـشکران زۆربــەی ڕەخنــەگران ئاوڕیــان لێنەدایــەوە، پێیــانوابوو ئــەو فیلمانــەش، وەك هــەموو بەرهەمـەکانی تـری هۆڵیـود، بـە مەبەسـتی کـات بـەفیڕۆدان و پـارە کێـشانەوە بەرهـەم هـاتوون و لەیاد دەچنەوە.

پاش دەیەیەك و لە کۆتایی شەستەکاندا، لـە هەڵوێستێکی پۆستمۆدێرنانەدا دژ بە کولتوری ئیستهلاك و بەفیڕۆدانی کارو وزەی ئیستاتیکی، سیرك توانی سەرلەنوێ ژیانی نوێ ببەخشێتەوە بــەو فیلمانــەو جووڵــە بخاتــەوە وێنــە وەستاوەکانی. زنجیرەیەك لێکچەری پێشکەشی سینەماناسـان کـردو ڕاڤـەیـەکی نـوێی بـۆ فیلمـە کۆنەکانی پێشکەشکرد، ڕایگەیاندا: پەیامەکـەی ڕەخنــەکردنی بــەها بۆرجوازیــەکانی ئــەمریکا بــووە. نێوەنــدە ئەکادیمیــەکانی ســینەمای ئینگلیزو ئەمریکا بە سەرسامییەوە قسەکانیان وەرگـرت و لەسـەر ئاسـتی تـەکنیکی دەرهێنـان و شــێوازی تــەوزیفکردنی دیــدی ئایــدیۆلۆجی سەرلەنوێ نزیککاری ڕەخنـەییان بۆ فیلمـەکانی ئەنجامـدا. ئـەو فیلمانـە سـەرلەنوێ بوونـەوە مایـەی بایـەخ پێدان و مـشتومڕو شیکردنەوە لـە کۆنگرەکانــداو لەســەر ڕووپــەڕی گۆڤــارە هونەریــەکان. بــەوەش ســیرك جۆرێــك لــە دەســتپێوەگرتنی ئــابوریی لــە بــواری کــاڵای هونــەری و ماددییەکانــدا ئەنجامــداو لــەبری بەرهــەمهێنانی فیلمــی نــوێ، خوێندنــەوەی نـوێ و ڕاڤـەی نـوێ و کۆنتێکـستی نـوێی بـۆ فیلمـەکانی بەرهـەمهانی. واتـە تـوانی چـێژی ئیستاتیکی و تێڕامـانی فیکـری لای ژمارەیـەکی زۆری بینــەران و ڕەخنــەگران و ســینەماکاران دروست بکا لە ئاست فیلمگەلێکدا کە لە ڕەفـەی ئەرشیف و هۆڵـەکانی سـینەمادا تـۆزو گـەردیان لێنیشتبوو[30].

جێگۆڕکێ لە هێما و نیشانەکاندا، دروستکردنی سیاقی نوێ بۆ دەق و ئاماژە وێنەییە بەسەرچووەکان، ستراتیجێکی ئیستاتیکای پۆستمۆدێرنە کە پێماندەڵێ: سینەمای مۆدێرن و هونەری مۆدێرن هێندە وێنە و کاڵایان بەرهەمهێناوە دەشێ لە ڕێگای کۆلاجکردن[31]، گۆڕینی سیاقەکانیان و سەرلەنوێ خوێندنەوەیانەوە، چێژی ئیستاتیکی نوێ ببەخشنەوە. واتە گەر بەها و پێوەری کاری هونەریی لە سەردەمی مۆدێرنیزمدا بریتی بووبێ لە تازەیی و تێپەڕاندنی بەردەوامی کۆن، ئەوا بەهای کاری هونەریی لە سەردەمی پۆستمۆدێرندا بریتییە لە زیندوکردنەوەی ئەو جوانیانەی کە بە لۆجیکی بازاڕ، وەك شمەکە ئابوورییەکان، کاتیان بەسەرچووە و فڕێدراون. گەر ئیستاتیکای مۆدێرنیزم هەمان ستراتیجی ئابووریی بازاڕی دنیای مۆدێرن پێڕەوبکا، ئەوا پۆست مۆدێرنیزم ئەو دۆخەی تێپەڕاندووە و گەیشتۆتە ئەو قۆناغەی کە بریخت ناوینا "سەرلەنوێ بەگەڕخستنەوە *refunctioning* یان خۆ بەدەستەوە نەدان *Cunning*، بەو مانایەی دەکرێ سەرلەنوێ کەلەپوور زیندوبکرێتەوە"[32]. واتە گەر رستەیەك لە فەرهەنگی سەربازیی قەرزبکەین دەکرێ بڵێین: پۆست مۆدێرنیزم لە خاکی خۆیدا دژی مۆدێرنیزم ناجەنگێ، بەڵکو لە خاکی دوژمنەکەیدا ئەو کارە دەکا و هەمان چەك و جبەخانەی تۆزلێنیشتووی ئەو بەکاردینێتەوە، بەوەش هەم کات و هەم وزەی زیاتری بۆ دەگەڕێتەوە.

"ولیام سیتس" ئەم ستراتیجە لە بواری هونەری شێوەکاریدا ناودەنێ "هونەری کۆکردنەوە". ساڵی 1961 مۆزەخانەی هونەری مۆدێرن لە نیویۆرك پێشانگایەکی بۆ ئەو شێوازە نوێیەی هونەر کردەوە، "سیتس" لە پێشەکی نامیلکەی ناساندنی پێشانگاکەدا نوسی: "ڕەوتی هونەریی کۆلاج و پێکەوەلکاندن کە ئەمڕۆ بەدیدەکرێ.. ئاماژە بە وەرچەرخانێکی هونەریی دەکا کە هاوتەریبە لەگەڵ هەڵمەتەکانی ژینگەپارێزیدا"[33]. "جاك درێدا" هەمان ستراتیج لە ڕەخنەی ئەدەبیدا پێڕەودەکا کاتێ دەڵێ: "گریمانەیەك کە سوورم لەسەری: هەموو هێما و نیشانەیەك، زمانەوانی بێت یان نا، نوسراو بێ یان وتراو.. لە یەکەیەکی بچوکدا بێت یان گەورە، دەکرێ دەربهێنرێ *be cited* و بخرێتە نێوان دوو کەوانە: بەمەش دەشێ لە سیاقی خۆی دەربچێت و بێکۆتا سیاق بەرهەمبێنێ، بەشێوەیەکی ڕەها و بێ هیچ سنورێك. ئەمە مانای ئەوە نیە کە دەشێ نیشانە لە دەرەوەی سیاق بوونی هەبێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە واتە دەشێ چەندین سیاق هەبن بەبێ بوونی چەقێك یان خاڵێکی جێگیر"[34].



چەق بەر لەوەی واقعێکی هەستپێکراو بێ، چەمکێکی زەینییە کە مرۆڤ بۆ جیاکردنەوەی سەنتەر لە کەنار ئەفراندویەتی. چەق بەر لەهەر شتێك بوونەوەرێکی زمانەوانیە کە پێویستی بە وێنای ناوەکی و زەینییە. بەڵام لە شارستانیەتی

ئەمڕۆدا، کە "رۆلان بارت" بە (شارستانیەتی وێنە) ناوی دەبا، چەقەکان بەژمارەی وێنەکان زیاددەبن و زاووزێ دەکەن. لە شارستانیەتی وێنەدا، وێنەکان بەشێوەیەك پەرشدەبنەوە کە ژێدەرێك بۆ چەقی رەسەن نامێنێتەوە. سینەما لەڕووی تەکنیکیشەوە گوزارشت لەو فرەوێنەیی و فرەچەقییە دەکا، هەر بینەرەو لەهەر گۆشەیەکی دنیا بێ، دەبێتە چەقێکی مەرجەعی و سیاقێکی تایبەت بۆ وەرگرتنی پەیامەکە. بەڵام تەنها سینەما گوزارشت لە شارستانیەتی وێنە ناکا، بەڵکو هەموو ئەو هونەرانەش گوزارشتی لێدەکەن کە بۆ گەیاندنی پەیام پێویستیان بە (ئاماژە *sign*)ی وێنەییە. تەنانەت ئەدەبیش رۆژ بەڕۆژ زیاتر لە ریتم و ئاماژە بیستراوو زمانەوانییە پەتیەکان دووردەکەوێتەوەو زۆرتر پەنا بۆ وێناکردن و بەگەڕخستنی ئاماژە وێنەییە مەجازیەکان دەبا. "بارت" پێیوایە لە هەموو دەقێکی نوێدا "بارگەیەکی رمێنەر هەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی سنوری تەقلیدیی نێوان ژانرەکانی وەك رۆمان و چامەی شیعریی و وتار لەلایەك و، کایە مەعریفییە مرۆییەکانی وەك ئەدەب و فەلسەفەو ئابوری لەلایەکی ترەوە"[35]. "بارت" خۆی لە کتێبی *S/Z* ئەو ستراتیجە پێڕەودەکا، دەقێك پێشکەش دەکا تێکەڵە لە شیکردنەوەی رەخنەیی، گێڕانەوەی ڕۆمان، ئاوێتەکردنی ستایلی دابەشکردنی وێنە بە ستایلی دابەشکاری لە کاری موزیکدا. ئەو کارە لە پرۆسەی تۆمارکردنی نوێی دەنگ دەچێ، دەنگدانەوە *reverberation* تێکەڵ بە خاوکردنەوە *delay*، چڕکردنەوە *compression* تێکەڵ بە کۆرسی دەستەجەمعی *chorusing*، ئاماژە موزیکییە جێگیرەکان ئاوێتەی ئاماژە دووبارەکان *Straight* دەبن..، سەرەنجام هەموویان بەناویەکدا تێدەپەڕن و بەرهەمێکی ئیستاتیکی فرە ژانر دروستدەکەن. لەڕووی ناوەرۆکی فیکری و ئیستاتیکیشەوە پۆست مۆدێرنیزم تێکەڵێکە لە دوو پرۆسە: فیکر لە چوارچێوەیەکی ئیستاتیکیدا پێشکەش دەکا و هونەریش لە چوارچێوەیەکی فیکریدا. سەرەنجام دەقی دووڕەگ و فرەڕەگ و لێك- موتوربەکراو *hybrid text* لەدایکدەبێ و دەلالەتی رۆشنبیری نوێ، لە ڕێگای کارلێکی رەگەزەکان و شیکردنەوەیانەوە دێتەبوون[36].

گەر سیاسەتی ئابوری و دەستپێوەگرتن لەڕووی مادییەوە پێویستی بە تەرشیق و باریککردنەوە هەبێ، ئەوە هونەری پۆست مۆدێرن لەڕووی ئیستاتیکییەوە هەمان پرۆسەی تەرشیق پێڕەودەکا، چونکە شتە جوانەکان بە قەبارە ناپێورێن، بەڵکو بەو کاریگەرییە دەپێورێن کە لەسەر بیرکردنەوەو ویژدان، لە سەردەمی پڕ ژاوەژاوی نیشانە سیمانتیکیەکاندا، دروستیدەکەن. بۆ نمونە هەرچەندە تیشکەوێنەی سینەمایی، کە پێشکەوتوترین دەرکەوتی هونەریی ئەم سەردەمەیە، لەڕووی تێچوونی مادییەوە لە هەموو ژانرەکانی تر گرانترە، بەڵام لەڕووی بەرجەستەکردنی رەهەندە جیاوازەکانی جوانییەوە لەهەموویان ئابوریی ترە، چونکە هونەرێکی فرەژانر بەرهەمدێنێ کە لە هەناویدا هونەرە بیستراوو بینراوو نوسراوەکان پێکەوە پەیام بەرجەستە دەکەن و هیچ کامیان، بێ ئەوی تر، توانای بەرهەمهێنانی ئاماژەی گشتی نیە. ئەڵبەتە کاریگەری وێنەی بزۆك لەسەر خەیاڵدانی مرۆڤ راستەوخۆترە، چونکە بەبەراورد لەگەڵ ژانرە نەریتییەکاندا پێویستی

بە کردنەوەی سیستمە ئاڵۆزەکانی کۆدی زمانەوانی و هێمای وێنەیی نیە. گەر مرۆڤی بەر لە سەردەمی تیشکەوێنە پێویستی بە وێناکردنی دیمەن و هاوکێشەی زەینی بووبێ لەپێناو بەرجەستەکردن و تێگەیشتن لە ئاماژە بیستراوو بینراوو نوسراوەکاندا، ئەوە لە شارستانیەتی وێنەدا زۆرجار وێنە–ئاماژەو وێنە–واتا (دال و مدلول *sign/significance*) تێکەڵی یەکتر دەبن، بەجۆرێك ئەو رووبەرە رەمزییەی کە لەنێوان ئاماژەکانی جوانی و خودی جوانیدا هەیە بەرەو کاڵبوونەوەو بەرتەسکبوونەوە دەڕوا.

واتە هەروەك چۆن لە سەردەمە کۆنەکاندا ئەفسانە موڵکی هەموان بووەو مافی لەبەرگرتنەوەو شانازی کردن بە ئەفسانەوە بۆ هەموان پارێزراو بووە، هەروەك چۆن لە سروتە دەستەجەمعیەکاندا مرۆڤ خۆی لەیەك کاتدا نێرەر (مرسل)ی ئەفسانەو وەرگر (متلقی)یش بووە.. لە سەردەمی ئێستاشماندا لەگەڵ بەرفراوانبوونی تۆڕەکانی زانیاری گۆڕینەوەو ئارەزوو گۆڕینەوەو ئاماژە گۆڕینەوەی وێنەییدا، سنوری نێوان ئاماژەی ئۆرجناڵ و ئاماژەی کۆپیکراو بەرەو کاڵبوونەوە دەڕوا و ژێدەر (مەرجع)ی ئاماژە بەرەو بزربوون و پووکانەوە دەڕوا. بۆ گوزارشتکردن لەو دۆخە وێڵگائاسایەی کە تیایدا کەنارو چەق تێکەڵی یەکدی دەبن، شێوەکارێکی پۆست مۆدێرنی وەك "ئاندی وارهۆڵ"، لە تابلۆیەکی هونەریی تێکەڵ بەتەوسدا، زنجیرەیەك وێنەی چەندبارەو بێشووماری مارلین مۆنرۆی پێکەوە کۆپی کرد، کە هەموویان لەیەك کاتدا ئۆرجناڵ (رەسەن) و لاساییکەرەوەش بوون[37]. بەوەش ئاماژەی دا بە ونبوونی وێنەی ئۆرجناڵ لە گەمەی کۆپییە بێشومارەکاندا، لە کاتێکدا رەسەنایەتی *originality*، پاراستنی وێنەی دەستی یەك و جیاکردنەوەی وێنەی رەسەن لە وێنەی ساختە..، خولیا و خەمێکی بەردەوامی هونەری شێوەکاریی کلاسیکی و مۆدێرن بووە.

ریچارد کۆرنی لە کتێبێکدا بەناونیشانی "شیعریەتی خەیاڵ لە هۆسرڵەوە تا لیوتار" باس لە سێ قۆناغی جیاوازی بەرجەستەبوونی وێنەی فیکری دەکا لە زەینی مرۆڤدا: یەکەم، وێنەی فیکر لە شێوەی (ئاوێنە)دا کە توانای کۆپیکردنەوەی وێنەی دووەمی هەقیقەتی هەیە، ئەو وێنەیەی کە ئەفلاتۆن و ئایدیالیستەکان بڕوایان پێی بوو. دووەم، وێنەی فیکر لە شێوەی (چرا)دا کە توانای رۆشنکردنەوەی هەموو شوێنە نادیارو تاریکەکانی هەیە، ئەو وێنەیەی فەیلەسوفە رۆشنگەرو رۆمانتیکەکان بڕوایان پێی بوو. سێیەم، وێنەی فیکر وەك زنجیرەیەك ئاوێنەی رووبەڕوو، کە مرۆڤ لەناویدا وێڵ دەبێ و توانای جیاکردنەوەی سەنتەرو کەنار، وێنەی ئۆرجناڵ و وێنەی کۆپیکراوی نامێنێ..، ئەڵبەتە ئەوەش وێنەی فیکرە لە سەردەمی پۆست مۆدێرندا[38].

بەم مانایە پۆست مۆدێرنیزم جۆرێکە لە وەرچەرخانی دووەمی مێژووی مرۆڤایەتی. وەرچەرخانێك کە مرۆڤ لە خولیای گەڕانەوە بەدوای سێنتەردا دەگوازێتەوە بۆ خولیای گەڕان بەدوای وێنە بێشومارو چەندبارەکاندا تا رادەی وێڵبوون. ئەم وەرچەرخانە کاریگەری لەسەر شێوازی خەزنکردنی زانیاریەکان و دەستکەوتن و گەیاندنیان بەجێدێڵێ. پۆست مۆدێرنیزم ئەو چرکەساتەیە کە ئەلفوبێی نوسراو، پاش ئەوەی لەدوای قۆناغی زارەکییەوە دەسەڵاتی گرتبوو دەست،

ڕێگەچۆڵدەکا بۆ ئامرازە ئەلەکترۆنیەکان. بەڵام تا ئێستا نازانین ئەم وەرچەرخانە بەکوێ دەگا؟ بەڵام زۆر لەوە دڵنیاین کە وەرچەرخانی یەکەم، لــە زارەکییــەوە بــۆ نوســین، یــادەوەریو بیرکردنەوەو خەیاڵی مرۆڤی لەبنەوە هەڵتەکاند. واڵتەر ئۆنگ *walter ong* پێیوایە ڕەنگە چاخی ئەلیکترۆنی قۆناغێك بێ تیایدا مرۆڤ بگەڕێتەوە بــۆ ســەردەمی زارەکــی، بــەڵام زارەکییــەکی پشتئەستور بە کۆدە ئەلیکترۆنیەکان. واتە مرۆڤ کەمتر پشتەبەسێ بە تێگەیشتنی ئەبستراکتی وشــەکانو زیــاتر پــشت دەبەســتێ بــەحیکاتی گێڕدراوەو تیشکەوێنە، چونکە ئامێرە بیستراوو بینراوەکــان کاردەکەنــە ســەر نــاخی وەرگــرو توانای خەیاڵی زاتی لێوەردەگرنەوە. سەرەنجام دەقــە لێکئــاڵاوە وێنەییــەکان جێگــەی دەقــە ڕەســەنەکان دەگرنــەوە[39]. بــەڵام پرســیارەکە ئەوەیــە ئایــا قۆنــاغی زارەکــیش پــشتئەستور نــەبوو بــە کــۆدی زمانــەوانی، ئایا وشــەکانیش هێماگەلێك نەبوون بۆ کۆمەڵێك وێنەی دەرەکیو ئایکۆنی سروشتی. ئایا پەنابردن بۆ ئایکۆن، لەبری وشە، لە تەکنیکی دیجیتاڵی سەردەمدا مانــای ئــەوە ناگەیــەنێ کــە مــرۆڤ لــەبری وشــەو پەیوەنــدیی زارەکــی زۆرجــار پــەنا دەباتــەوە بــەر ئــایکۆنو هێمــای وێنــەیی. کەواتــە وردتــر وایــە بڵێین شارســتانیەتی ئەمڕۆ جۆرێکە لەگەڕانەوە بــۆ شارســتانیەتی هیرۆگلــۆفی بــەڵام لــە دۆخــی دیجیتاڵدا.

لــە شارســتانیەتی وێنــەدا جــۆرێکی تــر لــە ململانێــی لــۆجیکی دروســتدەبێ، بــەڵام ئــەمجار لــەنێوان مانــاو گوزارشــتدا نیــە، بــەڵکو لــەنێوان خولیــای ڕەهــابوونی وێنــەو، کلێــشەو ڕێگــرە مــادیی دروستکراوەکاندایە. "جیــل دۆڵــۆز" لــە کتێبــی "وێنــە- کــات"دا، کــە دەربــارەی فەلــسەفەی ســینەما نوســیویەتی، پێیوایــە شارســتانیەتی ئــەمڕۆی مرۆڤایــەتی بــەر لــەوەی شارستانیەتی وێنە بێ شارستانیەتی کلێشەیە، شارســتانیەتی ئــەو چوارچێوەو جوغزانەیــە کــە دەســەڵاتە جیاوازەکــان بــۆ لەقاڵبــدانی وێنــە، بــۆ ڕۆشــنکردنەوەی هەنــدێ گۆشــەو تــاریککردنی هەنــدێکی تــر، دەیکێشن. لــەوەش کۆمیــدی تــر، هەنــدێ جــار لــەبری لاســاییکردنەوەی وێنــەکان کلێــشەکان لاســاییدەکرێنەوە. ســیمیۆلۆجیای ســینەما، بــەڕای دۆڵــۆز، لــە لاســاییکردنەوەی ئامــاژە زمانەوانیەکانــەوە دەســتپێکرد، تــا ئێــستاش سیــستمی زمانــەوانی باڵادەســتیەکی زۆری لەســەر شــێوازی گێڕانــەوەی وێنــەی سینەمایی هەیە. چونکە گرتە (لقطة) یەك لــەدوا یەکــەکان، تەرجەمــەی فرێــزو ڕســتە یــەك لــەدوا یەکــەکانی زمــانن. پاشــان دۆڵــۆز ئامــاژەدەدا بــە ئەگەری جیابوونــەوەی زمــانی ســینەما لــە زمــانی ئاخــاوتن، بــەو پێیــەی دەزگــای زمــانی ئاخــاوتن تاکــە دەزگایەکــە لــەپاڵ چــەندین دەزگــا ســیمانتیکی تــردا وك جلوبــەرگو ســەماو موزیــكو.. هتــد. ئــیتر زۆر ئاســاییە دەزگــای ســینەماش، وەك ئــەو دەزگایانــە، ســەربەخۆیی خۆی وەرگرێو لاسایی دەزگای زمــانی ئاخــاوتن نەکاتەوە.

لــەم خاڵــەدا (دۆڵــۆز) ئامــاژە بــە قــسەیەکی "پازۆلێنی" دەدا کە پێیوابوو سینەما دەتوانێ زمانێکی گەردوونی بخولقێنــێ بەدەر لە یاسای ســیمیۆتیکا، چــونکە: "ســینەما زمانــە (...) زمــانی واقعــە. زمانێکــە بــۆ گوزارشــتکردن لــە جیهان. لە پەنجەرەیەکەوە لە جیهان دەدوێ کە زانــستی ســیمیۆتیکا پــەی پێنــەبردووەو پشتگوێی خستووە. زمانێکە بۆ تێپەڕاندنی ئەو زمانــە زارەکــیو نازارەکیانــەی کــە تــا ئێــستا

هەبوون". هەرچەندە "ئیمبرتۆ ئیکۆ" هاوڕای "پازۆلێنی" نەبوو، پێیوابوو کەسێکی نەشارەزایە بە سیمیۆتیکا. بەڵام "دۆلۆز" داکۆکی لەو قسەیەی "پازۆلێنی" دەکاو پێیوایە زمانی سینەما توانای چنینی تەونێکی پڕئاماژەی ئەوتۆی هەیە، کە تیایدا پەیامە سیمانتیکییەکان پێکەوە، نەك پچڕ پچڕ، بەرجەستەدەبن. جگە لەوەی توانای بەگەڕخستنی "کات"یشی هەیە، بەجۆرێك "کات" خۆی دەبێتە ئاماژەیەك لەپاڵ ئاماژەکانی تردا، کە چیتر بۆ سیمیۆتیکای نەریتی بابەتێکی سانا نیە(40).

لەبەر رۆشنایی دنیابینیی ژمارەیەك دەرهێنەرو سینەماکاری ناوداری وەك: رۆبێرتۆ رۆسێلێنی، دۆسیکا، لۆچینیۆ فیسکۆنتی، فریدریکۆ فیلینی، پازۆلێنی، ئیزنیشتاینو یەلماز گۆنای..، "جیل دۆلۆز" رای وایە سینەما لەتوانایدایە ئاسۆی فراوان لەبەردەم ئەندێشەو بیری مرۆییدا بکاتەوە بەرەو بەزاندنی کلێشەکانو گەڕانەوە بۆ ئاماژە مرۆییەکانی بەر لە دروستبوونی زمان، بەڵام ئەمجارەیان ئاماژە مرۆییەکان تەنها بۆ گوزارشتکردن لە پێداویستییە مادییەکانو دروستکردنی پەیوەندیی غەریزیی نێوان مرۆڤەکان بەکار نایەت، بەڵکو بۆ دروستکردنی رایەڵی فیکریشە. تا ئێستا زمانی فیکر هەوڵیداوە ژیانی مرۆیی بەو جۆرە ئاراستە بکا کە تیۆریزەی بۆ دەکاو لە وتەزاکانیدا وێنای دەکا، بەڵام سینەما قۆناغی بەجێهێشتنی ئەو جەبرەیە نەك لەڕێگەی رەتکردنەوەی فیکرەوە، بەڵکو لەڕێگەی ئاشتکردنەوەی فیکر لەگەڵ وێنە بزۆکەکانداو دەربازکردنی وێنای فیکری لە فەزای وەستاو. واتە "چیتر ژیان ناچێتە ژێر کاریگەریی وتەزاکانی فیکرەوە، بەڵکو راستتر وتەزاکانی فیکر دەهاوێژرێنە ناو ژیانەوە"(41).

بەمەش، وەك دۆلۆز دەنوسێ، "سینەما پێماندەڵێ: لەگەڵ مندا، لەگەڵ وێنەی بزۆکدا، چیتر ناتوانن خۆتان لەو شوێکە لادەن کە (بیریارەکە)ی ناختان بەئاگادێنێتەوە"(42). سینەما تەنها هونەرێکی بینراو نیە کە پرۆسەی مۆنتاجکردنی گرتە جیاوازەکان بەرهەمی دێنێ، بەڵکو هونەرێکە لە فەزای فیکریشدا جوولە دەکاو "سیفەتی بزۆکی دەبەخشێتە بیرکردنەوەی مرۆڤ، هانی دەدا پرۆسەی مۆنتاجکردن لەناو فیکردا ئەنجام بدا"(43).

## پەراوێزەکان:

(1) بڕوانە: جیانی فاتیمو، نهاية الحداثة: الفلسفات العدمية والتفسيرية في ثقافة مابعد الحداثة، ت: فاطمة الجيوشي. دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 1998، ص59.

(2) *Marshal Mcluhan، Is It Natural That One Medium Should Appropriate and Exploit Another? (Essay from: Hot and cool).*

*http://www.lcc.gatech.edu/-xinwei/classes/readings/Mcluhan/NaturalExploit.html*

(3) ستينبيرج، عن: روبرت راي *Robert B. Ray*، ما بعد الحداثة *Postmodernism*، ت: عبد الرحمن شيحة، الأدب و النقد و التاريخ الادبي، المجلس الاعلى للثقافة، 1999، ص291.

(4) عن: جياني فاتيمو، نهاية الحداثة، ص38.

(5) بروانه: هانس جورج غادامير، تجلي الجميل، ت: د. سعيد توفيق. المجلس الأعلى للثقافة، 1997، ص75–76.

(6) مارتن هايدغر، ما الفلسفة؟ ما الميتافيزيقا؟ هيلدرلن وماهية الشعر، ت: فؤاد كامل ومحمود رجب، مر: د. عبدالحمن بدوي. ط2، القاهرة: دار الثقافة، 1974، ص38.

(7) بول ريكور، الحياة بحثاً عن السرد، "الوجود والزمان والسرد"، ت: سعيد الغانمي. بيروت– الدار البيضاء: المركز الثقافي العربي، 1999، ص52–53.

(8) والتر بنيامين، عن: روبرت راي، المصدر السابق، ص303.

(9) روبرت شولز، السيمياء والتأويل. ت: سعيد الغانمي. (ط1، بيروت: المؤسسة العامة للدراسات والنشر1994)، ص48–49.

(10) بروانە: أمبرتو إيكو، التأويل بين السيميائيات والتفكيكية، ت: سعيد بنكراد. بيروت– الدار البيضاء: المركز الثقافي العربي، 2000، ص25–26.

(11) روبرت راي، المصدر السابق،ص280.

(12) ***Paul Cezanne (1839-1906): Post Impressionism. "Painting stands for no other end Than itself...". http://www.theartgallery .com.au/Cezanne.html***

(13) عن: ادوارد سميث، فن مابعد الحداثة، ت: فخري خليل. بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، ص60–61.

(14) بروانە: جياني فاتيمو، "موت الفن وأفوله"، نهاية الحداثة، ص65.

(15) مرسيا ايلياد، ملامح من الأسطورة، ت: حسيب كاسوحة. دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 1995، ص228.

(16) بۆ زانیاری زیاتر دەکرێ تەماشای لێکۆڵینەوەیەکی پێشوترمان بکرێ بەم ناونیشانە: "ئیستاتیکای گریکی"، گۆڤاری سەردەمی رەخنە، ژ: 1، 2005، ل192.

(17) "جان فرانسوا لیوتار" رەخنەدەگرێ لە دیدی باڵاخوازی ئیستاتیکای مۆدێرنیزم کە پێیوایە لەرووی فەلسەفییەوە ئیمانوێل کانت نوێنەرایەتی دەکا. ئەو دیدە، بەبڕوای "لیوتار"، تیۆریزە دەکا بۆ دەستپێوەگرتنی چێژو بەستنەوەی بەئازارەوە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکە توانای وێناکردنی جوانیی نیەو هەمیشە رووبەرێك دەمێنێتەوە کە مرۆڤ ناتوانێ پڕی بکاتەوەو ناتوانێ گوزارشت لەو شتە بکا کە بیری لێدەکاتەوە. لیوتار لەوبارەیەوە رۆمانەکانی مارسیل برۆست و جێمس جۆیس بەنمونە دێنێتەوە کە رەگەزی کات و تەکنیکەکانی گێڕانەوە لەسەر حسابی خولیایەك بەگەڕدەخەن گوزارشتی لێناکرێ. بڕوانە:

جان فرانسو ليوتار، "رد على سؤال مابعد الحداثة"، الحداثة ومابعد الحداثة، تحرير: بيتر بروكر، ت: د. عبدالوهاب علوب، مر: د. جابر عصفور. أبوظبي: المجمع الثقافي، 1995، ص226.

(18) كلمنت جرينبرج ***Clement Greenbrg*** عن: روبرت راى، مابعد الحداثية، ص293.

(19) هـ. س. پ، ل276. لەوبارەیەوە هەندێ لێکۆڵیار پێیانوایە هەرچەندە روخاندنی ئەو پرۆژە تەلارسازییە بەدینامیت لەپێناو ئامانجی کۆمەڵایەتیدا بوو، بەڵام رووداوێکی مێژوویی بوو، کۆتایی بە قۆناغێکی هونەری تەلارسازی هێنا، هەروەك چۆن دوای 30 ساڵ رووداوی تیرۆریستیی روخاندنی هەردوو تاوەرەکەی نیویۆرك، لە 11ی سیپتێمبەری 2002، وەك رووداوێکی گەورە لەقەڵەم درا کە مێژووی کرد بەدوو کەرتەوە. ئایرۆنی سەیر لەوەدایە "مینۆرۆ یاماساکی" ئەندازیاری دیزاینەری هەردوو پرۆژە رووخێنراوەکەیە:

***Can Antonio Gaudi's Grand Hotel Replace the Twin Towers? Artist: architect Paul Laffoley hopes so.***

***Http://www.lottimeaccident.com/gaudi.html***

(20) د. خالد السلطاني، عمارة مابعد الحداثة: المصطلح والمفهوم، المتاح عبر:

*http://www.ahewar/debat/print.art.asp?t=o&aid=43603&ac=2*

تيارات عمارة مابعد الحداثة: التفكيكية، المتاح عبر:

*http://www.iraqoftomorrow.org/ws_extra/popups/prinarticle.php?id=41878*

(21) عمارة مابعد الحداثة: المصطلح والمفهوم، ص4 من5.

(22) رۆبێرت رای چەرکەی تەقینەوەی خۆپیشاندانەکانی شەستو هەشتی خوێندکارانی خۆرئاوا بەیەکێك لە ئاماژەکانی دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ دەژمێرێ، بڕوانە: نوسینەکەی پێشووی، ل279. هەروەها دەربارەی مانا سۆسیۆلۆجیەکانی دیاردەی هیپیەکان لەخۆرئاوا، بڕوانە:

سایمون فريث، علم اجتماع الشباب، اتجاهات جديدة في علم الاجتماع. (بغداد: دار الحكمة، 2001)، ص418.

(23) بڕوانە: گۆڤاری سەردەم، ژمارە 8، 2000، ل 234-235.

(24) سايمون فريث، مصدر سبق ذكره، ص47.

(25) روبرت راي، مصدر سبق ذكره، ص278.

(26) أمبرتو ايكو، "الحديث عن حرب بين المرئي والمكتوب أمر تجاوزته الأحداث"، حوار أجرته: اليزابيث شيملا. ت: وليد سليمان. المتاح عبر:

*http://www.jehat.com/arabic/amber1.htm*

(27) تيردمان *Terdman* عن، روبرت راى، المصدر السابق، ص280-281.

(28) المصدر السابق، ص280 و279 و288.

(29) المصدر نفسه، ص286-287.

(30) دەربارەی پێڕەوکردنی ستراتیجی "سەرلەنوێ هێنانەوە" لە فیلمەکانی دۆگلاس سیرکدا، بڕوانە: ﻫ.س.پ، ل281-283.

(31) کۆلاج *Collage* زاراوەیەکی هونەرییە، لەزمانە ئەوروپییەکاندا بەمانای پێکەوەلکاندن دێ، وەك پێکەوە لکاندنی پاشماوەکانی تابلۆی کۆن و پارچە رۆژنامەو جلوبەرگ و وێنەی فۆتۆگرافی و شتی تر لەپێناو بەرهەمهێنانی کاری نوێدا. ئەم زاراوەیە لە کاری ئەدەبیشدا بەکاردێت، بە تایبەتی ئەو کارانەی کە کاری جیاواز و زمانی جیاواز پێکەوە دەسازێنێ، وەك لە هەندێ لە کارەکانی جویس و پاوەند و ئیلیوتدا دەردەکەوێ. دەکرێ بڵێین سینەما، بەتایبەتی سینەمای دۆکیومێنتی، لەهەموو هونەرەکانی زیاتر توانای کۆلاجکردنی هەیە، نەك تەنها لە پێکهاتە بینراوەکانی شوێندا، بەڵکو لە کۆلاجکردنی کاتە جیاوازەکان و مێژووە جیاوازەکانیشدا.

(32) روبرت راي، مابعد الحداثية، ص286.

(33) ادوارد سميث، فن مابعد الحداثة، ت: فخري خليل. بغداد: دار الشؤون الثقافية العامة، ص9.

(34) روبرت راي، ص288.

(35) *Michael Payne، Reading Knowledge: An Introduction to Barthes، Foucault، and Althusser. Malden: Blackwell،1997، p.4.*

(36) روبرت راي، ص298-300.

(37) ادوارد سميث، فن مابعد الحداثة، ص21.

(38) عن: جابر عصفور، آفاق العصر. دمشق: دار المدى، 1997، ص12-13.

(39) روبرت راي، ص292.

(40) بڕوانە: جيل دولوز، الصورة- الزمن، ت: حسن عودة. دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 1999، ص31-41.

(41) جيل دولوز، الصورة- الزمن، ص249.

(42) جيل دولوز، الصورة- الزمن، ص208.

(43) جيل دولوز، الصورة- الزمن، ص210.

# سینەما، زمانی هاوبەشی جیهانی هاوچەرخە

**لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**

سینەما هونەرێکی زۆر گەنجە. ئەم هونەرە، بەرهــــەمی بــــە لوتکەگەیــــشتنی ســــەردەمی تەکنــەلۆژیاو پیــشەسازییە. ئاشــکرایە مــرۆڤ ئەگەر نەیتوانیایە ئاست و پلەیەکی تایبەتی و دیــاریکراوی لــە پیــشەسازیی و تەکنــەلۆژیا بەدەســـتبهێنایە، لەبێخـــەوە ئـــەم هونـــەرە نەیــدەتوانی بێتــەئاراوە. لەبــەر ئــەم هۆیــەی سـەرەوە هـەروەها بـەهۆی پەیوەسـتیی لـەجاران زیــاترو ئاشــکرای ئــەم هونــەرە بەچــالاکی و داهێنانە پیشەسازییەکانەوە، زۆر لە پسپۆڕان و شارەزایان، سینەما بە هونەرێکی رووت نازانن، بــەڵکو ســـینەما بەهونـــەر– تـــەکنیک (*Art-Technic*) لەقەڵەمدەدەن.

رەنگە لەبەر هەمان ئەم هۆو ئەنگێزەیە بێت کـە هەنـدێکی تـر لـە پـسپۆڕان و تیۆرسـینانی دنیــای هونــەرو رۆشــنبیریی، دژی ناوهێنــانی سینەمان وەکو (هونەری حەوتەم)، شانبەشانی هونـەرەکانی تـری وەکـو ئـەدەب، شـێوەکاریی، شانۆ، مۆسیقا، پەیکەرسازیی و تەلارسازیی و ئەو ناونیشانە بەشایستەی هونەری وێنەگرتن دەزانـن. بـەڵام راسـتی مەسـەلەکە ئەوەیـە کـە ناونـانی سـینەما بەهونـەری حەوتـەم زیـاتر لـەو ئەنگێزەیـەوە سەرچاوەی گرتووە کـە بـەجۆرێك دەتوانرێ سینەما بە کۆکەرەوەو سوودوەرگر لە هونەرەکانی تر بزانرێت. سینەما خۆی لەخۆیدا سوود لـە هونـەرەکانی تـر وەردەگـرێ و فۆرم و ناسنامەی خۆی پێدروستدەکات. لە سینەمادا گـەلێ ئامـاژەی جـدی وێنـەگرتن بەدیـدەکرێت. هـــــەروەها چـــــەند رەهەنــــدو رەگـــــەزێکی تەلارسـازیی و مۆسـیقاو شـانۆش لـە سـینەمادا هـــەن. ئەگەرچـــی هـــەموو ئـــەم بەڵگـــەو ئاراستەکردنانە هێشتا نەیانتوانیووە بەتایبـەتی یـارانی جـدی و شـەیدایانی هونـەری وێنـەگرتن قایلبکـەن لەیانـەی حـەوت هونەرەکـەدا بـەلای هونـەری وێنەگرتنـدا نەچـێ و بـاوەڕ بـەوەبهێنێ کە سـینەما جێگـەی گرتۆتـەوە. بـەڵام لەلایـەکی تریشەوە سینەما، بەسەر هونەرەکانی تردا زاڵە. ئـەوەش بریتییــە لــە ئامــادەگیی هەواڵــسازو سەرنجڕاکێـشەرانی سـینەما لـە بـیرو مێـشکی مرۆڤ و کۆمەڵگادا. سینەماو رووداوە ناوەکی و

دەرەکییەکانی، سینەماو رووداوە سەرەکی و لاوەکییەکانی، هەمیشە لەناو ئەو هەواڵ و دەنگ وباسانەدا لەپێشی پێشەوە بووە کە مایەی سەرنجی توێژە جیاجیاکانی خەڵك بوون لە کۆمەڵگا و وڵات و کلتورە جیاوازەکاندا. زۆر لە بڵاوکراوەو گۆڤارو رۆژنامەکان، بەدەر لە پسپۆڕ و ناپسپۆڕ و سیاسی و خێزانیی و تەنانەت وەرزشیش هەمیشە وەکو رێگایەکی دڵنیا بۆ راکێشان و هێشتنەوەی خوێنەر لە هەواڵە سینەماییەکان دەڕوانن.

هۆی ئەمە چییە؟ ئاشکرایە کە ناتوانرێ بەهاو کاریگەریی تایبەتیی بۆ هونەری سینەما لە ژیانی خەڵکدا ئەویش لە کۆمەڵگاو کلتورە جیاوازەکاندا دابنرێت. ئەم گۆتەیە هەرگیز لە سنووری سەرقاڵکردن و کات بەسەربردن و لە بازنەی خۆشڕابواردن و کاتکوشتن تێپەڕنابێت. کەواتە هۆی ئەم هەموو بایەخپێدانە بەم هونەرەو ئەم هەموو پێشوازیلێکردنەی و حەزی تایبەت لە دەقەکەی و نووسینی سەر شاشەکەی چییە؟

دەتوانین لە خاڵێکی دیکەوە لەم بابەتە بڕوانین: لەم سەدانەی دواییدا، سینەماو رۆمان، زمانی هاوبەشی جیهان بوون. کاریگەریی رۆمان لە بیناکردنەوەی کلتورو گوێزانەوەی کلتوردا بۆ کۆمەڵگاکانی تر، ناکرێ نکۆڵی لێبکرێت. بەتایبەتی لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا لە خۆرئاوادا، نموونەیەکی رۆشنی ئەم مەسەلەیەیە. روسیای قەیسەری، بە یارمەتی دەستەیەك لە بلیمەتانی راستەقینەی رۆماننووسین کە دەستی قەدەر لە ماوەیەکی زەمەنی کورتدا لەو وڵاتە کۆیکردبوونەوە[1] توانی لەڕووی رۆشنبیرییەوە، لەو ماوەیەدا، پێگەیەکی تایبەت بەدەستبهێنێت.

ئەو پێگەیەی تەنانەت لەوەشدا رۆڵی هەبوو کە ئەو ئایدیۆلۆجیایانەی لە روسیا سەریان هەڵدا هەژموونیان هەبێ و بە سەراپای جیهانیشدا بڵاوببنەوە.



لەگەڵ داهێنانی سینەما لە ساڵی 1895 داو پاشان ئامادەگیی جدی چیرۆکی سینەمایی لە سەراپای جیهاندا لە ساڵی 1920 بەدواوە، ئەوە سینەمابوو کە وردە وردە، جێگای رۆمانی گرتەوە. ئەم رەوتە بەردەوامبوو تا ئەو شوێنەی بەکردەوە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە، سینەما وەکو گرنگترین زمانی هاوبەشی جیهانی هاوچەرخ ناسرا. پاشان لە ساڵی 1955 دا لەگەڵ داهێنانی تەلەفزیۆندا، وەکو برابچووکی سینەماو پەرەسەندنی لە ڕادەبەدەری لە سەراپای جیهاندا، کێشەیەکی تازە لە هونەرە نمایشییەکاندا بەناوی زنجیرەو فیلمە تەلەفزیۆنییەکانەوە لەدایکبوو، و بەجۆرێك لەجۆرەکان، بەماناو چەمکی سینەما، لێکچوون

و وەکیەکی پەیداکرد. لەوەبەدواوە، ئەم دوو گۆتەیە (سینەماو زنجیرەی تەلەفزیۆنی) بەکردەوە ڕەنگدانەوەی یەك ماناو چەمکی هاوشێوەن.

رازی ئەم کاریگەریی و هەژموونە گشتیی و جیهانییە چییە کە سنوورو نەتەوە دەبەزێنێ؟ ئایا فۆرم و پێکهاتەی تەکنەلۆژیایی و مۆدێرنی ئەم هونەرە، لەم کاریگەرییەدا، ڕۆڵی سەرەکی هەیە؟ پێویستە بگوترێ کە بەرهەمە سینەماییەکان و (ریکلام بۆ زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان) پێویستی بە باکگراوندو پێشەکی پێویست هەیە، لە بابەتی خوێندەواریی، توانای چاپ و بڵاوکردنەوە، پێویستیی وەرگێڕانی تەواوەتی، بوونی کات و دەستبەتاڵیی تایبەتی و لەم بابەتە. ئاماریش ئەوە نیشان دەدات. نەك تەنیا لە ئێران، بەڵکو لە زۆر شوێنی جیهاندا، ڕادەی کات تەرخانکردنی تاکەکانی کۆمەڵ بۆ تەماشاکردنی تەلەفزیۆن و سینەما، سەدان ئەوەندەی کات تەرخانکردنە بۆ خوێندنەوەی کتێب و ڕۆمان. تا ئەو شوێنەی کە رووبەرێك بۆ ئەم بەراوردە نابەرامبەرە، نامێنێتەوە! بەڵام گرنگترین و سەرەکیترین هۆ بۆ کاریگەریی بەهێزو هەژموونی بێوێنەی فیلم وسینەما لەسەر هەموو چین و توێژەکانی خەڵك لە هەموو کۆمەڵگاو وڵاتەکاندا ئەوەیە کە سینەما زۆر واقیعی و بەشێوەیەکی باوەڕپێکراو، ژیان بەتەواوی وردەکارییەکانی و هەموو ئەو هەستو سۆزەوە کە تیایدا دەگوزەرێ، دەخاتە بەرچاوی بینەر. سینەما بەجادوی تایبەتی خۆی، هاوکات، دەنگ و ڕەنگی راستەقینە، بۆ بینەر دادەڕێژێتەوەو دەیخاتەوە بەرچاوی ڕێك بەهەمان شێوەی کە لە ژیانی واقعیدا تاقیکردۆتەوە. لە هەمان ڕووەوە، هەست و سۆزو جووڵەو جۆش و خرۆشی رۆحی و دەروونیش بەهەمان ڕادەی خودی ژیان بۆ بینەر دەخوڵقێنێتەوە.

سینەما تەنیا بۆ بینەر نمایش ناکات، بەڵکو دەستی دەگرێ و جادوگەرانە دەیبات بۆ ناو دنیای فیلمەکەو لەخەم و خۆشی، سەرکەوتن و ناکامیی، تووڕەیی و لێبوردن، خۆشەویستیی و رقلێبوونەوە و... هتددا دەیکات بەشەریك و هاوڕێ و هاوشان. بە دەربڕینێکی ئاشکراوباو، سینەما کارگەی خەون دروستکردنە، ئەویش لە بێداریدا. لەم جۆرە کارلێکردن و سوودوەرگرتنەدا لە سینەما (ڕەنگە سینەماش سوود لە بینەر وەربگرێت) تاڕادەیەك هیچ جیاوازییەك لەنێوان کۆمەڵگاو میللەتە جیاوازەکان و کلتورە جۆراوجۆرەکاندا نییە.

دیمەنێکی ڕۆمانسی یان کۆمیدی یان ڕووداوێکی ناخۆش و ترسناك چەند کار لە بینەرێکی سویدی دەکات بەهەمان ڕادەش کار لە بینەرێکی کینیایی، ئیکوادۆری (کە ڕەنگە زۆر لە خوێنەرانی ئەم بابەتە، نەزانن ئیکوادۆر کەوتۆتە کوێی جیهانەوە)، یان بینەرێکی هۆنگ کۆنگی، ئینگلیز، روس یان عەرەب یان سەر بەهەر ناوچەیەکی تری جیهان دەکات. تەواوی ئەم هۆو فاکتەرانە، سینەماو هونەری سینەمایان کردووە بەزمانی هاوبەشی جیهان. (پێویستە سەرنجی ئەوە بدرێت کە سروشتی ئەم باسە تا ئێرەو ئەو ئەنجامەی سەرەوە، بەچاوپۆشی لە بڕیاردان لەسەر باشی یان خراپی ئەم مەسەلەیە ئەنجامدراوە، و قسەوباس لەسەر چۆنیەتی سوودوەرگرتنی ئێمە یان کەسانی دیکە لەم

تایبەتمەندییەی هونەری سینەماو ئەو باسە ئاکارییی یان فەلسەفیانەی لێیەوە سەرچاوە دەگرن– کە دەچنە بازنەی بەکارهێنان و کاریگەریی ئەم گۆتەیەوە– باسێکی جیایە، کە لەم وتارەدا بە ڕەهەندەکانییەوە قسەی لەسەر دەکرێت.)

***

## حاڵی حازر سینەما لەجیهان و ئێراندا چ پێگەیەکی هەیە؟

لە هەنگاوی یەکەمدا، دەبێت ئەوە بەیاد بهێنینەوە کە لەنێوان 198 وڵاتی سەربەخۆو ناسراوی جیهاندا، دەتوانریْ تەنیا کەمتر لە (50) وڵات ناوبرێت کە بەشێوەیەك لە شێوەکان خاوەنی پیشەسازی سینەمان. ئەمەش بەو مانایەیە کە زیاتر لە سیْ لەسەر چواری وڵاتانی جیهان، بە ڕەهایی بەرهەمی سینەمایی وڵاتانی تر بەکاردێنن و خۆیان بەتەواوی توانای بەرهەمهێنانیان نییە لە بواری ئەم هونەر– تەکنیکەدا. لەناو ئەم کەمتر لە(50) وڵاتەشدا، زۆربەیان بەرهەمێکی زۆر دیاریکراویان هەیە واتە لە ساڵێکدا بەڕادەی یەك تا سیْ فیلم. هەندێکیشان بەچەند ساڵێك فیلمێك بەرهەم دێنن. تەنانەت وڵاتێکی وەکو سوریا، کە هاندەرێکی زۆری ڕۆشنبیریی هەیە لە ناوچەکەو جیهانی عەرەبداو فێستیڤاڵی فیلمی دیمەشق یەکێکە لە فێستیڤاڵە دیارەکانی جیهانی عەرەب، ئاماری بەرهەمی ساڵانەی سینەمای ئەم وڵاتە هەر لەو سنوورەی سەرەوەدایە. تەنیا نزیکەی (15) وڵات لە جیهاندا هەن کە بەشێوەیەکی جدی و بەردەوام و سیستماتیك و بنەڕەتیی، خاوەنی پیشەسازی ناسراون لە بواری سینەمادا. ئەم وڵاتانە، پەیوەندیان بە یانەی بەرهەمهێنەرانی زیاتر لە(50) فیلمەوە هەیە لە ساڵێکدا. ئێرانیش یەکێکە لەم وڵاتانە. لەم ریزبەندییەدا، چ لەڕووی چەندایەتی بەرهەمو چ لەڕووی چۆنایەتییەوە، ئێران لەپلەی دەیەم تا سیانزەهەمدایە، لەڕاستیدا، لەناو گروپی پێشڕەوی خاوەن پیشەسازی سینەما لە جیهاندا ئێران ئامادەگیی هەیە. ئێران بە بەرهەمهێنانی مامناوەندی (60 بۆ 70) فیلمی سینەمایی لە ساڵێکدا، پێگەیەکی پتەوی لەناو ئەم گروپە (15) ئەندامییەدا بۆ خۆی دەستەبەر کردووە.



لەڕووی چەندایەتی و ژمارەی بەرهەمی ساڵانەوە، پلەی یەکەمی بەرهەمهێنان بەر هندستان دەکەوێت! بەرهەمهێنانی فیلم لە هندستان ساڵانە دەگاتە هەزار فیلم، کە ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەرە. ناوەندی بەرهەمە سینەماییەکانی هندستان و شوێنی چالاکی زۆربەی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی فیلمی ئەم وڵاتە لە بەندەری (بۆمبای) ە، کە ئەم بەندەرە بۆخۆی بەتەنیا ساڵی (700) فیلم بەرهەمدێنیْ. بەڵام سینەمای هند، لەڕووی چۆنایەتی و قوتابخانەی هونەرییەوە، بەهاو متمانەی نییە. سینەمای هندستان بەزۆری لاساییکەرەوەو پاشکۆی سینەمای ئەمریکایە. ئەم لاساییکردنەوەو پاشکۆیەتییە تاڕادەیەکە کە تەنانەت ناوەندی سینەمایی هندو خەڵکی

سالآنەی هندیان ناوناوە (بۆلیوود)! واتە پیتی (ب) یان لەناوی بۆمبای وەرگرتووەو لەگەڵ ناوی دیاری (هۆلیوود) دا تێکەڵیان کردووە، و بە شانازیی تەواوەوە، پیشەسازی سینەمای خۆیان بە بۆلیوود ناودەبەن.

لە دوای هندستان، ئەمریکا بەپلەی دووەم دێت، کە سالآنە نزیکەی (800) فیلم بەرهەمدێنێ. هەڵبەتە ئەمە تەنیا لەڕووی چەندایەتیی بەرهەمهێنانەوەیە. دەنا لەڕووی سەرمایەگوزاری و هاتوچۆی سالآنەی ئابووری و رادەی فرۆشتن و ناردنەدەرەوەی فیلمەوە، ئەمریکا ژمارەیەکی زیاتر لەبیست ملیار دۆلاری دەستدەکەوێت، کە بەتەنیا هێندەی داهاتی سینەمای هەموو جیهانە. هۆلیوود کە بەمانای (دارستانی پیرۆزە)، شارۆچکەیەکی سینەماییە کەوتۆتە باکووری لۆس ئەنجلس-ەوە، لە ویلایەتی کالیفۆرنیا، شوێنی نیشتەجێبوونی زۆربەی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی فیلمی ئەمریکایی یان نێودەوڵەتییە. ئەم کۆمپانیایانە، ساڵی زیاتر لە (500) فیلم بەرهەم دێنن. بەڵام ئەمریکا ناوەندێکی سینەمایی دیکەشی هەیە. نیویۆرك شوێنی نیشتەجێبوونی هەندێ کۆمپانیای بەناو سەربەخۆی ئەمریکاییە، کە لەبنەڕەتدا، بانگەشەی ئەوە دەکەن سەربەخۆن و پەیوەندییان بەو تێڕوانین و جۆری پەیوەندییەوە نییە کە بەسەر هۆلیووددا زاڵە. ئەو فیلمسازانەی کە خۆیان بە سەربەخۆ ناوبردووەو رووبەڕووی تێڕوانینی تایبەتی هۆلیوود بوونەتەوە، لە نیویۆرك بەشێکی بەرچاوی بەرهەمی سینەمایی ئەمریکا بەرهەمدێنن. کەسانێکی وەکو وودی ئالان، فرانسیس فۆرد کاپولا، مارتین سکۆرسیزی و هتد لەم گروپە سینەماگەرەن. مایەی سەرنجە لەڕووی جوگرافیاییشەوە نیویۆرك کە کەوتۆتە ئەوپەڕی خۆرهەلآتی ئەمریکاوە، رێك بەرامبەری هۆلیوودە کە کەوتۆتە ئەمپەڕی خۆرهەلآتی ئەم ولآتەوە.

بابێینە سەر ئەندامە پێشڕەوەکانی تری یانەی ولآتە بەرهەمهێنەرەکانی سینەما کە لە(50) فیلم زیاتر بەرهەمدێنن:

فەرەنسا سێهەمین ولآتی ئەم گروپەیە. ئەم ولآتە کە تا چەند ساڵێ پێش ئێستا، بەرهەمی سینەمایی دەگەیشتە (90) فیلم لە ساڵێکدا، بەهۆی کۆمەڵێ سەرنج و تێبینیی سیاسی و رۆشنبیرییەوە، بایەخێکی تایبەتی بەپیشەسازی سینەما دا. فەرەنسا بە کۆمەڵێ هەڵوێستوەرگرتنی تایبەتی و بەربەرەکانێی بالآدەستیی کلتوریی ئەمریکا بەسەر ئەورووپادا، کە تەنانەت بوو بەهۆی رووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو ولآتە لە رێکخستنی ناوەڕۆکی پەیمانی بازرگانی جیهانیدا واتە (گات)- کە پاشان بەناوی رێکخراوی بازرگانی جیهانیەوە ناسرا (*WTO*)- هەوڵیدا سینەمای خۆی بەهێز بکات و ململانێی هۆلیوود بکات. ئەم ولآتە بە تەرخانکردنی یارمەتییەکی دارایی قەبەو پشتیوانییەکی بەرفراوان لە پیشەسازی سینەمای خۆی، لە مەیدانی ئەورووپادا خۆی نواند، و بەرهەمهێنانی چەند فیلمێکی گەلێ پڕ خەرجی (سوپەر پرود ئەکشن)ی لەبەرچاوگرت، کە لێرەدا دەکرێ ئاماژە بۆ فیلمی (نیکیتا)ی (لوك بسون) بکرێت کە لە ساڵی 1998 دا بەرهەمی هێناوەو تێچوونەکەی (90) ملیۆن دۆلارە. بە بەراورد لەگەڵ خەرجی مامناوەندی فیلمی ئەورووپایی، کە لەخوار (10) ملیۆن دۆلارەوەیە، و بە بەراورد لەگەڵ پڕخەرجیترین

فیلمی ئەوروپایی تا ئەوکاتە کە تێچوونەکەی تەنیا (30) ملیۆن دۆلاربوو، خەرجی ئەم فیلمە تەواو سەیرو بێوێنە دێتە بەرچاو.

لەم ساڵانەدا فەرەنسا، لەرووی چەندایەتیشەوە بەرهەمی سینەمایی خۆی زیادکرد، سەرەنجام لە ساڵی 2002 دا، بەرهەمهێنانی گەیشتە (230) فیلم. بەم ئاستی بەرهەمهێنانە، فەرەنسا تاڕادەیەك خۆی لە گروپی ئەو(15) وڵاتە جیاکردەوە کە لە سینەمای جیهاندا تاڕادەیەك لەپێش بوون و لە دوو وڵاتی یەکەم و دووەم نزیکبۆوە.

دوای فەرەنساش هۆنگ کۆنگ دێت کە ساڵی (150) فیلم بەرهەمدێنێ– هەڵبەتە هەموو فیلمەکان تەقریبەن باسی یەك بابەت دەکەن و ناوەڕۆکێکی هاوبەشیان هەیەو زیاتر بایەخ بە وەرزشی شەڕکردن دەدەن. (وەکو جۆدۆو کاراتی).

لەم کۆمەڵە وڵاتەدا دەکرێ ئاماژە بۆ باقی وڵاتەکانی تری وەکو ئیسپانیا، ئیتالیا، بەریتانیا، و... ئێران بکرێت. هەروەکو پێشان وترا، ئێران بە بەرهەمهێنانی (60 بۆ 70) فیلم لە ساڵێکدا، لە دەوروبەری پلەی دەیەم تا سیانزەهەمدایە. نابێ بەهیچ جۆرێ ئەم توانا زۆر و پراکتیکە، بە کەم بگیرێت. ئایا ئێمەی ئێرانی لە پیشەسازیدا، پلەوپایەیەکی وامان لە جیهاندا هەیە؟ ئەی لە بواری پزیشکیدا حاڵمان چۆنە؟ ئایا بازاڕی بۆرسەی ئێمە لەناو پانزە بۆرسە لەپێشەکەی جیهاندایە؟ لە وەرزشدا ئایا بەرزترین و باشترین پلەی گشتیی و جیهانیی ئێمە (لەناو وڵاتەکانی ئۆلەمپیکدا) بیست و چەندەم نەبووە؟ لە ئۆتۆمۆبیل دروستکردن و بوارە قەبەکانی تردی بەرهەمهێناندا حاڵ و باڵمان چۆنە؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبێت ئاگامان لەوە بێت کە سینەما لەدەستەی ئاڵۆزترین و قورسترین و پرۆفیشناڵترین لقەکانی هونەرە، و رەنگە هۆی ئەوەی کە زۆربەی وڵاتانی جیهان لەم بوارەدا، تەنیا بەکاربەری بەرهەمی سینەمایی وڵاتانی ترن ئەوە بێ کە سینەما لە ئاستێکی باڵادایەو لە رووی هونەرییەوە ئاڵۆزەو پێداویستییەکانی دەگمەنن، ئەم وڵاتانەش لەم بوارەدا دەستیان بەهێزی پسپۆڕ و شارەزای ئەم کارە نەگەیشتووە. ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئێران، سەرەڕای هەندێ کێشەو گیروگرفت، خاوەنی ژمارەیەکی باشە لە هێزی مرۆیی و ئامێری تەکنیکی و کەرەسە پێویستەکان و ستۆدیۆ و هتد. بەڵام رێك لێرەدا، ئەم زانیاری و ئامارانە، هێواش هێواش و بەرە بەرە ئەو پرسیارە تایبەتە لە مێشکی خوێنەراندا تۆخ و تۆختر دەکاتەوە: کەواتە بۆچی حاڵی سینەمای ئێران، لەناوخۆدا ئاوا مایەی دڵتەنگییە؟[2]

## پەراوێز:

1–هەڵبەتە بێگومان پسپۆڕان و شارەزایانی ئەدەب، گەلێ هۆی دیکە جگە لەدەستی قەدەر بە کاریگەر دەزانن سەبارەت بە گردبوونەوەی سەرسوڕهێنەری ئەم بلیمەتانە لەو کات و شوێنەدا کە بابەتی باسەکەی ئێمە نییە.

2–لەکۆتایی ئەم باسەدا بەئەنقەست چەند دێڕێکم وەرنەگێڕاوە لەبەرئەوەی پەیوەندی بەناوخۆی ئێرانەوە هەیەو نووسەر لە باسەکەی دەرچووە.

## سەرچاوە:

سایتی سورە مهر

# پییرپاولۆ پازۆلینی له ژێر ئالآی رامبۆدا

نۆمی گرین

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

لــە هــاوینی ســاڵی 1987 دا، خــۆم لــە نــاو شــەمەندەفەرێکدا بــینی کــە بــەرەو (کاسارســا دیــل ولیــزی) دەچــوو، شــارێکی بــچووک لــە ناوچــەی فریــولی لــە بــاکووری خۆرهــەڵاتی ڤینیــسیا. لەبەرئــەوەی شارۆچــکەی کاسارســا پەیوەندیــەکی زۆر تونـد و تـۆڵی بـەدوا قۆنـاغی تەمـەنی نووسـەرو دەرهێنــەر پییرپــاولۆ پازولینیــەوە هــەبوو، بــەلای منــەوە ئــەو ســەفەرە وەك زیــارەتێکی ڕووناکبیری وا بوو.

بایەخدانی من بە پازۆلینی لە پێش چەند ســاڵێکەوە دەســت پــێ دەکــات، کاتێــك لــە دوا نیوەڕۆیەکی باراناویدا لە پاریس — ئەو شارەی بــەردەوام پــازۆلینی تیایــدا جێگــای ســەرنج و سەرسامیی بــووە— هاوڕێیــەکم دنــەی بینــینی یــەکێك لــە فیلمــەکانی پــازۆلینی دام. هــەر ئەمــەیش بــوو بــە هــۆی ئــەوەی لــە ســەرەتای حەفتاکانـدا لـە ڕۆمـا نیـشتەجێ بم. لـەو کاتـەدا پــازۆلینی لــە ژیــانی ڕوونــاکبیری و سیاســی ئیتالیادا گرنگترین کەسایەتی جێگای مشتومڕ لەسەرکردن بوو.

لە ڕۆماوە بۆ کاسارسا، یان بە پێچەوانەوە، قۆناغێکی گرنگە لە ژیانی پیشەیی پازۆلینیدا. دوای ئەوەی لە کاسارسا لە بواری ئەدەبیدا وەك شــاعیرێك دەرکــەوت، لــە ڕۆمــادا جــێگیر بــوو ناوبــانگی دەرکــرد. یەکــەمجار وەك شــاعیر و ڕۆمــاننوس و وتــارنووس و پاشــان وەك فــیلم سازو لە دواییـشدا وەك لێکۆڵـەری سیاسـی کـە گەلێك چەند و چوونی وروژاند.

لــە تــشرینی دوەمــی ســاڵی 1975دا، لــە ئـەنجامی تیرۆرێکـی دڕندانـەدا —پـێ دەچـێت گـەنجێکی هۆمـۆ کـردبێتی— کۆتـایی بـە ژیـانی پیاوێك هات کە لەو کاتـەدا نـەك وەك شاعیرێکی زۆر دیـار، بـەڵکوو وەك یـەکێك لـە بیرمەنـدەکانی ئـەوروپای ئـەو قۆناغـەی دوای شـەڕی جیهـانی تەماشا دەکرا.

پازۆلینی لە ئیتالیادا پێگەیەکی هەیە دەشێ بە پێگەی سارتەر لە فەرەنسادا بەراورد بکرێت. پازۆلینی لە گۆرستانە چکۆڵەکەی کاسارسادا بە پاڵ دایکی و هەندێك لە کەس و کاریدا نێژراوە.

دایکی مامۆستایەکی خوێن شیرینی قوتابخانەو ژنێکی بە ئەسڵ گوندی و خاکیی ناوچەی فریولی بوو. بەڵام باوکی لە بنەماڵەیەکی نیمچە خانەدانی لاڤینایە، دوای ئەوەی میراتیەکەی باوکی بەهەدەردا پەیوەندی بە سوپاوە کرد. دەبوو پازۆلینی بەو مووچە کەمە بژی کە باوکی وەریدەگرت. پازۆلینی ساڵی 1922 لەدایك بوو "ئەو ساڵەی کە مۆسولینی گەیشتە دەسەڵات" وەك وردە بۆرژوایەك منداڵی بەسەربرد کە خۆی ناوی لێناوە "هەژاریەکی خانەدانانە".

جیاوازی نێوان ڕیشە کۆمەڵایەتیەکەی باوك و دایکی جیاوازی تری – مەزاجی و فیکری – لێکەوتەوە، کە وەك ئەنجام بە جیابوونەوەیان کۆتایی هات و ئەمەیش بۆ ماوەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر دوالیزمی ڕوانینی پازۆلینی دانا لەسەردنیا. بەپێی قسەی نیکونالدینی ئامۆزای پازۆلینی، هاوسەرگیریەکە سەرکەوتوو نەبوە، سۆزانای دایکی خۆشەویستیەکی زۆری بۆ پازۆلینی هەبوە بەڵام چ خۆشەویستیەکی بۆ مێردەکەی نەبوە.

پازۆلینی خۆی دان بەوەدا دەنێت کە هەر لە منداڵیەوە "هەستێکی دوژمن کارانەی گەورە" لە نێوان ئەوو باوکیدا هەبووە، سروشتی باوکی زۆر جیاواز بووە لەگەڵ سروشتی نەرم و نیانی دایکیدا کە ئەم بە سروشتێکی "تیژ و حەزی خاوەنداریەتی" ناودێری دەکات. هەرچەندە دایکی پازولینی سیستمی کۆمەڵایەتی نەخستۆتە ژێر پرسیارەوە بەڵام دژی فاشیزم بووە. بە پێچەوانەی دەستەڵات خوازیی باوکیەوە کە هەر لە سەرەتاوە بە خۆشیەوە پێشوازیی لە ڕژێمی موسۆلینی کردووە. لەبارەی ناکۆکی نێوان باوکی و دایکی و کاریگەریی قووڵی لەسەر لاویەتی ئەم پازۆلینی دەڵێت: "هەموو ژیانم، کاریگەریی ئەو دیمەنانەی پێوەیە کە باوك و دایکم تەوەری بوون. دیمەن گەلێك کە تۆقینیان لە مەرگ تیا دروست کردم، باوکم لە دایکمی دەدا چونکە ئەم سەری لە ناو هەورا بوو، لە ڕاستیا باوکم فاشی بوو بەڵام دایکم نا. ژیان لە ناو هەورا بە نیسبەت باوکمەوە مانای ئەوە بوو گوێ بە داب و نەریتی باوو یاسای دەوڵەت و بیری ئەو کەسانە نەدەیت کە لە نێو دەسەڵاتدان".



یادەوەریەکانی منداڵی بەردەوام لەگەڵ پازولینیدا ژیاوە، لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، بە (داسیاماريني) هاوڕێی دەڵێت: تا تەمەنی سی ساڵانیش بە شێوەیەکی خودئەڤینی سەرلەنوێ لەگەڵ منداڵیمدا دەژیام.. ئەوە ناوازەترین قۆناغی ژیانم بووە... زۆر زۆر بە تاسەیەوە دەژیام".

ئەگەرچی پازۆلینی لە تەمەنی هەڵکشاوتریدا ئەو قۆناغە "ناوازەییە" بە جۆرێکی دی دەبینێت. بەڵام هەمیشە خۆشەویستیەکی گەورە بۆ دایکی دەردەبڕێت کە بە درێژایی تەمەنی لەگەڵیدا ژیاوە. کەچی بە

پێچەوانەوە سۆزێکی پەرت و بڵاوو شپرزەی بەرانبەر بە باوکی هەیە. ئەو وەك خوێنەرێکی جیدیی فرۆید، بەردەوام ویستوویەتی ئەو مانایانە بپشکنێت کە پەیوەندی ئەم بە باوك و دایکییەوە دەبەستنەوە. لە زنجیرە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەنووسی فەرەنسی جان دیفلو دەڵێت: "بەداخەوە تۆ شیکارێکی سایکۆلۆژی نیت.. من زۆر خۆم هەڵدەقورتێنمە ئەو مەسەلانەو بەدوایاندا دەگەڕێم، ئەوەندەیشم خوێندونەتەوە کە گومان لەوە بکەم دەربارەی پەیوەندی خۆم بە دایك و باوکمەوە بتوانم بە زمانی سادەی شیعری و تەنانەت چیرۆکیش قسە بکەم.. بە سادەو ساکاری دەڵێم من ئەزموونی خۆشەویستیەکی گەورەی دایکمم کردووە.. ئامادەگیی دایکم، شێوازی قسەکردن و ناسکی و لێهاتووییەکەی، هەموو ئەم شتانە کاریگەری زۆریان لەسەر منداڵیم داناوە. تەنانەت بۆ ماوەیەکی درێژیش من بڕوام وابوو کە هەموو ژیانم، بە هەڵچوون و هەستیاریەکانیەوە، بەو سۆزە هەڵچووەوە داڕێژراوە کە هەندێك جار وام هەست دەکرد شێوازێکی نائاساییە لە شێوازەکانی خۆشەویستی. بەم دواییەیش هەستم کردووە کە پەیوەندیی سۆزداریم بە باوکمەوە بەردەوام گرنگییەکی هەبووە کە گرانە لەبیر خۆتی بەریتەوە، پەیوەندیەك کە تەنیا پەیوەندی موونافەسە و خۆشنەویستنی یەکدی نەبوە بە رووتی.

خۆشویستنە "نائاسایی"یەکەی پازۆلینی بۆ دایکی بەو مانایەیە کە دایکی بە میساڵیەتەکەی و بڕوابوونی بە جوامێری و چاکە و خواپەرستی و دەست و دڵکراوەیی مەیلی زۆر قووڵی لە پازۆلینیدا دروست کردووە. پازۆلینی تا رادەیەکی باش لە بیروباوەڕەکانی دایکی وەرگرتووە. بە تایبەتی رێزگرتنی لە "دەسەڵات" کە هۆکاری رێزگرتنی بوو لە داب و نەریت و رەنگە لە یاخیگەرییش.

دوای ساڵانێکی زۆر پازۆلینی کە بە زمانی کەسی سێیەمەوە باس لە خۆی دەکات دەڵێت: "ئەو بە دوای دەستەڵاتێکدا دەگەڕا کە ترسی دایکی لێ دەکەوتەوە نەك لەو دەستەڵاتەی کە باوکە فاشیزمەکەی ئەزموونی دەکرد.. لەبەرئەمە، دیسانیش دووبارەی دەکەمەوە، پابەندبوونی ئەو بە داب و نەریتەوە –کە سەرچاوەکەی دایکیەتی نەك باوکی– بۆ ماوەیەکی زیاد لە ئاسایی رێگای ئەوەی پێنەداوە لە جەوهەری ئازادی و یاخی بوون بگات، چونکە ئازادی و یاخی بوون وەك نان وابوە بۆی".

ئێمە لە قووڵایی ئەم پەیوەندیە دژبەیەکەدا، پابەند بوون بە داب و نەریت و یاخی بوونەوە، لادانی سێکسی دەدۆزینەوە. بە نیسبەت پازۆلینیەوە، ئەو ستایڵە سێکسیەی کە پاشان لە خۆی دەگرێت، تەنانەت لە سەرەتای منداڵیشیدا لێی دەرکەوتوە، ئەوەی لە تەمەنی بیست ساڵیدا لە یاداشتەکانی رۆژانەیدا نووسیویەتی، ئەوە دەردەخەن کە کاردانەوەیەکی توندی هەبوە کاتێك لە تەمەنی سێ ساڵیدا هەستی بەوە کردووە کە حەزی لە یاری کۆڵ کۆڵێنە لەگەڵ منداڵدا.

ئەگەر ئەم دێڕانە تەعبیر لە سروشتی ئارەزوە سێکسیە بەراییەکانی پازۆلینی بکەن، ئەوەیش دەردەخەن کە چۆن پازۆلینی بۆ لەوەودوا بەردەوام شەیدای وشە بووە – لەم حاڵەتەدا (تیتافیلیتا)ی بەکارهێناوە کە پاشان

دەرکەوتوە وشەکە ئیحای مانایەکی سێکسی دەدات – تیتس.

"من ئێستا تێدەگەم کە ئەوە هەستێکی بەهێز بوو، کە بیری لێدەکەمەوە لە ناوەوەمدا تەواو هەست بە توانەوەو خەم و هەڵچوونی توند دەکەم. هەست بە شتێك کە ناتوانیت بە جەستە هەڵی بگریت، هەستێکە تا ئێستا ناوی بۆ نەدۆزراوەتەوە، من خۆم دامهێناوە و ناوی تیتافیلیتام لێناوە، هەر ئەوەندەی لە کاتی چالاکی و یاری و نوشتانەوەیاندا لاق و لەتەریانم دەبینی ئیتر بەخۆم دەوت من هەست بە "تیتافیلیتا" دەکەم، کە شتێکە لە ختووکەدان و وەسوەسە و زەلیلی" ئاماژەیش بە "زەلیلی" لە کۆتایی ئەم پەرەگرافەدا دەبێتە تەوەرێکی دی بۆ یاداشتە ڕۆژانەییەکانی پازۆلینی. لەوێدا باسی ئەزموونێکی تری دوای دوو ساڵی خۆی دەکات کە لەو کاتەدا تەمەنی پێنج ساڵان بووە. کاتێك ریکلامی فیلمێك دەبینێ کە پاڵەوانەکەی پیاوێکە و پڵنگێك برینداری دەکات.. کە دوای چەند ساڵێك ئەمەی بیر دەکەوێتەوە دەڵێت ئەوە یەکەمین ئەزموونی بوە لەگەڵ سینەمادا کە ئەزموونێکی کاریگەرە.

"سەرکێشە بچکۆلەکە وای دەزانی هێشتا هەرماوەو دەژی، لەگەڵ ئەوەیشدا کە پڵنگەکە نیوەی لەشی قووت داوە، ئەو بە ڕاکشانەوە سەری داخستبوو، وەك ژنێکی ڕووت کە توانای بەرگری کردنی نەبێت، لە کاتێکدا پڵنگەکە زۆر دڕندانە لە ژێر خۆی نابوو، لێرەوە هەستێکی لەم شێوەیە دایگرتمەوە کاتێك کە لە پێش دوو ساڵدا منداڵەکانم لە بیلونو بینی یاریان دەکرد. بەڵام ئەم هەستەیان تەمومژاوی و سەخت تر بوو.

بە ڕاستیی لە ناوەوەی خۆمدا هەستم بە موچڕکێك کرد کە جۆرێك بوو لە بەئاگاهێنانەوە، لەو کاتەدا هیوای ئەوەم خواست من ئەو دۆزەرەوە "مکتشف"ە بوومایە کە دڕندەکە هەر بە زیندوویی کە ئامبازی بوو بوو".



لەم پەرەگرافەدا کە هەستیاری و مەیلی چوونە ناو خودەکانی بە ئاشکرا تیا دەردەکەوێت – بە شێوەیەکی تاڕادەیەك یەك لاییکەرەوە– لە تەمەنێکی منداڵییەوە پازۆلینی بەرەو شیعر دەبات. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، کە دایکی بە شیعرێك خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕێت، دوای چەند ڕۆژێك پازولینی چەند دێڕە شیعرێکی تایبەتی بۆ دەنووسێت کە وشەی ئەدەبیانەی تیایە لە بابەتی "هوزار" و "قەشەنگ".

پازۆلینی بە داسیامارلینی وتوە: "لە تەمەنی چواردەساڵیدا ماکبێسی خوێندۆتەوە، ئەو جێگایانەی دۆزیوەتەوە کە کتێبی دەستی دوویان تیا فرۆشتووە، بڕوایشی بە خودا نەماوە". دوای ساڵێك و پاش ئەوەی ئارسەر رامبۆی شاعیری فەرەنسای خوێندۆتەوە، باری

سەرنجی دەربارەی دنیا گۆڕاوە. پازۆلینی مەستی بلیمەتی رامبۆی هەرزەکار بوو.. هەروەها سۆز و یاخیگەری ڕامبۆو، پەیوەندی خۆشویستنە شوومەکەی بە شاعیری ژندار پول ڤیرلینەوە و پاشان هەڵاتنە رۆمانتیکیەکەی ڕامبۆ لە ئەوروپاوە بۆ ناوجەرگەی ئەفریقای رەش، هەموو ئەمانە پازۆلینیان بەرەو لای رامبۆ بەکێش کرد.

دۆزینەوەی ئەم "شاعیرە نەفرەتیە" مەزنە وەك نیکوی ئامۆزای ناودێری دەکرد، وەك ئەوە وابوو کە پازۆلینی دارشتنەوەیەکی تری ئەدەبی و سیاسی تیا کرابێت کە لە چرکەساتێکدا کلتووری ئەدەبی و لۆکاڵی و خۆبەستنەوە فاشیانەکەی بە داب و نەریتەوە ورد و خاش بووبێت و تەنانەت شوناسەکەیشی، وەك شاعیرێکی هەرزەکار لە تەنگژەدابێت. لە ساڵی 1941دا، لە کاتێکدا لە زانکۆی بولونیابوو، تێزێکی ئەدەبی لەسەر باسکوولی شاعیر نووسی، لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێکانیدا هەوڵی دەرکردنی گۆڤارێکی ئەدەبیان بە ناوی – ئیریدی–وە دا، ئەمان خۆیان بە میراتگری کلتووری ئیتالی نوێ دەزانی کە نووسەرانی وەك ئونگاریتی و مونتالە نوێنەرایەتیان دەکرد. بەڵام پرۆژەکە لە ئەنجامی نەمانی کاغەز لە کاتی جەنگدا سەرنەکەوت و شکستی خوارد. لە ساڵی داهاتوودا (1942) پازۆلینی بەشداریی نووسینی لە گۆڤارێکی تازەدا کرد بە ناوی سیتاسیو. هەرچەندە گۆڤارەکە بە چاودێریی لاوە فاشیەکانی زانکۆ دەردەچوو، بەڵام بۆ ڕاکێشانی رووناکبیرە لاوەکان رێگایان پێ دەدان بە نیمچە ئازادیەك ڕا تایبەتیەکانی خۆیان دەربڕن. پازولینی، زۆری نەبرد ئەو ئازادیەی بۆ خۆی پاوان کرد، ئەمەیش ئەوە دەردەخات کە ئەو بیروباوەڕە کۆنینەکانی وازلێهێناوە. دوای ئەوەی دوو کۆبوونەوەی لەگەڵ لاوە فاشیەکاندا کرد – یەکێکیان لە فلۆرەنساو ئەوی تر لە ڤایمەر – وتارێکی لە گۆڤاری "سیتاسیو"دا نووسی و بەراوردی لە نێوان پروپاگەندەی نازیەکان و داب و نەریتە مەزنەکانی شارستانیەتی ئەوروپادا کرد.

ساڵی 1943 شەڕگەیشتە بۆلۆنیا کە شارێکی ئیتالیە، پازۆلینی لەگەڵ دایکی و گیدوی برای هەرە بچووکیدا شارەکەیان بەجێهێشت و پەنایان بۆ فریولی برد. فریولی ناوچەیەك بوو پازولێنی شارەزای بوو، هەر لە منداڵیشەوە کە هاوینی لە کاسارسا و دەوروبەری بەسەردەبرد ئەو ناوچەیەی خۆش دەویست. چاو ئەندازە گوندیەکەی دیمەنێك بوو بۆ ئامادەکردنێکی بەرایی ئەو. ئەوەی لە یاداشتەکانی رۆژانەیدا نووسیویەتی ئەو راستیە دەردەخەن کە ئەو ئارەزوە سەرەتاییانەی پازۆلێنی چەندە توندوتیژ بووە. بابەتەکەیشی کە باسی کوڕە جوتیارێکە و ناوی برونۆیە و پازۆلینی ئەو کوڕەی وا بینیوە کە "توندوتیژ و زبر"بووە، هەروەها گەیشتن بەوەی کە مندالان "فریشتە نین کە ئارەزووی سێکسیان نەبێت" لە پاڵ ئارەزوە توندەکەیدا، فاکتەر بوون بۆ ئەوەی خۆی و دنیا بە شێوەیەکی تازەی وا ببینێت کە ململانێکەرە". پازۆلینی وا هەست دەکات لەدەستدانی بەرائەتەکەی "ناپاکیە" لەگەڵ سروشتە زۆر "بەسۆز و بەخشندەییەکەیدا"

لە یاداشتنامەکانیدا پازولێنی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەستی وایە تەنانەت دنیا سروشتیەکە بەلای ئەوەوە وێنەیەکی تازەی

لەخۆگرتووە، وێنەیەکی تەواو هەستیارانە، وێنەیەك سوورە لەسەر پێداگری. ئەوەی لە یاداشتە ڕۆژانەکەیدا نووسیویەتی وەسفی ئارەزووە پڕ لە سۆزەکانیەتی. ئاماژەیشە بۆ هەستە ئاینیەکانی کە سۆز شێواندوونی: دانی پێدا دەنێت و دەڵێت: من لە رووتبوونەوەیەکی سۆفیانەدام، لە رووتبوونەوەی رۆحدا کە ترسی لێ دەکەوێتەوە، رەنگە شێوازێك بدۆزمەوە پاساوی خودی خۆمی پێ بدەم، پێویستە من هەڵە بکەم، ئەمە بە مانای پەیرەوی کردنە لە شێوازی مەسیح بەڵام بەشێوەیەکی پێچەوانە. چونکە ئاشکرایە ئەو کەسەی ئاسایی لە ئاین دەردەچێت بەسەر قۆرتێکدا زاڵ دەبێت کە ئەویش حاڵەتی گوناهباریە، منیش ناچار بووم لەو حاڵەتی بەرائەتە سەپێنراوەوە بگوێزمەوە بۆ حاڵەتێك کە خۆم هەڵمبژاردووە..

جەنگ وەك زەمینەیەکی شانۆیی وا بوو بۆ دراما شەخسیەکانی پازۆلینی. خودی کاسارسا، کە وێستگەیەکی گرنگی شەمەندەفەر بوو، چۆن دیمەنی شەڕە توندوتیژەکانی تیا دەبینرا، هەر ئاوایش لەلایەن هاوپەیمانانەوە تۆپباران دەکرا. ساڵی 1944 پازۆلینی بەم جۆرە بۆ هاوڕێیەکی دەنووسێت: "شەڕ بۆگەنە، هەموو شتێك بۆگەنە، ئەوەی هێڵنجت پێ دەدات ئەوەیە کە دەبینیت و بیردەکەیتەوە کە ئەم "نازیانە" پیسساییەکانیان لێرەدا هەڵدەڕێژن. حەزدەکەم تف لەو زەویە گەوجە بکەم کە هێشتا سەوزە گیا دەردەکات و گوڵی زەرد و شین و چرۆیش بە درەختی ناو ئاو دەکات.. هەموو شتێك بۆنی فیشەك و پۆستاڵی گرتووە".

لاوەکان لەبەردەم مەترسیی گرتنی فاشیەکان و بە زۆر راپێچ کردندا بوون بۆ سەربازی. پازۆلینی بۆ ئەوەی لەو چارەنووسە خۆی دوور بخاتەوە کاسارسای لە ساڵی 1944 دا بەجێهێشت و چوو بۆ "فیرسوتا" کە گوندێکی بچووك بوو. لە گۆڕەپانی کەنیسەی ئەو گوندەدا تابلۆیەکی کانزایی هەیە یەکێك لە شیعرە سەرەتاییەکانی پازۆلینی پێوەیە، لەو گوندە بچووکەدا پازۆلینی توانی قوتابخانەیەکی گچکە بۆ ئەو منداڵانە بکاتەوە کە بەهۆی شەڕەوە، نەیانتوانیبوو بە دڵنیاییەوە بچن بۆ قوتابخانە ئاساییەکانیان. ئەم کارە گوزارشت لەوە دەکات کە پازۆلینی ئارەزووی فێرکردنی هەبوە – لە وتارەکانیدا ئەم ئارەزوە دەردەکەوێت – ساڵێك لەوەوبەر پازۆلێنی و هەندێك لە هاوڕێکانی قوتابخانەیەکی لەو شێوەیەیان لە کاسارسا کردبووەوە، ئەو ساتانەی پازۆلینی لە پۆلدا دەیگوزەراند خۆشی و شادیەکی زۆر قووڵی تێدەگەڕا، لە یاداشتەکانیدا دەڵێت: "بڕواناکەم شتێکی وام بەو دڵسۆزی و لە خۆبووردەییە لەگەڵ خۆمدا کردبێت، وەك ئەوەی وانەی زمانی ئیتالیی و مێژووم بەو قوتابیانە وتۆتەوە"

تەنیا چەند مانگێك پێش کۆتایی هاتنی شەڕ، خانەوادەی پازۆلینی باجێکی گەورەی جەنگی دا. لە هاوینی 1944 دا برا خۆشەویستەکەی پاولو ماڵی بەجێهێشتوو چوە ریزی هێزەکانی بەرگریەوە "دەمانچەیەکی لەناو دیوانە شیعرێکدا شاردبوەوە" دوای ئەوە بە کەمتر لە شەش مانگ و لە شوباتی 1945 دا، لە شەڕێکی بێ هوودە و دڕندانەدا کە لە نێوان خودی هێزە بەرگری کەرەکاندا ڕوویدا گیدو مرد. پێ دەچێت بە پیلانێك مردبێت کە کۆمەڵە یوگسلافیەکان (یان رەنگە ئیتالیەکان) نەخشەیان بۆ کێشابێت. ئەو کۆمەڵانەی بۆ ئەوە

تێدەکۆشــان ناوچــەی فریــولی بخەنــە ســەر یوگسلافیای تیتۆی کۆمۆنیستی. پازۆلینی کە ئەم ڕووداوە خەمێکی زۆری پێ دابوو هەستی دەکرد خۆی بەرپرسیاری مەرگی براکەیەتی، چونکە ئەو پێشنیازی بۆ گیدو کردبوو بڕواتە ناو ئەو گروپانەوە، دوای بیست ساڵ پازۆلینی لەو بارەیەوە دەڵێت: "کە بیر لە گیدوی برام دەکەمەوە ئێستایش دەگریم، هەواداریێك کە هەوادارە کۆمۆنیستەکانی تر کوشتیان. ئەو لە پارتی *Partito d Azion*دا بوو، بەڵام من ئامۆژگاریم کرد وەك کۆمۆنیستێك پەیوەندی بە بەرگریکارانەوە بکات. ئەو لە چیای بەرەی شەڕە نەفرەت لێکراوەکەدا کوژرا".

دوای ماوەیــەکی کــەم بــاوکی گەڕایــەوە ماڵەکــەی، ئــەو ســاڵی 1941 چــوو بــوو بــۆ ئەفریقیا، ماوەیەکی زۆریی شەڕی لە ئۆردوگای ئینگلیزیدا کە بۆ دیلەکانی شەڕ تەرخان کرابوو لە کینیا بەسەربرد. شەڕو شکست و خواردنەوە تەواو هاڕیبوویان و وا ئێستایش بەسەر مەرگی کوڕەکەیدا گەڕابووەوە. بەردەوام لە چاخانەیەکی لای خۆیاندا دەیخواردەوە، هەستی بە بێزاری و تــاڵی دەکــرد. بــەردەوام بــوونی لەســەر بەدمەستی و کێشەی ڕاهاتنی لەسەر ئالکول بەجۆرێك بارودۆخی ماڵەوەی هەراسان کردبوو کە ژیانی تێدا بەسەرنەدەبرا. پازۆلینی لە نامەیەکیدا بۆ هاوڕێیەکی لە ساڵی 1948 دا دەڵێت: "زۆر هەوڵ دەدەم حاڵەتێك بپارێزم، کە لە نێوان (هەستیاری و عیرفاندایە) حاڵەتێك لە دڵخۆشــی کــە خــۆم لــە بیرکردنــەوەی ئاینــدە بپارێزم. نەخۆشیی بارانویای باوکم (بەپێی دەست نیشان کردنی پزیشکی دەروونی) ژیانی خێزانیمانی کردووە بە دۆزەخ. کێشەیەکە بێ چارەسەر.. بڕوام پێ بکە وشەی وام پێ نیە وەسفی ئەو حاڵەتەی پێ بکەم کە باوکم لە چرکەســاتی قەیرانــە دەروونیەکەیــدا دروستی دەکات".

کە شەڕ کۆتایی هات، پازۆلینی پێی باشبوو لــە فریــولی بمێنێتــەوە، بــاوکی سەرچــاوەی هەراســان کردنــی بــوو، هــەموو کەسـێك لەمــە دەگــات، بــەڵام پــازۆلینی تاڕادەیــەك لەگــەڵ هاوڕێو ئەو ژیانەی بۆ خۆی دیاری کردبوو گونجابوو. ئەو قوتابخانە بچووکانەی دروستی کردبوون و زانیاریەکی فراوانیان دەدایە، دوای ئــەوەی پلــەی زانــستی پــێ بەخــشرا مووچەیەکیشیان بۆ بڕیەوە. فریولی بۆ ئەو وەك خۆی دەڵێت: "تاڕادەیەك دەوڵەتێکی ئایدیالی بوو، پێ دەچوو لە دەرەوەی شوێنکاتدا بێت. بۆ من هەرێمێك بوو بۆ شیعری عاتیفی، منێك کــە بــە شــێوازی رامبــۆ و فــرلین و لۆرکــا شیعرم دەنووسی".

لە ڕاستیدا پازۆلینی بە درێژایی جەنگەکە دەینووسی، یەکەم دیوانە شیعری – شیعر بۆ کاسارسا – بوو. نیازوابوو لە گۆڤارە بێ بەختەکــەی *Evedie* دا لــە ســاڵی 1942 دا بڵاوبکرێتــەوە. سەرســامی و خۆشــبەختی پازولێنی لەوەدا بوو کە نووسەری بەناوبانگ – جیــانفرانکو کــونیتنی – ستایــشی لــە دیوانەکە کرد.

ئــەوەی جێگــای سەرســووڕمانە یەکــەمین دیوانە شیعری پازۆلینی بە زمانە مەزنەکەی ئیتالیا نەنووسراوە، بەڵکوو بە دیالێکتی فریولی لۆکاڵی نووسراوە کە زیاتر جوتیاران پێی دەپەیڤین (خێزانە بۆرژوازیەکەی پازۆلینی بە دیالێکتی ڤینیسی قسەیان دەکرد، یەکێك لە کوڕە ئامۆزاکانی پێی دەڵێت شێوە زمانێکە کە بە بەراورد لەگەڵ شێوە زمانی فریولیدا وشك و

ساكاره) هەڵبژاردنەكەی پازۆلینی بۆ ئەو شێوە زمانــە لەچــەند ســەرێكەوە گرنگبــوو. لەســەر ئاســتی شەخــسی توانییــەتی بــە زمــانی ناوچــەكەو ســتایڵی ژیــانی كــۆن و مەسـیحیەتە گونـدی و عیرفانیەكـە تـەعبیر لـە ختوورەكـانی خــۆی بكــات، بــەڵام لــە دیــدی ئامۆزاكەیــەوە نووسین بەو شێوە زمانە ئەو راستیە دەردەبڕێت كـە پـازۆلینی سـۆزی لەگـەڵ دنیـای جوتیارانـدا هەیـە، نوسـتالۆژیای بـۆ ئـەو زمانـەیش هەیـە كە پـێش ئـەوەی ڤینـسیەكان بڕژێنــە ناوچــەكەوە دیـالێكتی بـاو بـووە، لـە چـەند سەرچـاوەیەكی لیریكیــەوە هــاتووە كــە لــە ڕێ و ڕەسمــە ئاینیەكاندا بەكارهاتووەو پڕە لە هەستی سۆز و خۆشەویستی.

دوای چـەند سـاڵێك، پـازۆلینی لێكدانـەوەی بۆ وابەستەیی بە زمان و دنیای جوتیارانـەوە بۆ ئـەوە دەگێڕێتـەوە كـە ئـەوە یەكـەم دیمەنـە لـە دیمەنەكانی نۆستالۆژیا، كە بە درێـژایی ژیـانی لــە هــەر جێگــا و كاتێكــدا بوو‌بێــت هەمیــشە پەیوەنـدی بـەو شارسـتانیەتە كۆنـەوە زیـادی كردووە.

نوستالوژیای پـازولێنی وەك چـۆن بـۆ شـێوە زاری فریــولی هــەبووە، هــەروەها هەمیــشە بــۆ هەردوو ڕەگەزی زمـان و ئایدۆلۆژیشی بوە. ئەو پەرۆشــیەی بــۆ شــێوە زمــان و شارســتانیەتی كۆنی هەبوە، ڕوویەكی تـرە لـەو هەستەی كە بۆ قــەیرانی شارســتانی و زمــان هــەیبوە لــە چوارچێوەی شارسـتانیەتەكەی خۆیـدا. لەگـەڵ ئەوەیشدا پازۆلینی زانیویەتی كەسی بێ لایـەن، ئەو كەسەی فریولی نیە، توانای زیاترە بۆ دەرك پێكردنــی بــەكارهێنانێكی هۆشــیارانە یــان ئەدیبانـە بـۆ شـێوە زمـان. لـەم بـارەوە دەڵێـت: "گەڕانــەوە" كــە ئــەركی شــێوەزمانە، لەبــەر كۆمـەڵێك هـۆی ئـاڵۆزی نـاوخۆ و دەرەوە دەبێـت ڕووبـدات. دەبێـت ئـەوە لـە زمـانی ئیتالیـەوە بـۆ فریـولی دەسـت پـێ بكـات، كـە ئەمـەی دواییـان بوەتـە بابـەتی نوسـتالۆژیەكی سـەخت كـە لـە هەستەوە سەرچاوە دەگرێـت (بە تـەواوی مانـای ئــــەم وشــــەیە) بــــەڵام گەڕانەوەكــــە لەگــــەڵ نوستالۆژیای ئەو كەسەدا دەگونجێت كە دەژی – هەستیشی پێ دەكـات – لـە شارستانیەتێكدا كە لـە قـەیرانێكی زامانـەوانی و مایـە پووچـی و توند و تیژیەك كە دەقاودەق لەگەڵ دەربڕینێكی ڕامبۆدا ***Ne sus piusparles***[1] دەگونجێت.

پابەنـدبوونی زۆری پـازۆلینی بـە فریولیـەوە ئـەو راسـتیە دەردەخـات كـە چـۆن بـە درێـژایی ژیانی بایـەخی بـە زانستی زمـان داوە. لە سـاڵی 1945 دا یارمـەتی دامەزرانـدنی ئەنجومـەنێكی داوە كە ئامانجی لێكۆڵینەوە بووە لەسـەر زمـانی فریولی بە نـاوی ***Academiula di lenqa furlana***. بــەڵام وەك لــەم پەرەگرافــەدا هــاتووە، هەســتی ئــــەدەبیاتی پــــازولێنی، بــــە تایبــــەتی خۆشەویـستیەكەی بـۆ شـاعیرە ڕەمزیـەكان و لـە ناویانـدا رامبــۆ شــوێن بایــەخی زیــاتری بــوە. هەڵبــژاردنی بــۆ دیــالێكتی فریــولی كــە زۆر جیـاوازە لـە زمـانی ئیتـالی و بەمـەیش سـەرنجی خوێنــەر بــۆ لای ئــەو زمانــە رادەكێــشێت، بــە شــێوەیەكی ئۆتۆمــاتیكی مەبەســتی ئــەوەبوو دەســتەڵاتی بەســەر زمــانی شــیعری (ڕەهــا)دا بشكێت. پازۆلینی لە ناخی خۆیدا وای دەبینی كە نووسین بە زمانی باو "لووتكەی تـەم و مژ و شـاردنەوەو ڕەت كردنـەوەی بـەردەوامی لەسـەر ئـەوەی بـاوە" ئـەو وا دەزانێـت كـە "فریولیـەت پرۆسـەی خۆشەویـستیەكی عیرفانیـە و جۆرێكـە لــە ***felibrism***[2] لەســـەر شــێوازی شــاعیرانی پرۆڤینی، دەڵێت: شیعرە بەراییەكانم بە فریولی

نووسیوه، ئەوسا تەمەنم حەڤدەساڵ بوو، وەك دەزانن ئەوسا لە ئیتالیادا باوی قوتابخانەی شیعری بەتەم و مژ بوو[3]، ئەم قوتابخانەیە شەپۆلێکی لۆکاڵی ڕەمزی بوو کە لە ئیتالیادا ڕەواجی زۆری هەبوو. ئەمە لە کاتێکدایە مالارمیە گەورەترین کاریگەری لەسەر شاعیران هەبوو، ڕەمزیەتیش بەشێوەیەکی فراوان لە ئیتالیادا پەیڕەویی لێدەکرا.. بیری سەرەکی قوتابخانەی شیعری تەمومژاوی ئەوە بوو کە زمانی شیعر زمانێکی ڕەهایە".

پازۆلینی بە هەڵبژاردنی ئەدەب و زمانی فریولی دەرئەنجامی سیاسی و کۆمەڵایەتی لێ کەوتەوە. ئەویش دەرخستنی ئەو پەیوەندیە گەرمەی نێوان سیاسەت و کلتوور بوو کە بوە خەسڵەتێکی تایبەتی بۆ هەموو کارەکانی پازۆلینی. پەسەندکردنی شێوە زمانێکی لۆکاڵی لەلایەن پازۆلینیەوە وەك بەرەنگاربوونەوەی فاشیەت وابوو کە گاڵتەی بە سنوورو شێوە زمان دەهات چونکە "بە شێوەیەك لە شێوەکان زمانی لۆکاڵی بە زمانی هەقیقی دەزانی و ئارەزووی سڕینەوەی دەکرد" ئەقڵیەتی فاشیزم خودی کلتوری بە شتێکی گوماناوی دەزانی. لە یەکێك لەو دیدارانەدا کە لەگەڵیدا کراوە پازۆلینی باس لەو هەستە ئەدەبیەی خۆی دەکات کە لە یەك کاتدا هۆشیاریە سیاسیەکەی داڕشتۆتەوەو ڕەنگیشی تێدا داوەتەوە:

"من بۆ بەرەنگاریکردنی فاشیزم تەنیا دوو ڕێگام لەبەرگرت: قوتابخانە بە تەمومژەکەی شیعر یان ڕەمزیەت کە بەشێوەی سەرەکی شێوازی زەوقێکی تەندروست بوو. پاشان تێکەڵ بوونم بە ژیانە خاکیەکەی جوتیارە مەسیحیەکان لەناوچەکەی دایکمدا. ئەمە شێوازێکە لە ژیان کە تەواو جیاوازە لە ئەقڵیەتی فاشیەکان"

بێجگە لەمە هەڵبژاردنی فریولیەت لەلایەن پازۆلینەوە، هوشیاریەکی سیاسی شاراوەی لەدواوەیە سەرەڕای ئەوەی خەسڵەتێکی فرۆیدیانەی ڕوون و ئاشکرای پێوەیە. کتێبی "شیعرێ بۆ کاسارسا" کە پازۆلینی پێشکەشی باوکی کردووە، بەپێی دەربڕینی خودی پازۆلینی "دەستپێشخەریەکی بوێرانە"بووە، بێگومان دەستپێشخەریەکی تێرو ئاڵۆز و پڕ لە ناکۆکی، بەکارهێنانی زمانێکی ناوچەیی باوکە فاشیەکەی بریندار کردووە، چونکە باوکی هەست بە سووکایەتی پێکردنێکی "ئەتنی" دەکات بۆ هەموو ئەو شتانەی لە ناوچە سەر سنووریەکانی وڵاتەوە دێت. پازۆلینی دوای نزیکەی چارەکە سەدەیەك ئاماژە بە شیعرەکە و پێشکەشیەکە دەکات و دەڵێت: ئەو کارە ئاماژە بوو بەوەی کە چەند ڕقمان لێیانە، ئاماژەیەکە هیچ چەند و چوونێك هەڵناگرێت، ئاماژەیەك کە ناتوانێت باسێکی زانستی بشێوێنێت:

"ناشێت بە هەڵەیدا بەرێت. ئەو کتێبەی پێشکەشم کردبوو، بە دیالێکتی فریولی لۆکاڵی نووسیبووم. شێوە زمانەکەی دایکم، شێوە زمانی بەشێکی بچووك لە دنیا، بۆی هەبوو گاڵتەی پێ بکات، یان بە "سەبری باوکانە" قبووڵی بکات"

وەلێ وادەردەکەوێت کە باوکی "شیعرێ بۆ کاسارسا"ی بەو جۆرە نەدیبێت کە ئاماژە بێت بۆ ڕق لێبوونەوە. بەڵکوو بە پێچەوانەوە یاداشتەکانی پازۆلینی ئاماژە بەوەدەدەن کە کتێبەکە نەك بە "سەبری باوکانە" بەڵکوو بە "شانازی باوکانە" قبووڵ کراوە. "سەرەڕای

ســووکیەتی ئــەو زمانــەی لــە نووســینی ئــەو دیوانە شیعریەدا بەکارهاتووە، بەڵام پێشکەش بەو کرا بوو، ئەمە وای لێکردووە کە هەست بە خۆشی بکات"

پەسەندکردنی شێوە زمانی فریولی لەلایەن پازۆلینیەوە، لەسەر هەردوو ئاستی شەخسی و سیاســـی بەرئـــەنجامی تـــری لێکەوتـــەوە، بەکارهێنانی شێوە زمانی قسەکردنی جوتیاران، وردە وردە پازۆلینی لەوان و هەروەها لەو کێشە راســتەقینانە نزیــك خســتەوە کــە دەوری ژیانــە سەختەکەی ئەوانی دابوو. پازۆلینی درکی بەوە کـرد کـە ژیـانی جوتیـاران لەگـەڵ ژیـانی ئەمـدا "ژیانی سایکۆلۆژی روونـاکبیری هزریـی، رۆحـی و ژیـانی سێکـسیان" هـەموو ئەمانـە تـەواو لـە یـــەکتری جیـــاوازن، ئەمـــەیش هۆشـــیاریی چـــینایەتی تیـــا قـــووڵ کـــرد و لەگەوهـــەرە بۆرژوازیەکـەی خـۆی بـە تـەواویی تێگەیـشت. دوای تێپـــەڕبوونی ماوەیـــەکی زۆر دیـــدی بـــۆ ژیــانی گوندنــشینان خەســڵەتێکی میلیانــەی وەرگـــرت. "بـــە ســـۆز و سوشیالیـــستیەکی شـاراوەوە کـە زیـاتر لـە رۆمانـسیەت دەچـوو" چـــــەندە ئـــــەو سوشـــــیالیزمیەی لەگـــــەڵ عەشـقەزمانیەکەدا کاریـان لێـك دەکـرد، لایـەنی رەمـزی یـان تەمومـژی شـیعرەکانی زیـاتر بـەرەو پووکانەوە دەچوون، تەنانـەت تا ئەو کاتـەی کە بیروباوەڕە کۆنەکەی لە پاشەکشەدا بوو "فۆرمی کۆمەڵایەتیەکی واقیعیانەتر" جێگاکەی گرتـەوە. وردە وردە بـەکارهێنانی شـێوە زمـان بـوو بـە مەبەستێکی سیاسی و کۆمەڵایـەتی زیـاد لـەوەی ئیستاتیکی بێت. هەرچەندە ئەو فریولیەتی وەك "زمانی تایبەتی شیعر" هەڵبـژارد، بـەڵام تێکـەڵ بوونی بە فریولیەت کاریگەریـەکی زۆری هـەبوو: "لـــەو رێگایـــەوە تـــوانیم تارادەیـــەك واقیعـــی

جوتیارەکـان تێبگـەم، دیـارە لـە سـەرەتادا بـە شێوەیەکی ناکامڵ و بە رێگای ئیستاتیکدا لێـی تێگەیـشتم، بـەڵام دوای ئـەم هـەنگاوە نـەمتوانی بوەسـتم، شـێوە زمانـە ناوچـەییەکەم نـەك وەك ئەنگێزەیـەکی ئیـستاتیکی – شـیعری بـەڵکو و زیـــاتر وەك رەگـــەزێکی بابـــەتی و واقیعـــی بـەکارهێنا. ئەمـە لـە رۆمانەکانمـدا گەیـشتە لووتکە، کاتێك شێوە زمانی ناوچەی ڕۆمام بـە جـۆرێکی تـەواو جیـاواز لـەو شـێوە زمانـەی فریولی سەرەتام بەکار هێنا. بەهۆی دەربەست بـوونی پـازۆلینی بـە فریولیـەوەو زیـادبوونی هوشیاریە کۆمەڵایەتیەکەی، لە ماوەیەکی کەمدا پەیوەنـدی بـە کۆمەڵێکـەوە کـرد کـە تـەواویی هــەوڵ و کۆشــشی خۆیــان بــۆ ئــەوە تــەرخان کردبوو فریـولی ببێتـە زمانێکی سەربەخۆ، هـەر لـــە هـــەمان کاتـــدا ئامـــادەی کۆبوونـــەوەی دەسـتەیەکی کۆمۆنیـستی دەبـوو. لـە سـاڵی 1948 دا بـە شـێوەیەکی فـەرمی پەیوەنـدی بـە پـارتی کۆمۆنیستەوە کـرد و لـە سـان جیوڤـانی بــوو بــە رازگــری پــارتی کۆمۆنیــست، ســان جیوڤانی شارۆچکەیەکە نزیك بە کاسارسا. پـێ دەچـێت بـەو راسـتیە قـارس نـەبووبێت کـە کۆمۆنیـستەکان لایـەنگیری ئامـانجی کۆمەڵــە فریولیەکەیان نەدەکرد.

وەك دەســتپێکی ئــەو ناکۆکیــە زۆرەی کــە رووبـەرووی پـازۆلینی بـوەوە لەگـەڵ حیزبـدا، بــەڵام ئــەو هــەر ســوور بــوو لەســەر بیرۆکــە ئایدیالیەکــەی کــە فریــولی بکرێتــە زمــانێکی ســـــەربەخۆ، هـــــەروەها پابەنـــــدی ئامانجـــــە کۆمۆنیـــستیەکان بـــوو. بـــەڵام ئەمـــە تاقـــە مەسەلەیەك نەبوو کە جێی مشتومڕ بێت.

لـە وتارێکیـدا سـاڵی 1948، پـازۆلینی ئـەو حوکمـەی حیـزب دەخاتـە ژێـر پرسـیارەوە کـە

دەیەوێت لە دیدی فیکری و سیاسیەوە تەماشای ئەدەب بکات.

"لە ئەدەبدا و تەنیا لەبەر هۆکاریی ئەدەبی رووت، راستڕەو هەیە و چەپڕەوییش هەیە. بەلاّم ئەوانەی چەپڕەوی ئەدەبن هەرگیز لەگەڵ چەپڕەوی سیاسەتدا نین.. بۆیە لە نێوان پێشڕەوانی سیاسەت و پێشڕەوانی ئەدەبیدا پەیوەندیەکی دووفاقی بەرقەرارە"

لەو ماوەیەدا کە پازۆلینی پەیوەندی بە پارتی کۆمۆنیستەوە کرد، گروپێکی چەپڕەو لە شارۆچکەی سان ڤیتو ئال تاگالیامینتوی دراوسێی ناوچەکەیان، خۆپیشاندانێکیان سازدا، خۆپیشاندانەکە بۆ نارەزایی دەربڕین بوو لەسەر ئەوەی کە جوتیارە میاومینەکان و کرێکارە بێ کارەکان یارمەتی نەدەدران و دەرفەتی کاریان بۆ نەدەرەخساندن. لە کاتێکدا کە بەڵێنی قەرەبووکردنەوەی ئەو زەرەرو زیانەیان پێدرابوو کە لە کاتی جەنگدا لێیان کەوتبوو. بەشێوەیەکی زۆر سەرنج راکێش رژابوونە سەر شەقام و منداڵترین کەسیان گەمارۆی باخ و باخاتێکی فراوانیان دا کە خاوەنەکانیان لەوێ نەبوون. دیمەن و بەرەنگاربوونەوەی چینایەتی نێوان کرێکارانی میاومین و خاوەن ساختمانە دیارەکان کارێکی وای کردە سەر پازۆلینی کە رۆمانێکیان لەسەر بنووسێت بە ناوی ***El songo di une cosa,*** ***"1962"***. نیکۆی کوڕە مامی پازۆلینی، لەسەر رووداوەکە دەڵێت: "رێنەکەوتوە بیرۆکەی شۆڕشی جوتیاران لە خەونەوە ببێت بە هەقیقەت تەنیا لەو چرکە ساتەدا نەبێت".

دوای ماوەیەکی زۆر، پازۆلینی لە ستوونی رۆژنامەیەکی کۆمۆنیستیدا، ئەو نارەزایی جوتیارانەی بە "چرکە ساتێکی یەکلایی کەرەوە" لە ژیانیدا ناودێر دەکات، چرکەساتێك ئەو باوەڕەی لا سەلماند کە ئایدۆلۆژیا لە بیری رووتەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکوو لە ئەزموونەکانی ژیانەوە. "ئەزموون کردنی راستەوخۆی کێشەی کەسانی دی، لە ڕیشەوە گیروگرفتە تایبەتیەکانی منی گۆڕی، بۆیە من وا هەست دەکەم کە لە رەگی کۆمۆنیستی بورژوازیدا هەمیشە فاکتەرێکی ئاکاری بە مانا ئینجیلیەکەی هەیە"

بە نزیك بوونەوەی هەڵبژاردنی ساڵی 1948 کە یەکلاییکەرەوە بوو، شەپۆلێك لە چالاکیە سیاسیەکان، پازۆلینی و هاوڕێکانی لەگەڵ خۆیدا برد: دیدار و مشتومڕ و وتاری رۆژنامە بوو بە چالاکیی رۆژانەیان، تەنانەت ئەو شکست خواردنە تاڵەی کە لە هەڵبژاردندا تووشی چەپەکان هات، لە جۆش و خرۆشە سیاسیەکانی کەم نەکردنەوە. هەندێك لە هاوڕێ کۆنەکانی پازۆلینی کە لە ڕا سیاسیەکانی نیگەران بوون لێی کشانەوە و هاوڕێی تازە جێگایان گرتنەوە.

لەو ماوەیەدا پازۆلینی دەستی بە خوێندنەوەی دەقە تیوریەکان کرد: چەند بەشێکی سەرمایەکەی مارکس. لەوە گرنگتر خوێندنەوەی کارەکانی ئەنتۆنیو گرامشی کە دامەزرێنەری حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا بوو. پازۆلینی وای دەبینی کە مارکس لەبەر چەند هۆکارێك "بێ لایەن" بووە، بۆیە دەڵێت: "بیروباوەڕەکانی گرامشی لەگەڵ بیروڕای مندا دەگونجێت و قەناعەتیان پێ کردووم، هەروەها ئەو بیروڕایانە رۆڵی سەرەکیان لە دروست کردنی مندا لە رووی ئایدۆلۆژیەوە هەبووە"

لە ڕاستیدا چالاکیە زۆرەکانی پازۆلینی بەرپرسیارە لە یەکەم ناوزڕاندنیدا "فضیحة"

زیاد لە زنجیرە ناوزڕانەکانی تر کە زۆری ئازار پێگەیاند، وەك هەموو ئەوانەی تر کە بەدوایدا هاتن، ئەم درامایە بەرئەنجامی تێکەڵ بوونی سێکس و سیاسەت بوو. ژمارەیەك لەو کاسۆلیکیانەی کە ئاسایی پشتیوانیان لە دیموکراتیە مەسیحیەکان دەکرد و دەیانویست پازۆلینی بیسەلمێنێت کە هاوڕێیە نەك کۆمۆنیستێکی دوژمنکار، بە چاوی دوژمنایەتیەوە تەماشای چالاکیە سیاسیەکانی پازۆلینیان دەکرد. پازۆلینی کە وەك مامۆستا و بیرمەند لە رۆژنامە لۆکاڵیەکاندا دەینووسی، ئامادەگیەکی بەهێز و تەنانەت ترسناکیشی هەبوو.

پازۆلینی کە زۆر چاك دەیزانی کاسۆلیکیەکان چەندیان ڕق لێیە، ساڵی 1949 لە نامەیەکیدا بۆ ژنە هاوڕێی خۆشەویستی سیلڤانا مۆری دەنووسێت: "قەشەی ناوچەکە لە مینبەرەکانیانەوە ئابڕووم دەبەن، بەلاّم من بڕوای گەورەم بە کۆمۆنیستی هەیە".

پازۆلینی لەسەر میسالیەتی خۆی مایەوە، تەنانەت دوای ئەوەیش کە قەشەیەکی بە پلە و پایە هەڕەشەی مەرگی لێکرد ئەگەر سنورێك بۆ چالاکیە سیاسیەکانی دانەنێت. ئەمە لە پاییزی ساڵی 1949 دا بوو، لە 22 تشرینی یەکدا بە ئاشکرا تۆمەتی "منداڵ بازی و کاری ئاشکرای داوێن پیسی" درایە پاڵ. نیلو نالدینی ئەم تۆمەتە رەت دەکاتەوە، وەك دەردەکەوێت لە سەرەتادا ئەم تۆمەتە بە شێوەیەکی ناڕەسمی درایە پاڵی، بەلاّم دوژمنانی پازۆلینی بەرزیان کردەوە بۆ ئاستی تۆمەتی قەزایی. هەرچەندە پازۆلینی لە تۆمەتی بلاّوکردنەوەی بێ ئابڕوویی رزگاری بوو، بەلاّم بەوە تۆمەتبار کرا کە کاری داوێن پیسی دەکات.

دوای دوو ساڵ – دوای چاودێری کردنی هەڵسوکەوتی پازۆلینی لەو ماوەیەدا – تۆمەتەکەی لەسەر لابرا، چونکە دادگای پیاچوونەوە لەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو تۆمەتبارکردنەکەی هەڵوەشاندەوە.

بەلاّم پازۆلینی زیانی پێگەیشت، دوای ئەوەی وانە وتنەوەی لە قوتابخانەی دەوڵەتدا لێ قەدەغەکرا و سەرچاوەی بژێویەکەیان بڕی. لە هەمان کاتدا لە پارتی کۆمۆنیست دەرکرا، ئەمەیان ناخۆشترین هێدمە بوو کە وێرانی کرد.

کە تەماشای رووداوەکانی پێشتر دەکەیت تاوانی کۆمۆنیستەکان لە تاوانی دیموکراتیە مەسیحیەکان کەمتر نییە. ئەگەر دۆخی شەڕی سارد بە هەند وەربگرین، لەوە تێدەگەین کە بۆچی کۆمۆنیستەکان لەوە دوو دڵ بوون بەرگری لە کەسێك بکەن کە هۆمۆسکسواڵ بووە، بەلاّم دەرکردنی پازۆلینی کە لە رۆژنامەی "یونیتا"ی کۆمۆنیستەکاندا بلاّوکرایەوە بە زمانێك نووسراوە ئاماژەی زیاتری تیایە. زمانێکی تژی بە گەورەیی و دەمارگیری، ئەم دوانە بە درێژایی ژیانی لە کۆڵ پازۆلینی نەدەبوونەوە.

رۆژنامەکە دەنووسێت: "لە ڕاستیدا ئەوەی بوو بە هۆی سزادان و تەمێی قورسی پازۆلینی شاعیر، دەرفەتێکی تازەمان دەداتێ بۆ بەگژداچوونی ئەو کاریگەریە زیان بەخشەی کە شەپۆلە ئایدۆلۆژی و فەلسەفیە دیاریکراوەکان هەیانە، کە نمونەیان لە گایدو سارتەر و شاعیرو ئەدیبە رەمزیەکانی تردا دەردەکەوێت، ئەمانە وا خۆیان دەردەخەن پێشکەوتوو خوازن، بەلاّم لە هەقیقەتدا کامە خراپترین و زیان بەخشترین وێنەی بۆرژوایە ئەوە پەسەند دەکەن".

پـازۆلینی لـه هێدمـەی ئـەو بێبـەش کردنـە سیاسییەدا نامەیەکی کاریگەری بۆ فردیناند و موتینـو نووسـی کـە ئـەو بڕیـاری دەرکردنـی پازۆلینی نووسیبوو، دوای ئەوەی مۆتینو لەوە ئاگـادار دەکاتـەوە کـە دوژمنـە سیاسـیە هاوبەشـەکانی دەسـتیان لـە نـاو ڕاندنەکەیـدا هـەبووە. پـازۆلینی بـە ئاماژەیـەکی زیـاتر شەخـسیانە ڕق و تووڕەییەکـەی دەردەبـڕێ و سـوور بوونیـشی لەسـەر مەیلـە سیاسـیەکەی دەردەخات:

"سـەر لـە بـەیانی دوێـنێ خـەریك بـوو دایکـم شـێت بێـت، باوکیـشم لـە حاڵێکـدا بـوو کـە بـاس ناکرێـت، گـوێم لـێ بـوو بـە درێـژایی شـەو دەینالاَنـدو دەگریـا، مـن بـێ کـارم، واتـا گەڕاومەتـەوە نوختـەی سـەرەتا، تـەنیا لەبەرئـەوەی مـن کۆمۆنیـستم، لـە کاتێکـدا غـەدری دیموکراتیـە ئەهریمەنـەکانم بـەلاوە سـەیر نـەبوو، بـەڵام نامرۆڤایەتیەکـەی ئێـوە تووشـی سەرسـوڕمانی کـردم. پێویـستە لـەوە تـێ بگـەیت کـە قـسەکردن لەسەر لادانی ئایدۆلۆژی بێجگە لە گەوجی چی تـر نیـە. تـۆ بتـەوێت یـان نـا مـن هـەر بـە کۆمۆنیستی دەمێنمـەوە بە هـەموو رەسـەنایەتی مانـای ئـەم وشـەیەوە. تـا دوێـنێ بیرکردنـەوە لـەوەی مـن لـە پێنـاوی بـەها بالاَکـانی خۆمـدا قوربـانیم بـە ژیـان و کـارم داوە توانـای پـێ دەبەخـشیم. بـەڵام ئێـستا هـیچ نـەماوە ئـەو توانایـەم پـێ ببەخشێت، ڕەنگە ئەگەر یـەکێکی تر لە جێگای مندا بوایە خۆی بکوشتایە. بەڵام بەداخـەوە دەبێـت مـن بـۆ دایکم بـژیم، بـۆ ئەمـە ناپاکیم لەگەڵ چینەکەمدا کرد و لەگەڵ ئـەوەی پێی دەڵێن کلتوری بۆرژوازیدا.. ئێستا ئـەوەی ناپـاکیم لەگەڵـدا کـرد بەشـێوەیەکی ترسـناك و گەلێك دڵڕەقانە تۆڵـەم لـێ دەکاتـەوە.. منیش بە تـەنیا لەگـەڵ خـەم و دایکـم و بـاوکم و مردووەکەدا[4] دەمێنمەوە".

ئـەو سـۆزە کەمـەی بەخـشرایە پـازۆلینی لـە هاوپەیمانە سیاسیەکانی رابووردوویەوە نـەبوو، بـەڵکوو لـە دانیـشتوانی کاسارساوە بـوو. وەلـێ ئەمەیش کەمێکی لەو نائومێدیە کەم کردەوە کە لـە هەفتـەکانی دوای ناوزڕاندنەکـەدا ئـەزموونی کردبـوو. پـازۆلینی خـۆی بـە "رامبۆیـەك بـە بـێ بلیمـەتی"دانـا، کاتێـك ئـەم شـاعیرە لاوە بـۆ هاوڕێیـەکی نووسـی "ئاینـدەم نـەك هـەر ڕەشـە بەڵکوو هەر نیە".

نائومێـدی و گۆشـەگیری وای لـە پـازۆلینی کـرد کـە بـە تـەواوی خـۆی بـۆ نووسـین تـەرخان بکـات – وەك خـۆی نـاوی لـێ نـابوو "زینـدانی پیشەکەی" لە هەموو کاتێك زیاتر بە تووڕەیی و تاك ئامانجیەوە بنووسێت.

لـە کاتێکـدا کـە پـازۆلینی ئـازاری نـەبوونی دەچەشـت و پێـی ناخۆشـبوو پـارەی لـە باوکـە هەمیـشە مەسـتەکەی وەردەگـرت. دواجـار هـەنگاوێکی نـا کـە سـەلماندنی هـەنگاوێکی گرنگـە لـە ژیـان و کاریـدا و لـە دنیـای کلتـوری ئیتالیـدا. بـۆ سـیلفانا مـوری ژنـە هـاوڕێی نووسـیێ کـە ئـەم بـە دوای تەنانـەت "سووکترین" کاردا گەڕاوە: "دەڵێن من نامرم لە برساندا" لە 28 کانوونی دووەمی ساڵی 1950 دا کە دایکی لە باوکی جیابوەوە ئەم چوە لای دایکی، کاسارسای بەجێهێشت و رووی لە ماڵی یـەکێك لـە خاڵـەکانی کـرد لـە رۆما. دوای چەند سـاڵێك لـە بـارەی ئـەو قۆناغـە گرنگـەوە دەنووسێت:

"بـە کۆتـایی هـاتنی جـەنگ، ژیـانم زۆر لـە جـاران ناخۆشـتر بـوو، مردنـی براکـەم، خـەم و

خەفەتی دایکم کە مرۆڤ بەرگەی نەدەگرت، گەڕانەوەی باوکم لە زیندان – کۆنە جەنگاوەرێکی نەخۆش کە شکستی فاشیەکان ژیانی ژەهراوی کردبوو، وێران و کلۆڵی دەست خوێن ڕێژێك کە چ پەنایەکی نەمابوو، بادە خراپەکان هۆشیان پێنەهێشتبوو، شاعیرێك بە خۆشەویستیەکی زۆری دایکمەوە، کەچی دایکم هەرگیز زۆری خۆش نەویستبوو و ئێستایش ئالآبوە خەمە تایبەتیەکانیەوەو ژیانی منیش ببوو بە کێشە و گرفتێکی تری. وەك باسم کردوە من و دایکم لە زستانی 1949 دا چووین بۆ رۆما".

ئەو رۆمایەی پەنای بۆ برد هێشتا شارێك بوو وەك لە فیلمە واقیعیە تازەکاندا دەردەکەوت – شاری بێ کاری و برسیەتی و هەژاری – لە سەرەتادا ژیان تیایدا سەخت بوو، تا ڕادەیەك کە پازۆلینی لەبارەیەوە دەڵێت: "بۆ ماوەی دوو ساڵ نائومێد و بێ کار بووم، تەواو وەك ئەوانەی بە خۆکوشتن کۆتایی بە ژیانیان دێنن" بۆ ئابڕووبردنی ئەمیش دایکی بڕیاریدا لە ماڵاندا کاری پەروەردەیی بکات. پازۆلینی دوای ساڵانێك دەڵێت: بە یارمەتی خاڵە خوێن شیرینەکەمەوە گەیشتینە رۆما – کە هەندێك لە خوێنی خۆی پێدام – وەك کەسێك ژیام فەرمانی مەرگی بەسەردا درابێت – ئەم بیرۆکەیە هەمیشە بەرەو خواری ڕادەکێشام – هەست بە سووکایەتی و داماوی و پێویستی کارکردن – بۆ ماوەیەك دایکم بوو بە کارەکەر– ئەمە ئازارێکی بێ هەتوانە – چونکە من وردە بۆرژوام".

لە سەرەتادا دۆزینەوەی کار مەحاڵ بوو، پازۆلینی لە نائومێدیدا پەنای بۆ هاوڕێکانی برد، لە پێناوی هەر توانایەکدا بۆ ڕێ نوێنی و پەیوەندی، لەگەڵ ئەمانەیشدا ناوی خۆی لە لیستی ئەو ئەکتەرە یەدەگانەدا نووسی کە لە ستۆدیوی سینسیتادا بە دوای کاردا دەگەڕان، هاوکات بۆ ماوەیەکیش هەڵەچنی چاپەمەنیی دەکرد.. هەژاری وای لێکرد ئەو کتێبانەی خۆشی دەویستن بیانفرۆشێت. هاتنی باوکی بۆ رۆما هیچ بارێکی سووك نەکردن: " هەمیشە باوکم لەوێ بوو، بە تەنیا لە چێشتخانە بچووکە هەژارەکەدا ئانیشکی دادەدایە سەر مێزەکەو دەموچاوی دەخستە نێو هەردوو دەستیەوە.. بێدەنگ، بێ جووڵەو خەمبار، ئەو ڕووبەری ژوورە بچووکەکەی بە قەبارەیەکی گەورەی لاشەی مردوان پڕ دەکردەوە"

لەگەڵ ئەمانەیشدا، لە هەموو ئەو کاتانەدا پازۆلینی زۆر بە گەرمی دەینووسی، سەیر ئەوەیە کە یەکەم نووسینی ئەدەبیی ئەم لاوە کۆمۆنیستە لە رۆژنامەیەکی کاسۆلیکە ڕاستڕەوەکاندا بڵاوبووەوە. وردە وردە ژیانی بەرەو باشی چوو، نزیکەی دوو ساڵ دوای هەڵاتنی لە کاسارسا، لە قوتابخانەیەکی تایبەتیدا بوو بە مامۆستا، هەرچەندە مووچەکەی زۆر کەم و دەبوو رۆژانە چوار سەعات بە پاس بڕوات، بەڵام دایکی توانی واز لە کارەکەی بهێنێت. هەروەها پازۆلینی یەکەم گرێ بەستی بۆ هەڵبژاردنی چەند سەرە قەڵەمێکی ئەدەبی بە زمانی میللی بەست. ئەنجامەکەی ئەو کارە ئەدەبیە مەزنە بوو کە ساڵی 1953 پێشوازیەکی زۆری لێکرا ( ***poesia diaolel nov ecento***) پاشان چەند هەڵبژاردنێکی تری ئەدەبی کە تایبەت بوو بە شیعری میللی ئیتالی و دوای دوو ساڵ بڵاوبووەوە. ساڵی 1953 بەرگێکی لە شیعری فریولی و کورتە چیرۆکێکی بە ناوی ***Ragazzid vita***[5] وە

بلاوکـردەوە کـە لـە دواییـدا بـوو بـە بەشـێك لـە یەکەم ڕۆمانی، بەکاووخۆ ئەدیبە ناسراوەکانی وەك گــادا و ئونگــاریتی بــوون بــە هــاوڕێی، بەتایبــەتی پەیوەنــدی گــەرمی لەگــەڵ هــەردوو ڕۆمـــاننووس ئـــەلیزا مـــورانیتی و ئـــەلبرتو موراڤیادا پەیدا کرد. هەروەها پەیوەندی گەرمی لەگەڵ ئتیلیو برتولوچی نووسەر پەیدا کرد کە باوکی دەرهێنـەر بیرنـاردۆ بـوو. بۆ ماوەیـەکیش لەگــەڵ خێزانــی بەرتولوچــیدا لــە خانوویەکــدا بــوون. بــەرناردو بەرتولوچــی لــە یــادی ئــەو ســاڵانەو پازۆلینیــدا دەنووســێت "مــن شــیعرم دەنووســـی، هـــەر لـــە نووســـینی شـــیعرەکە دەبوومــەوە، یەکـسەر لـە قـاتی پێنجـەوە – کـە ئێمەی لێ نیشتەجێ بووین – دەچووم بۆ قاتی دوو کە پییر پاولو پازۆلینی لـێ بوو، زەنگم لـێ دەدا، ئەگـەر لـە ماڵـەوە بوایـە دەبـوو خێـرا هـەر لەوێــدا بیخوێنێتــەوە، ئیــدی بەشــێوەیەك لــە شێوەکان بۆ من پییر پاولو پازۆلینی ڕەمزێکی باوکانە بوو.. من لە بینینی واقیعدا حەزم دەکرد شـوێن پێـی ئـەو هـەڵگرم، تەنانـەت بـۆ شـێوازە ئەدەبیەکەیـشی هـەروا بـووم. هەنـدێك شـیعری بلاونـەکراوەم هەیـە، بۆیـە بـلاوم نـەدەکردەوە چـونکە زۆر پازۆلینیانـەبوو، تـەواو بـە شـێوازی پازۆلینی نووسراون".

تـــەنیا ئـــەو دۆســـتایەتیانە نـــەبوون کـــە پازۆلینیان بەو شارە نەمرەوە بەستبووەوە. دوای "مەســـیحیەتی عارفانـــەی فریـــولی" ڕۆمـــا بـــە هەســـتێکی وەســـەنیانەی کامڵـــەوە دەرکـــەوت. ئیـــدی سەرکێـــشیە سێکـــسیەکان ســـووك و ئاســـان ڕۆژانـــە و بـــێ مەترســـی بـــوون "بـــەم جـــۆرە نموونـــەی پەیوەندیـــە ڕەمـــەکی و جۆراوجۆرەکانی دەست پێکرد کـە بـە درێـژایی ژیانی بەردەوام بوو"

لەوانەیە ئەم لایەنەی شار یارمەتی پازۆلینی دابێت بۆ کەمکردنەوەی ئەو مەیلە سێکسیانەی کــە هــەیبووە "عــەزیا هــەزار ســەرەکە" ئــەو هەستەی لە نامەیەکیدا بۆ سیلڤانا مۆری دوای هاتنـە ڕۆمـای بـە ماوەیـەکی کـەم هێشتا لـە ژێـر کاریگەری هێدمەی ناو زڕاندنەکەیدایـە– زۆر بـە ناسـکی دەری دەبڕێـت– لـە نامەکـەدا شـیکاری خەسـڵەتە مۆنۆپۆلیەکــەی دەکــات بــۆ مەیلــە سێکسیەکەی کە پاشان ڕەخنەگرەکان بە مەیلی خۆ ڕووت کردنەوەیان دانا.

پـازۆلینی دەڵێـت: "ئەوانـەی لـە مـن دەچـن" ئەوانــەی بۆیــان نــەلواوە بــەپێی یاســا باوەکــە بـژین، لـە دواییـدا توندڕەویی لـە تەقدیرکردنی یاساکاندا دەکەن. خەڵکی ئاسایی دەشـێ خـۆی ڕابهێنێـت "ئـای کـە دەربڕینێکـی دزێـوە" لەسـەر داوێــن پــاکی و دەرفــەت لەدەســتدان، بــەڵام بــە نیــــسبەت منــــەوە ســــەختیی هەســــت بــــە خۆشەویــستی کــردن وای کــردوە کــە ئەگــەر پێویستیت بە خۆشەویستی بێت وا دابنرێت کە ئـەوە کـۆنترۆڵ کردنـە" پـازۆلینی دەنووسـێت: "ئەو کە بە هۆی مەیلـە سێکسیەکەیەوە هەست بە شەرمێك دەکات و ئەمـە هـانی دەدات کە حـەز بکـات بـە خـەڵکیی بڵێـت وەك – سیلفانا – ئـەو تــەنیا لــە ڕێــی دان پیانانــەوە دەتوانێــت وا لــە خودە پێشوەکە "باش و شەریفەکە"ی بکات کە لەوەی بەسـەریهاتوەو ئاینـدەی ژیـانی خستۆتە ژێـر ئـالای ڕامبـۆ یـان کامبانـا یـان وایلـد، لێـی خــۆش بێــت. لەســەر نووســینەکەی دەڕوات و دەڵێـت: "مـن هـەرگیز گونـاهی خـۆمم پـێ قبـووڵ نـەبوە، لەگـەڵ سروشـتی خۆیـشمدا دانوسـتانم نەکردووە، خۆیـشم لەسـەری ڕانـەهێناوە. مـن بـۆ ئەوە لەدایك بووم کە ئاغر و ژیر و سروشـتی بم، لادانە سێکسیەکەم شتێك بوو لە دەرەوەی خۆم،

بەردەوام وەك دوژمنێك لە پاڵ خۆمدا دەمبینی، هەرگیز هەستم پێ نەکردوە شتێك بێت لە ناوەوەی خۆمدا" بۆ خۆشبەختی ئەو رەشبینی و سووکایەتی بەخۆکردنەی لەم نامەیەدا بالادەستە بەردەوام نەبووە، رۆژبەرۆژ نامە لە دوای نامە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

لە هاوینی ساڵی 1952 دا کاتێك ناخۆشی ساڵە بەراییەکانی بەرەو ڕەوینەدەچوو، پازۆلینی بەشێوەیەکی تەواو جیاواز بۆ سیلفانا دەنووسێت. بە گەرمیەوە وەسفی رۆما و گۆڕانی باری ژیانی خۆی دەکات: "رۆما منی کردووە بە وەسەنیەکی وا کە بڕوام بە راست و دروستی ئەو بنەما ئاکاریە دیارانە نەمێنێت کە مۆرکی باکوریان پێوەیە و بۆ ئەم کەش و هەوایە چ مانایەکی گەورەی نیە.

من ئێستا ژیانێکی تەواو ناخۆش دەژیم، لە وێرانەیەکدا، لەو گۆرانیە دەکات کە هەمیشە دووبارەم دەکردەوە. لای کەسانێك و تاڕادەیەك وەك ئامێرێك کاردەکەم، کەسانێکن هەڵوێستە مەسیحیەکانی وەك لێبوردن و خاکیەتی و شتی تر نازانن.. هەموو شێوەیەکی خۆپەسەندی رەوایە.. رۆمایەك کە دۆزەخی بۆرگێت دەوری داوە و ئێستا دەتتاسێنێت: ئێمە پێویستمان بە فێنکی هەیە تا بتوانین خۆمان لەبەر گەرمیەکەیدا بگرین"

مەبەستی پازۆلینی لە پورگیت *porgate* ناوچەکانی دەوروبەری رۆمایە، ئەو چۆڵەوانی وەوێرانەیەی هەژارترین کەس ئاوەدانیان کردۆتەوەو تیایدا نیشتەجێ بوون. بە چین و توێژە هەرە بەش مەینەتەکان کە زوربەیان لەو کرێکارانە بوون لە باشوورەوە بەرەو پایتەخت کۆچیان کردبوو. پازۆلینی ئەو شارە گەورەیە باش دەناسێت کە لە رۆژە بەراییەکانیدا لەو ناوچە هەژارنشینانەدا ژیاوە و لە دواییدا هاوڕێی تیا پەیداکردوون، پاشان دوان لەو هاوڕێیانە بە تایبەتی پەیوەندیان لەگەڵ سینەمای پازۆلینیدا بەست: سیر جیوسیتی "دەرهێنەر کە لەسەر بودجەی تایبەتی خۆی کاری دەکرد" و زۆر جار کامێرامان بوو. نیتو دافولی کە بوو بە ئەکتەرێکی ناسراو لای جەماوەری سینەمای پازۆلینی "پاشان سیرجیوو سیتی، وەك دافولی، بوو بە یەکێك لە ئەکتەرە چاکەکانی پازۆلینی"

پازۆلینی لە ڕۆما، وەك ئەوەی جارێکی تر تاسەی زمان و سۆزداریەکەی بۆ جوتیارانی فریولی دووبارە بکاتەوە، بە شێوە زمانی دانیشتوانی رۆما کەوتە نووسین دەربارەی گەنجانی پۆرگیت. لە نامەیەکیدا بۆ سیلفانا موری دەڵێت: "ژیاننامەی من هەمیشە بە ئەدەب کۆتایی دێت" بەسەرهاتی رۆمانە بەراییەکانی "کوڕەکانی ژیان 1955" و "ژیانێکی توند و تیژ 1959" باس لە دنیای هەژارانی پورگیت دەکات. دنیایەك تا ئەو کاتە زوربەی دانیشتوانی رۆما پێیان نەزانیوە.

ئەو دوو ڕۆمانە و دیوانە شیعریە سەرەکیەکەی "خۆڵەمێشی گرامشی 1957" سەرکەوتنێکی ئەدەبیی بوون بۆ پازۆلینی کە زیاد لە دە ساڵ خەونی پێوە دەبینی. بەلام لەگەڵ سەرکەوتنەکەدا ناوزڕاندن و ناوبانگ خراپیەکەیشی بلاوبوەوە. رۆمانی "کوڕەکانی ژیان" هەر لەگەڵ چاپکردنیدا تۆمەتی ئەوەیان وەپاڵدا کە "بەرهەمێکی سکاندالٔ ئامێزە"، ئەگەرچی لە تۆمەتەکە پاشگەزبوونەوە، بەلام ئەوە سەرەتای گەلێك تۆمەتی تر بوو کە تا پازۆلینی ناوبانگی زیاتر دەربکردایە تۆمەتەکان زیادیان دەکرد، لەو بارەیەوە پازۆلینی وتی:

"دەتـوانم ڕاپـۆرتێکی فـەرمی لـە بـارەی پەیوەندیم بە دادوەریی ئیتالیاوە بنووسم" لە ڕاستیدا دوای مردنـی پـازۆلینی ڕاپـۆرتێکی فـەرمی نووسـرا، بـەڵکوو کتێبێـك لـە ڕاپـۆرتی فەرمی کە بە وردی باس لە سی و سیٚ تۆمەت دەکـات کـە بـەرەو ڕووی پـازۆلینی کراوەتـەوە: *Pasolini corouaca a gindi ziaria percecu zioue morte.* "میلانو – گارزانتی 1977"

بێجگە لە هێرشە بەردەوامەکانی ڕۆژنامەی لایەنە ڕاستڕەوەکان بۆ سەر پازۆلینی و تۆمەتی بەدئـەخلاقی دژی کتێب و فیلمـەکانی "لەگـەڵ سانسۆردا نـۆ فیلمـی توشـی کێـشە هـات" کەسـانێکی نـاجۆر و کـاڵ فـام بـە تۆمـەتی هەڵبەسـتراو و زێـدەڕۆ کـە هـەرگیز نـەیانتوانی هیچی لەسەر ساغ بکەنەوە دایان بە دادگا. ئەم پیـاوە بـەوە تۆمـەتبار کـرا کـە بۆتـە مایـەی ئـاژاوەگێری میللـی و بـەدخوو کردنـی هـەرزەکاران و هـەڵگرتنی چـەکی ترسـناك. لـە کاتێکدا گەلێك لەوانەی شارەزای ڕۆح سووکی ئەم پیاوە بوون بە هێورو نـەرم و نیـان ناویـان دەهێنا.

سەرکەوتنی یەکەم ڕۆمانی لە دنیای سینەما نزیکـی کـردەوە، ئەمـە بـوو بـە هـۆی ئـەوە کـە پێشنیازی نووسینی چەند سیناریۆیەك بکات یان بەشدار بێت تیایاندا. بە واقیعیش پازۆلینی سـاڵێك پـێش نووسـینی ڕۆمـانی (کوڕەکـانی ژیان) سیناریۆی بۆ چیرۆکێکی ماریو سوڵدانی *Ladouna lelfiune* ئامـادەکرد. ئەگەرچـی پـازۆلینی لـە ڕێگـای چـالاکیە ئەدەبیەکانیـەوە گەیشتە سینەما، بـەڵام بایەخدانی بە فیلم بە هیچ جۆرێك تازە نەبوو. چونکە ئەو کاتێك لە بولونا قوتابی بوو لە ڕێگای یانەی سینەماوە گـەلێك لـە فیلمـە کلاسـیکیەکانی دیبـوو، بـۆ ماوەیـەکی کـورتیش بـیری لـەوە کردبـوەوە کـە بـچێت بـۆ ڕۆمـا بـۆ خوێنـدنی فـیلم سـازی لـە قوتابخانـەی فیلمـە نیـشتمانیەکان: *Centro operinentale di cinemato grafia*دا. خـۆی دەڵێت: "وەك لاوێـك بـیرم کـردەوە کـە بـبم بـە دەرهێنـەری سـینەمایی پاشـان لـە بـیرم چـوو. دوایـی لەگـەڵ بەرپابوونی جەنگدا گـەلێك شـتی دی هاتـە گـۆڕێ بـەڵام سـینەما بـۆ مـن یەکـەمین پـەیامبوو" هەرچـەندە بـارودۆخ و چـالاکیە ئەدەبیەکان بۆ ساڵانێکی زۆر وایان دەردەخست کـە دەسـتبەرداری "یەکـەمین پـەیامی" خـۆی بووبێت، بـەڵام هەمیـشە پـازۆلینی وای دەبـینی کـە نووسـین و دەرهێنـان "دوو ئـەزموونی هاوبەشـن" بـۆ نموونـە ڕۆمانـەکانی، لـە دیـدی خۆیـدا ڕەنگدانـەوەی ئـەو خۆشەویـستیە پێـشینەیە بـوە کـە بـۆ سـینەما هـەیبوو، بـە تایبـەتی خۆشەویـستیی بـۆ دەرهێنـەرانی وەك چاپلن و ئیزنشتاین و دریر: "ئەگەر سەرنج لە چەند لاپەڕەیەکی ڕۆمـانی کوڕەکـانی ژیـان بـدەن هەسـت بـەوە دەکـەن خەسـڵەتی وێنـە سـازیان هەیـە، مانـای وایـە کـارە ئەدەبیـەکانم هەندێك لـە ڕەگـەزی بـەهێزی سینەمایان تێدایـە" لەلایـەکی تـرەوە پـازۆلینی قەناعـەتی وایـە کـە وەك شـاعیر فیلمـەکانی ئەنجامـداوە: "ئەگـەر بـەراوردی هەندێك لە شیعرەکانم لەگەڵ هەندێك لە گرتـەی فیلمەکانمدا بکەن ناتوانن نکوولی لەوە بکەن کە چ لێکـچوونێك لـە شـێوازی هەسـت کـردن بـە شتەکاندا هەیە"

وەك سیناریست پـازۆلینی لەگـەڵ گـەلێك لـە دەرهێنـەرە بـەتواناکانی وەك مـاریو سـوڵداتی و مـورو بولـونینی و فرانکـو روسـی و فلورسـتانو فانسینیدا کـاری کـردووە. بـەڵام گـرنگترین فـیلم کە بەشداری تیا کردبێت فیلمی شەوانی کابیریا

"1965"ە لەگەڵ سێرجیو سێتیدا وەك راوێژكاری زمانەوانی. پازۆلینی لێپرسراوی ئەو بەشانەبوە كە پەیوەندیان بە شێوازی "ژیانی ڕسوایی"یەوە هەبوە.

"چونكە لە رۆمانی كوڕەكانی ژیاندا، فیلینی وای بیر لێكردەوە كە من چاك لەو جۆرە كەسایەتیانە و دنیاكەیان دەزانم. لە راستیا دەمزانی، چونكە من لە بونتیمامولو ژیابووم كە زۆرێك لە دزە چكۆڵە و سۆزانیەكانی لێ بوو، كەش و هەواكەو، بەتایبەتی پەیوەندیەكانی كابیریا بە سۆزانیەكانی ترەوە، بە تایبەتی ئەو بەسەرهاتەی بە دەوری خۆشەویستیە ئاسمانیەكەدا خول دەخوات، هەموویم كردوە. هاوبەشی سەركیم لەو دیالۆژەدا كردوە كە هەندێكی لەناوچوو چونكە فیلینی شێوەزارێكی بەكاردەهێنا كە هەندێك لە شێوە زارەكەی من جیاواز بوو"

زۆر لەوە دەچێت كە فیلینی زیاد لە دیالۆژەكانی پازۆلینی و كەسایەتیەكانی شەوانی كابیریای گۆڕیبێت. بە تایبەتی ئەو خەمۆكیە زۆرەی تووشی ئەكتەرە ژنەكە دێت و مایەی بەزەیی پێداهاتنەوەیە، ئەم رەگەزانە لە فیلم و رۆمانەكانی پازۆلینیدا ونن. هەر لەو بابەتە زۆر پێ دەچێت مورو بولونینیی دەرهێنەر وێنەی ئەو كرێكارە گەنجانەی لەو دەقەی ساڵی 1959 بۆ فیلمی بولوینیی پازۆلینی نووسیویەتی هێورتر كردبێتەوە. لە كاتێكدا لە فیلم و رۆمانەكانی پازۆلینیدا لاوان لە دنیایەكی سەربەخۆدا دەجوڵێن – دنیایەك كە هەڵس و كەوتێكی تایبەتی بە زمان و یاسایانەوە دیارە – كەچی لاوانی بولونینی لەوە زیاترن كە وێنەیەكی هەژاری لاوانی بۆرژوا بن.

دوای ئەوەی پازۆلینی وتی فیلمی *lanotte beava* یەكەم فیلمە كە خۆی وێنەی گرتبێت و نووسیبێتی، سەرنجی ئەوەیدا فیلمە ئامادەكراوەكە جیاوازە لەوەی كە لە كاتی نووسیندا خەیاڵی لێكردۆتەوە: "من حەزم لەوەیە تاڕادەیەك فیلمەكە واقیعیەتێكی كۆنترۆڵ بێت، كەچی پولونینی مەیلی بەلای ئەوەدایە كە فیلمەكان ملكەچی "نامۆییەكی قەشەنگ"بن.

ئارەزووی پازۆلینی، وەك ئەوەی لێی تێدەگەین نایەوێت كەس دەقە سینەماییەكانی بگۆڕێت و، وەك چۆن خۆی وێنەی دەگرێت و خەیاڵی لێ دەكاتەوە دیمەن و كەسەكانی كۆپی ئەو واقیعەبن. بێگومان ئەمە یەكێك بوو لەو هۆیانەی هانیدا بۆ ئەوەی خۆی ببێتە دەرهێنەری فیلمەكانی. ئەوەیش ڕوونە كە پازۆلینی لەوە نیگەران بوو دەوری نووسەری دەق تا ئەو ڕادەیە سنووردار بكرێت. ئەو لای وابوو دەبێت دەوری نووسەر لەوە ناوازەتر بێت بۆیە بە بێزاریەوە دەڵێت: "بۆ نەگبەتی مرۆڤ لەگەڵ كەسانێكی نەزان و گەوجا كار دەكات كە نازانن چیان دەوێت و، نووسەری دەقیش بۆی نیە هیچ لە بەرهەم هێنان و دابەشكردن بزانێت. دەبێت نووسەر لەگەڵ دەرهێنەردا كار بكات"

بێجگە لەم هۆیانە فاكتەری سەرەكیی تر هەبوون كە پازۆلینیان بەرەو سینەما كێش كرد. بڕوای وا بوو ئارەزووی فیلم سازی بۆ "هەڵاتنە لە پاوان كردن" ئەمە لە چوار چێوەی ئەزموونگەری و رۆنانی "شێوازی داهێنەرانەی هونەری"دا. ئەم شێوازە داهێنراوە لە دۆخی سینەمادا دوو رووی گرنگی هەیە. یەكەمیان مێژوییە، لە كۆتایی ساڵانی پەنجادا پازۆلینی هەستی كرد لە ئەدەبدا، لە هەردوو باری كلتوری و فیكریەوە گەیشتۆتە رێگایەكی بن

بەست، شەپۆلی "رۆمانی نویٚ" و ئەزموونە پێشەنگەکانی دی کە رەواجیان پەیدا کردبوو، جێگای زۆر بایەخ پێدانی ئەو نەبوون. هۆی دووەمی قووڵبوونەوەی زیاتری بوو لە بوونگەراییدا، بەلای پازۆلینیەوە سینەما زیاتر دەرفەتی پیٚ دەدا بۆ نزیك بوونەوە لە واقیع. وەك چۆن باوەڕی وا بوو کە شێوە زمان بۆ تێگەیشتن لە دنیای جوتیار "شێوازێکی هەستیارانە"ی دەداتیٚ، بڕوایشی وا بوو کە دەربڕینی سینەمایی، واتا "ئەو واقیعیەتەی لە سینەمادا هەستی پیٚ دەکرێت" بواری ئەوەی دەداتیٚ "بەشێوەیەکی کامڵتر لە ژیان بگات" تا لە رێگای ئەفراندنێکی تریەوە ئەزموونی بکاتو تیایدا بژی، هەروەها بواری ئەوەیشی دەداتیٚ کە پارێزگاری لە هەموو پەیوەندیەکی لە بابەتی پەیوەندیەکانی لەش و مادی و تەنانەت هەستیەکانیش بکات"

کە لاپەڕەی رووداوەکانی ڕابووردوو هەڵدەدەیتەوە بە ئاشکرا بۆت دەردەکەوێت کە فاکتەری قوولٚ لە دوای بیرۆکەی پازۆلینیەوەن دەربارەی سینەما. وەرچەرخانی پازۆلینی لە رۆمان نووسیەوە بۆ دەرهێنان گەلێك قسەی بەدوای خۆیدا هێنا. بۆ تێگەیشتنی هۆیەکەی دەبێت لەبیرمان نەچێت کە ساڵی 1961، ئەو ساڵەی یەکەم فیلمی پازۆلینی تیا بەرهەم هات، پازۆلینی وەك شاعیر و رۆمان نووس بوو بە کەسایەتیەکی بەناوبانگ و دیار. بە قسەی یەکێك لە رەخنەگرەکان، ئەمە بەو مانایەیە کە کاتێك پازۆلینی دەستی دایە دەرهێنانی فیلم "ئەمە یەکەمجار بوو بیرمەندێك – مەبەستی پازۆلینە – بۆ دەربڕین شێوازێك لەبەربگرێت کە تەواو لە شێوازی ئەدەب جیا بێت. ستایلێك لە سەرچاوەو پێشکەوتنیدا پەیوەندی بە کلتورسازیەوە هەبێت" تەنانەت جان کۆکتۆ، ئەو شاعیرە گەورەیەی لە پێش پازۆلینیدا تاقە کەس بوو لە شیعرەوە رووبکاتە فیلم سازی، ئەویش، بە پێچەوانەی پازۆلینیەوە، لە دەرگای پشتەوە هاتە ناو دنیای سینەماوە، کاتێك کەوتە کارکردن بۆ بەرهەم هێنانی کورتە فیلمی ئەزموونکاری و دوور لە مەبەستی بازرگانی.

پازۆلینی لە ڕێی خۆتەرخان کردنیەوە بۆ فیلم سازی و، ناسینی لەلایەن جەماوەری دنیاوە، زیاتر ناوبانگی پەیدا کرد، بێگومان فیلمەکانی جیا ناکرێنەوە لە کۆی کارەکانی تری، هەروەها لەو شانۆ ئەقڵی و هونەریەی بیری ئەوروپایی کە پازۆلینی یەکێکە لە دیارترین کاراکتەرەکانی.

## پەراوێزەکان:

1–هەر بە فەرەنسی لە کتێبە ئەسڵیەکەدا نوسراوە.

2–لە کتێبە ئەسڵیەکەدا هەر بە فەڕەنسی نووسراوە.

3–*Hemeticism* قوتابخانەیەکی شیعریی ئیتالیە ئارتور ئونوفری (1885–1929) پێشەنگیەتی.

4–مەبەستی لە مردوەکە چینەکەیەتی کە ئەم دەستبەرداری بووە.

5–ئەسڵە ئیتالیەکەی بە مانای کوڕەکانی ژیانە.

## سەرچاوە:

پیر پاوڵو پازۆلینی "السینما کبدعة" ل 3–25.

SARDAM No. 54 2008

# پەیوەندی وێنە و دەنگ

بابەکی ئەحمەدی

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

## ئاخاوتن

لە بەرهەمەکانی برسۆندا ئاخاوتن بەرلەوەی ئامرازی پەیوەندی نێوان تاکەکان بێت، ئامرازی پەیوەندی تاکە بە دەرونی خۆیەوە. برسۆن ئەوەی ئاخاوتن و گوتار لە بەرهەمی سینەماکارانی تردا ئەنجامیدەدات، دەیبەخشێت بە سەیرکردن، دەست و ڕەگەزەکانی وێنە: "ئەوەی بۆ چاوە، نابێت لە ڕێگەی دوبارەکردنەوەوە وەك شتێك بۆ گوێ بەکاربهێنرێت". گرنگی سەیرکردن لە بەرهەمەکانی برسۆندا هەر ئەم ڕەهەندی لەبری وەرگرتنەیە، چونکە کاری پەیوەندی زمانی ئەنجامدەدات. ئاخاوتن زۆرتر بەکەڵکی ناسینی دەرون دێت، ڕێك وەك زمزمەی دوعا یان دانپیانان (ئیعتراف).

تیورەی برسۆن لەبارەی بەکارهێنانی دەنگەوە لە سینەمادا، لەسەربناغەی جیاوازی دەنگ و وێنە ڕاوەستاوە. سەربەخۆی دەنگ لە وێنە ئەگەرچی لە بەرهەمەکانی برسۆندا بەتەواوی بەکارهێنراوە، بەڵام پێشینەیەکی دورودرێژی هەیە. خاڵی گرنگ لە گریمانەکەی برسۆندا ئەوەیە گەر دەنگ زیاد لە وێنە گرنگ نەبێت، ئەوا بەهایەکی یەکسانی بە وێنەی هەیە و گوتار و ئاخاوتن لە فلیمی سینەماتۆگرافدا تەنها بە تەواوکەری وێنەکان دانانرێن، بەڵکو بون و ژیانێکی سەربەخۆیان هەیە. شریتی دەنگی بەرهەمەکانی برسۆن، خۆی لە خۆیدا بەرهەمێکی هونەری بێ ئەڵتەرناتیڤن. برسۆن لەبارەی دەنگەوە (وەك وێنە) بنەمای کورتی لە دەربڕین و وشێوازی ئاماژەو کورتبێژی بەکارهێناوە و لەم ڕێگەیەوە ڕۆیشتن بەرەو ئەبستراکتی درێژە پێداوە. بەبڕوای ئەو دەنگ و وێنە دوو ڕەگەزی جیاوازی فیلمن، هیچیان نابنە جێگری ئەوی دیان: "دەنگ هەرگیز پشتیوانی وێنە و وێنەش هەرگیز پشتیوانی دەنگ نابێت". لێرەوە سودوەرگرتنی برسۆن لە "دەنگی دەرەکی" تەفسیرەکان نابێ وەك یارمەتیدانێك بۆ وێنە ببینین. ڕەنگە بە

بەکارهێنانی ئەم تەفسیرانە، وێنەکە سادەتر و کورتر پێشکەشبکرێت یان هەڵبژاردنی ڕەگەزە سەرەکیەکانی وێنە ئاسانتر ئەنجامبدرێت یان تەنانەت ماهیەتەکەی بگۆڕێت. بەڵام ئەمە دەرئەنجامی بەکارهێنانی دروستی دەنگە و بەهەرحاڵ دەنگ تەواوکەری وێنە نیە و هۆی ئەنتۆلۆجی ستاتیکانەی خۆی هەیە.

هەر لەبەرئەمەش لە سێ فیلمی برسۆندا کە دەنگی دەرەکی گرنگیەکی زیاتری هەیە: واتە **یادەوەریەکانی قەشەکەی لادێ، سزادراوێك بە مردن رایکردووە و جیب ئیر**، بەکارهێنانی نەك لەبەرئەوەی ڕەگەزەکانی وێنە توانای دەربڕینی "بابەتەکەیان" نەبووە، بەڵکو لەبەر هۆیەکی دی پێویست بوو: گەیشتن بە زمانێکی ئەبستراکت (تەجریدی). لەم حاڵەتانەدا دەنگی مرۆڤێك کە دەق زۆر بە "وشکی و فەرمی" بێ پیشاندانی هیچ هەژان و شەوقێك (بەشێوەیەکی تەسنوعی) دەخوێنێتەوە، دروستکەری شێوازێکی ئەبستراکتە کە بۆ تێگەیشتن لە کەسایەتی سەرەکی _ و دۆزینەوەی پەیوەندی کردارەکانی بە ویژدانیەوە_ پێویست و ناچاریە.

وەك چۆن ئاخاوتن بە بینینی دەوری سەربەخۆی خۆی دەتوانێت ماهیەتی وێنە بگۆڕێت، هەرواش بەکارهێنانی دروستی ماهیەتی وێنەش دەتوانێت ماهیەتی ئاخاوتن بگۆڕێت. ئەم پەیوەندییەی نێوان ئاخاوتن و وێنە وەك دەرئەنجامی شاراوە و بەکارهێنانی لاوەکیانە و هاوکاری شکڵوەرگرتنی دەربڕینی نوسراو و کورتەی فیلم دەکات. بۆ نمونە لەبری ڕستەسازی ئەدەبی لەبارەی شکانی دڵی ژنێك کە عاشقەکەی دانی پیادەنێت کە خۆشی ناوێت لە فیلمی **خانمانی جەنگەڵی بۆلۆنیدا**، تەنها چەند وێنەی کورت دەبینین: ژان لە ژورەکە دێتە دەرێ، هلن لەسەر سیسەمەکە دادەنیشێ، لە ژێر سێبەری روناکی ژورەکەدا دەکرێ نیشانەکانی فرمێسك ببینین، دەنگی زەنگی تەلەفونەکە دێت، کارەکەرەکە دێتە لای دەرگاکەوە هلن لە ژێر لێوەوە دەڵێت لەگەڵ کەس قسە ناکەم. کارەکەرەکە دەپرسێت لەگەڵ هیچ کەس؟ و گوێی لێدەبێت"هیچ کەس". ئەم دەربڕینە کورتە دەرئەنجامی بەکارهێنانی سەربەخۆی دەنگ و ڕەنگە. دوو فیلمی سەرەتای برسۆن واتە **فریشتەکانی گوناه** و **خانمەکانی جەنگەڵی** بۆلۆنی بە بەراورد بە بەرهەمەکانی تری قسەی زۆرتری تێدایە. بەڵام لە یەکەم رۆژەکانی نمایشی دوو فیلمەکەدا رەخنەگران بە "نۆستالیژیای سینەمای خامۆش" لەقەڵەمیان دا و فیلمەکانیان زیاد لە سنور بە کەم قسە دەزانی. چەند ساڵ دوای ئەوە لرسیە لە ستایشی فیلمی **یادەوەریەکانی قەشەی لادێدا** نوسی "یەکەم فیلمە لە مێژووی سینەمادا کە تیایدا وشەکان بالاترن لە وێنەکان و بێدەنگی بالاترە لە قسەکردن". ئەم فیلمە کارێکی فەلسەفیە و لە ئەدەبیات، واتە لە سەرچاوەی کارەکەی دورکەوتۆتەوە" تەنانەت گەر بەشێوەیەکی ڕەها قسەکانی لیرێیە قبوڵنەکەین و فیلمی **یادەوریەکانی قەشەی لادێ** بە یەکەم فیلمی مێژووی سینەما نەزانین کە تیایدا وشەکان لە وێنە بالاترن، بەڵام بەهەرشێوەیەك بێت دەبێت دان بەوەدا بنێین کە دەرئەنجامی ئەم جیاکاریە (یان زنجیرە پلەیە) زۆر پرشنگدار بووە و کاری برسۆن هاوشانی هەوڵی چەند سینەماکارێکی بەرجەستەی ترە (ماکس ئەفولس بەتایبەتی لە فیلمی **نامەکانی ژنێکی نەناسراودا** و ژان پویر ملویال لە خامۆشی دەریادا).

میشل شیون لە کتێبی دەنگ لە سینەمادا دەنوسێت: نمونەی برسۆن لە شێوەی بەکارهێنانی ئاخاوتندا بریتیە لەژێر لێوەوە قسەکردن. وەك ئەوەی پاڵەوانی فیلمەکە لەگەڵ خۆیدا قسەبکات و هیچ وەسواسێکی بەرامبەر تێگەیشتنی وەرگر یان تەماشاکەر نەبێت". کاتێك موشت یان میشل جین ئیر شتێك لە ژێر لێوەوە دەڵێن، سنوری نێوان قسەی دەرونی (وتوێژ لەگەڵ خودا) و ئاخاوتن وەك ئامرازێکی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیدا، تێکدەشکێنێت. هەندێکجار لە جیهانی دەرونی خۆیانەوە بەرەو جیهانی ئەوی دی هەنگاو دەنێن و هەندێکجاریش یەکسەر ئاخاوتن دەچێتە خزمەت دنیای دەرونیانەوە. بەڵام تەنانەت لە حاڵەتی یەکەمیشدا واتە لەو حاڵەتەدا کە زمان وەك ئامرازێك بۆ پەیوەندیکردن بەوانی دیەوە بەکارهاتووە، دیسان خاڵی گرنگ نەك سروشتی دەربڕینی زمان، بەڵکو سروشتی شاردنەوەیەتی. کەسایەتیەکانی برسۆن وەك ئەوەی ئەو رستەیەی ئاندرێ مالرۆیان کردبێتە سەردێڕی خۆیان"مرۆڤ ئەو شتەیە کە خۆی دەیشارێتەوە".



دەڵێن ئەکتەرەکانی برسۆن سارد، بێهەستو بە یەك ریتم قسەدەکەن، ئەم رەخنەیە بناغەیەکی پتەوتر لە رەخنەی شێوەی دەوری مۆدێلەکان لە بەرهەمەکانی برسۆندا نیە، لە شێوازی دەربڕینی مۆدێلەکانی برسۆندا هیچ نیشانەیەك لە بەرزو نزمی دەنگ و هەستیاربوون و دەربڕینی باو و ئاشنای شانۆگەری نیە. واتە مۆدێلەکان چاودێری بەردەوامیان بەسەر شێوەی دەربڕینی و قسەکردنی خۆیانەوە نیە و نمونەیەکیش وەك تاکە شێوازێکی راست قبوڵناکەن و دوای ناکەون. بە نزیکبونەوەی شێوەی دەربڕینی مۆدێلەکان لە "حاڵەتی میکانیکی"، برسۆن دەنگی مرۆڤێك کە (کە بەراستی سازێکی مۆسیقیە) دەگۆڕێت بۆ دەزگایەك کە ئامرازی دروستکەری میلۆدیەکانە. لەلایەکی دیەوە برسۆن هەوڵیداوە بۆئەوەی دەنگی مۆدێلەکان و هونەری ئاخاوتنیان بەجۆرێك رێکبخات کە دواجار لێکچوون لەنێوان کۆی کەسایەتیەکانی بەرهەمەکانیدا دروستبێت. وەك ئەوەی هەموویان لەیەك خێزان بن. لێکچوونی شێوازی قسەکردنی کارەکتەرەکانی بەرهەمەکانی برسۆن ئەو وەهمە دروستدەکات کە هەموو ئەکتەرەکانی (بەیەك ریتم) قسەدەکەن. بەڵام دەبێت گۆڕانی ئاوازی قسەکردنی مۆدێلەکان بە پێوەری جیاواز لە "نەریتەکانی شانۆگەری" بپێوین. دەنگی مۆدێلەکانی بەرهەمەکانی برسۆن جۆرێکی تازەی گۆڕانکاری و جیاکاریە لە ئاوازدا. کاردانەوەی تەماشاکەران لەراستیدا کاردانەوەیە بەرامبەر بەم "تازەییە". وەك چۆن هەر شێوەیەکی تازەی مۆسیقا لەسەرەتادا بۆ گوێ "تازەکارەکان" نائاشنا و یەك ریتمە. لە سەرەتاکانی نیوەی سەدەی 19 دا دوا کوارتێتەکانی بتهۆڤن بۆ ئەو گوێیانەی خوویان بە کوارتێتەکانی هایدن و مۆتزارتەوە گرتبوو، نامۆ و تەنانەت قابیلی تەحەمولکردن نەبوو،

ئـــەمڕۆش بـــۆ ئـــەو کەســـانەی خویـــان بـــە کوارتێتـــەکانی هایـــدن و مـــۆتزارت و بتهوڤنـــەوە گرتـووە، کوارتێتـەکانی شـۆئنبرگ بـە "کۆمـەڵێك دەنگـی بێمانـا" دێتـە گوێیـان. لـە بنەڕەتـدا عادەتو خوو دواکەوتوخوازن، لەبارەی ئاوازی دەربـڕین لـە بەرهەمـەکانی برسـۆندا کێـشەکان تەنانەت زیاترە لە نمونەکانی سەرەوە: گوێکان خویان بە شتێکی ناڕاست و دروستکراو، واتە لاســـــایکردنەوەی هونــــــەری دەربڕینـــــــی شـــــانۆگەریەوە گرتـــــووە و گوێیـــــان لـــــە دوبارەبونـەوەی بـووە لـە سـینەمادا و بـەردەوام خوازیـاری بیـستنەوەین، بـەڵام هەنوکـە دەبێـت شـێوەی راسـتی بـەکارهێنانی ئاخـاوتن لـە سینەمادا فێربن.

برسـۆن بـەردەوام هەوڵیـداوە تـا ئـاوازی گوتارەکان بگۆڕێت بۆ خوێندنەوەیەکی سادەی دەقەکان یان وەك خۆی دەڵێت لە مەنەلۆگێکی دەروونـی نزیکیـان بکاتـەوە: "ئـەوە بـە بـیر مۆدێلـەکان بهێنینـەوە، بەجۆرێك قسەبکەن وەك ئـەوەی لەگـەڵ خۆیانـدا قـسەبکەن، مەنـەلۆگ لەبری دیالۆگ". ئەم دەنگە هاوتا و یەك ریتمەی مۆدێل کە لـە هـەموو شێوەیەك گۆڕانی ئاوازی شانۆگەرییانە ئازادە، بەبێ ئەو جێگۆڕکێیانەی دەرئـــەنجامی کاردانـــەوە عەســـەبیەکانە، ئـــەو ئەگـەرە دەرەخـسێنێت تـا لـە هۆکـان و پاڵنـەرە سەرەکیەکانی هەر هەستێك تێبگەین. دەکرێ و دەبـێ دەنگـی مـرۆڤ وەك سـازێکی مۆسـیقی لەبەرچاو بگیرێ. هەوڵدان بۆ لاسایکردنەوەی دەنگـی مـرۆڤ یـان ئـاژەڵ بـەهۆی سـازێکی مۆسـیقیەوە بەگـشتی دەرئـەنجامی پێکـەناوی هەیـە، حەیفـە دەنگـی مـرۆڤ راکێـشین بـۆ گاڵتـــەجاڕی لاســـایکردنەوە و دەبـــێ ئـــەوە قبوڵبکەین کە سود لـە دەنگی مرۆڤ بۆ کارێکی گـــرنگتر وەربگـــرین. لـــە مۆســـیقای ئـــاوازە مەزهەبیـەکان و فیلمـەکانی برسـۆندا "ئـەمکارە گـرنگترە" دەناسـرێت. لەلایـەکی دیـەوە کاتێـك دەنگی مرۆڤ وەك سازێکی مۆسیقایی لەبەرچاو بگرین، ئەوکات دەتوانین دۆزینەوەیەکی گرنگی مۆســـیقای فـــرە دەنگـــی ئـــەوروپی لـــەبارەی بـــەکارهێنانی ســـینەماتۆگرافیکی دەنگیـــی مرۆڤیـشەوە بەڕاسـت بـزانین: هـەر یەکەیـەکی دەنگسازێك_ بۆ نمونە دەنگی هەر دوگمەیەکی پیانۆ_ لە پاڵ یەکەیەکی تردا دەبێتە دەنگێکی تـازە. لـە بەرهەمـەکانی برسـۆندا دەنگـی هـەر ئەکتـەرێك لەگـەڵ دەنگـی ئەکتـەرەکانی دی و دەنگـە نامرۆڤانـەکانی تـردا (دەنگـی شـتەکان، مۆسیقای سازێك، دەنگە سروشتیەکان...وهتد) واقعێکـی تـازە دروسـتدەکات. لانـسلۆ کاتێـك لەگەڵ گونیوردا قسەدەکات دەنگێکی جیاوازی هەیـە لـەو کاتـەی لەگـەڵ ئارتۆردا قسەدەکات، نـەك لەبەرئـەوەی کـە ئەکتـەرێك بـە دوو ئـاوازی جیـاواز قـسەدەکات، بـە پێـچەوانەوە ئـەو لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا بـە ئاوازێکی یـەك ریـتم و هاوشێوە قسەدەکات (بەشێوەیەکی میکانیکی)، جیاوازیەکـە لـە پێکهاتـەی مۆسـیقایی دەنگـی لانسلۆدایە لەگەڵ ئەوانی دیدا.

برسۆن جەخت لەوە دەکات هەرچەند هەست یان هـەژانێك زیاتر بێت، دەبێت ئاوازی دەنگی مۆدێلەکـە سـادەتر بێـت و پـتر لـە خوێندنـەوەی دەقـــەکان بـــچێت: "دەبـــێ دەق بەشـــێوەیەك بخوێنرێتـەوە کـە دینـو لیبیـاتی مۆسیقای بـاخ لێـدەدات. دەنگـی جـوانی سـازوکاری نۆتـەکان. سەرەتا ئەندێشە و پاشان هـەژان". ئەمە نهێنـی یەك ریتمی دەنگی مۆدێلەکان و دەنگی دەرەکی بەرهەمـــەکانی برســـۆنە. ئـــەو لـــە چـــەند بەرهەمێکیدا سودی لە دەنگی دەرەکی یان بـە وتـەی خـۆی "دەنگـی دەروونـی" وەرگرتـووە. دیـــارە ئـــەم کـــارە هـــەرگیز لـــە ســـینەماو

(شانۆگەریدا) بێوێنە نیە. گوایە لە سەرەتای سینەمادا ئەم شێوازە چەندان جار زیاتر لە ئێستا کاری پێکراوە. برسۆن بە بەکارهێنانی تایبەتی دەنگ، تەفسیر یان دەنگی دەرەکی لە خەسڵەتی کاریگەریانەی جیاکردۆتەوە و کردویێتی بەجۆرێك راڤەکردن. هەرلەبەر ئەمەش لە دکوبازی **یادەوەریەکانی قەشەی لادێدا** لەبری "دەنگی دەرەکی" نوسیویێتی "دەنگی بیرەوەریەکان یان تەفسیری دەرونی". سیمای کۆتایی فیلمەکە سێ دەقیقە دەخایەنێت و دوربینەکە نامەی دۆفروای هاوڕێی قەشە پیشاندەدات و سێبەری سەلیبێك لەسەر دیوارەکە دەبینرێت. دەنگێکی دەرەکی نامەکە دەخوێنێتەوە:" ئەو بەوپەڕی ئارامیەوە ئەم وشانە _ کە من دڵنیام بە دروستی گوێم لێیان بوەوە_ دەردەبڕێ: ئەم هەموو شتە بە چ مانایەکە؟ هەموو شتێك فەیزی خوداوەندە". هەستدەکەم رێك دوای گوتنی ئەم رستانە ئەو کۆچی دوایی کرد". لێرەدا ئیدی وێنە بەکەڵکی هیچ نایەت و بە وتەی بەناوبانگی ئاندرێ بازن "دەبێت لەناو بچێت". بەبڕوای بازن سێبەری سەلیبەکە بەسەر دیوارەکەوە بەراوردی نێوان مەسیح و قەشە لاوەکە بە ئەنجام دەگەیێنێت، و ئەندێشەی باسکالیانەی قەشەکە کە " هەموو شتێك فەیزی خوداوەندە" بە کاملترین شێوە دەردەبڕێت. لە بەرامبەر ئەم دەرئەنجامە راچڵەکێنەرەدا، هەموو جۆرە ئاوازێکی نمایشی، هەموو شێوە گۆڕانی ئاواز و شێوازی دەربڕین و بە یەك وشە هەموو جۆرە پەنابردنێك بۆ هەستە مرۆییەکان، بێمانا دەبێت. دەنگی دەرەکی ئەو سنورانە لەناودەبات کە سیستەمە نیشانیە جیاوازەکان لەیەك جیادەکاتەوە و دەبێت بە نوسراو. جیاوازیەك لە نێوان هێڵەکانی نامەکەی دۆفروا و دەنگی مۆدێلەکانی برسۆندا نیە.

دیالەکتیکی دەنگ و وێنە لە **بیرەوەریەکان قەشەی لادێدا** رەنگدانەوەی ناکۆکی نێوان رۆحی شاعیرانە و رەهەندی دراماتیکی فیلمەکەیە. ئاندرێ بازن ئەوەی دۆزیوەتەوە کە لەم فیلمەدا "بەردەوام ئاخاوتن کەمێك لە پێش وێنەوەیە" و ئەمەش نهێنی کاریگەری فیلمەکەیە لەسەر تەماشاچی. فیلمەکە راستەوخۆ لەسەر بناغەی دەفتەری بیرەوەریەکان راوەستاوە، واتە لەسەر شێوەی تۆمارکراوی روداوەکان. راپۆرتێك لەبارەی روداوە نزیك و گرنگترەکانەوە، راپۆرتێك لەبارەی ژیانی رۆحێکەوە. لێرەوە لە فیلمەکەدا روداوە دەرەکیەکان تەنها رونکەرەوەی روداوە دەرونیەکانن و دەنگی دەرەکیش دەبێت لەم لایەنەوە هەڵسەنگێنرێت. لە " **سزادراوێك بە مردن رایکردووە** "دا دەنگی دەرەکی ئاماژەیەکە بۆ چارەنوسیش. بەڵام ئەمە فیلمێکە لەبارەی بێدەنگی و ئەو جوڵانەی لە بێدەنگیدا ئەنجامدەدرێت. دەبێ دابڕانی ناچارانە لە نێوان وتوێژەکانی فیلمەکەش بە سەرنجدان لەم خاڵەی سەرەوە سەیر بکرێت. هەر لەبەرئەمەش دەنگی دەرەکی لە لایەکەوە وەك ئاخاوتنێکی دەرونی لەگەڵ رۆحی خوددا دەردەکەوێت و لەلایەکی دیشەوە جیهانی دەرەکی تەفسیر دەکات و مانای پێدەبەخشێت. ئەم دەنگە دەرەکیە نیشانەیەکی چارەنوسە و رەنگە هەر لەبەرئەمەش بە هاتنە ژورەوەی ژۆست و ئەگەری وتوێژ لەنێوان ئەو و فۆنیتندا،



تەفسیری دەرەکی هەروا بەردەوام دەبێت و ناپچڕێت. لە بەرهەمەکانی برسۆندا تەنها لەو شوێنەدا پێویستی دەنگی دەرەکی دەسڕێتەوە کە ژیانی دەرونی کەسایەتیەکان بە پشتبەستن بە شێوازەکانی دور لە قسەکردن بناسرێن. بۆ نمونە لەبارەی **چوار شەوی خەوبینیەوە** وتوێتی لەم فیلمەدا دەنگی دەرەکی پێویست نەبوو، چونکە "بە ئاسانی دەمانتوانی ژیانی دەرونی ژاك پیشانبدەین". ئەم توانایە وێنەیی نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە جۆرێکی دی گوتارەوە هەبوو. گوتاری ژاك لە مایکرۆفۆنی ریکۆدەرەکەیدا، کاری دەنگی دەرەکی ئەنجامدەدات. لەم فیلمەدا دەنگی ریکۆدەرکراو جێگەی نوسراو دەگرێتەوە. برسۆن لە وتوێژکردن لەگەڵ کلارانسدا جەختی لەوە کردووە: "هەستدەکەم ئەمە باشترین شێوە بۆ دەربڕینی جیهانی خەیاڵی ژاك بوو". کلارانس دەپرسێت: "ئایا ئەمە دوبارەکردنەوەی رێسای ئاشنای بەرهەمەکانتان نییە کە لەهەر شوێنێکدا دەشێت دەنگ لەبری وێنە دابنێیت؟" برسۆن لە وەڵامدا دەڵێت: "بەڵێ. گوێ زۆر ئاسانتر لە چاو سەرنجی دەروون دەدات. چاو رووی لە دەرەوەیە. ئێوەش دەزانن چەمکی "دەروون" تا چ رادەیەك بۆ من گرنگە. بڕواموایە گرنگترین بابەت لە کاری سینەمادا دەرونە. بە پێچەوانەی شانۆگەریەوە کە هەرچیەك دەیەوێت بیڵێت رووی لە دیار و دەرەوەیە".

یەکێك لە نمونە رونکەرەوەکانی بەکارهێنانی ئاخاوتن لە بەرهەمەکانی برسۆندا فیلمی"**دادگای ژان دارکە**". لەسەرنجی یەکەمدا ئەوەی فیلمەکەی برسۆن لە فیلمی درایر "**کارەساتی ژان دارك**" جیا دەکاتەوە، هەر ئەم بەکارهێنانە تایبەتی زمانە. برسۆن بناغەی کارەکەی لەسەر بەڵگە مێژوویە پاشماوەکانی دادگایکردنی ژان دارك و هەروەها دادگای گێڕانەوەی بەها بۆ ژان دارك دامەزراند. بەڵام فیلمەکەی کارێکی مێژوویی نیە، و لەهیچ شوێنێکدا جەخت لەسەر لایەنی مێژووی نادۆزرێتەوە. بناغەی فیلمەکە پرسیاری دادوەران و وەڵامەکانی ژان دارکە. برسۆن وتوێتی: "ئاخاوتن لە فیلمدا وەك ئاخاوتن نیە لە چیرۆك و شانۆگەریدا. لێرەدا ئاخاوتن دەبێت کەڵەکە بێت، بە ئەندازەیەك کە جەخت لەو وێنەیە نەکات کە هاوڕێیەتی...لە فیلمی دادگای ژان دارکدا من وەك هەمیشە هەموو جۆرە دەرونناسیەکی شانۆگەریانە یان چیرۆکانەم خستۆتە لاوە، بەتایبەتی لەبارەی ڤارۆیك و کوشنەوە هەموو جۆرە پەنابردنێك بۆ دەرونناسی، زیانی بە فیلمەکە دەگەیاند. وازم لە شێوازی مێژوویش هێنا کە زۆر جێی بایەخ نیە....بەیەك وشە هەوڵمدا ژان دارك بە مرۆڤێکی سادە و واقعی _ رەنگە ئاڵۆز و ناواقعی_ پیشانبدەم. دژواری کارەکەم دروستکردنی فیلمێك بوو لەسەر بناغەی پرسیار و وەڵامەکان. من سودم لە هۆکاری یەك ریتمی وەرگرت و کردم بە بناغەی کارەکەم و هەموو گۆڕانێکم لەسەر ئەو بناغەیە ئەنجامدەدا. فیلمەکەم بە ریتمێکی خێرا بردە پێشەوە...سینەماتۆگراف بۆ کۆپیکردنەوەی ژیان دروستنەبووە، دەبێت ریتمێك پێشکەش بکات کە نوسەری فیلم دایڕشتووە. نابێ هەقیقەت لە روداو و تاك و شتەکاندا بدۆزینەوە، بەڵکو دەبێت لەو هەستانەدا کە هەموو ئەم شتانە دەیوروژێنن، بدۆزینەوە".

چۆن دەکرێت بناغەی فیلمێك لەسەر زنجیرەیەك پرسیار و وەڵام، واتە لە دوا شیکردنەوەدا بەردەوامی وشەکان بێت؟ ئەمە لە

کاتێکدا دەشێت کە نوسەری فیلم هوشیار بێت بە چەمکی "وێنە لە خزمەتی وشەکاندا". دادگای ژان دارك لە گەڕاندا بۆ سەرچاوەی هەقیقەت و سەقامگیری رۆح بناغەکەی لەسەر گوتار داناوە: "فیلمی من لە وشەکانەوە دەستی پێکرد و لە خزمەتی ئەواندا بوو. بناغەکەی پرسیار و وەڵامەکانە. رێك وەك چۆن لە دەقی بەڵگەنامەکانی دادگایکردنی ژان دارکدا هاتووە". کاتێك یەکەم رستەی دادگاییەکە (یان راسترە بڵێین لێپرسینەوەکە) دەست پێدەکات، دەستەکانی ژان دارك دەبینین کە لەسەر کتێبی پیرۆز دانراوە و گوێمان لە دەنگی دەبێت کە سوێند دەخوات راستی بڵێت. لە ناوەڕاستدا ژان دارك دەبینین وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە لەبارەی ژیانیەوە دەکرێن. تەنها لە کۆتایی ئەم دیمەنە پرسیارکەرەدا، قەشەیەك دەبینین. هەرکاتێك پرسیارە لێکچووەکان دوبارە دەبنەوە، وەڵامەکانی ژان وردتر دەبێت.



رێك وەك مایەی سەرەکی پارچەیەکی مۆسیقی کە بە پێ بەپێی کات کامڵتر دەبێت. شێوازی کەمکردنەوەی گرنگی وێنە کە لە کاتی نمایشی **دادگای ژان داركدا** هێشتا سەرسوڕهێنەر دیار بوو، ئەمڕۆ ئاشناترە. فیلم بەم هاوسەنگیە دروستە لەنێوان وێنە و دەنگدا دەچێتە پێشێ و بۆ ساتەوەختێك ئەم هاوسەنگیە تێکناچێت. ئەم وردیە لە هەڵبژاردنی ئاخاوتن لە **دادگای ژان داركدا** بەکەڵکی چی هاتووە؟ برسۆن بە وردبینی پرسیاری قەشەکان و وەڵامەکانی ژان دارکی بەکارهێنا تا لەبەرامبەر مەزهەبی بەدەزگاییبوووی پرسیارکەراندا (ئەوەی کیرکگارد بە نەفیکردنی ئیمانی داناوە) باوەڕو ئیمانی تاکەکەسی، سروشتی و سادە و قوڵی کچە گەنجەکەیان بەرجەستەکردووە. وشە کۆنەکانی فیلمەکە کە رەنگی قسەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی هەیە، بۆتە هۆی دروستبوونی پێکهاتەی رستەگەلێکی جوان و راچڵەکێنەر کە باوەڕی روونی کچەکە پیشاندەدەن. لە کۆتایی یەکەم لێپرسینەوەدا ژان دارك دەڵێت: "من هەموو ئەو شتانەم گووت کە دەیزانم. بەڵام نەء. نەك هەموو شتێك. من لەلای خوداوەندەوە هاتووم و هەرچیەك دەیکەم بە فەرمانی و ئیرادەی ئەوە. دەمەوێت بمگەڕێننەوە لای ئەو". یان لە دانیشتنی دوهەمدا بەمشێوەیە هەڕەشە لە قەشەکان دەکات "بیر لەو شتە بکەنەوە کە ئەنجامیدەدەنو وریا بن! من لە لایەن خوداوەندەوە هاتووم و ئێوە خۆتان روبەرووی مەترسیەکی مەزن کردۆتەوە. من بڕوام بە بەخشینی خوداوەند هەیە". یان لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا بەڕاست رەحمەت و فەیزی خوداوەند دەناسێت، دەڵێت: "ئەگەر شایستەی بەخشینی خوداوەند بم، هیوادارم لەم پلەیدا بمێنمەوە و ئەگەر شایستەشی نەبم، هیوادارم بۆ ئەم بەخشینە رێنماییم بکات". لەم دۆخەدا دەنگی خشەی قەڵەمی نوسەر بەسەر کاغەزەکەدا و نیگای کوشۆن بۆ داوەرەکان و قەشەکان، لە حوکمی ستایشی هێزی قسەکانیدایە.

ئەم قسە سەرسوڕهێنەرانە، گەڕانێك بەناو دەرونی ژان دارکدا، رێخۆشکەری سنورگەلێکی تازەیە بۆ هونەری هاوچەرخ. قسەکانی ژان دارك زمزمەیەکی دەرونیە بۆ خودناسین و تەماشاچی بە ئارامی ئاشنای ئەم جیهانە دەرونیە دەبێت. ئەویش دەستدەکات بە ناسینی خود. دەبێت نهێنی ئەم کاریگەریە مەزنە لەوشەکاندا

بدۆزینەوە. قسەکانی قەشە لاوەکە ئامبریکۆر لە **بیرەوەریـــەکانی قەشــەی لادێــدا** بــەردەوام ســادەیی و لەهەمانکاتــدا ســەختی قــسەکانی منــاڵانی هەیــە. قــسەکردنێك کــە لــە زانینێکــی تایبەتــەوە هــەڵقوڵاوە و لــە زانینــی مەســەلە رۆژانەییــەکان زیــاتر دەڕوات: "ئــەی بــاوکی خاوەن ئاسمـان و زەوی سوپاسـگوزارم کـە ئـەم مەسەلانەت لە زانایـان و عاقڵەکان شاردۆتەوە و بۆ منالاَنت کەشفکردووە"(عەهدی تازە، ئنجیلی لۆقا. بەشی دەهەم. ئایەتی 21). ئەم هوشیاریە دەرونیە کە قەشە گەنجەکە وەك منالاَن دەستی پێڕاگەیشتووە، پێویستی بە زمانێکی تایبەت هەیە. زمانی بیرەوەریەکان قەشەکە.

برســـۆن ئـــەم وانـــە گرنگـــەی لـــە ژۆرژ برنانۆســەوە فێربــووە کــە ئاخـاوتن دەبێـت لـە رەهەنـــدە دیاریکراوەکـــانی ژیـــانی رۆژانـــە روتبکرێتـەوە و بـەرەو ئەبستراکت بـڕوات. ئـەم گەیشتنە بە سنوری ئەبستراکت لەو جێگایەنەدا کــە ئاخــاوتن لــە کارکردنــەکانی پەیوەنــدی دوردەکەوێتــەوە و هــەر وشــە و هــەر رســتەیەك دەبێتــە دەلالــەتێك بــۆ خــودی زمــان، زمــانی بەرهەمـەکانی برسـۆن لـە شیعر نزیکدەکاتـەوە. ژان کۆکتـۆ لـە زمـانی نوسـینی وتـاری **خانمـانی جەنگەڵی بۆلۆنی**دا نوسیبووی: "رێگەیەکی دی نیە، دەبێ زمانی سینەماتۆگراف لە شیعر نزیك بکەینــەوە". بــەراوردی دەقــی ســەرەکی رســتە بەناوبانگەکـەی کۆکتـۆ لـە **خانمـانی جەنگـەڵی بۆلۆنیدا** کە وەرگێڕانـە ناشرینەکەی بە کوردی بەمشێوەیەیە "چیرۆکی دڵی ئێوە، وشە بە وشە چــیرۆکی دڵــی غــەمگینی منــە ئــەوەی ئێــوە گوتوتانــە، منــیش بــەخۆمم گوتــووە، خــامۆش بــووم، تەحــەمولم کــردووە، پــێش ئێــوە هیــچم نـــەگوتووە. چ وانەیـــەك". لەگـــەڵ رســـتە هاوشێوەکەیدا لە چیرۆکی دیدرۆدا، حوکمەکـەی کۆکتـۆ دەسەلمێنێت. ئەم نزیکیـەی زمانی فیلم لــە شــیعرەوە، رێگــە بــۆ دەربڕینــی کــورت دەکاتەوە. لەبری قسەکردنی دورودرێژ، هلن بە ژان دەڵێت: "بە بەدکاریـەوە هاوسەرت هێنـاوە. هـاوڕێم، سـەماکار بـوو. تـۆ لەگـەڵ منـدا یاریـت کرد. ئەمەش یاری من لەگەڵ ئێوە" و لەسەری دەڕوات و دەڵێـت: "بگەڕێنـەوە بـۆ لای ئینـس. دیارە بەتەنیا نابن. هەموو عاشقانی لە ماڵەکەی ئێوەن و ماڵەکە پڕ لەخەڵکە".

برســۆن لــەبارەی زمــانی شــاعیرانە، کــۆن، نابــاوو زۆر خــەمناکی **دادگــای ژان دارکــەوە** وتـوێتی: "من وشە کۆنەکانم پـێ باشترە، بەلاَم نەك هەمیشە. لە **دادگای ژان دارکدا** هەندێك لەم وشــانەم بــەکارهێنا بۆئــەوەی فێــری رەنگــی تایبـەتی وەلامـەکانی ژان ببم. کـاتێکی زۆرم بـۆ پێشەکی کارەکە دانا بۆ ئەوەی چەمکەکان بێتە دەسـتم. ئـەمکارەم زۆر بـە خـاوی ئەنجامـدا. لـە ترسی ئەوەی نەوەکا خیانەت لە شتێك بکەم". دەوری قـسە لـە **لانـسلۆ دۆلاکـدا** چـەندانجار نـامۆترە لـەو دەورەی لـە **دادگـای ژان دارکـدا** هەیــەتی. زمــان لێــرەدا کــۆنترە. ئــەو وشــە نەناسراوانەی کـە لـە زمانی فەرەنسی ئـەمڕۆدا سودی لێوەرناگیرێت، زۆرتـر بەکارهاتووە. لـەم فیلمەدا کورتکردنەوە و کورتبێژی زۆرتر رەچاو کـراوە، گوتـاری فیلمەکـە راسـتەوخۆ لـە شـیعر دەچـێت. لـەزۆر حاڵەتـدا گوتارەکـان بـوون بـە رســـتە و رســـتەکانیش بـــوون بـــە ووشـــە. دوبارەکردنەوەی ناوەکان ـ رێك وەك ئەدەبیاتی حەماسی سەدەکانی ناوەڕاست ـ هـەزار مانایـان لە خۆیاندا شاردۆتەوە.

**سەرچاوە:**

وەرگێڕانی بەشێك لە فەسڵی سێهەمی ئەم کتێبەی خـــوارەوە: (بابــك احمـــدی. بـــاد هرجـــا بخواهـــد میوزد.انتشارات فلم .چاپ اول زمستان 1369).

# هۆلیود و جیهان

تووبی میلەر

لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

کە سەدام حوسێن پارچە مۆسیقای (رێگـای مـن)ی فرانـك سـیناترا کـە ناوبـانگێکی جیهـانی هـەبوو، وەك تێمـی رێو رەسمـی جێـژنی پـەنجاو چوارسـاڵەی لـەدایکبوونی هەڵبژارد، ئەم کارەی لە ژێر گوشاری ئیمپریالیسمی ئەمریکادا نەکرد.

**(مایکل ئاسنێر)**

ئەمریکاییەکان خودی نائاگا (نەست) ی ئێمەیان داگیر کردوە.

**(ویەم ڤێندرسێن)**

**بەسەرهاتی هۆلیود**

**ئێمـــە هـــەمووومان کارناســـانی فیلمـــە ئەمریکاییـەکانین و دەبـێ واش بێت چونکە 40 بــۆ 90 لەســـەدی ئـــەو فیلمانـــەی لەزۆربـــەی شـوێنەکانی جیهـان پیـشان دەدرێـن بەرهـەمی ئەمریکان.**

**ســـــاڵی 1993 وڵاتـــــە یـــــەکگرتووەکان بەرهەمهێنـــەری 88 لەســـەدی پڕفرۆشـــترین فیلمـەکان بـوو، سـاڵی 1994 بـۆ یەکـەم جـار داهاتی دەرەکی سینەمای ئەمریکا کەوتە پێش داهـاتی ناوخۆییـەوە (راك ڤوول*hI1994*). ئەمـە بـــەمانای نکـــۆڵی کـــردن نییـــە لـــەگرنگی کولتوورەکـانی تـری بەرهـەم هێنـەری فـیلم. زۆربـەی بەرهەمهێنـەرانی فیلم لـەجیهان رەنگین پێـستن، کـە بـە بـەراورد لەگـەڵ هۆلیـودا زۆر پرۆژەی ئیدیۆلۆژیکی و نموونەی بڵاوکردنـەوەی فرەچەشـــنتر بەرهـــەم دەهێـــنن(شـــوهەت و ئێـــستەم(27،1994). بـــەڵام کولتـــووری لۆسانجلێسی و بازرگانی نیۆیۆرکی، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پانتایی بڵاوکردنەوەی فیلمی لەهـــەموو جیهـــانی گرتۆتـــەوەو، ســـەرکەوتنی بەرچاوی پیشەسازی فیلم لەئەمریکا لەشەڕی یەکەمی جیهانی بەدواوە بووە بە نموونەیەك بۆ**

هەناردەی کالاّ مۆسیقایی، تەلەفزیۆنی، کارە پڕوپاگەندەیی و ئینتێرنێتییەکان لەئەمریکای باکوورەوە بۆ دەرەوە. گەشەسەندنی بەرنامە تەلەفیزیۆنییە سەتەلایەتییەکان و کاسێتە ڤیدیۆییەکان، وێڕای تایبەتی کردن و ئازادکردنی بلاّوکردنەوەی رادیۆ–تەلەفزیۆنی کەناڵە نەتەوەییەکان، تادێ پانتایی کارکردنی تێکنۆلۆژی دەنگی–وێنەیی بەربلاّوتردەکات. (واسکۆ 223:1994). بەلاّم ئەم دەسەلاّتدارێتیە چۆن شکلّی گرت؟

زانستی ئابووری بۆ تیۆریزەکردنی پیشەسازی سینەما تووشی کێشە بۆتەوە. بەرهەمهێنانی فیلم بەپێچەوانەی زۆربەی بەرهەمهێنانەکانی تر، زۆربەیان پاوانی کۆمەڵێ کۆمپانیای گەورەن کە هەرکامەیان بەرهەمی سنووردارو تایبەت بەخۆیان بەرهەم دەهێنن. زۆربەی سەرمایەگوزارییەکان (لەسینەمادا) تووشی شکستی تەواو دەبن، ئەمە ئازارێکە کە تەنیا کۆمپانیا گەورەکان توانای ئەوەیان هەیە بەرگەی بگرن، لە دیدی بینەرانەوە چیرۆکی فیلم بایەخ و گرنگی هەیە نەک تێچووی فیلم ئەمە بەپێچەوانەی گریمانە باوەکانی ئابووری کلاسیکە دەربارەی دەوری نرخ بۆ دروست کردنی هاوسەنگییەك لەنێوان بەرهەمهێنان و خواستدا، بەدەر لەمەش لەبەر گرێدراوێتی فیلم بە فەزا دەقیەکەیەوە، هۆکارە دەرەکییەکان دەورێکی گرنگیان هەیە لەسوودی ئابووری فیلمدا.

زانستی ئابووری بەمانا باوەکەی سەرکەوتنی هۆلیود لەم چەند ساڵەی رابردوودا بەپێی فەرهەنگی بەڕێوەبەرایەتییەکی نەرمونیان و سیستەمی ئابووری کراوە، ئازادو داهێنەرانەشەوە روون دەکاتەوە کە وای کردووە لەگەلّ هەلّومەرجی ئابووری و کۆمەلاّیەتی هەردەم لەگۆڕاندا بسازێت. بەم شێوەیە لە سەردەمی فیلمە بێدەنگەکاندا فیلمگەلێك بەرهەم دەهات کە جگە لە بازاڕی بەربلاّویی نەتەوەیی ئەمریکا، لەبازاڕی ولاّتانی تری ئینگلیزی زمانیشدا دەفرۆشرا. لەبەرئەوەی زمانی ئینگلیزی زمانی نێونەتەوەیی بوو، سەرهەلّدانی سینەمای بگۆ بوو بەهۆی گەشەی بازاڕی فیلمە ئامریکاییەکان، هەروەها پێکهاتەی فرەچەشنی نەتەوەکان لە ولاّتە یەکگرتووەکان یارمەتیدەر بوو بەوەی (سینەما) ببێ بە شێوەیەکی خەلّکیترو جیهانی تر بۆ دەربڕینی چیرۆك ، بەبەراورد لەگەلّ کولتوورەکانی تردا. بەپێی ئەم بەلّگاندنانە، لەو سەردەمە بەدواوە، هۆلیود بە پشت بەستن بەم خالّە بەهێزانەو پەیڕەوی کردن لە بنەمای بازرگانی ئازاد و رەقابەت کردن، گەشەی سەند(ئێجنس و مۆل 271–3:1994).

لەبەرامبەردا بۆچوونی ئابووری–سیاسی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم سەرکەوتنە قەرزداری هاوئاهەنگی نێوان سەرمایەو دەولّەتە بۆ سەلماندن و پاراستنی پێگەی زالّی بازرگانی و ئیدیۆلۆژیکی هۆلیودو، لەم ناوەشدا دەوری دەولّەت بە ڕادەی دەوری بینەران و کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکان گرنگە. هەلّبەت هەندێ جار ئەم پێوەندیە هاوکات بووە لەگەلّ ناکۆکی و تێکهەلّچوون.

ئەوەی راستی بێت ئاستی بازرگانی فیلم هەردەم بەم شێوە نەبووە کە ئێستا دەیبینین. لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، فەرانسە هەموو حەوتوویەك دە تا دوانزە فیلمی دەفرۆشتە ولاّتە یەکگرتووەکان، تا ساڵی 1914 ولاّتە یەکگرتووەکان زۆربەی فیلمە سینەماییەکان و

بەشێکی زۆری تەکنۆلۆژیای بەرهەمهێنانی لە دەرەوە دەکرێ، ئەوکات (بازاڕی) بەرهەمهێنان و پیشاندانی فیلم لە ئامریکای لاتین لە کۆنترۆڵی ئیتالیاو فەرانسەدا بوو(بیلیوو 3،1993–32)، بەڵام کۆمپانیای ڤیتاگراف (***Vitagraph***) تا ساڵی 1907 لەهەر فیلمێك دوو نگاتیڤی هەڵدەگرت، یەکێکیان بۆ ئەوروپاو ئەوەی تریان بۆ ناوەوەی وڵات(دووگراتسیا 1989:57)تا ساڵی1909 کۆمپانیاکانی ئەمریکای باکوور دەیانتوانی بۆ دابین کردنی خەرجی فیلمەکانیان پشت بە بازاڕی ناوخۆ ببەستن و تێدەکۆشان نرخی هەناردەی فیلمەکان بۆ ناردن بۆ سنوورەکانی دەرەوە دابەزێنن(ئۆرگانی 1992:313) لەنێوان ساڵەکانی 1915و 1916 هەناردەی فیلمی سینەمایی وڵاتە یەکگرتووەکان لە 36 میلیۆن فووتەوە گەیشتە 159 ملیۆن فووت، ئەمە لە حاڵێکدایە هاوردەی فیلمی ئەم وڵاتە کە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی 16 میلیۆن فووت بوو لە ناوەڕاستی دەیەی 1920 دابەزی بۆ 7 میلیۆن فووت(کینگ.22،1990:10)

بەگەشەسەندنی(بازاڕی) فیلمە داستانییەکان لەو ساڵانەدا، هۆلیود ڕێگای کردەوە بۆ بازاڕەکانی ئاسیاو ئامریکای لاتین، بۆ وێنە بەکرینی نووسینگەی دابەشکردنی فیلم لە بەڕازیل، بەرهەمهێنانی ئەم وڵاتەی تا رادەیەك لەناوبرد(شوهەت و ئێستەم 1994:28). لەساڵی 1919ەوە بەشێکی زۆر لە خەرجی فیلمە هۆلیودییەکان لەڕێگای فرۆشی دەرەکییەوە دابین دەکرا، لەدەیەی 1920دا بەریتانیا، ئۆستراليا، ئارژانتین و بەڕازیل زۆرترین پێگەکانی هەناردەی هۆلیودبوون (ئارامس 1978:48). بەدانانی شێوەی دەنگدانان، هەوڵدرا بە بەرهەمهێنانی فیلمە موزیکاڵەکان دڵی ئەو بینەرانە بەدەست بێنن کە ئینگلیزی زمان نین، بەدەر لەمەش ئەو ستۆدیۆیانەی لە وڵاتە جیاوازەکاندا دامەزرابوون هەوڵیان ئەوە بوو کۆپییەك لە فیلمە سەرکەوتووەکانی دونیا بەزمانی خەڵکانی رەسەنی دانیشتووی ئەو ناوچەیە بەرهەم بهێنن. (تانستیل 1977:91). هەروەها پیشەسازی فیلم بە دروست کردنی پێوەندی لە نێوان فرۆشی بەرهەم گەلێکی وەك رادیۆ و سەفحەی گرامافۆن لەگەڵ فیلمە مۆزیکاڵەکاندا ، بە یەکپارچەیی و یەکدەستی گەیشت. بەپێی




بەراوردی دێپارتمانی بازرگانی ساڵی 1939، شەست و نۆ لەسەدی ئەو فیلمانەی لەجیهاندا نمایش کراون بەرهەمی وڵاتە یەکگرتووەکان بووە (هارلی1940:21).

بەدڵنیاییەوە بەشێ لەم سەرکەوتنانە بەهۆی سەرنجراکێش بوونی چیرۆکی فیلمەکانەوە بوو. بۆ وێنە لەدەیەکانی 1920و 1930 دا لە ئیتالیا، هۆلیود جۆرێ مۆدێرنیتی درەوشاوەو ئەفسانەیی بەوێنا دەکێشا کە تەنانەت سەرنجی مۆسۆلۆنیشی راکێشابوو. جوانی، چالاك بوونێکی لاوێتی، سەرمایە لەژێر ناوی سەرقاڵکردندا ئاوێتە کراون. بازاڕ

دۆزی(بازاریاب) ناوچەیی، شادیە نایابەکانی جیهانی مۆدێرن و جیاوازییەکانی لەگەڵ ژیانی نەریتی ئیتالیا بەرجەستە دەکات. هاوکات بەهۆی بەربڵاوبوونەوەی تۆڕی بڵاوکردنەوەی (بەرهەمە) ئەمریکاییەکان، هەروەها ئەو باجە نوێیەی دەوڵەت دیاری کردبوو، بە پشت بەستن بە تێکنۆلۆژیای ئەمریکایی توانای پێشبڕکێی لە پیشەسازی نەتەوەیی سینەما (لەئیتالیا و وڵاتانی تری ئەوروپایی و_ك) سەندبۆوە (هیی 1987:71:66).

بەهەموو ئەمانەشەوە دوو شەڕی جیهانی هەموو چەشنە باسێك تووشی کێشە دەکات، کە لەودا زاڵ بوونی ئەمریکا تەنها بەپێی بەرێوەبەرێتی پێشکەوتوو یان پەسەندکردنی بەرخۆرەکانی لەپانتایی جیهانیدا شی بکرێتەوە. شەڕەکانی 1918–1914و 1945–1939 ریتمی بەرهەمهێنانی نەتەوەیی لەسەرجەم ئەوروپا وەستاند یان ئارامی کردەوە(ئەیزد 1988:61–3،82،118). زۆر فیلم لە چاوەڕوانی دەرچوون لە "لیستی ئەو فیلمانەدا بوون کە نمایش نەکرابوون( لەماوەی چوارساڵدا، لەساڵی 1945 بەدواوە 2000 فیلمی داستانی نێردرایە ئیتالیا)، لەگەڵ ئەمەش وڵاتە یەکگرتوەکان سەرقاڵی بەهێزکردنی ژێرخانی (پیشەسازی– کەشتی رانی) روو بەگەشەی ئەو وڵاتە بوو. سیاسەتەکانی ئاژانسی ناردنی فیلمە سینەماییەکان، لەباری شێوەو ناوەرۆکەوە، ئەوەندە نزیکایەتی لەگەڵ سیاسەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان هەبوو کە ئەم رێکخراوە تازە دامەزراوە لەدەیەی 1940 دا خۆی ناو نابوو"وەزارەتی دەرەوەی بچووك" (گۆبەك 1987: 3–92). هەر لەم ساڵانەدا بوو لەسەر خواستی وەزارەتی دەرەوەی "تر" سیستەمی سانسۆڕ *code production*خود– رێکخەری ئەم پیشەسازییە، بابەتێکی تازەی بەو بابەتە فرەچەشن و سەیرانە زیاد کرد کە دەرخەری کەڵکەڵە پیشەییەکانە دەربارەی سێکس: ئەو بابەتەش خستنەڕوو فرۆشی شێوەی ژیانی ئەمریکایی بوو بۆ هەموو جیهان (شاتز 1988:160 پادوێرمیکەر 1950:36).

توانەوەی بەناچاری رێکخراوە دەوڵەتیەکانی بەرهەمهێنانی فیلم لەوڵاتانی تەوەر، وێڕای بەرنامە دژە فاشیزم و کۆمۆنیستییەکان ، تەواوکەری گەڵاڵەی هۆلیود بوون بۆ بەدەست هێنانی سوودی زیاتر. کەوایە، سەرەڕای هەموو ئەو باسانەی دەربارەی هۆلیود دەکرێ کە گۆیا پەیڕەو لە سیاسەتی پێشبڕکێی ئازاد دەکات، راستی ئەوەیە هۆلیود بەدرێژایی دەیان ساڵ سیاسەتی پشتیوانی کردنی لەپشت بووە، بۆ وێنە ئیمتیازی باج، ناوەنداریێتی فیلم، نوێنەرایەتی کردن لەوەزارەتی دەرەوەو ئابووری، یارمەتی ماڵی و ئابووری و پاوانکردنی بازاڕی کڕین لەناو وڵاتدا. بەدەر لەمەش، دەوڵەتی ئەمریکا سەرچاوەی گەورەی تەرخان کردووە بۆ بەرهەمهێنان و پاراستنی پیشەسازی فیلم لەبەشی تایبەتدا، کە لەخزمەتی ئایدۆلۆژیا و بەرژەوەندییەکانیدایە (هارلی 1940:3 الساسیر 1989:11–10).

لەگەڵ بەمەترسی کەوتنی سوودی بەرهەمهێنانی فیلم لەناوەوەو لە ئەنجامی یاسای دژە پاوان و برەوی *tv*، هۆلیود لە دەیەی 1950 دا زیاتر لە جاران رووی هێنایە بازاڕی جیهانی (ئارامس 1987:49). گەیشتن بە وێکچوونی ستوونی *vertical Antegtation* لەرێگای بەدەست هێنانی خاوەنداریێتی

بەرهەمهێنان، بڵاوكردنەوە ، رەنگە لەناوخۆی وڵاتدا لەرێگای یاساوە سنووردار بكرێتەوە یان بەری پێ بگیردرێ، بەڵام لەئاستی جیهانیدا بەم شێوە نییە. تا دەیەی 1960 وڵاتە یەكگرتووەكان لە سەر داهاتی پیشەسازی فیلم كە پشتی بەهەناردە دەبەست حیسابی دەكرد. بەریتانیاو ئەمریكای لاتین زۆرترین كڕیارانی فیلمە هۆلیودەكان بوون. لەهەر بابەتێكدا، نالەباربوونی هەڵومەرجی ئابووری لە لایەكەوەو كەمتەرخەمی لەسەرمایەگوزاری كردن بۆ سینەما چەن هۆڵییەكان لەلایەكی ترەوە بوو بە هۆی كەم بوونەوەی ژمارەی ئەوانەی دەچنە سینەما. هەربۆیە هۆلیود رووی كردە شێوە نوێكانی سوودمەندبوونی بازرگانی(وەك "دۆزینەوەی" بەردەنگ و بینەری رەش پێستی ئامریكایی و سەرهەڵدانی ژانێری" رەش تەوەر"*blaxploitation* . داوبەداوی ئەم سوود وەرگرتنە تازەیە لەلایەن چەند- كۆمپانیەكانەوە *congl.merates* و بەدەست هێنانی ستۆدیۆ لەلایەن كۆمپانیەكانەوە، كۆمەڵێ رێكار گیرایە بەر بۆ ئەوەی جارێكی تر بینەر بەدەست بێتەوە(تیلار 1979:194). حكوومەت و بەشی پیشەیی فیلم لە ئەمریكا یان هەرتكیان هەوڵیاندا بازاڕی هەناردەو فرۆشی فیلم لەسەرتاسەری جیهان بگرنە دەست، وێڕای ئەمەش ئۆفیسی تایبەتیان كردەوە بۆ فیلمە ئەفریقاییە ئینگلیزی و فەرانسی زمانەكان؟"كۆمپانیای هەناردەی فیلمی ئەفریقایی هۆلیود" لەدەیەی 1960 دا بازاڕی فرۆشی فیلم بۆ ئەو وڵاتانەی گرتە دەست كە پێشتر ژێردەستەی بەریتانیا بوون. لەم دەیەدا هەموو ساڵێ 350 فیلم نمایش دەكرا كە دەكرێ بوترێ نیوە زیاتری بەرهەمی ئەمریكا بوو. (دیاوارا 1994:6،1992:106-385 یوكادایك 1994:63). ئەمڕۆكە زۆر ئاسانتر دەكرێ فیلمێكی ئەفریقایی بدۆزینەوە كە لە ئەمریكا یان ئەوروپا پیشان درابێ، لەوەی كە لە خودی ئەفریقا نیشان درابێ. دوای شەپۆلێكی ئاوسانی ئابووری لە 2 دەیەی 1970-1980 پیشەسازی فیلمی لە ئارژانتین و مێكزیك، تا ئاستی داخران برد، ژمارەی ئەو




فیلمە هۆلیودیانەی لە ئەمریكای لاتین نمایش دەكران بە شێوەیەكی بەرچاو چووە سەر، ئەمە لەحاڵێكدا بوو لە ناوەڕاستەكانی 1980 دا ژاپۆن بەگەورەترین بازاڕی دەرەكی دەژمێردرا (هێپیل 1996:52: ئۆرگان 1992:30). وەك ئەوەی بینیمان گۆڕانەكان، وەك بادانەوە بەرەو سیاسەتەكانی نیۆلیبرالیزم و سەرمایەگوزاری چەن نەتەوەیی لەدەیەی رابردوودا(دەیەی

1990)،سوودێکی زۆری بۆ هۆلیود لێکەوتەوە لەرێگای تایبەتی کردنی راگەیاندنەکان، بازاڕی یەکەی رۆژئاوای ئورووپا، گەیشتن بەبازاڕی ولاتانی رۆژهەلاتی ئەوروپا برەوسەندنی سیستمەکانی بلاوکردنەوەی وێنەکانی (ڤیدیۆ) (ئێلاسێرا 1989 گووپەك1987:9و ئیسکۆ 1994:220و224).

بەلام ئەگەر زالّ بوونی رۆژ لەدوای رۆژی ئابووری بازاڕی جیهانی هۆلیود واقیعێکی حاشاهەلّنەگرە، بۆچی ئەم زالّ بوونە بووە هۆی نیگەرانی دەولّەتەکان؟ بۆچی ئەو پرسیارانەی کە لەخۆیاندا پرسگەلێکی پیشەیین بوون بەهۆی نیگەرانی فەرهەنگی و کولتووری؟ ئەم زالّ بوونە باس لەچ چەشنە"هەڕەشەیەك" دەکاو بەراست چ شتێك دەکەوێتەوە مەترسیەوە؟

### ئیمپریالیزمی کولتووری

ولاتانی پەراوێز کەوتوو(ئەوانەی ئێستا جیهانی سیهەمین) لە دەورانێکدا بە درێژایی هەزارەیەك. بیروڕاو کالاکانیان گۆڕیوەتەوە. رایەلّەکانی گۆڕینەوەی زانیاری و دانوستانی بازرگانی، تا سەدەی پازدەهەم پانتاکانی ئۆقیانووسی ئارام، ئاسیا و دەریای ناوەڕاستو ئەفریقای پێکەوە گرێ دەدایەوە، لە ماوەی ئەم سەدانەدابوو کە کۆیلەیەتی، سیستەمی سەربازی و تەکنۆلۆژیا و ئێمپریالیسمی ئەوروپا کەوتە بیری ئەوەی ئەم رێگای پێوەندییانە بپچڕێن. پێوەندی نێوان قارەکان ئارام ئارام گرێ درایەوە بە ئەورووپاوە وەك قارەی ناوەند و (ئەوروپا) بوو بە پردی پێوەندی نیوان جیهان. ئایدۆلۆژیای تازەش هاتنە گۆڕ. سەرێتی نەژادی و پەیامی مەسیحییەت بەوەی لایەنگرانی دینەکانی تر بێن بە مەسیحی (هیم لینگ 223- 4:1990). ئیتر کولتوور و زانیارییەکان بوو بە خالّی گرنگ لای ئیمراتووری ئەوروپا. تەکنۆلۆژیا و چیرۆك بێژی سینەمایی هەر لەو دەمانەدا وەك بەشێکی گەورە لە گۆڕانە گرنگەکان لە سیاسیەتی کۆلۆنیالیزمدا دەردەکەوێ: ولاتە یەکگرتووەکان، فیلیپین و کوبای داگیر کرد، هیزە ئەوروپاییەکان رێك کەوتن لە سەر دابەشکردنی قارەکان و بەرەنگاری دانیشتووە رەسەنەکانی ئەمریکایان تێك شکاند. لە حالێکدا مافی دانیشتوانی رەسەن پێشێل دەکرا، لەگەلّ ئەمەش هەناردەی کولتووری – بازرگانی و دەسەلاتداری رەها دەبرایە ئەو ناوچانە. (لەگەلّ زنجیرە چیرۆك و گێڕانەوەکان دەربارەی جینۆساید کە لە سەر پەردەی سینەمادا نیشان دەدرا). ئەو ناوەندانەی لە هۆلیودەوە فیلمیان دەنارد بو شوێنە جیاجیاکان تەنانەت بەر لە سالّی 1912 ش چاك دەیانزانی فیلمە هۆلیودییەکان لە هەر کوێ نمایش دەکرێ دەرگای چوونە ناوەوەی کالا ئەمریکاییەکان بۆ ئەو شوێنانەش دەکرێتەوە. ویل هیز سالّی 1930 بە ئاژانسی پڕووپاگەندەی جی والتەر تامپسۆنی وتبوو کە ناردنی هەر فووتێك لە فیلمە ئەمریکاییەکان یەکسانە لەگەلّ فرۆشی 1 دۆلار لە بەرهەمەکانی ئەمریکا لە شوێنێکی جیهان (هیز 1931:15). تا کۆتاییەکانی دەیەی 1930 زۆر چیرۆکی سەیرو سەمەرە باس دەکرا دەربارەی پێوەندی نێوان سینەماو بەرهەمەکان: وەك چیرۆکی پەرە سەندنی بازاڕی نوێ بۆ فرۆشی چەرخی جل دووریی ئەمریکایی بە هۆی نمایش کردنی فیلمێکەوە دەربارەی هەلوومەرجی

کۆمپانیایـەکی ئـەمریکایی: هەڵبـەت بە شـێوەی داڕشـتنی هۆلیـودی. واڵـتر وێنگـەری دەرهێنـەر تەنانــــەت باســــی لــــە مــــانگرتنی "خێــــرا نووسـەکانی" فەرانسە کردبوو کە ناڕازی بوون بە هەلوومەرجی ژیانی خۆیان بە بەراورد لە گەڵ هەلوومــەرجی ئــەو کارمەندانــەی لــە فیلمێکــی ئەمرکاییدا کار دەکەن– وێنگەر باسی لە دەوری 120000 باڵیۆزی ئەمریکا (ژمارەی هـەناردەی فیلمـە ئەمریکاییـەکان لـە یـەك ساڵدا) کردبوو و خۆشـحاڵی خـۆی لـەم شـتە دەربڕیبـوو (وێنگـەر 1939:50،45). پێوەنـدی لـەم شـێوە دەتـوانین لە 2 دیمەنی ناودار کە کلارك گیبل دەوری تێدا دەبینێ ببینین. لـە دیمـەنێك لـە فیلمـی لـە ناپـل دەستی پێکرد *(It started in Naples)* بەرهەمی (میلۆیل شاولسۆن 1960) کلارك گیبل خەریکە منـاڵێکی رەسـەنی ئـەمریکایی فێـری دروسـت کردنی هەمبەرگر دەکات. ئەم بابەتە بوو بە هۆی وروژانی مشت و مڕ لە نێوان خەڵکدا دەربارەی ئــەوەی خــەڵکی دەریــای ناوەڕاســت خــواردن خـراپ دروسـت دەکـەن. چـارەکە سـەدەیەك بـەر لـەوە، وەفـدێك لـە بازرگانـە ئارژانتینییـەکان لـە باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا سـکاڵایان دژ بـە فیلمـی "شەوێك رووی دا *(It happened one night)* بەرزکردەوە، چونکە لەم فیلمەدا کلارك گیبل لە حاڵێکدا ژێر کراسی لـە بەر نییـە کراسـەکەی لـە بــەر دادەکــەنێ و بــەم شــێوەیە کاڵایــەکی تــر دەخاتــە پێڕســتی مەخزەنەکانــەوە (کیــنگ، 1990:23)

هەرچەن هۆگری بە پەراوێزەکانی سینەما بە زۆری بە جۆرێ هەستیاری لێبرالی لە سەردەمی ئێستا دەزانن، بـەڵام لـە راسـتیدا ئـەم پرسـە هـەر لــــە کۆنــــەوە یــــەکێك لــــە کەڵکەڵــــەکانی پاوانخوازەکـانیش بـووە. لـە دەیـەی 1920ەوە هۆلیـود چـۆنییەتی کاریگـەری دانـان لـە سـەر بینــەرانی خــستە ژێــر چــاودێرییەوە. ســاڵی 1922 مێکزیك هـەر لـە سـەر ئـەم پرسـە دەسـتی دایــە بەرتەســك کردنــەوەو هــەروەها حەســاری بازرگانی و هەر لەم دەیەشدا ئاڵمان و فەرانسەو ئیتالیاو ئسپانیا ناڕەزایـەتی خۆیـان دەربـڕی بـە سـووکایەتی کردنـی کولتـووری لـە فیلمەکانـدا (ویــزی،1992: 618، 1– 620 ، 624، 627، 631). لەگــەڵ ئــەوەی وڵاتــە جۆراوجۆرەکــان دەبـوون بـە سەرچـاوەیەکی گـەورەی مـاددی بـۆ هۆلیود، کاریگەریشیان لە سـەر فیلمـەکان زیـاتر دەبـوو. پێرسـتێك لـە "وەهـا نـابێ" و "وریـا بــن"ەکــان کــە هۆلیــود پێــشنیاری دەدا بــە دەرهێنـەرەکان کـە خۆیـان بپـارێزن لـە (نمایـشی ئــایین، مێــژوو، دامــەزراوەکان، کەســایەتییە ناودارەکـانی وڵاتـانی تـر بـە شـێوەی خـراپ و ناشیرین". بەریتانیاییەکان جەختیان دەکردەوە بــەوەی نابــێ ئیــزن بــدرێ بــەوەی مەســیح لــە فیلمەکانـدا نیـشان بـدرێ، هـەر بۆیـە مەسـیح لـە دوایـین رۆژەکـانی پـۆمپی *The last days of Pompeii* (ئەرنـست بـی شـۆتزاك،1935) دا نەدەبینرا، ئەمە لە حاڵێکدایە سامۆئێل گۆڵدوین بــە گلەییــەوە دەیگــووت " تــەنها کەســێتیەکی نیگەتیڤ کە ئەمڕۆکە(1936) دەتوانین نیشانی بدەین سپی پێستەکانی ئەمریکاییە (وەرگـیراو لە هـارلی 1940:23). لـە لایـەکی تـرەوە ئەگـەر ژاپۆنییەکان کەمتەرخەم بوون لە کڕین و نمایش کردنــی فیلمــە هۆلیوودییەکانــدا، لــە دەیــەی 1930دا مەترســی ئــەوە هــەبوو کــە دەوری کەســایەتی خــراپ و بکــوژ و بــە پــەراوێز کەوتوویان پێ بسپێردرێ.

بەرپرسە بازرگانییە ئەمریکاییەکان زۆر زوو هاتنـە سـەر ئـەو بـاوەڕەی لەگـەڵ فیلمـەکانیان

هەندێ بەرهەمی تر بنێرن. ئەم کارە بوو بە هۆی پەرچەکرداری نێگەتیڤی زۆربەی وڵاتانی هەژار، بەتایبەت لە سەردەمی دوای شەڕی دووهەمی جیهانیدا. لەو سەردەمەدا ئەم جۆرە هەناردانە بە رەسمی بە بەشێك لە بەرنامەی هاندانی وڵاتانی کەمتر پێشکەوتوو بەرەو باروودۆخی مۆدێرن ناوی لێدەبرا. پەرچەکرداری بەرینی دژ بە گوتاری مۆدێرن کردن وەك گەلاڵەیەکی رەگەز پەرەستانە و بەرژەوەندی خوازانە- لە باشترین حاڵەتدا کوێخا مەنشانە- سەری هەڵدا کە لەم ناوەدا جەخت دەکرایەوە لە سەر دەوری راگەیاندنەکانی بۆرژوازی و نێونەتەوەیی وەك توخمە دیاری کەرەکان بۆ بیچم بەخشین بە زەوق و بینین و پەسەندەکانی خەڵك لە بوارگەلێکی وەك کڕین و کەڵك وەرگرتن لە بەرهەمەکان، کولتووری گشتی و شێوەکانی رێکخستنی ئابووری و سیاسی لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێهەمدا. بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بدەین بە هەناردەی فیلمەکان و ژێرخانی سینەمایی و هەروەها دەسەلاتداریێتی ئەمریکا لە بواری تەکنۆلۆژیاو پێوەندییە نێونەتەوەییەکان. رەخنەگران باس لەوە دەکەن گەشەدان لە رێگای پەرەدان بە بازرگانییەوە بوو بە هۆی دابەزینی گەشەی ئابوری و بێبەری بوون لە ماڤ کولتووری (لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا)، لەگەڵ ئەوەش بووە بەهۆی سەرهەڵدانی جۆرێ چینی باڵادەست لە وڵاتانی گرێدراو کە تەنها بە پشت بەستن بە سەرمایەو ئایدۆلۆژیای دەرەکی لە وڵاتەکەی خۆیاندا فەرمانڕەوایی دەکەن.

ئەم تیۆری گرێ دراوێتییە لە دەیەکانی 1960 و 1970 دا بە هەموو جیهاندا بڵاوبۆوەو لە پەراوێزی رێکخراوە فەرهەنگییە نێونەتەوەییەکان و یەکەکانی گرووپی 77 دا لایەنگری پەیدا کرد. بەڵام لە دەیەی 1970 بە دواوە پلەو پێگەیان لە باری سیاسی و فیکرییەوە روو لە دابەزین بوو. ئەو کاتەی کە تیۆری گرێدراوێتی لە یۆنسکۆدا باسی لێکراو پەسەند کرا، لاوازی و سست بوونی لە بەرامبەر فرەخوازیو ئالۆزی ئەم رێکخراوەیەدا دەرکەوت، چونکە یۆنسکۆ لە لایەکەوە جەختی دەکردەوە لەسەر هاوسەنگی و هاوترازبوونی هەموو کولتوورەکان و لە لایەی ترەوە باوەڕی بە پێوەندی و نزیکایەتی شوناسی نەتەوەیی بوو لەگەڵ شێوە جۆراوجۆرە کولتوورەییەکان. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەریتانیا لە ناوەڕاستی دەیەی 1980 دا لە یۆنسکۆ هاتنە دەرەوەو بەم کارەیان ئەو سەرچاوانەیان بێ هێز کرد کە خستبوویانە خزمەت یۆنسکۆ بۆ دامەزراندنی پرەنسیپی نوێ لە پانتای کولتوورو راگەیاندنەکاندا. لە هەمان کاتدا نووسەرانی چەپگەرا هێرشیان کردە سەر قوتابخانەی گرێ دراوێتی بە هۆی کەم و کووڕییەکانییەوە لە قسەکردن دەربارەی بۆرژوازی ، هەلومەرجی کۆلۆنیالیزم، هەڵسوکەوتی چینایەتی ناوخۆو نێونەتەوەیی، دەوری دەوڵەت، دەوری کولتووری لۆکاڵی(تانستل ،57:1977 ریۆز 1993: 30-5: شیلزینگێر، 1991:، 145: مان 1993

دوایین خاڵ، واتە دەوری گرێ دەرەوەی کولتووره رەسەنەکان لە پێوەند لەگەڵ بەرهەمەکانی هۆلیود، گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆ هێور کردنو کەم رەنگ کردنەوەی تیۆری ئیمپریالیسمی کولتووری. راپۆرتی میشێل فۆکۆ دەربارەی دیدار لەگەڵ دەروونناسێکی رەش پێست هەڵگری خاڵێکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە سیستەمە جیاوازەکانی

جوانیناسی. كه ماموستا دەروونناسەكه داوا لە بینەرەكان كە دانیشتوانی رەسەنی ئەو ناوچەیەن دەكا چیرۆكی فیلمە نمایش كراوەكە بگێڕنەوە ، ئەوان بە جێگای سەرنجدان بە پێرسۆناژ و گەلاڵەی چیرۆك كە مەبەستی ماموستا بوو باسیان لە "گوزەری تیشك لە لای شاخ و گەلاَی دارەكان و سێبەرەكەی" دەكرد كە زیاتر لەهەر شتێ سەرنجی ئەوانی بۆ لای خۆی راكێشابوو.

وەك چۆن راپرسی تەلەفزیۆنی گۆڤاری ئۆكۆنۆمیست لە ساڵی 1994 نیشانی دەدا، سیاسەتی كولتووری، هەر دەم و لە هەر بابەتێكدا ، جۆرێ رەنگ و بۆی لۆكاڵی بە خۆ دەگرێ كە "گرێ كوێرە ئەلكترۆنییەكانی" شانۆنامەی هەناردەی پێ دەكرێتەوە (هایلمەن 1994:راپرسی 4). تەیلمێر لێبس و ئیلالیهۆ كەیتس لە لێكۆڵینەوەیەكدا دەربارەی پێشوازی كردن لە زنجیرەی تەلەفیزیۆنی دالاس لە ئیسرائیل، ژاپۆن و ولاَتە یەكگرتووەكان، سێ مەرج دیاری دەكەن بۆ گواستنەوەی سەركەوتوانەی ئایدۆلۆژیای ئەمریكایی: دەقەكە هەڵگری كۆمەڵێك زانیارییە و بۆ یارمەتیدان بە بەرنامەكانی دەرەوەی سنوورەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان داڕێژراوە، كۆددارین و لە هەمانكاتدا كۆدەكان بكرێنەوە، وەك نۆرمێكی باو دەڕۆنە ناو كولتووری ئەو ولاَتانەی لەوێ نمایش دەكرێن. ئەم لێكۆڵەرانە تەنها رووبەڕووی ژمارەیەكی كەم لە زەینە سادەو بێ غەشەكان بوونەوە لە نێوان گرووپە جیاوازەكاندا كە قسەیان دەكرد دەربارەی فیلمەكان و خەریكی رادەربڕێن بوون لەو بارەوە، لە بەرامبەردا ژمارەیەكی زۆر لە دیمەنەكان بە شێوەی جیاواز تەفسیر كران و خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ كرا( لیبس و كەیتس، 3،1990-4)

لە راستییدا نیگەرانی لە بابەت فیلمە سەرقاڵكەرە ئەمریكییەكانەوە بە زۆری لە ژێر چەتری نیگەرانی بۆ " كولتووره نەتەوەییەكان" لەلایەن ئەو كولتوورانەوە دەردەبڕدرێ كە یان ئەوەیە سەركوت كراون یان تووشی وەهم بوون. رەسەن خوازی زیادەرۆییانەی بەشێك لە لایەنگرانی پاراستنی كولتووری، نكۆڵی كردنە لە لایەنە ئازادیخوازییەكانی بەشێكی زۆر لە فیلمە سەرقاڵكەرەكانی ئەمریكا لە دەست بونیادە چەپێنەرەكانی چینایەتی، وەك ئەو شتەی لە بەریتانیادا دەیبینین.

سینەما نەتەوەییەكانیش نەیانتوانیوە خۆیان لە رەخنەكانی هۆلیود دوور بگرن و هیچ رەخنەیەكیان لە هۆلیود نییە. بەشێكی زۆریان خەریكی لاسایی كردنەوەی هۆلیود بوون كە دیارترینیان دەتوانین ئاماژە بدەین بە شەپۆلی سی بۆی *Si –boy* لە ئەندۆنزیا لە دەیەی 1980و كولتووری گەنج پەسەند بە ماشێنە خێراكانیان و (خزمەتكارە ئینگلیزی زمانەكانیانەوە) (سێن 129،73،64:1994-30). ئەمە لە حاڵێكدایە بەشێك لە ولاَتان هەندێ ئۆلگوو و سەرچەشنیان لە كولتووری سینەمای هۆلیودی ئاوێتەی ئۆلگووە لۆكاڵییەكان كرد بۆ ئەوەی جۆرێكی نوێ لە شوناسی نەتەوەیی بخەنە روو، وەك ئەو شتەی لە سینەمای ئیرلەندادا دیتمان( راكێت و دیتران،1998: 147). هەندێ لە ولاَتان فیلمە هۆلیودییەكان دەكەن بە بەربەستێك بۆ ئەوەی ئیزن نەدەن بەشێك لەو فیلمانەی كە هەرچەن نزیك بێت بە كولتوورەكەشیان بڕواتە ولاَتەكەیانەوەو بەم شێوەیە لە سینەمای

هۆلیودی کەڵك وەردەگرن. پاکستان پێی باشە جیاوازییە کولتوورییەکانی ئەمریکا وەربگرێ نەك وێکچوونی کولتووری لەگەڵ هێند.(ئێرگان،1992:343)

## سەرچاوەکانی ئەم بابەتە:


*Acheson, Keith, and Christopher J. Maule (1994) "Understanding Hollywood's Organization and Continuing Success", Journal of Cultural Economics, 18/4*: 271-300.

*Armes, Roy (1987), Third World Film Making and the West (Berkeley: University of California Press).*

*Balio, Tino (1993), Grand Design: Hollywood as a Modern Business Enterprise* (1930-1939 *New York: Scribner's).*

*Binford, Mira Reym (1987), "The Two Cinemas of India", in John D. H. Downing (ed.), Film and Politics in the Third World (New York: Autonomedia).*

*David, Joel (1995), Fields of Vision: Critical Applications in Recent Philippine Cinema (Quezon City: Ateneo de Manila University Press).*

*de Grazia, Victoria (1989), "Mass Culture and Sovereignty: The American Challenge to European Cinemas 1920-1960", Journal of Modern History, 61/1*: 53-87.

*Diawara, Manthia (1992), African Cinema: Politics and Culture (Bloomington: Indiana University Press).*

——— (1994), "*On Tracking World Cinema: African Cinema at Film Festivals,*" *Public Culture, 6/2: 385-96.*

*Elsaesser, Thomas (1989), New German Cinema: A History (Basingstoke: Macmillan' London: British Film Institute).*

*Foucault, Michel (1989), Foucault Live (interviews, 1966-84), ed. Sylvère Lotringer, trans. John Johnston (New York: Semiotext(e) Foreign Agents Series).*

*Guback, Thomas H. (1984), "International Circulation of US Theatrical Films and Television Programming", in George Gerbner and Marsha Siefert (eds.), World Communications: A Handbook (New York: Longman).*

——— (1987), "*Government Support to the Film Industry in the United States", in Bruce A. Austin (ed.), Current Research in Film: Audiences, Economics and Law, iii (Norwood, NJ: Ablex).*

*Harley, John Eugene (1940), World-Wide Influences of the Cinema: A Study of Official Censorship and the International Cultural Aspects of Motion Pictures (Los Angeles: University of Southern California Press).*

*Hay, James (1987), Popular Film Culture in Fascist Italy: The Passing of the Rex (Bloomington: Indiana University Press).*

*Hays, Will (1931), Speech, 12 May, J. Walter Thompson Collection, Duke University, Creative Staff Meeting File, Monday Evening Meettings.*

*Heilemann, John (1994), "A Survey of Television: Feeling for the Future," Economist, 330/7850, Survey 1-18.*

*Rockwell, John (1994), "The New Colossus: American Culture as Power Export ,"New York Times, 30 Jan. H1, H30.*

*Schatz, Thomas (1988), The Genius of the System: Hollywood Filmmaking in the Studio Era (New York: Pantheon).*

*Schlesinger, Phillip (1991), Media, State and Nation: Political Violence and Collective Identities (London: Sage).*

*Sen Krishna (1994), Indonesian Cinema: Framing the New Order (London :Zed).*

*Shohat, Ella, and Robert Stam (1994), Unthinking Eruocentrism :Multiculturalism and the Media (London: Routlege).*

*Runstall, Jeremy (1977), The Media are American: Anglo-American Media in the World (London: Constable).*

*Ukadike, Nwachukwu Frank (1994), Black African Cinema (Berkeley: University of California Press).*

*Vasey, Ruth (1992), "Foreign Parts: Hollywood's Global Distribution and the Representation of Ethnicity", American Quarterly, 44/4: 617-42.*

*Wasko, Janet (1994), Hollywood in the Information Age: Beyond the Silver Screen (Cambridge: Polity Press).*

*Wenders, Wim (1991), The Logic of Images: Essays and Conversations, trans . Michael Hofmann (London: Faber & Faber*

سەرچاوە:

گوڤاری ارغنون ژماره 23

*Himpele, Jeffrey D. (1996), "Film Distribution as Media: Mapping Difference in the Bolivian Cinemascape", Visual Anthropology Review, 12/1: 47-66.*

*Izod, John (1988), Hollywood and the Box Office 1895-1986 (New York: Columiba University Press).*

*King, John (1990), Magical Reels: A History of Cinema in Latin America (London: Verso).*

*Liebes, Tamar, and Elihu Katz (1990), The Export of Meaning: Cross-Cultural Readings of Dallas (New York: Oxford University Press).*

*McAnany, Emile G. (1989), "Television and Cultural Discourses: Latin American and United States Comparisons", Studies in Latin American Popular Culture.*21-8:1 ,

*Mann, Michael (1993), "Nation-States in Europe and Other Continents :Diversifying, Developing, not Dying", Deadalus, 122/3: 115-40.*

*O'Regan, Tom (1992), "Too Popular by Far: On Hollywood's International Popularity", Continuum, 5/2: 302-51.*

*Powdermaker, Hortense (1950), Hollywood the Dream Factory: An Anthropologist Looks at the Movie-Makers (Boston: Little, Brown).*

*Reeves, Geoffrey (1993), Communications and the "Third World" (London :Routlege).*

*Rockett, Kevin, Luke Gibbons, and John Hill (1988), Cinema and Ireland) Syracuse, NY: Syracuse University Press).*

# سینەما

# پانتایی، زەمەن، وێنەی مۆنتاژکراو

ماری ئالین ئۆبراین

لە عەرەبییەوە: عەلی کەریم

جەستەی ئەکتەر خۆی لە خۆیدا پانتاییەکی پڕ لە ئێسك و، جومگە و، هەناسەو، شلەیەکی هەردەم بە تەوژم و شەپۆلاوییە کە پێشتر لە دەقەکەدا لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی دیار ئاشکراکراوە.

—کامێراش وەك ئامێرێکی میکانیکی بۆی هەیە ببێتە مایەی بێزاری یان دەرخستنی نهێنێییەکانی ئەودیوی گوزارشتەکان — شەریکە بەشە لە پرۆژەکەدا بۆیە پێویستە ئەکتەر خاوەنی بەئاگابونێکی قوڵ و فراوان بێت لە پەیوەندییەکانیدا لە تەك کامێرادا، تۆ بڵێی هەر لە خۆڕا گوزارشتەکانی وێنا بکات، یا زێدەڕۆیی بکات لە وێناکردنی وردەکارییە خۆڕسکەکانی ئەکتەر؟ چین ئەو کاریگەرییانەی دەوروبەر بەسەر تواناکانی ئەکتەر، بە کامێراوە، بە سیناریۆوە، بە تێکڕای کارەکتەرەکانەوە، ستاندی کامێرا، گەرمی پڕوچکتۆرەکان، دەوری نێوان ئەکتەر و کامێرا، هەر هەموویان توخمگەلێکن کار ئەکەنە سەر ئەکتەر، بۆی هەیە بەربەستێکی زۆری بخەنە بەردەم تا رادێت لەگەڵ کارەکەیداو، وەك هەر ئێکسسوارێك، یان هەر ئامێرێك خۆشە ئەبێت، ئەوسا ئەکتەر ئەتوانێت هەموو تواناکانی بخاتە گەڕ بە مەبەستی بەرجەستەکردنی کارەکتەرەکەی لە زەمەن و، دیکۆر و، رووداوەکانی کە لە دەقەکەدا هاتووە.

کارکردن لە سینەمادا قازانجێکی زۆری هەیە، وا پلانی بۆ دانراوە کە لە میانەی کامێراوە بەجێ بهێنرێت و، لەگەڵ ئەوەی دەرهێنەر و، دواتر لەگەڵ وێنە خامەکەدا ئەیکەن ئەکتەر لە شانۆدا دوسێ سەعاتی بەدەستەوەیە گەشە بە کارەکەی بدات لە کردەی

یەکەمیدا پەرە بە سۆزی ئەدات بە مەبەستی دەستپێکردنی کردەکانی داهاتوی. بەدەر لە شانۆ هێمنیەکی ئارامبەخش دەوری ئەم سێکوچکە شانۆییەی داوە! دەق، ئەکتەرەکان، بینەر، لە کاتێکدا ئەکتەر لە میانەی کردارە شانۆییەکانەوەو بە هۆی کاردانەوە بینەر گەشە ئەکات و، بەئاگابوونی قوڵتر ئەبێ ئەویش یا بەهۆی پێکەنینەوە بێ یان لە میانەی بێدەنگییەوە، بە هۆی ئەم بەدەنگ هاتنەوەیە شتێك لە نواندنی ئەگۆڕێ و، هەر لە میانەی پەردە هەڵماڵین لەسەر خودی خۆی لە دەورەکەیدا ئەتوانێت بە ئاسانی هەست بە حەساسیەت و، پەرت بوونی بینەر بکات لە کاتی بەرجەستەکردنی کارەکتەرەکەیدا، یان چیرۆکەکەدا. لە سینەمادا ئەکتەر وەك سیلویت بەسەر شاشەوە ئەبینرێت، رەنگە هەر خۆی واتە هەمان ئەکتەر لە فیلمێکی دی کار بکات، یان لە ماڵی خۆیدا سیناریۆیەکی دی بخوێنێتەوە، بۆیە ناتوانێت نە ئەدائی بگۆڕێت و، نە بە دەمیانەوە بچێ، کاری ئەکتەر بەر لە چەندین مانگ، ئەو کاتەی چۆتە ستۆدیوە کۆتایی هاتووە، ئێستا تەماشای کارەکەی ئەکەن و ئەیخەنە ژێر کاریگەری ئامێر و تەکنیکاری بە مەبەستی روناکردنەوەی قژی زۆرتر لەوەی سەرنجی راستگۆیی کردار و سلوکەتی بدەن لە دیمەنەکەدا، رەنگە ئەکتەر چوار سەعات زیاتری لەسەر کورسی ماکیاژکردن بردبێتە سەرو، دوو سەعاتێکیش چاوەڕوانی دەستپێکردنی وێنەگرتن بوبێت، ئەوە ناچارە بەپێی رێوشوێنی دیاریکراو لەسەر زەوییەکەدا کە بەهۆی (عەدەسە)ی درێژی بەکارهاتوی دەستی وێنەگرەوە دیمەنەکەی ئەنجام بدات، گەیاندنی دەنگی گرنگ نییە، مادەمەکی میکرۆفۆنەکان بە چ ئاستێك بیانەوێت دەنگی ریکۆرد ئەکەن هەروەها بۆی هەیە تەکنیکاران ئاستی دەنگی وەك پێویست چاك بکەنەوە، ئەکتەر دیمەنی کورت کە ماوەکەی لە نێوان یەك دەقیقەوە بۆ نۆ دەقیقە وێنە ئەگرێ، رەنگە کاری وێنەگرتنی یەك رۆژێك سێ دەقەی زەمەنی نمایشەکە بێت لەسەر شاشە، هەروەها رەنگە ئەو دیمەنانەی



کە لە رۆژێکدا وێنەگیراون یەك لە دوای یەکەوە نەبێت و، زنجیرەش نەکرابێت، لەبری ئەوەی ئەکتەر لە شانۆدا ئەچێتە سەر تەختەی شانۆ بە مەبەستی ئەوەی بۆ ماوەی سێ سەعات ژیانی کەسایەتییەك بونیاد بنێت، ئەکتەری سینەمایی ئەچێتە پانتاییەکی تەنگەبەرەوە (ئەگەرچی وا دیارە بە زنجیرە چیایەك دەوری دراوە) ناچارە لەم شوێنە بچوکەدا نواندنە شانۆییەکەی چڕتر بکاتەوە بۆ سێ و چوار ساتەوەخت بە هیوای ئەوەی بتوانێت لە رۆژی داهاتودا لە کاتی وێنەگرتنی دیمەنەکەیدا پڕ لە لۆژیك و خەیاڵ داهێنانەکەی بونیاد بنێت.

نەبوونی زنجیرەی یەك لە دوای یەکی دیمەنەکان لە کاتی وێنەگرتندا قورسترین ئەرکە لە سینەمادا لە کاتی نواندندا، ئامادەکردنی شوێنی وێنەگرتن بۆ دیمەنێکی دڵداری جاری

وا هەیە ئامادەکردنی (لۆکەیشن) شوێنی وێنەگرتنی دیمەنێکی دڵداری لە یەکەمین رۆژی وێنەگرتندا کچە ئەکتەرەکە تا ئەو ساتە کورە ئەکتەرەکەی نەبینیبێت دواتر لە یەکەمین بەیەکگەیشتن هەردوو دڵدارەکە وێنە ئەگیرێت (ئەمەش ماوەیەکە ئەشێ لەو ماوەیەدا لەگەڵ یەکدا ناکۆك بوبن) لێرەدا پێویستە ئەکتەر تەرکیزێکی بەهێزی هەبێت ئەبێ توانایەکی خێرای هەبێت لە کاتی پرۆسەی نواندندا، پێویستە لەسەر هەموو ئەکتەرێك خۆی چارەسەری کێشەکە بدۆزێتەوە، ئەکتەری کەم وێنەی وەك (بول ماریونی) لەو بارەیەوە ئەڵێ: ئەکتەر پێویستی بە کۆششێکی زۆرتر هەیە زەینی بخاتە کار بە شێوەیەك بگونجێ لەگەڵ دیالۆگەکەی بەرانبەر کامێرا، پێویستە لەسەری خۆی بگونجێنێ لە حاڵەتی دیمەنی پێشوتری و کاریگەری هەبێ بەسەر دروستی سۆز دەربڕیندا، بەئاگابوون لە کاریگەرێتی دیمەنی پێشوتر بە تەنها ئەرکێکی زهنی نییە، بەڵکو ئەرکێکی جەستەیی و سۆز ئامێزیشە، بە تەنها گەیشتن بەوپەڕی سۆز گرنگ نییە، گرنگ جەستەیە، ئەبێ جەستەش لەو ئاستەدا بێت لە کاتی چونە ناوەوەی کارەکتەرەکەدا لە کاتی نواندندا، ئەمەش کارێکی قورسە بەتایبەت ئەگەر کارەکتەرەکە لە شوێنی وێنەگرتنی ناوەوە بۆ شوێنی وێنەگرتنی دەرەوە. بجوڵێ، دیمەنەکانی ناوەوە لە کاتێکی دیاریکراودا وێنەگیراون، بەڵام وێنەگرتنی دیمەنەکانی دەرەوە لە کاتێکی دیدایە، لەوانەیە چەند هەفتەیەك لە نێوان وێنەگرتنی چونە دەرەوەی کەسێك لە خانویەکەوە لە دیدی کەسێکی دی ناو خانۆکەوە هەبێت بەمەش ئەبێ بونیادنانی سۆز لەو کاتەوە دەست پێ بکات کە کەسایەتییەکە لەناو خانۆکەدایە تا دوا سات کە لێوەی دەرئەچێتە دەرێ بۆ سەر شەقامەکە، ئەبێ ئەکتەر درك بەو جۆرە گرفتانەی نواندن بکات، لە سینەمادا هەندێ لە ئەکتەرەکان بە هێمنی دائەنیشن و هەوڵئەدەن توانای جەستەیان بخەنە کار، هەندێکی تریان بەدەم دیالۆگ لەبەرکردنەوە دێن و دەچن و خۆیان رائەهێنن لەسەر دیمەنەکە، ئەوانی تر یان یاری ووشە یەکتربڕەکان ئەکەن، یا یاری کاخەزێن ئەکەن، یان ئەخوێننەوە، ئەوەیشی کە بەرپرسی لایەنی تەکنیکی بەردەوام بونی دیمەنەکانە سەبارەت بە وەستانی ئەکتەر و، جل و بەرگەکەی و، ئێکسسواراتەکەی بەرپرسە لەوەی هەموو ئەمانە بگونجێنێ لەگەڵ دیمەنی پێشووتر، بەلاّم ئەو پردە نەپچڕاوەی بەدەنگەوە هاتنی سۆزداری ئەمێنێتەوە سەر کۆشش و، جەستەی ئەکتەر خۆی، کە ئەبێ بەردەوام ئامادە باش بێت بۆ هێنانەوەی بارودۆخەکەی پێشتر، زۆر جار کە فیلمێك ئەبینن هەست ئەکەین لە نێوان ساتەوەختێك و ئەوی دیدا گۆڕانێك هەیە، رەنگە ئەمەش لەوەوە هاتبێت کە نەگونجانێك هەبێ لە ئاستی بایەخدانی زهنی و، گەرمی سۆز، وەك ئەوەی رەنگە هەندێ جار لە داهێنانی قژ یا ماکیاژدا جۆرە جیاوازییەك هەبێت، ئەم نەگونجانەش ئەمانشەڵەژێنێ بۆیە هەست بە ناتەواوی وێنەکە ئەکەین، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە کاری ئەکتەر لەسەر هاوتەریبی ئاستی بایەخدان و گەرمی سۆز لە گرتەیەکەوە بۆ گرتەیەکی دی کارێکی قورسە، تێپەراندنی پرۆسەی وێنەگرتنی دیمەنێك بۆ یەکێکی دی پێویستی بە هێنانەوەی تەوژمە سروشتییەکەی روداوەکانە، کە بە هۆیەوە ئەکتەر ئەتوانێت

لایەکی جڵەوەکە بگرێ و، هەر لەوێشەوە هەنگاو بنێت.

دەرهێنەری روسی "بۆدەفکین" پێشنیازی ئەوە ئەکات کە پێویستە سیناریۆی وێنەگرتن دووبارە رێك بخرێتەوە بە مەبەستی راهێنان (بۆ ئەوەی ئەکتەر درك بە زنجیرە یەك لە دوای یەکەکانی گرتەکانی رۆڵەکەی بکات و، مەنەلۆگی دوور و درێژی پێ بسپێردرێ) لەوانەیشە ئەم دەقی راهێنانە گۆڕانکاریەك بێت بۆ کرداری تر لە سیناریۆی وێنەگرتندا، هەڵبژاردنی "بەدیلەکانیش" پشت ئەبەستێت بە جۆر و ئاستی ئەو کۆسپانەی کە پێویستە کارەکتەرەکە لە پێناوی بەدیهێنانی مەبەستەکان زاڵ بێت بەسەریاندا، بۆ نمونە، بۆدەفکین لە دەقی راهێنانەکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەو کارەکتەرەی پێویستە بەپێی سیناریۆی وێنەگرتن بچێتە ئەودیوی دەرگایەکەوە ئەگۆرێتەوە بە پەڕینەوە لە روبارێك لە سیناریۆ ئەسڵەکەی وێنەگرتندا، چونە ئەودیوی دەرگایەك توانای جەستەیی و سۆزداری ئەکتەر گەرمتر ئەکات بۆئەوەی سەرکەوتوو بێت لە بەدیهێنانی مەبەستەکەیدا، بەلاّم ئەو بەدەنگەوە هاتنە ئەگۆڕێ بە هەڵوێستو، ئامانج لە سیناریۆی وێنەگرتندا، لەم بارودۆخەدا ئەکتەر لە کەسێکی وەرزشکار ئەچێ جەستەی ئامادە بکات بۆ بەدەنگەوە هاتنی هەستان بە کردەی نەرمە غاردان لەو شوێنەدا، کاتی راهێنانە گشتییەکان ئەکتەر وا لێئەکات لە ناوەوە لە نێوان گرتەکاندا بووروژێ، ئەمەش یارمەتیدەرێکی باشە جار لەدوایجارو، لە چاوتروکانێکدا توانای ئەکتەر چالاکتر بکات لە پرۆسەی وێنەگرتنی راستەقینەدا. لە کاتی راهێنانیشدا ئەو (ئیرتیجالەی) کە پشت ئەبەستێت بە هەڵوێست و، زوروفی کارەکتەرەکانەوە لەو کاتانەی کە ئەکەونە نێوان دیمەنە نوسراوەکانەوە یارمەتی ئەکتەر ئەدات پتر ئاگاداری لایەنەکانی کارەکتەرەکە بێت، ئەم شێوە تەکنیکە لە راهێناندا نمونەییە، لە رۆژگاری ئێمەدا ئەم بودجە زۆرەی ئەم چەشنە فیلمە لە کارکردندا بەسەرچووە، بەهەرحاڵ بەکارهێنانی تەکنیکی (ئیرتیجال) لە سینەمادا بە تایبەت لە فیلمی "ناشفیل"ی "رۆبەرت ئاڵتمان" کە لە رێگەی (ئیرتیجال)ەوە گەشەی بە هونەری ئەکتەر داوە، جێی بایەخیش بوو، هەندێ لە دەرهێنەرەکان پەنا ئەبەنە بەر وێنەگرتنی ئەم جۆرە "ئیرتیجالە" بەمەبەستی ئەوەی ئەو بە دەنگەوە هاتنە لە ناکاوانە بە فیڕۆ نەچن، ئەگەر ئەکتەری سینەمایی کاریگەری وێنەگرتنی زنجیرەیەك گرتە، کارەکتەرەکەی پێ ئاشنا ئەکات، ئەوا هەرگیز ناتوانێت لە رۆڵەکەی خۆی بەگشتی و، روون و رەوان ئاشنا بێت.

ئەگەر دیمەنەکە پێویستی بە موزیکێکی کەمانجە ژەنین بوو، کەچی ئەکتەرەکە چەشنی تیپێکی مس پیایدا هەڵشاخا ئەوا هیچ پەیوەستییەکی هارمۆنی لە ساتێکەوە بۆ ساتەوەختێکی دی دروست نابێت، پێویستە ئەکتەر خۆی وەك ئامێرێك میزانسین بکات ئەگەر هاتوو بەرنامەی بەرهەمهێنانەکە مەسەلەکەی بە بایەخەوە وەرگرتبوو، کاتێکی دیاریکراویشی بۆ دانابوو، بە جۆرێك ئەکتەر بۆی هەبێت چ جۆرە یارییەك و، چ شێوە راهێنانێك بکات بە ئامانجی ئەوەی پەیوەستێکی ناوەکی لە نێوان دیمەنە جیاوازەکاندا بخولقێنێ. یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی جیاکردنەوەی نواندنی سینەمایی

لە شانۆ ئەوەیە کە لە سینەمادا کامێرا ئەتوانێت بجولێتەوە، بەڵام لە شانۆدا چەند مەترێك لە ئەکتەرەکە دورین و، کەمجار ئەتوانین گۆڕانەکانی سەر روخساری بەدی بکەین، سەرنجی ئێمە بۆ ئەکتەری شانۆیی زیاتر بەلای ئەو گۆڕانانەدا ئەچێ کە پێکهاتەکانی ناو تابلۆ شانۆییەکەن، کارەکتەرەکانیش لا ئەکەنەوە بۆ ئەوەی گوێیان لە یەکدی بێت لەسەر شانۆ، بینەریش سەرنجی ئەو ئەکتەرە ئەدات، ئێمە بێ ئاگاین لەو گوزارشتانەی سەر روخساری ئەو کارەکتەرانەی کە لا لە یەکدی ئەکەنەوە، جوڵە جەستەییەکانیان پێك هاتووە لەو هێما و ئاماژانەی سەرنجی بینەر بۆ شوێنێکی تر رائەکێشن. لە سینەمادا کامێرا سەرنجی ئێمە بە توندی بۆ خۆی رائەکێشێ، ئێمە ناتوانین سەرنج نەدەین وەك لە شانۆ ئەتوانین – ئەگەر بمانەوێت – ئەتوانین سەرنجی روخسارەکان بدەین لە دیمەنێك لە دیمەنە بە کۆمەڵەکان، یا تەماشای دیکۆرەکە بکەین و، بەڵام گوێمان لە کارەکتەرە سەرەکییەکە بێت، لە سینەمادا بۆی هەیە روخساری ئەکتەر سەراپای شاشەکە بگرێتەوە، ئەمەش کارێکە تەنها بە سینەما ئەکرێت کە لەو نزیکەوە سەرنجی بدەین. لەوانەیە، کامێرا هەموو جوڵەیەك گەورە بکاتەوە، پێویستە ئەکتەری سینەما بە مەبەستەوە ئاماژەو، جوڵەی جەستەی بەکاربهێنێ، ناشبێت هەندێ جوڵەی وا بکات کە هەست بکەیت زۆر لە خۆی ئەکات، ئەکتەری سینەمایی ئەبێ هەلی زۆر برەخسێنێ بۆ ئەوەی کامێرا بتوانێت وردەکارییە بچوکەکانی دەم و چاوی و گوزارشتەکانی روخساری بە وردی وێنە بگرێت، لە سینەماش بە پێچەوانەی شانۆوە ئەکتەرەکان تەنانەت لە دیمەنە بە کۆمەڵەکان ئەتوانن هەل بقۆزنەوە بۆئەوەی جێی سەرنجی بینەر بن، دیارە ئەشتوانین درکی پێ بکەین ئەگەر سەیری گرتە نزیکەکان بکەین، لە شانۆدا کە سەرنجی ئەکتەرە سەرەکییەکەمان دا، ئەوا ئەوانی دی بەر سەرنجمان ناکەون مەگەر وەك پێکهاتەیەکی گشتی. لە شانۆدا پێویستە ئەکتەر دەنگی لەو پانتاییەدا بە زوڵاڵی بگەیەنێ، هەروەها پێویستە ئەکتەر هەوڵبدات چپەکانی بگاتە ئەو حاڵەتەی سۆز بەخش بێت، لە سینەمادا مایکرۆفۆن و سستمەکانی دەنگ تەنها شت نین کۆنترۆڵی دەنگ بکەن، بەڵکو کۆنترۆڵکردنی یان گۆڕینی لە ژووری مۆنتاژ لەلایەن مۆنتێرەوە ئەکرێت، زۆر لە دەرهێنەرەکان هەوڵئەدەن خۆیان رزگار بکەن لەو پڵتە پڵتەی کاتێ دەم و پلی ئەکتەر لە کاتی نارەحەتی دەرونییەوە دروستی ئەکات، لەوانەیشە دەنگی ئەکتەر چەندین دیمەن پڕ بکات لە کەموکوڕی، بۆیە ئەو دیمەنانە بێدەنگ ئەبن، هەروەها بۆی هەیە دەنگی هەندێ ئەکتەر دۆبلاژبکرێت ئەگەر پێویست بکات ئەکتەری شانۆیی لە بەرانبەرماندا لێپرسراوییەکی گەورەی هەیە وەك نواندن، پێویستی بە توانایەکی جەستەیی مەزن هەیە بۆئەوەی بتوانێت ئامادەکی خۆی بپارێزێ لە ماوەی سێ سەعاتدا، هەروەها توانایەکی زۆری جەستەییش لە سینەمادا پێویستە ئەویش بۆ گەڕانەوەی ئەو کردارانەی کە پێویستییەکی جیاوازیان هەیە لە جوڵەی یەك لە دوای یەکی جەستەیی.

بۆی هەیە ئەو کارەکتەرە سینەماییە کە ئەیبینین وەك پراکتیك چەندین ئەکتەر لە خۆبگرێت، ئەو ئەکتەرەی کە رۆڵی دانەرێکی مۆزیکی ئەبینێ لەوانەیە دەنگی دۆبلاژکرابێت

لەلایەن کەسێکی لێهاتووی زمانزانێکی بیانی، لەو دیمانانەش کە "عەزف" ئەکات، پیانۆ ژەنێکی لێهاتوو ئەهێنن و، وێنەی دەستی ئەگرن گوایە هی ئەکتەرەکەیە، هەر هەمان شت دەنگی ئەکتەرێك بە دەنگی گۆرانی بێژێکی لێهاتوو ئەشوبهێنن، کچە ئەکتەرێکی روخسار جوان بەلاّم دوقاچ و رانێکی رێکوپێکی نییە بتوانێ رۆڵی کچە سەماکەرێك ببینێ ئەگەر لە کاتی پێویست دوو قاچ و رانێکی جوانی، سەماکەرێکی لێهاتوو بەکاربهێنرێت، یان ژنێکی روت لەناو بانیۆیەکدا لە گەرماوەکەدا بکوژرێت لە فیلمی "کەسانێکی ئالۆز" ئەوە جەستەی "جانێت لی" نییە، رەنگە کەسێکی وەکو "ماری نیکسون"ی دانسقەش نەبێ کە لەلایەن هاموشۆکەرانی سینەماوە ناسراوە، بەلاّم دەنگ لە فیلمی (خانمە جوانەکەم) کە (ئۆدی هیبورن) رۆڵی (ئەلیزا دۆڵتیل) ئەبینێ دەنگ خوازراوە. دەنگی "سوارە دەماخکراوەکە" کە نوێترین بەرهەمە، هەموو فیلمەکە لەلایەن ئەکتەرێکی ترەوە دۆبلاژکراوە ، هەروەها دەنگی کچە ئەکتەر (مارسیدس ماڵمێرگ" لە هەندێ دیمەندا دەنگی (لێدا بلێر" بوو لە فیلمی "دوای روحەکان کەوتو"، ئەم دەنگ گۆڕینە لە کاری فیلمسازیدا کارێکی ئاساییە، تەنها لە سینەمادا ئەم پیشە دوفاقییە بۆ کارەکتەرەکە قبوڵ ئەکرێ، مادام ئێمە بێ ئاگاین لەم ئاڵوگۆڕانانە، کەواتە بۆی هەیە بەم شێوە تەکنیکییە جوانە جێبەجێ بکرێت، ئەم پیشە دوفاقیە وەزعێکی ئەوتۆ ئەرەخسێنی بۆ ئەکتەر، کە ببێتە هۆکارێك بەدەستی دەرهێنەرەوە زیاتر لە ئەکتەری شانۆیی، چونکە کاتێك ئەکتەرێکی شانۆیی بەسەر تەختەی شانۆکەدا دێت و دەچێت، نواندنەکەی موڵکی خۆیەتی، خۆی سەرپشکە لە هەموو هەڵچوون و داچونێك و جوڵەیەك، بەلاّم ئەکتەری سینەمایی لە هەموو رویەکەوە جوڵەی کامێراکە کە دەرهێنەر بڕیاری لەسەرداوە نواندنەکەی دەستنیشان ئەکات، لەوانەیە ئەکتەر لە سینەمادا بەکارێکی دەگمەن هەڵبسێت لە رووی بەدەنگەوە هاتنی سۆزەکانییەوە، بەلاّم ئەگەر دیمەنەکە لەسەر شانەوە وێنەگیرابوو "ئۆڤەر شۆلدەر" ناتوانین ئەو بەدەنگەوە هاتنە ببینین یان هەستی پێبکەین تەنها لە رێگەی پشتی سەریەوە نەبێت ئەوەی بۆ ئەکتەری سینەمایی دەرئەکەوێت بەتایبەتی ئەو چرکە گوزارشتەیە کە جێی رێزلێنانەو، کلیلیشە بۆ سەرتاپای کارەکتەرەکەی، رەنگە مۆنتێر لێی لابدات، یا دەرهێنەر توڕیدات، کەسیش نازانێ بۆ تەنها ئەم دوو کەسە ئەم کارە ئەنجام ئەدەن. لەوانەیە ئەکتەرێك بگەڕێ بەدوای پێڵاوێکی لەبار بۆ کارەکتەرەکەی بگونجێ، کەچی دواتر بۆی دەرئەکەوێت کە بەپێی بۆچونەکانی دەرهێنەر لە هیچ گرتەیەکدا پێڵاوەکان دەرنەکەوتون، رەنگە پێڵاوەکان بوبنە مایەی ئەوەی کە ئەکتەرەکە هەندێ لایەنی کارەکتەرەکەی دۆزیبێتەوە، بەلاّم بینەر ئەمەی بەلاوە گرنگ نییە، یان رەنگە ئەکتەرێك کار بۆ ئەوە بکات رێکردنێکی شیاو، تایبەت بۆ کارەکتەرەکەی بدۆزێتەوە کە بگونجێ لەگەڵ خەسڵەتەکانی دی بەلاّم مۆنتێر تارادەیەك رتم و خێرایی ئەو رێکردنە ئەگۆڕێ، نیاز و بۆچوونەکانی دەرهێنەر سەبارەت بە کارەکتەرەکە، کە سەنگی مەحەکن و، دواتر لە دوای مۆنتاژی کۆتایی لەسەر شاشە رەنگ ئەداتەوە.

**سەرچاوە:**

کتێبی التمثیل السینمائی

وەرگێرانی بۆ عەرەبی: د. ریاض عصمت

# زاراوە هونەرییەکان

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

**دەرهێنەر** ***Director***

کەسێکی هونەرییەو بەرپرسی یەکەمی فیلمەکەیە، بەرپرسیارەتی هەموو ئەوانەی لە فیلمەکەدا ئیشدەکەن، هەر لە ئەکتەرەکانەوە تاکو ئەوانەی بەکاری هونەری هەڵدەستن، دەکەوێتە ئەستۆی دەرهێنەر.

**بەرهەمهێن** ***Producer***

ئەو کەسەیە کە کۆمەکی فیلمەکە دەکات، دەکرێ تاکە کەسێك بێت یاخو کۆمپانیایەك بێت.

**نوسەر** ***Writer***

ئەو کەسەیە کە چیرۆکی بنەڕەتی فیلمەکە دادەنێ.

**بەڕێوەبەری بەرهەم** ***Director***

ئەو کەسەیە سەرپەرشتی کاروباری دارایی فیلمەکە دەکات، بە هاوکاری دەرهێنەرو شارەزایان بوجەی فیلمەکە دادەنێت.

**ئەندازیاری دیکۆرو دیمەنەکان** ***Art Director***




ئەو کەسەیە کە بەرپرسی وێنەیە، هەروەها بەرپرسی ئامادەکردن و جێبەجێکردنی ئەو دیکۆرو دیمەنانەیە کە لە فیلمەکەدا پێویستن.

**بەڕێوەبەری وێنەگرتن** ***Director of photography***

دەبێ وێنەگرێکی زۆرباش بێت و لەو بوارەدا شارەزاییەکی گەورەی هەبێت، سەرپەرشتیاری ئیشوکاری وێنەگرو یاریدەدەرەکەی دەکات، گۆشەی وێنەگرتنەکان هەڵدەبژێرێ. چۆنیەتی ڕوناکی دادەنێ، دەکرێ وێنەگر لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەری وێنەگرتن بێت.

**نوسەری سیناریۆ یان سیناریست –** ***Script-Writer Scenarist***

ئەو کەسەیە چیرۆکەکە دەگۆڕێ بۆ گرتە (لقطـة) و دیمەن، ژمارە بۆ دانان و بەدوایەکداهاتنی گرتەو دیمەنەکان ڕێکدەخات.

**کامێرەمان *Cameraman***

وێنەگری سینەماییە، ئەرکی بەڕێوەبردنی ئامێری وێنەگرتنەکەی لە ئەستۆیەو دیمەنی فیلمەکان دەگرێ.

**مۆنتێر *Editor***

بەرپرسی کاری مۆنتاژکردنە.

**ماکییر *Maquilleur***

ئەو کەسە پسپۆڕەیە کە هەڵدەستێ بەکاری ماکیاژکردن.

**ڕیجیسیر *Regisseur***

ئەو کەسەیە دوای ئەوەی گرێبەست لەگەڵ چەند ئەکتەرێکی سانەویدا دەبەستێت، دەیانخاتە بەردەست دەرهێنەری فیلمەکە، پاشان لەڕێگەی ڕێنماییەکانی دەرهێنەرەوە ئەکتەرە پێویستەکان هەڵدەبژێرێت و جۆری ئەو ڕۆڵەیان بۆ دەستنیشان دەکات کە دەبێ لە فیلمەکەدا پێیهەستن.

**گرتەی سەرەکی *Mastar shot***

گرتەی سەرەکی ئەو گرتە فراوانەیە کە ئەکتەرێك یاخود زیاد لە ئەکتەرێك لەخۆدەگرێ، تێیدا ئامێری وێنەگرتنەکە لە دیمەنەکەدا دەکەوێتە شوێن جووڵەی ئەکتەرەکان.

**گرتەیەکی دووانەیی *Two- shot***

گرتەی دوانەیی بریتییە لەو گرتەیەی هەردوو کەسەکە لەخۆدەگرێ کە لە گرتەکەدا دەردەکەون.

**لەسەر شان *Ovar- the- shoulder***

بریتییە لەو گرتەیەی کە کامێراکە لەپشتی ئەکتەرێکەوە، وێنەی دەموچاوی یەکێك لە ئەکتەرەکان دەگرێ.

**گرتەی نزیك *Close- up***

ئەو گرتەیەیە کە تەنها دەموچاوی تێدا دەردەکەوێ، یاخود دەموچاوو مل دەردەکەوێ، یان دەموچاوو مل‌و هەردوو شانی یەك ئەکتەر دەردەکەوێ.

**گرتەی سینگ *Bust shot***

گرتەیەکە بۆ تەنها یەك ئەکتەر ئەنجامدەدرێ و تێیدا سنگی ئەکتەرەکە دەردەکەوێ.

**گرتەی ناوەڕاست *Waist shot***

گرتەیەکە ئاستی خوارەوەی دەگاتە ناوقەدی ئەکتەرەکە.

**گرتەیەکی هێجگار گەورە *Big close up***

گرتەیەکە زۆر لە نزیکەوە وێنەی ئەو شوێنە دەگیرێ کە مەبەستیانە وێنەی بگرن، گەر مەبەست گرتنی لاشەی ئەکتەرەکەبوو، ئەوا تەنها بەشێك لە دەموچاو یاخود دەست...هتد دەگرێتەوە.





**گرتەیەکی گەورەی مامناوەندی یان دیمەنێکی گەورەی مامناوەندی *Medium Clos- shot***

گرتەیەکە لەنێوان دیمەنێکی گەورەو دیمەنێکی مامناوەندی، گەر مەبەست گرتنی لاشەی ئەکتەرەکە بێت، ئەوا لەسەری ئەکتەرەکەوە تاکو ئەژنۆی دەکەوێتە ناو گرتەکەوە.

**دیمەنێکی مامناوەندی یان گرتەیەکی مامناوەندی *Medium shot***

گرتەیەکە لە نزیکەوە وێنەی بابەتەکە دەگیرێ، لەم گرتەیەدا شتەکان بەڕوون و

ئاشـكرایی دەردەكـەون، گـەر مەبەسـت گـرتنی لاشەی ئەكتەرەكە بێت، ئەوا لـە ناوقەدییـەوە بۆ سەرەوە دەردەكەوێ.

**دیمەنێكی گـشتی مامناوەنـدی یـان گرتەیـەكی گشتی مامناوەندی *Medium Long shot***

دیمەنێكــە دەكەوێتـــە نێــوان دیمـــەنێكی مامناوەندیو دیمەنێكی گشتییەوە.

**دیمەنێكی گشتی یاخود گرتەیەكی گشتی *Long shot***

گرتەیەكـــــە لـــــە شـــوێنێكی زۆر دوورەوە وێنەی ئەو بابەتـە دەگرن كـە دەیانــەوێت وێنـــەی بگـرن، بـەجۆرێك هەنـدێ وردەكــاری دەردەكــەوێ، گــەر مەبەســت لاشـــەی ئەكتەرەكــە بــوو، ئــەوا بەتـەواوی وێنـەی لاشـەی ئەكتەرەكــە دەگیرێــتو تــــەواوی جەســــتەی دەردەكەوێ.

**دیمــەنێكی تــەواو یــان گرتەیەكی تەواو *Full shot***

گرتەیەكـە تێـدا ئـەو كەسـە یـاخود ئـەو شـتەی وێنــەی دەگـیرێ، بەتــەواوی درێژییەكەیــەوە لــەنێو چوارچــێوەی وێنە گیراوەكەدا دەردەكەوێ، یاخود بریتییە لە گرتنی دیمەنی تەواوی ژورێك.

**پان *Pan***

بریتییــە لــە جوڵــەی كـامێرا بەشـێوەیەكی ئاسۆیی لەكاتی گرتنی دیمەنێكدا

**دیمەنێك بە گۆشەیەكی بەرز *High Angle shot***

بریتییە لە وێنەگرتنی دیمەنێك لە شوێنێكی بەرزەوە، شوێنێك بەرزتر لە ئاستی ئەو بابەتـەی وێنەكەی دەگیرێت.

**دیمەنێك بە گۆشەیەكی تیژ *Low Angle shot***

بریتییە لە وێنەگرتنی دیمەنێك لە شوێنێكی نزمـەوە، شـوێنێك نـزمتر لـە ئاسـتی ئـەو بابەتـەی وێنەكەی دەگیرێت.

**دیمەنێكی نامۆ یان گرتەیەكی نامۆ *Insert***

دیمــەنێك یــان گرتەیەكـە تێیـدا بـۆ نمونـە ناونیـشانی ڕۆژنامەیـەك یـاخود هەنـدێ دێـڕی كتێبێــك یـــان ڕۆژمێرێــك یـاخود هێمـای شـەقامێك دەردەكەوێ.



**گرتــەی بــەرگر *Cut-away& Cut- in***

ئەو گرتەیەیـە یـان ئـەو ڕســـتە فیلمەیـــە كـــە ســەرنجی بینــەر لەســەر ڕوداوە ســــــەرەكییەكە لادەبـاتو دەیباتـە سـەر خـــۆی، بـــۆ نمونـــە پیشاندانی پەرچەكرداری منـــداڵێك لـــە ژورەكـــەی خۆیـدا لەسـەر ئـەو شـەڕو دەمەقاڵێیـــەی لـــەنێوان دایـكو باوكیـدا ڕودەدات، ئـەم گرتەیـە لـەنێوان گرتـەكانی دیمـەنی دەمـەقاڵێی بـاوكو دایكەكـە دادەنرێت.

**گرتەیەكی بزواو *Dolly shot***

بەو گرتەیـە دەوترێت كە لەسەر گالیسكەی تایبـەت جێبـەجێ دەكرێـت، ئـەو گالیـسكەیە ســەكۆی تایبــەت بــە كــامێراو كامێرەمـــان (وێنــەگر)ی لەســەرەو لــەكاتی جێبــەجێكردنی گرتەكەدا دەبزوێنرێت.

**گرتەی بەدواداچوون و بەردەوامی (شاریۆ)**
***Tracking shot***

لەم حاڵەتەدا کامێرا لەسەر سەکۆی تایبەت دادەنرێت، ئەم سەکۆیەش لەسەر سکەیەکی تایبەتی ئاسنین دەجولێت، ئەم جۆرە گرتەیە بەرەو ڕێچکەیەکی دیاریکراو دەجوڵێ، بەهاوشانی ئەو ئەکتەرەی کە پێویستە وێنەی دیمەنەکەی بگیرێت و کامێراکە شان بەشان لەگەڵیدا ڕێدەکات. ئەم گرتەیە لەکاتێکدا بەکاردەهێنرێت کە خێرایی ئەکتەرو ئەو ماوەیەی دەیبڕێت، گەورەتربێت لە توانای جوڵەی ئاسۆیی کامێرا، وێنەگر لەم جۆرە گرتەیەدا دەتوانێ کۆمەڵێ وردەکاری تایبەت وێنەبگرێت.

**گرتەی تێڵت *Tilt***

جووڵاندنی کامێرا بەشێوەیەکی ستونی لەکاتی وێنەگرتندا. کامێراکە لەسەر سێپایەکی تایبەت جێگیرکراوە.

**گرتەی تێڵت بۆ سەرەوە *Tilt Up***

زۆربەی جار ئەم جۆرە گرتەیە لەسەر سێپای کامێراکە جێبەجێدەکرێت، جووڵەی کامێرا لەسەر یەک هێڵ لەخوارەوە بۆ سەرەوە دەجولێت، بۆ نمونە لەکاتی وێنەگرتنی ئاپارتمانێکی بەرزدا، چاوی کامێراکە لە نهۆمەکانی خوارەوە بۆ نهۆمەکانی سەرەوە بە ئاپارتمانەکەدا هەڵدەگەڕێت.

**گرتەی تێڵت بۆ خوارەوە**
***Tilt Down& Pan Up***

پێچەوانەی گرتەی تێڵت بۆ سەرەوەیە، چاوی کامێرا لەسەرەوە بۆ خوارەوە دادەبەزێت. واتە جووڵەی کامێرا لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە.

**جووڵەی خێرا *Accelerated Motion***

گرتەیەکە تێیدا خێرایی پیشاندانی دیمەنەکە لە خێرایی ڕاستەقینەی خۆی زیاترە، بۆیە جووڵەی کەسێتیەکان بەشێوەیەکی پێکەنین ئامێز دەردەکەون.

**جووڵەی خاو *Slow Motion***

گرتەیەکە تێیدا خێرایی پیشاندانی دیمەنەکە لە خێرایی ڕاستەقینەی خۆی کەمترە، بۆیە جووڵەی کەسێتییەکان خاو و لەسەرخۆیە و وەك ئەوەی لە هەوادا بڕۆن.




**گونجاندنی گرتەکان**
***Matching***

ئەو ڕێگایەی لە وێنەگرتنی دیمەنێك پەیڕەودەکرێ بەم شێوەیەیە، هەمو دیمەنێك لە کۆمەڵێ بەش پێکهاتووە، سەرەتا وێنەی گرتە سەرەکییەکە دەگیرێ کە تێیدا ناوەرۆکی دیمەنەکە لە گرتەیەکی فراواندا دەردەکەوێ، پاشان کۆمەڵێ گرتەی دیکە لە نزیکەوە و لەسەر شان دەگیرێ، دواتر ئەم بەشە جۆرا و جۆرانە کۆدەکرێنەوە و بە جوانی ڕێکدەخرێن، تاکو لەسەر شاشەکە وەك جووڵەیەکی بەردەوام و گونجا و مەنتقی دەرکەوێت.

**ئەکشن *Action***

ئەو وشەیەیە کە دەرهێنەر بە ئەکتەرەکانی دەڵێ تاکو دەست بە نواندنی دیمەنەکە بکەن.

**بیبرە *Cut***

ئەو وشەیەیە کە دەرهێنەر بۆ وەستاندنی کاری وێنەگرتنی دیمەنەکە دەیڵێ.

**چوارچێوە *Frame***

تەنها وێنەیەکە لەکۆی ئەو زنجیرە وێنە چاپکراوەی لەسەر فیلمەکە.

**دەرکەوتنی پلەپلە *Fade- in***

دیمەنەکە تەواو تاریکە، پاشان وردە وردە ڕوناك دەکرێتەوە تاکو لە دواجاردا بە تەواوی دەردەکەوێ، گەر دیمەنەکە پەیوەست بوو بە دەنگەوە، ئەوە مانای ئەوەیە دەنگەکە لە دەنگێکی کزی نەبیستراوەوە وردە وردە بەرزدەبێتەوە بۆ دەنگێکی بەرزی بیستراو.

**دیارنەمانی پلەپلە *Fade- Out***

تەواو پێچەوانەی دەرکەوتنی پلەپلەیە

**تێکەڵبوون *Dissolv***

دیارنەمانی وردە وردەی دیمەنێك، لە هەمان کاتدا دەرکەوتنی وردە وردەی دیمەنێکی دیکە.

**سڕینەوە *Wipe***

گواستنەوە لە دیمەنێکەوە بۆ دیمەنێکی دیکە، ئەم کارە بەهۆی هێڵێکەوە ئەنجامدەدرێ کە بەناو شاشەکەدا تێدەپەڕێت و دیمەنی یەکەم دەسڕێتەوە و دیمەنی دووەم شوێنەکەی دەگرێتەوە.

**چاپکردنی دوو گرتە لەسەر یەك *Sperimposr***

بریتییە لە چاپکردنی گرتەیەك لەسەر گرتەیەکی دیکە، بەجۆرێك لەکاتی نمایشکردنی فیلمەکەدا هەردوو گرتەکە ببینرێ.

**کامێرا *Camera***

ئامێری وێنەگرتنەکەیە، فیلمەکەی لەناودا دادەنرێ تاکو وێنەی دیمەنەکان بگیرێت.

**قۆڵی کرێن *Capman crane***

ئامێرێکی گەورەی تایبەتە بە وێنەگرتنی سینەمایی، ئەم ئامێرە گەورەیە لەسەر گالیسکەیەکی بەهێزو تایبەت جێگیردەکرێت، بەمەرجێ بتوانرێ بە ئاسانی بجوڵێت و کامێرای وێنەگرتنەکەی لەسەر چەسپکراوە، لە کۆتاییەکەیدا باڵێکی گەورە و درێژ هەیە کە بەهۆی چەند قورساییەکەوە هاوسەنگییەکەی ڕاگیراوە. لەسەر ئەم باڵە و لە تەنیشت ئامێری وێنەگرتنەکەدا جێگایەك هەیە بۆ دانیشتنی وێنەگرو دەرهێنەرو ئەو کەسەی تایبەتمەندە لە ڕێکخستن و دەستنیشانکردنی پنت و خاڵەکانی بینین. ئەم باڵە بەهۆی دەسکێکەوە و لەلایەن کەسێکی تایبەتمەندەوە بەرزو نزم دەکرێتەوە و بۆ هەر لایەك بیەوێ دەتوانێ بیجوڵێنێ.

**دەسکی میکرۆفۆن *Boom***

دەسکێکی درێژە بەستراوە بە میکرۆفۆنەکەوە.

**دۆللی *Dolly***

گالیسکەیەکە کامێراکەو وێنەگرەکە هەڵدەگرێت و دەیانجوڵێنێت، بەڵام جووڵەکە بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە نییە.

**مۆڤیولا *Moviola***

ئامێرێکە ئەو کەسە بەکاریدەهێنێت کە بەرپرسی مۆنتاژی فیلمەکەیە، یاخود مۆنیتێرەکە بەکاریدەهێنێت تاکو کاری مۆنتاژکردنەکە جێبەجێ بکات.

**کلاکێت *Clapper***

بریتییە لە دوو پارچە تەختەی بەیەکەوە بەستراو، بەشی سەرەوەی پارچە تەختەیەکی باریك و بچوکە و جووڵەی لە جووڵەی دەمی مقەست دەچێ، ئەم دوو تەختەیە لەسەرێکەوە

بــەهۆی بزۆکێکەکــەوە بەیەکــەوە بەســـتراون. کلاکێـت لـە بـەردەمی کـامێراداو لـە سـەرەتای وێنەگرتنی هەر دیمەنێکدا بەشی سەرەوەی بەر بەشی خوارەوەی دەکەوێ‌و تەقەیەکی تایبەتی لێـوە دەردەچـێت. کلاکێتەکـە لـەکاتی دانـانی لەبـەردەم چـاوی کامێراکــەدا نـاوی فیلمەکـەو دیمەنەکـــەو گرتەکـــەو دووبـــارە بوونـــەوەی گرتەکەی لەسەر دەنوسرێت، ڕۆڵی گرنگی ئەم ئامێرە لـەژوری مۆنتـاژدا دەردەکـەوێت، ئەمـەش بۆ دەستنیشانکردن‌و هەڵبژاردنی دیمەنە باش‌و چـــاکەکانی فیلمەکـــەو ڕێکخـــستنی دەنـــگ‌و وێنەکان لەکاتی مۆنتاژدا.

**سیناریۆ *Script***

بریتییــە لــە نوســینەوەی فیلمەکــە لەســەر کاغــەز، تێــدا گفتوگــۆی کەســێتییەکانی نــاو فیلمەکــە دەنوســرێ، هــەروەها تێیــدا بــاس لــە دیمەن‌و گرتەکانیش دەکرێت.

**مۆنتاژ *Montage- Editing***

پرۆسەی هەڵبژاردن‌و ڕێکخستنی گرتەکانەو گەیانــدنی هـــەر گرتەیەکـــە بـــە گرتـــەی دوای خۆیـــەوە بەشـــێوەی تێکـــەڵاوکردن یـــاخود سڕینەوە، یاخود چاپکردنی دیمەنەکان لەسەر یــەکتر. هــەروەها دانــانی دەنگــی حیوارەکــان‌و مۆسیقاو کاریگەرییەکانی دیکە، تاکو فیلمەکە دەگاتە شێوەی کۆتایی.

**دیکۆر یان دیمەن *Décor set***

ئامادەکردنی کۆمەڵێ دیکۆر، تاکو دیمـەنێك یان چەند دیمەنێکی فیلمەکەی تێدا بگیرێت.

**پلاتۆ (ستۆدیۆ) *Plateau***

ئـەو شـوێنەیە کـە لـەناو سـتۆدیۆدا کـاری وێنەگرتنی تێدا ئەنجامدەدرێ.

**لۆکەیشن *Location***

شـــوێنێکە دەکەوێتـــە دەرەوەی ســـتۆدیۆ، دەرهێنەر ئەو شوێنە دەستنیشان دەکات، تاکو دیمــەنێك یـاخود چـەند دیمـەنێکی فیلمەکـەی وێنەبگرێت.

**پێشەکی فیلم *Trailer***

بریتییــە لــە کۆمــەڵێ بەشــی فیلمەکــە، لــە ســـــینەما یـــــاخود لـــــە تەلـــــەفزیۆن وەك پڕوپاگەندەیەك بۆ فیلمەکە پیشاندەدرێ

**نوسخەی ئەسڵی *Standard***

زاراوەیەکــە بــە نوســخەی کۆتــایی فیلمەکــە دەوترێ. واتە دوای شۆردنەوەی هەردوو فیلمی دەنگ‌و وێنە پێکەوە.

**گێڕانەوە *Narration***

ئەمــە بــە زۆری لــە فیلمــی ڕۆمانئــامێزدا بەکاردێت، یەکێك لە کەسێتییەکان هەڵدەستێ بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە.

**کاریگەرییە تایبەتییەکان *Special Effect***

بریتییــە لــە هــەر کاریگەرییــەکی دەرەکــی کــە دەخرێتــە ســەر فیلمەکــە، ئەمــەش دوای ئــەوەی ئـەو کاریگەریانـە لەبەشـێکی تایبـەتی وێنـەیان دەگیرێ.

**تێبینی:**

زۆر سوپاسی سینەماکار"طاهر عبدالواحد" دەکەین کـە لـە وەرگێڕانـی هەنـدێ زاراوەدا یارمەتییـەکی زۆری داین.

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕی الفن السابع

# رەوتی مێژوویی موزیكی فیلم

رەفیق فواد یارئەحمەدی

موزیك هەر لە یەكەم ساتەكانی سەرهەڵدانی سینەماوە هاوكات لەگەڵ نمایش كردنی فیلمەكاندا كەڵكی لێوەرگیراوە(لوئی لومی یەر) لەیەكەم نمایشی فیلم لە ساڵی 1895 دا داوای لە كەمانچە ژەنێك كرد كە هاوكات لەگەڵ نمایشی فیلمەكەدا كەمانچە بژەنێت تاكوو هەم دەنگی ئامێری نمایش كردنەكە بەرگوێ نەكەوێت و هەم كەشێكی مۆسیقاییش بخوڵقێنێت.

ئێستاكەش یادەوەری ئێمە لە فیلمە بێ دەنگەكان تەنیا دەنگی ژەنینی پیانۆیەكە كە لەگەڵ فیلمەكەدا دەمانبیست.



یەكێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەكانی فیلمی بەناوبانگی لەدایك بوونی نەتەوەیەك بەرهەمی گریفیس موزیكی ئەو فیلمە بوو كەدەرهێنەر بەهاوكاری ئاواز دانەر جی.سی.بریل بەكەڵك وەرگرتن لە موزیكی نەریتی ئامریكاو چەند تەمێكی موسیقایی رەسەن بۆ ئەو فیلمەیان دانابوو. لە ئاواز دانەرە بەرچاوەكانی دەیەی 20دەتوانین ئاماژە بكەین بە ئێدمۆندمی سل كە موزیكی بۆ فیلمی (بێرلین سەمفۆنیای شارێكی گەورە) دانابوو و موزیكی ئەم فیلمە یەكێك بوو لە بەرچاوترین توخمەكانی پێكهێنانی ئەم فیلمە. دواتر هەر ئەم ئاواز دانەرە ئاوازی بۆ نوسخەیەك لە فیلمی (پاپۆڕی جەنگی پۆتمكین)ی ئایزنشتاین دانا كەلە ئاڵمانیا بڵاودەبووەوە. لەسەردەمی سینەمای بێدەنگدا چەند جارێك هەوڵیان دا كە لەكاتی نمایشی فیلمەكەدا موزیكی تۆماركراو لەسەر قەوانی گرامافۆن بكەنە جێگری ئۆركێسترا و ژەنیارەكان، بۆ وێنە لە ساڵی 1926دا ستۆدیۆی برایانی وارنێر فیلمی (دۆن ژوان) یان لەگەڵ موزیك و دەنگی فیلمەكە تۆمار كردو لەكاتی نمایشی كردنی فیلمەكەدا لەگەڵ گرتەكاندا رێكیان خست. (بەم سیستەمەیان دەگوت: ویتافۆن) لە دوای جێگیربونی دەنگ لە

سینەمادا، ستۆدیۆکانی فیلمی هالیوود بەشی بەرهەمهێنانی موزیکیان بەرێکخراوەکەیان زیاد کرد، لەم بەشەدا کەسێك بەرپرسی ئامادەکردنو دانانی موزیك لەسەر فیلمەکان بوو و دەبوایە هاوسەنگی موزیك و گرتەکانی رابگرتایە. لەم سەردەمەدا ناوی ئاوازدانەریان لە فیلمەکاندا نەدەهێنا و موزیك هەر لە درێژەی سەردەمی فیلمی بێ دەنگدا کەڵکی لێوەردەگیرا وەك تەواوکەرێك بۆ خوڵقاندنی فەزایەکی لەبارتر بۆ نمایشی فیلمەکە. لە دەیەی 30دا ئاوازدانەرانی بەرەچەڵەك ئەوروپی کە بۆ ستۆدیۆکانی فیلمسازی کاریان دەکرد توانیان بەبەرهەمی موسیقایی جیاواز هونەری موزیکی فیلم گەشە پێبدەن و بیکەنە خاوەن پێگەو بایەخێکی تایبەت و لەوە بە دوا ناوی ئاواز دانەر لەسەر فیلمەکاندا دەنوسراو بەچاوی ڕێزەوە سەیری دەکرا.

دەتوانین وەك یەکێك لەبەرچاوترین ئاواز دانەرانی ئەو سەردەمە باس لە ماکس ستاینەر بکەین کەبەدانانی موزیکی فیلمی کینگ کۆنگ 1933و سیخوڕ 1935 توانی بۆچوونێکی نوێو بوێرانە لە بەرهەمهێنانی موزیکی فیلمدا بێنێتە ئاراوە و یەکەم خەڵاتی ئۆسکاری تایبەت بە موزیکی فیلم لە مێژووی سینەمادا بۆ خۆی دەستەبەر بکات. بێجگە لە هالیوود ئاوازدانەرانێکی دیکەش هەبوون کە خەریکی




لێکۆڵینەوەو کارکردن بوون لە بواری موزیکی فیلمدا. موریس ژوبێر ئاوازی بۆ چەندین فیلمی وەك (چواردەی ژوئی) بەرهەمی رێنەکلێر و پاپۆڕی ئاتلانت بەرهەمی ژان ویگۆ داناوە.

لە ئاوازدانەرە بەرچاوەکانی ئەو سەردەمەی بەریتانیا دەتوانین ئاماژە بکەین بەموزیکی فیلمی شتەکانی داهاتوو لەلایەن ئارتۆر بلیس 1936 و موزیکی وون ویلیامز بۆ فیلمی 94 پلە و ....

هاوکاری پرۆکوفی یەف لەگەڵ ئایزنشتاین دا بۆ فیلمی ئالکساندر نۆڤسکی هەوڵێکی بەرچاو بوو بۆ هاوسەنگ کردنی گرتەکان لەگەڵ دەنگدا.

لە دەیەی 50دا ڕۆڵی موزیکی فیلم بایەخی زیاتری پەیدا کردو ناوی ئاواز دانەرەکان گرینگی پێ دەدرا و موزیکی فیلمەکان بەشێوەی جیاو لەسەر قەوانی گرامافۆن تۆمار دەکرا و ڕێژەیەکی زۆری لێدەفرۆشرا. لە فیلمی روداوی نیوەڕۆ 1953 و گۆرانییە بەناوبانگەکەی کە بەدرێژایی فیلمەکە لێدەدرا، وفرۆشی لەرادەبەدەری ئەم گۆرانییە، دانانی گۆرانی لە فیلمەکاندا وەك شتێکی پێویستی لێهات. هەر لە دەیەی 50دا موزیکی جاز وەك موزیکی فیلم هاتە نێو فیلمەکانەوە بۆ وێنە لە فیلمی شیکردنەوەی تاوانێك 1959کە موزیکی ئەم فیلمە لەلایەن (دۆك ئێلینگتۆن) ەوە ئامادەکراوە و فیلمی دارستانی تەختەڕەش

1955کە بۆ موزیکی ئەم فیلمە کەڵکیان لە موزیکی (راك)ی بیل هیلی وەردەگرت. لە کۆتایی دەیەی 60و بەنمایشی فیلم گەلێك وەك گراجۆئت1967 ئیزی رایدەر1969 و کاوبۆی نیوەشەو 1970 موزیکی پۆپ لەو فیلمانەدا کە چیرۆکێکی مودێرن و تایبەت بە کۆمەڵگای هەبوو هاتە ئاراوەو بووە باو.

هەندێك لە فیلمسازەکان زانیاری تایبەتیان هەیە لەسەر هەبوونی موزیك لە فیلمەکانیاندا، وەکو ئالن رێنە کە موزیکی فیلم بەر لە وێنەگرتنیش لە وێناکردنی دیمەنەکان دا بەشداردەکات و کەڵکی لێوەردەگرێت.

دەیەی 70لەسینەمادا دەسپێکی سەردەمێکی نوێ و گواستنەوەیەك بوو لە سەردەمی هونەری (پۆپ)ەوە بۆ سەردەمێکی تر. لەم ساڵانەدا موزیکی ئەلکترۆنیك کە کاریگەرییەکی نوێی پەیدا کردبوو توانی بێتە پانتای سینەماوە و بەکەڵك وەرگرتن لە نوێگەرییە تەکنۆلۆژیاییەکان، هۆڵەکانی نمایش بوونە خاوەنی دەنگی ستریۆ و بەم پێیە موزیك توانی گەشەیەکی نوێ بەدەست بهێنێت، و ئەوەندە چووە پێش کە توانی لە پەراوێزی فیلمەکانەوە خۆی بگوازێتەوە بۆ سەرقەوان و کاسێت و فرۆشێکی بەرچاوی بەدەست هێناو بووە هۆی بەناوبانگ بوون و زیاتر سەربەخۆبوونی ئاوازدانەرانی فیلم.

دەیەی 80و سەرەتای دەیەی 90بە خێرایی تەکنۆلۆژیا لە بوارە کۆمەڵایەتیەکاندا سینەماشی تووشی ئاڵ و گۆڕی خێرا کرد. فیلمەکان گەشەیان سەند و پەردە گەورەکانیان پڕ کردەوە. ئەفسانە زانستی و خەیاڵ ئامێزەکان هاتنە پانتای سینەماوە. ئاوازدانەرانی سینەماش توانیان بەکەڵك وەرگرتن لە تەکنۆلۆژیای نوێ ئەزموونی جۆراوجۆریان هەبێت. ئێستاکە لە سەرەتای هەزارەی سێهەمدا موزیك لەبارەی جۆری فیلمەکانەوە گرنگیەکی نوێی پەیدا کردووەو لە ناخی موزیکی کلاسیك، ئەلکترۆنیك و کۆمپیوتەرییەوە موزیکێکی بێ وێنە لەسینەمادا سەری هەڵداوە کە هەندێ جار جیاکردنەوەی لەگەڵ دەنگی فیلمەکەدا دژوارە، موزیکی فیلم توانیویەتی ئەوەندە گەشەبکات کە خۆی وەك لقێکی سەربەخۆ لە هونەری موزیکدا چاوی لێدەکرێت. فرۆشی لەرادەبەدەری فیلم لەسەر دیسکێتە نوێیەکان لە پانتایی جیهاندا، مژدەی ئەوەمان پێ دەدات کە ئەم هونەرە توانیویەتی بەشێوەیەکی جوان و سەربەخۆ خۆی پێناسە بکات. ئەمرۆکەو لە سەرەتای هەزارەی سێهەمدا ئەگەر بمانەوێت ئاماژە بە ئاوەزدانەرە ناودارەکانی مێژووی مۆسیقا بکەین، ئاوازدانەرانی سینەما توانیویانە خاوەن باکگراوەندێکی بەپیت و بەپێزبن لەم مەیدانەدا و ناویان بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە.


**سەرچاوەکان:**

1.اهنگسازان فیلم/سعید کاشفی

2.موسیقی فیلم/شاهرخ خواجە نوری.محمد حسین تجیدی

3.مفاهیم کلیدی در مطالعات سینمایی /سوزان هیوارد

4.شناخت سینما/لوییس جانتی

5.فرهنگ واژەهای سینمایی/پرویز دوایی

6.راهنمای فیلم(جلد اول، دوم و سوم) بهزاد رحیمیان

# یەڵماز گوینای

# دیدارێك لە زیندان

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ساڵی 1987 لەلایەن خانەی زانست (ناوکا) لە مۆسکۆ، کتێبێك بەناوی "یەڵماز گوینای"یەوە بڵاو کرایەوە. ئەم کتێبە رۆژنامەنوس و سیناریستی سینەمایی ئازەربایجانی "حەسینۆڤ" نوسیویەتی. کتێبەکە بە گشتی دیدارێکی دوور و درێژە کە بە چەند دانیشتنێك لەگەڵ سینەماکاری کۆچکردوی کوردی "یەڵمازگوینای"دا کراوە، کاتێك کە لە زینداندا بووە. ئەمەی لێرەشدا دەیخوێنیتەوە بەشێکە لە گفتوگۆکانی ناو ئەو کتێبە.

**-ناوی تەواوەتیت چییە؟**

+یەڵماز حەمید و دایکیشم ناوی ئەگلۆبیتۆنە.



**-کەیی و لە کوێ لەدایك بویت؟**

+لە یەکی نیسانی ساڵی 1937 لە گوندی ئینجە لە دایك بووم. ئەم گوندە 27 کیلۆ مەتر لە شاری ئەزنەوە دوورە.

**-ئەی بۆچی هەندێك مێژوی لە دایك بونت بە ساڵی 1931 دەنوسن؟**

+ئەوانەی وا دەنوسن بە هەڵەدا چوون.

**-تکایە بە وردی باسی منداڵی و داهێنانەکانی خۆتمان بۆ بکە؟**

+دایك و بابم کوردن. دایکم لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندە، بەڵام دوای لەشکرکێشی سوپای قەیسەر لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بنەماڵەکەیان هەڵهاتوون. باوکم بە پێچەوانەوە،

سەر بە خێزانێکی زۆر دەست کورت و هەژارە. سەرەڕای ئەوەش لە تەمەنی لاوێتیدا ناچار بووە کەس و کاری جێبهێڵێت، لە ترسی تۆڵە کردنەوەی خێڵایەتی. بە ڕێکەوت دایك و بابم لە ئەزنە چاویان بەیەك دەکەوێت و خێزان دروست دەکەن. لەو کاتەدا هەردووکیان بێ ماڵ و پارە بوون، بۆیە تاماوەیەك بە کولەمەرگی ژیاون، بەڵام دواتر بەخت یاوەری باوکم دەبێت و وەك وردبینێك لە کۆمپانیا یەکدا کارێکی دەست دەکەوێت، ئەم کۆمپانیایەش خاوەنەکەی دەرەبەگێکی گەورە دەبێت. کارکردنی لەو شوێنەدا گوزەرانی مادیان دەگۆڕێت. تا تەمەنی حەوت ساڵی منداڵیەکی خۆشم هەبوو، تا ئەو کاتەی باوکم ژنی دووەمی هێنا. لەو ڕۆژە بەدواوە ژیانی خێزانی ئێمە شێواو بگرە بۆ بوو بە دۆزەخ. باوکم بەردەوام لە دایکمی دەدا و هەندێ جاریش لە ماڵ دەری دەکردین. ئەو کات خوشکێکم هەبوو ناوی لەیلا بوو، دوو ساڵ لە خۆم منداڵتر بوو. بەردەرگای ماڵەکەمان درەختێکی توو و دوو دار هەنجیری تێدا بوو. ئەو کاتانەی باوکم دەری دەکردین، لە ژێر سێبەری ئەو دارانەدا پەنامان دەگرت. جارێکیان هەرسێکمان بەرەو شاری ئەزنە ڕۆیشتین، چونکە ئامۆزایەکی دایکم لەوێ بوو، بە درێژایی ڕێگاکە دایکم دەگریا و بە گۆرانی کوردی ئەیلاواندەوە. ئەگەرچی من و خوشکەکەم زۆر بە باشی کوردیمان نەدەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەو لاواندنەوانەدا، سەیری دایکمان دەکرد و دەگریاین. لەو کاتەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە نەهامەتی و قوڕ بەسەریمان دوایی نایەت. خۆزگەم دەخواست بمردمایە، نەك ئاوا دایکم بە مەحزونی ببینم. پاشان کارکردن دەستی پێکرد. هەر لە منداڵیەوە و لە وەرزی میوەو لۆکە کردندا لە باخ و کێڵگەکاندا کەوتمە کارکردن (دواتر یەڵماز چەند فیلمێك لەمەڕ تۆڵەی خێڵایەتی و کرێکارانی لۆکەچنین، دەردەهێنێت)، هەروەها وەك کۆڵبەریش کارم کردووە.

تا لە گوندەکەی خۆمان بووم، سێی سەرەتایم خوێندبوو، بەڵام سەروەختێك گەیشتینە ئەزنە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیم تەواو کرد. لەو کاتەدا دەمخوێند و ئیشیشم دەکرد. سەرەتا چەرەسات لەسەر شەقامەکان دەفرۆشت، پاشان ڕۆژنامە فرۆشی و بەقاڵیم کرد. هەروەها لە کۆمپانیاکاندا وەك میکانیکیەکی ئامێرەکانی کارپێکردنی سینەما، کارمکردووە. یەکەمجار ئەم ئیشەم لە کۆمپانیای (ئەندفیلم) دەستپێکرد، ئەمەش بۆ خۆی ستۆدیۆیەکی سینەمایی و هۆڵێکی نمایشکردنی فیلم بوو، دوای ئەوە لە کۆمپانیای (کەمال فیلم) دا کارمکرد. بۆ نمایشکردنی فیلمەکان دێهات و دێهاتم دەکرد و هەندێ جاریش وەکو کۆمبارس نواندنم دەکرد. دەکرێت بڵێم (بە پێکەنینەوە) بەمجۆرە چوومە جیهانی سینەماوە.

**-ئەی دوای ئەوە لە کوێ درێژەت بە خوێندن دا؟**

+ساڵی 1956 چوومە کۆلیژی ماف لە زانکۆی ئەنکەرە، بەڵام تەنها دوو مانگێك بەردەوام بووم. چونکە هیچ کارێکم دەسگیر نەبوو بیکەم. لە کاتێکدا دەبوو خۆم بژیەنم و یارمەتی خانەوادەکەشم بدەم. لەو ساڵانەشدا خێزانەکەمان گەورە بوو بوو، بووبووینە چوار براو دوو خوشك. لەبەرئەوە ناچار بووم بگەڕێمەوە بۆ ئەزنە، لەگەڵ گەڕانەوەشمدا دەست بەجێ لە کۆمپانیایەکی بەکرێدانی فیلمدا دەستم بەکارکردن کرد.

کۆتایی ساڵی 1957 گەیشتمە ئەستەنبول و لەوێ لەسەر کارەکەی خۆم لە ئۆفیسی سەرەکی کۆمپانیای (دار فیلم) بەردەوام بووم. ساڵی 1958 چوومە کولێژی ئابوری لە زانکۆی ئەستەنبول، بەڵام ئەمجارەشیان نەمتوانی خوێندنەکەم تەواو بکەم، چونکە لە ساڵی 1961 گیرام. ئەوەش یەکەمجار بوو بگیرێم. دوای ئەوە خۆبەخۆی خۆم خەریکی خوێندن بووم، زۆرم خوێندەوەو لە زانکۆی ژیاندا خوێندم.

**–چۆن تێکەڵ بە دنیای هونەر بوویت؟**

+بەر لە هەر شتێك، من لە مەیاندا قەرزار باری دایك و باوکم و بە ئاشکرا دەیڵێم. ئەگەر چی باوکم بەردەوام ئەزیەتی دایکمی دەدا، بەڵام منداڵەکانی زۆر خۆش دەویست، بەتایبەت من کە نۆبەرەی بووم. کۆی لەوە نەدەکرد کە دوا فلسی گیرفانی لە پێناو خوێندنی مندا خەرج بکات. دایکم و باوکم، جوانترین و خەمگینترین گۆرانیان بە زمانی کوردی دەچڕی. باوکم سەنتوری ئەژەنی، خەڵکێکی زۆر لە بۆنەکانی جەژن و زەماوەند و لەدایك بونی منداڵەکانیاندا بانگیان دەکرد، بۆ هەموو ئەو شوێنانەش منی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. زۆر چێژم لە مۆسیقا و گۆرانیەکانی دەبینی. هەرچی دایکیشمە ئەوا بە شەوانی درێژی زستاندا، سەربوردە و چیرۆکی لە مێژوی کوردەوە بۆ دەگێڕاینەوە، هەروەها حیکایەت و ئەفسانەی کوردی بۆ باس دەکردین. لە کاتی گێڕانەوەی ئەم شتانەدا ماڵەکەمان پڕ دەبوو لە دراوسێکانمان و ئامادەشبون تا بەیانی گوێ قوڵاغی ئەو شتانەبن. من دەمویست تەواو ئەو چیرۆك و حیکایەتانە بنوسمەوە، بەڵام لەو کاتەدا نوسینەوەیانم بە چاکی نەدەزانی.

لە گوندەکەماندا پیرەمێردێك هەبوو ناوی "یەعقوب" بوو، ئەم پیاوە بە چاکی گۆرانی دەچڕی و سازی دەژەنی و شیعر و گۆرانیشی دەنوسی. من و ئەو بووینە هاوڕێ.. خۆشی دەویستم و هەر ئەویش فێری شیعر دانانی کردم. لە سیانزە ساڵیمدا بۆ یەکەمینجار چوومە سینەما و لە چواردە ساڵیدا وەکی پێشتر بۆم باسکردی، ئامێری پەخشکردنی فیلمم کار پێدەکرد. پاشان وەك کۆمبارسێك دەستم بە نواندن کرد و لێرەشدا ژیانم گۆڕانێکی تێکەوت.




**–کەی و چۆن دەستت بە نوسین کرد؟**

+لە دووەم ساڵی خوێندنی ئامادەییدا، چیرۆکێکم بۆ نەشرەی خوێندنگاکەمان نوسی و چیرۆکەکەش باسی لە جوتیارێکی هەژار دەکرد کە ژنە نەخۆشەکەی دەبات بۆ شار، ئەم جوتیارەش هیچ پارەو پولێکی پێنابێت، لەبەرئەوە کەڵەشێرێك لەگەڵ دەستی خۆیدا دەبات بۆ پزیشکەکە (کە بە نرخترین شتی ئەو بووە)، بەڵام کاتێك پزیشکەکە دەزانێت جوتیارەکە پارەی پێ نییە، هەرسێکیان پێکەوە

دەردەکات، جوتیارەکە و ژنە نەخۆشەکەیی و کەڵەشێرەکەشیان. (دوای چەند ساڵێك یەڵماز گوینای فیلمی مێگەل دەردەهێنێت، دەربارەی جوتیارێك کە ژنە نەخۆشەکەی دێنێت بۆ شار، بەڵام لەگەڵ ڕووداوگەلێکی زۆر تراژیدیانەتردا). ئەم چیرۆکەیان بلاّونەکردەوە، بە بیانووی ئەوەی کە ناوەڕۆکێکی چەپڕەوانەی هەیە. ئەگەرچی من لەو ماوەیەدا نەمدەزانی چەپ و چەپایەتی یانی چی.

لە ساڵانی 1953–1954 دەستم بە نوسینی وتار و کورتە چیرۆك کرد. ئەم شتانەشم دەنارد بۆ گۆڤار و رۆژنامەکان. لە ناوەڕاستی ساڵی 1954، وتار و چیرۆکەکانم لە لاپەڕەی ژمارەی تایبەتی رۆژی یەکشەممانی رۆژنامەکاندا بلاّو دەبووەوە، لە کۆتایی ئەو ساڵەدا بەرهەمەکانم لە گۆڤارەکانیشدا بلاّو دەکرایەوە. گرنگترین چیرۆکم کە لەو ماوەیەدا بلاّو کرابێتەوە، بەناوی (مەرگ بانگم دەکات) بوو. ئەم چیرۆکە باس لە خۆشەویستی تراژیدی دوو جوتیاری هەژار دەکات. کوڕە گەنجەکە کاری دەست ناکەوێت و بەمەش ناتوانێت داهاتووی خێزانەکەی مسۆگەر بکات، لەبەرئەوە خۆشەویستەکەی بەجێدێڵێت. ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی خۆشەویستەکەی خۆی بکوژێت و دوای خۆشی پارچە کاغەزێك جێ دێڵێت کە تیایدا نوسیویەتی (بۆچی کوشتمت، لە کاتێکدا من دەمویست بژیم تا تۆم خۆش بوێت). هەروەها چیرۆکی (سوکایەتی پێکردن کۆتایی بۆ نییە)، چیرۆکێکی گرنگی ئەو قۆناغەم بوو. چیرۆکەکە باس لە کەسێك دەکات بە دوای کاردا دەگەڕێت، لەم گەڕانەشیدا سوکایەتی پێکردنێکی زۆر قبوڵ دەکات، سەرباری ئەوەش هیچ کارێکی دەسگیر نابێت، هەر بۆیە لە پردێکی بەرزەوە خۆی بەردەداتەوە و خۆی دەدات بەدەم ئاوەوە. ئەم دوو چیرۆکە لە ساڵی 1956 لە گۆڤاری (ئیتی ئۆفۆکلار – ئاسۆی نوێ)دا بلاّو کرانەوە.

بەڵام ئەوەی هەرای زۆری نایەوە چیرۆکی (نهێنی سێ هۆکاری نادادپەروەری کۆمەڵایەتی) بوو، کە لە ژمارە 13 گۆڤاری (ئەنوج – توێژینەوەی هونەری)دا بلاّو بووەوە. ئەم چیرۆکە بووە قۆناغێك لە ژیانی من، چونکە رەنگدانەوەو کاریگەری زۆر بە زەقی بەسەر کاروانی ژیانی داهاتوومەوە دیار بوو. هەر بۆیە کاتێك لە ساڵی 1957 هاتمە ئەستەنبول، زیاتر لە سی وتار و چیرۆکم بلاّو کردبووەوە. ئیتر هاوڕێکانم یەکەمین نازناویان پێبەخشیم (چیرۆك نوس یەڵماز).

**–دەکرێت ئەگەر بە کورتیش بێت، باسێکی ئەم چیرۆکەمان بۆ بکەیت، چونکە من ژمارەی ئەو گۆڤارەم قەت نەدیووە؟**

+هەرگیز ناشیبینیت، لەبەرئەوەی ئەو ژمارەیە رۆشنایی نەبینی و چاپ نەکرا.. سانسۆر ڕێگەی بلاّوکردنەوەی نەدا. بە گشتی چیرۆکەکە باس لە نەبونی دادپەروەری و یەکسانی کۆمەڵایەتی دەکات لە وڵاتدا. یەکێك رەنج دەدات و یەکێکی تر بەری رەنجەکە دەخوات. یەکەمیان لە نەداری و هەژاریەکی زۆردا دەژی وەکو مرۆڤی سەرەتایی، بەڵام دووەمیان بڕوانامەی بەرز بەدەست دێنێت و ژیانی مسۆگەرە لە هەموو ڕویەکەوەو لە هەوڵی ئەوەشدایە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەوی دیدا بسەپێنێت، ئەویش لە ڕێگای سێ شتەوە: (پارەو ئایین و داب و نەریت). ئەڵبەتە ڕوداوەکانی چیرۆکەکە لە واقعی ژیانەوە

هـەڵێنجراوە. لـە پـای نوسـینی ئەمەشـدا، کـاتی خۆی بە کۆمۆنستی تاوانباریان کردم.

**-رۆمانـــەکانت و زۆرێـــك لـــە چـــیرۆکەکانتم خوێندۆتەوەو تەواوی فیلمەکانیشتم بینیووەو زۆر بـە باشیش ئاشنای ئەو زەمینە سیاسیەم کە تۆ کاری لەسەر دەکەیت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێت ئەو شتانەی دیکەش بزانم کە کاریگەرییان لەسەر دروستکردنی هۆشیاری تۆ هەبووە؟**

+ئەو شتانەی تر، ژیـان و ئـەو ژینگەیەیـە کـە تیایـــدا پـــەروەردەبووم و چـــاوم کـــردەوە. لـــە منداڵیمـدا هەسـتم بـە کوردبـونی خـۆم نـەدەکرد، چونکە چوار دەورەکەم بە تورکی قسەیاندەکرد. لێرەدا دووبارە دەیڵێمەوە کە من بە زمـانی دایك کە زمانی کوردیە، خراپ قسەم دەکرد. ئەو کـات دوژمنایـەتی لـە نێـوان خـەڵکی تـورك و کـورددا، یـان بڵـێین سـەیرکردنی کـورد و کەمایەتیـەکانی تر، بە چاوی دوژمنکارانە، بە ئاشکرا دیـار بـوو. ئـەم دۆخـەش وای لێکـردم هاوسـۆز بم لەگـەڵ ئەوانـەی کۆچـپێکرابون و بـە زۆر لەسـەر مـاڵی خۆیان دەرکرابوون.

کـە منـداڵ بـووم و لەگـەڵ منـداڵی خـوا پێداوەکانـدا یـاریم دەکـرد، تێگەیـشتم جیـاوازی چینایەتی یـانی چـی. هاوینـان دایکـم بـۆ درەو لەگـەڵ باوکمـدا کـاری دەکـرد و، زسـتانانیش خزمـەتکاری ماڵـە دەوڵەمەنـدان بـوو. کـە تـەواو دەبـوو پاشمـاوەی خواردنـەکانی ئـەوانی لەگـەڵ خۆیـدا دەهێنایـەوە. ڕۆژ بـە ڕۆژ دەمزانـی ئەمـە دۆخێکـی ڕسـوایی و تاقـەت پڕوکێنـە.. ئـەم هەسـتەش لـە ناخـەوە دەیخـواردم. لـە ڕوکەشـدا پەیوەنـدی نێـوان دەرەبـەگ و جوتیـار لەسـەر بنەمایـەکی دیموکراسـی دامـەزراوە، چـونکە جوتیـار وەکـی ئاغـا قـاوە دەخواتـەوەو لـە ڕووی یاسایشەوە هەردووك وەك یـەکن و تـەواوی مافـە کۆمەڵایەتیـەکانیان هەیـە، بـەڵام چەوسـانەوەو سـتەمکاری ئـەم شـتانە کاریـان لێناکـات و بـەو شـتانە نارەوێنـەوە. بـاوکم بـەردەوام خـەونی بەوەوە دەبینی کـە مـن خوێنـدنم تـەواو بکـەم و پێیـدەوتم: (کـوڕم بـڕۆ بـۆ مەکتـەب و فێـر بـە، تـا وەکو ئێمە نەبیتە کۆیلە)، بەڵام نەیدەزانی رەنگە مـرۆڤ لـە کۆمەڵگـەی بۆرژوازیـدا ببێتـە کۆیلـە، ئەگەرچی خوێندەواریش بێت.

*ئەم گفتوگۆیە "برهان شاوی" لە زمانی ڕوسییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.

**سەرچاوە:**

*www.tirej.net*

# فیلم و فەلسەفە

تۆم کۆنلی*

لەفارسییەوە: محەمەد کەریم

جیل دۆلۆز-*Deleuze* بەچاپکردنی هەردوو کتێبی (وێنەو جووڵە) لەساڵی 1983 داو کتێبی (وێنەو کات) لە ساڵی 1985 دا زۆر لە تیۆرسینانی سینەمای فەرەنسای تووشی سەرسوڕمان کرد. لەو زەمانەدا هەندێ لێکۆڵینەوەی کۆنی تایبەت بە فیلم رەواجێکی بەرچاویان هەبوو. گروپێك لە بیریاران (سیمۆلۆجیستەکان) هەستیان بەوە کرد کە چەند زاراوەیەکی تازە کار لە دنیای سینەما دەکەن. زاراوە تازەکان جێگەی زاراوە نادیارو تەمومژاوییەکانی رێزمانی سەرەتایان گرتەوەو دواجار ئەوە دەرکەوت کە هونەری حەوتەم (سینەما) هێندەی هونەری زمان تۆکمەو بەهێزە. دەروونشیکاران باوەڕیانوایە فیلم کلیلی دەرگا داخراوەکانی نەستەو وەکو راگەیاندنێکی خەیاڵیی (ناواقیعی) نیشانەو شوێنەوارەکانی نەخۆشی دەروونی و دەروونپەرێشانیی بەشێوەی گرنگ و پڕ داهێنان پێناسە دەکات. ئامانج لە شیکردنەوە ئەوەیە کە لەڕێگەی فیلمەوە، ئەو درزانەی لە دیوارەکانی بەرگریی و یادەوەریی شاراوەدا هەن دەتوانرێت بکرێنەوە. سینەما بۆ لایەنگرانی شێواز (ستایل)ی جاك دریدا، راگەیاندنێکە کە تیایدا هەموو باسەکان یان هەندێکیان بەشێوەی بەش، لەتکراون و بەشێوەی پێکەوەلکێنراو دەبینرێت. ئامانجی سەرەکی شیکردنەوەی سینەمایی، بریتییە لە دۆزینەوەی خاڵە پێچەوانەکان یان درزی ناو زاراوەکان و وێنەی دروستکەری سینەما. بەشێك (مەبەست لەبەشێکی تەواو نامۆیە بەزمان) بۆ گۆڕینی نیشانەو ناوەڕۆکی بەشێکی تر بەکاردەهێنرێت.

بەشی وێنە بەر لە زمان دەخرێتەڕوو، بەخستنەسەری دەنگ تەواو دەبێت، بەشێوەیەك کە نیشانەکانی بیستن هەرگیز بەتەواوەتی لەسەر پەردەی سینەما دەرناکەون. دەشێ ئەم دووانە واتە (دەنگ و وێنە) هیچ کاتێ بەیەکدا نەچن. کاتێ باسی جیاوازی و سینەما وەکو

بابـــــــەتێك خرایـــــــەڕوو: مامۆســـــــتا هەڵوەشێنەرەوەکان (تەفکیکییەکان)، هەستیان بەوەکرد کە پێویستیی بۆ داهێنانی ڕێزمانی سینەمایی تەواو، لە حوکمی نێزە هەڵدانی ڕۆشـــبیراندایە بـــۆ ئاشـــی کـــۆنی بـــا. سیمۆلۆجیستەکان باوەڕیان بەوە نییە بۆ وەسفکردن و ڕیزبەندیی شتێك، زمان ئامرازێکی زۆر ئاشکراو قسەکەربێت، لەکاتێکدا کە بە بۆچوونی دەروونشیکاران ناوەڕۆکی فیلمەکە بوار بە سینەما دەدات لە قاڵبێکی زانستیداو بەشێوەیەکی بەسوود ئەمکارە بکات. لەدوای ڕەوتی تیۆری ساڵی 1970، لێکۆڵینەوەی تایبەت بەفیلم بە پێکهێنانی ئەرشیفێك و خستنەگەڕی بەرنامەیەکی کارکردن دەستپێکردو بەئاراستەی دوورکەوتنەوە لە ڕەهەندی ئەبستراکت و بیرکردنەوەی ڕووت پەرەی سەند.

بەرهەمەکانی جیل دۆلۆز بەهۆی پەیوەندی پتەویان لەگەڵ فەلسەفەی خۆرئاواو پەیوەستی چەمکەکانیان بە ڕەگەزو پێکهاتە سینەماییەکانەوە، مایەی سەرسوڕمان بوون و فەرەنسییەکان بەگشتیی بەخوێندنەوەی ئەم بابەتە گێژو سەراسیمە بوون. جیل دۆلۆز لەڕستەی یەکەمی کتێبی (وێنەوکات)دا دەڵێت:




(ئەمە لێکۆڵینەوەی مێژووی سینەما نییە، بەڵکو لێکۆڵینەوەی جۆرێکە لە ڕیزبەندیی واتە ڕیزبەندیی ئاماژە و وێنەکان. ئەم نوسخانە، نوسخەی مێژوویی نین بەڵکو تەنیا لە هەلومەرجێکی زەمانی دوای جەنگی دووەمی جیهاندا ڕێکخراون واتە زەمانێ کە بابەخدان بەبابەتەکانی سەردانێك لە ئۆردوگای نازییەکاندا قابیلی وێناکردن نەبوو. بەئاراستەکردنی ئەو پرسیارەی کە ئایا هەر وەسفێك- لەقاڵبی فیلم، شیعر، نووسراوی مێژوویی و ئامار-دا بۆ ژیان بەکەڵکە؟ لەو ساتەوەختەدا گورزێك لەمێژووی مۆدێرن وەشێنرا. بەچاوخشانێك بەڕەوتی مێژووی سینەمادا، لەلایەکەوە سینەمایەك دەبینین کە جووڵەی لەی وێنە و بە ناونیشانی وێنە دروستکردووەو دەیکات بە شتێکی بە بەرهەم و لەلایەکی ترەوە، سینەمایەکە وێنەی توندوتیژیی و بێرەحمیی دەگرێت ( بەحسابکردن بۆ ئەو خاڵەی کە تۆمارکردنی سیستمی ئاماژە بەشێوەیەکی جێگیر کاری کردە نییە). زەمان واتە دیاردەیەکی یەك لەدوای یەکی خۆبەخۆو بەردەوام- کە پڕە لە حاڵەتی ناوەوەی وێنەکانی کارەساتی کورەکانی سووتاندنی مرۆڤ. سینەمای دوای

سالّی 1945 باس لەوە دەکات کە تۆمارکردنی وێنەی گونجاو لە ماوەیەکی درێژخایەندا کاری کردە نییە.

چۆنیەتی دەنگ و وێنە یان جووڵەی رووت لە فیلمێکدا، کاریگەریی درێژخایەنی نییە. بەمپێیە بینینی بابەتی تەحەمول نەکراو، دەبێتە مایەی ئازارو سەخت دەبێت. لەهەر رووداوێکدا، شتێك لە وێنەدا لە باقی بەشەکانی تر بەهێزترە. هەربۆیە ریزبەندیی لەسەر بنەمای رەوتی مێژوویی ئەنجامدەدرێت. بۆنموونە لە پرۆژەی (مێژووی ئەتنی ***phylogeny***) سینەمای لینینیدا، وێنەکان بەچەند شێوەیەك دەبینرێن. لە بواری جووڵەدا دەتوانریٚ ئاماژە بۆ ئەم بابەتانە بکرێت: دەرککردنی گشتیی وێنە لە (لۆنگ شەت) و رۆڵبینین لە (میدیەم شەت) و کارتێکردنی وێنە لە(کلۆز ئەپ)دا ئەنجامدەدرێت کە گوزارشت لەوە دەکات رادەی پەیوەندی بابەتەکان لەگەڵ یەکتریدا تاچەندە. بەمپێیە وا دێتەبەرچاو لەگەڵ درێژەدان بە وێنەی هەژێنەردا، هەستی توندوتیژو ئەنگێزە (پاڵنەر) سەرەتاییەکانی دەرهێنەر شایانی لێتێگەیشتنە. وەکو ئیشەکانی بۆنۆیل. بەڵام ئەم بابەتە، زۆرجار لەگەڵ ئەو وێنە زەینیانەشدا پەیوەندی دروستدەکات کە لە رەهەندی دەروونی هیچکۆکدایە. جۆراوجۆریی لە جووڵەی ئەو وێنانەدا کە لەسەر بنەمای ریزبەندیی کاتێکی دیاریکراو، دادەرێژێن، بینەر بەرەولایەك رێنمایی دەکات کە دەرککردنی وێنەکان بەلایەوە قورس بێت کاتی واقیعی و گرنگ لە قاڵبی مۆسیقاو هێزی بینیندا بەرجەستە دەبێت. (فلاش باك)ەکان (گەڕانەوە بۆ رابردوو) و یادەوەریی کارەساتباری رابردوو، دووبارە دەناسرێنەوەو ئەم مەسەلەیە دەربڕی ئەو خاڵەیە کە سینەمای مۆدێرن سەرەڕای خەیاڵیبوون و ناواقیعیبوونی هێشتا بەهێزو کارتێکەرە.

بە چاوخشانەوە بە بەرهەمەکانی دۆڵۆزدا دەتوانرێت بوترێت کاتی سینەما، کاتی رەنگدانەوەیە هەم لە خودی راگەیاندن و هەم لەسەر بینەرانیشی. کاتی سینەمایی، گەلێ پرسیاری پەیوەست بە رەوتی فیکری و شێوەی دەستنیشانکردن ئاراستە دەکات کە دۆڵۆز ئەو پرسیارانە لەکاتی دەرکەوتنی ئەم راگەیاندنەوە تائێستا وەکو بەشەکانی وێنەیەك ئاراستە دەکات. بەشەکانی وێنە سینەماییەکان پێکهاتەی ئەوانەی دەخوێنرێنەوەو ئەوانەی دەبینرێن لەخۆ دەگرێت، دوای بینینی دیالۆگ لە دەنگی فیلمەکەدا، دەنگی سەر فیلمەکە وەکو دەنگێکی زیادە یان رەنگدانەوەی لێدانی پلاکێك و دانانی وێنەکان بەشێوەیەك کە رەهەندە ئەندازەییەکانی دیمەنێك تاماوەیەکی زۆر دەبینرێت بەجۆرێ کە توێژی خاك و درزو گردو دۆڵەکان ئاماژە بۆ ریتمی نائۆرگانیکی خوڵقاندنی بەرهەمەکە دەکەن. هەروەها لەتەنیشت یەکەوە دانانی پارچەکانی دەنگ و وێنە لە فیلمەکەدا ناهاوئاهەنگی دروستدەکات کە لەزۆر حاڵەتدا دەبێتە هۆی مامەڵەکردنی هەڵە. دواجار، دۆڵۆز بەجوانترین شێوە، دوودڵییەکانی ئێمە دەربارەی خاڵە تاریك و نادیارەکانی ریزبەندیی ناهێڵێت. بەجۆرێك کە ئەم بابەتە دەبێتە زەمینەیەك بۆ خستنەڕووی تیۆرێك:

بەپێی ئەم تیۆرە، بزواندنی سینەما (دروستکردنی فیلمێك) لە ئامانجەکەی کەمتر نییە، بەڕای زۆر لە فەیلەسوفەکان، ئەمە بزواندن نییە، بەڵکو پێشزەمینەیەکە

(باکگراوندێکە)و دەبێت بۆ دەستپێکردنی ئەو ئامادەکارییە ئەنجامبدرێت. بەڵام تیۆرێکی فەلسەفی خۆ بزوێنە (ئۆتۆماتیکە) کە بەقەد ئامانجەکەی واتە (خولْقاندنی بەرهەمەکە) بایەخی هەیە. ئەم بزواندنە، راهێنانی چەمکەکانەو دەبێت لەگەڵ باقی راهێنانەکانی ناویدا هەڵبسەنگێنرێت. لەو تیۆرانەدا کە پەیوەندیان بە سینەماوە هەیە، چەمکی سینەما بەتەنیا تەئکیدی لێناکرێتەوە بەڵکو زیاتر تەئکید لەو چەمکانە دەکرێتەوە کە سینەما لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت و پەیوەندی لەگەڵ باقی ئەو چەمکانەدا هەیە کە پەیوەستن بەڕاهێنانەوە. بەشێوەیەکی گشتیی، راهێنانی چەمکەکان لەپێش باقی بابەتەکانی ترەوەیە. ئەم بابەتە لەسەر ئاستی بەیەکداچوونی زۆر لەراهێنانەکان قسەوباسی لەسەر دەکرێت وەکو بوون (وجود)، وێنەکان و چەمك و هەموو جۆرە رووداوەکان. ئەو تیۆرانەی پەیوەستن بە فیلمەوە پەیوەست نین بە سینەماوە، بەڵکو پەیوەستن بە چەمکەکانی سینەماوە. سینەما بۆخۆی جێبەجێکردنێکە لە وێنەو ئاماژە کە فەلسەفەکەی دەبێت تیۆر بۆ راهێنانی چەمکەکان بگەڕێنێتەوە. لایەنی تەکنیکی و کاریگەریی (دەروونشیکاریی، زمان) و رەنگدانەوەیەك بۆ فۆرمەڵەکردنی چەمکە سینەماییەکان بەتەنیا بەس نین. بەکورتی دۆلۆز، پێماندەڵێت: لێکۆڵینەوەی سینەما، رەنگدانەوەیەکی کاریگەرە سەبارەت بە پەیوەندی وێنە لەگەڵ چەمکەکانداو چەمکەکان بە بزواندنی وێنەکان بەشێوەی چەند بابەتێك دەکەونە بەردەستی هەموان، دۆلۆز ئیدیعای ئەوە دەکات کە هیچ راگەیاندنێك بەقەد سینەما خاوەنی ئەو تایبەتمەندییە نییە.

جێگەی داخە کە زۆربەی نووسەرەکانی دوای دۆلۆز: فەیلەسوف و جوانناسانی سینەما، لە هەموو لایەنەکانی بەرهەمەکانی دۆلۆز و ئاوێتەبوونی فەلسەفەو سینەما لە بەرهەمەکانیدا قووڵ نەبوونەتەوە یان تەنانەت هیچیشیان لێنەخوێندۆنەتەوە. تەنانەت لەمەش خراپتر، لەباشترین بەشی ئەم کتێبەدا(مەبەست لەو کتێبەیە کە ساڵی 1996 چاپکراوە)، بابەتێك ئاشکرادەبێت کە لەسەروو ناکۆکی نێوان بەرنامەو وێناکردنەکانەوەیە.



چوارچێوەی شێوە چوارگۆشەیی لاپەڕەو ریزبەندی لاپەڕەکان و فەزای بەتاڵی تەنیشتی لاپەڕەکان و هێشتنەوەی بۆشایی لە نێوان ناونیشان و وتارەکاندا، هەموویان حسابیان بۆ کراوەو لەبەرچاو گیراون. وەکو کتێبە هونەرییەکان دیزاین کراوە کە وێنە چاپکراوەکانیان لەسەر جامخانەی دوکانی کتێب فرۆشییەکان، دەخەنەڕوو: فەهرەستی چەند بابەتێکی کورت لە دەستپێکی هەر لاپەڕەیەکدا هەیە، (لاپەڕە 6) ئەوشوێنەیە کەناوی نووسەرەکان دەهێنرێت بۆ ناونیشانەکانی هەر بەشێك. هەرجۆرە هاوکاری یان بەشدارییەك بەوێنەی (دیزالۆ)، بەدەنگێکی نادیارو هێواش بەبێ ناوی نووسەرەکە دەخرێتەڕوو. زمانی هەر وتارێك یەك شێوازو

یەك حاڵەتی وەك یەكی خوڵقاندنی هەیە بەجۆرێك كە هەموو قسەكان تەئیدی بابەتێكی دیاریكراو دەكەن. هەروەكو لە ناونیشانی كتێبەكەدا هاتووە، هەموویان شیكەرەوەی فیلمن كە حەزدەكەن لەدوای دۆڵۆز فەیلەسوف بن. ئەمانە نووسینەكانیان لە ساڵی 1996 دا واتە ساڵێك دوای مردنی دۆڵۆز (تشرینی دووەمی 1995) چاپكرد. ئەگەر ئەمانە لە كاتێكی بەرەو دوادا، بەشێوەی سێبەر بەسێبەر بەدوای دۆڵۆزدا بچن (بەرهەمەكانی پێش دۆڵۆزو دوای ئەو) لە بەدواداچوونی دیالۆگ و قسەو باسێكدا بۆ هەمیشە ئەمانە لەم باسە دووربخاتەوە، كاتێك دروستدەبێت كە لەگەڵ كات و ئەندێشەی كەسی بیركەرەوەدا هاوڕێك دەبێت و هەرگیز ئەو سنوورە نابەزێنێت.

لەبەر شێوەی پیتچنینی نووسینەكان، پێویستە تایبەتمەندیی جێگری چەمكەكانی هەر وتارێك لێی بكۆڵرێتەوە. نووسەرانی پێشەكی (دۆمینیك شاتو- *Dominique chateau* و ژاكینۆ لاژیرا-*Jacinto lageira*) باوەڕیان وایە كە ئامانجیان بریتییە لە دەستنیشانكردنی هەنگاوە سەرەتاییەكان بەرەو (هەڵسەنگاندنی شێوە جیاوازە فیكرییەكان و خستنەڕووی پێشنیازی پەیوەستیی سینەما لەگەڵ فەلسەفە یان لەگەڵ جوانناسیدا)، ئەنجامدانی ئەم كارە لە رێگەی یەكێتییەوە وەكو (رەنگدانەوەیەكی تیۆری یان مێژوویی) و فەراهەمكردنی ئاراستەیەك یان بابەتێك كە بۆ دیدگا فەلسەفییەكان یان ئیستاتیكییەكان بەهادارە (هەربۆیە ژاكینۆ لاژیرا بەم پرسیارە باسەكەی دەستپێدەكات: ئایا لە دوای تیۆرەكانی فیلم ژیان بوونی هەیە؟) نووسەرەكان هەستدەكەن یەكەمین (گۆڕانی زمان) لە رێڕەوی جوانناسیدا پڕ بایەخە، حوكمی دانانی بەهای زۆر بۆ فیلم، فیلم وەكو هونەرێك دەخاتەڕوو. لاژیرا بە دانانی ئەم باسە لەبەردەم (گۆڕانی جوانناسی)دا كۆتایی پێدەهێنێت.

بابەتی دوای ئەوەی نووسینی ڤێرونیكا كامپن-ە كە وەڵامێك ناخاتەڕوو، كامپن دەنووسێت: بیری دۆڵۆز لە بەیەك گەیشتنی سیستمە جیاوازە فكرییەكانەوە خرابووەڕوو و لە ئاراستەی فینۆمینۆلۆجیاوە گەشەی كردبوو، ئەگەر ئێمە باوەڕ بە گوتەكانی دۆڵۆز بكەین، مەبەست لە گوتە فەلسەفییەكانێتی نەك نووسینی كتێبە سینەماییەكانی "بە هاوكاری فیكلس گاتاری، چاپی یەكەم، 1991 " كەواتە زانستی دیاردەكان "فینۆمینۆلۆجیا" دەبێت تاڕادەیەك پەیوەستبێ بە هونەرەوە. دۆڵۆز دەنگ و شێوەی "بیستن"ی فیلم، لەلایەن بینەرەوە لە بازنەی دەرككردنێكی دەوڵەمەندا دەستنیشان دەكات. دەنگ رەگەزێكی جووڵەییەو ئێجگار ئاڵۆزە بازنەی بینین لێڵ دەكات كە: رەگەزێكی ئارام و بێدەنگەو زۆر رێكخەرە لەگەڵ ئەو رەنگدانەوە هەمەجۆرەدا كە پەیوەندی بە خەون و بەڵگەی رۆژانەو ئارەزووەكانی بینینەوە هەیە. پرۆژەكەی كامپن تاڕادەیەكی زۆر بەرهەمی نووسەرانی پێشخۆی وەكو ریك ئاڵتمان-*Rich Altman*، میشیل شیۆن-*Michel chion*، كلودیا گۆربمان- *Gorbman Claudia*، میشیل ماری- *Michd marie*، دەوڵەمەند دەكات بەڵام بەگشتی بەبەراورد لەگەڵ بەرهەمەكانی میرلو پۆنتی- *Merleau ponty* و دۆڵۆزدا بەتازەو بنیاتنەر دەیانهێڵێتەوە.

فەلسەفەی دیردینی -*Derridean* و لێکۆڵینەوەی پەیوەست بە شیکردنەوەی ناوەڕۆکی زیاتر لە بەرهەمەکانی کلۆر رووپێرز لە کتێبی (دابەشکردنی ناوەڕۆك) 1981 ، کتێبی (ئۆکرانیك) 1990 و گەلێ وتارو بەڵگەی پەیوەست بە (*Hors carde* 1983-1993)ی تێدا هێنراوەتەوە. بە سەرنجێکی خێراو ورد لە کتێبی (مێژووی سینەما)ی گدار، دەبینین کە ژان لۆك گدار هەستی بە پەیوەندی نزیکی نووسینەکانی دریدا کردووە لەگەڵ دنیای سینەمادا. بە بوونی چەندین بەش و نمایشی (ڕووناکییە عەکسکراوەکان) ئەم بابەتە ئاشکرا دەبێت. مەسخی کەسێتی لە دیالۆگی ئەکتەردا، لە نووسینی فیلمەکە جیا نییە، بەمپێیە لە مانای (خۆنمایشیدا) ئەم یەکپارچەییە بوونی نابێت لەکاتێکدا لە باسی کاریگەرییە تایبەتییەکاندا، بەدڵنیاییەوە چەند مامەڵەیەکی نەگونجاو هەن کە دەشێت لە شێوەی بیرکردنەوەو ئامانج و دەوڵەمەندیی باسێکدا کە سەبارەت بە هاوئاهەنگی لەنێوان ئەو نیەتەی هەمانەو دەربڕینیدا دەیخوێنینەوە، جیاواز بێت. گدار بە تێگەیشتن لەو جیاوازیانەی لەنێوان دەنگ و وێنەو چالاکی دیدار یان نووسیندا بوونی هەیە، بەو ئەنجامە دەگات کە دەتوانرێت لە ئەنجامگیریی و کورتەی وتارەکانەوە پرسیار ئاراستەبکرێت. ئیشەکەی گدار پێشەکییەکی باشە لەسەر بەشداریکردنی دومینیك شاتو. (پرۆژەی فەلسەفەی سینەما وەکو هونەر: هونەرو راگەیاندن و فینۆمینۆلۆجیا- لاپەڕە 56-84-)، واتە ئەو وتارەی کە لە پێشەکییەکەیدا، بیروبۆچوونەکانی بازن-*Bazin* سەبارەت بەفیلم بەناونیشانی (واقیعی رووت) و چەمکی (بوون)ی دۆڵۆز پێکەوە دەبەستێتەوە. نووسەر سوودی لە لێکۆڵینەوە دیارەکەی ئالان بادیۆ- *Badiou* وەرنەگرتووە- دۆڵۆز لە کتێبی (ئارامیی بوون) دا (کە بەم دواییە لە زانکۆی مینە سوتا تەرجومەکراوە بۆ ئینگلیزی) باسی بوونناسی دەکات، واتە دەربارەی بابەتێك کە لە ستایلی فەلسەفەی ئەوروپاییەوە دۆڵۆز بەرەو مارسیل پروست و بەتایبەتی بەرەو فیلم بەکێش دەکات. باسەکەی بادیۆ، دەربارەی جوانناسی، پڕە لەو پرسیارانەی پەیوەندیان بە (بوون)ەوە هەیە. شاتوش لە لێکۆڵینەوەکانی بادیۆوە ئەنجامێکی لەو شێوەیەی بەدەستهێنا. کاتێ سارتەرو بازن (واقیعی) سینەما وەکو (بوون)ی سینەما پێناسە دەکەن، دەڵێن ئەو واقیعەی کە پەیوەندی لە پەرتکردن نەهاتووی فیلم لەگەڵ بابەتی فیلمەکەدا ئاشکرادەکات، واتە پەیوەندی لەگەڵ بابەتەکەو هەلومەرجی دروستکردنیدا. شاتو بەتایبەتی باسی ڕەهەندەکانی تیۆری بازن دەکات، بەڕای ئەو ڕەهەندی هەڵگیراوی تیۆرەکەی بازن کۆنەپەرستانەیەو ڕەهەندی نەناسراوی تیۆری لەوچەشنە، ئایدیۆلۆجییە. بەتایبەتی بەپێی پێناسەی پەیوەندی وێنەسازیی لەگەڵ نموونە ڕاستەقینەکانی بەرهەمهێنانی کە لای بینەر دەپارێزرێت. شاتۆ زۆر باش وریای ئەو خاڵانەیە کە پەیوەندیان بە لۆکەیشن (شوێنی بابەتەکەوە) هەیە (وەکو لاپەڕەی یەکەمی کتێبی وێنەو کات) لەو کتێبەی دۆڵۆزدا نووسینەکانی بازن بەکاردەهێنێت و دووبارە دەیاننووسێتەوە، بەڵام شاتو بەنیسبەت نووسینەکانی بازن و دۆڵۆزەوە (نووسەری کتێبی وێنەو جووڵە، وێنەوکات) قۆناغێك لەپێشترە.

وتاره پڕ بەهاو فەلسەفییەکانی پاش دۆلۆز زیاتر پەیوەندیان بە ڕەگەزی واقیع بینانەو سیمۆلۆجیای ژان پیەر ئیسکونزی-*Esquenazi*ەوە هەیە: (هەر ڕووداوێك مانایەکی تایبەتی هەیە)- لاپەڕە 58-114. ئیسکونزی باسی ئەوە دەکات کە دۆلۆز وەکو نووسینەکانی سەرەتای نیشانەکان بۆ بەرهەمهێنان ڕاو دەکات. ئیسکونزی بەسوود وەرگرتن لە پروست و نیشانەکان *Les signs* دەڵێت هێزی فیکری نیشانە چییە؟ لەم ڕووەوە، دۆلۆز سەرەتا لە پرۆژەیەکی نیشانەناسی (سیمۆلۆجیا)دا بەجێگیری دەمێنێتەوە. لە شێوەی دەربڕین و فەزای کتێبەکانی پیرس و برگسون-ەوە تا مامەڵەکردن لەگەڵ ئەلفرێد نۆرس وایت هێد-*White head*، واتە ئەو فەیلەسوفەی کە باوەڕی وایە، تێگەیشتن لە نیشانەیەك بەرامبەر بە (ڕووداوێکە). تێگەیشتنی ئەو شتەیە کە واقیع دەهێنێتە ئاراوە: لە فەزایەکی بایۆلۆجی و فینۆمینۆلۆجیادا قابیلی دەرککردنەو ئاراستەکەی یەکێکە لەو بابەتانەی پەیوەندیان بەدەرککردنی فەزاوە هەیە. (ڕووداوێك یەعنی مانا بەخشین و وەك پێویستیش بەمانای دروستبوونی جووڵەی واقیعە).

ئیسکونزی بەبێ ئەوەی باسەکەی پشتیوانیی هەبێت بە ناونیشانی (ڕووداو چییە؟) سەبارەت بە نووسینە کورت و دیارەکانی دۆلۆز قسەدەکات (کە تیایدا وایت هێد سیستمی کراوەی بەرهەمهێنان لەگەڵ سیستمی داخراوی لایبنیتس-*Leibniz* دا بەراورد دەکات) ئیسکونزی بەتایبەتی لەبەشی چوارەمی کتێبەکەی دۆلۆزدا وەکو باری جووڵەو کات باسی ڕووداو دەکات و زەمینە لایەنی گرنگ لەدەست دەدات. هەر بۆیە ئەو خوێنەرەی کە لە کارەکەیدا سینەمای (فرانسوا جۆست-*Francois Jost*) بەکار دەهێنێت. دوای لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی ئیسکونزی هەستدەکات کە قۆناغێك لەدواترە. بە چاوخشانەوەیەکی گشتیی بە باشترین بەرهەمەکانی دۆلۆزدا، جۆست سەبارەت بە بەکارهێنانی پرنسیپەکانی پاوڵ گودمان *Paul Goodman*- و ژیرار ژینێت-*Gerard Genetle* دەربارەی شیکردنەوەی هەندێ فیلم قسە دەکات. جوست بۆ تێگەیشتنی وەرگر لە پێناسەی ڕەگەزی سینەما، لە بەرامبەر دەستنووسەکاندا جیۆلۆجیایەکی تایبەت بەکاردەهێنێت. دۆلۆز لە جووڵەو کات-ەوە دەست بەم چەمکە دەکات. دۆلۆز وەکو ڤاڵتەر بنیامین-*Bensamin Walter*، باوەڕیوایە ئەو فیلمانەی کەلایەنی ئیستاتیکایان بەهێزترە بینەر هێندە حەزیان لێناکات، ئەم بەرهەمانە ئەوەندە ڕوون و ئاشکران کە پێویست ناکات بۆ بینەر ڕاڤەبکرێن و مانایان لێکبدرێتەوە. ژاك گیستێرنکۆم-*Jacques Gersternkom* لەکاری هاوبەشیدا لە فیلمی *Semio- Rhetonic* زەوی هیلکەیی لە فیلمەکەدا (40-131)پلە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە. خوێنەرانی ئیشە سەرەتاییەکانی جوست، لە شیکردنەوەی فیلمدا، وێنەی کلاسیکی و جوان دەهێننەوە یادی خۆیان. جوست لە سینەمادا گەلێ چەمکی بەکارهێنا کە لە ئیشەکانی ژیرار ژینێت وەریگرتبوون. بەمپێیە جیاوازییەکانی جوست لەگەڵ شێوەکانی شیکردنەوەی پراکتیکیدا گرێدەدرێ کە لەگەڵ کارە خواستراوەکانی پەیوەست بە لێکۆڵینەوە باڵاکانی فینۆمینۆلۆجیای فەرەنسا لە ساڵی 1970 دا

ئاوێتە دەبێت. نووسەر بەبێ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ دۆلۆز، (جۆرناسی – *typology*) سڕینەوەی هاوشێوە دەخاتەڕوو، لەکاتێکدا ئەوە دۆلۆزە کە لە ئاماژەکانیدا بۆ پازۆلینی و قسەی ئازادو ناڕاستەوخۆ دەربارەی سینەما، لەسەر ئەم چەمکە ئیشی کردووە.

ژیرارد بلانك–*blanc Gerard le*، پێشنیازی بەدەستهێنانی بینینێکی زیاتر دەربارەی بەرهەمەکانی دۆلۆز ناکات، لە کتێبێکدا بەناونیشانی (چەمکی نیسبی جیهان)، چەند ڕەنگدانەوەیەکی کاریگەریی شیعرو سینەما بەدیدەکرێت. بلانك دەیتوانی بە لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی دۆلۆز، دەستەواژەی (شتەگشتییەکان) و(جیهان) بەکاربهێنێت. لە هەندێ زەمینەی هاوبەشدا، دەگەینە جێگایەك کە دەبینین ئەو ڕەخنانەی کە لە قاڵبی شیعردا دەخرێنەڕوو، زادەی پەسەند نەکردنی جیهانن (بەوشێوەیەی کە هەیە). کە بەمشێوەیە، لەو شوێنەدا کە سینەما بەنمایشی وێنەکان، سەرلەنوێ دنیای ئازاد لەبەرامبەر دنیای فەرزکراودا دەخاتە بەرچاو. دەرك بەوە دەکەی کە دۆلۆز هەندێ نووسەر ئاگادار دەکاتەوە کە بایەخ بە ئامادەگی سینەما بدەن لە ئەزموونی تاکە کەسیکدا کە دیار نییەو ڕەنگە وەرگرێکی نەبێت.

لە سەرەتای ئەم وتارەدا، ئەوە بەیاد هێنرایەوە کە لەدوو ڕەهەندی ڕیزبەندی و مێژووییەوە لە کارکردنی دۆلۆز لەسەر فیلم دەکۆڵرێتەوە. (هەروەها لەپاش دۆلۆز) بەرهەمەکانی لە ڕەهەندی ڕیزبەندییەوە لەئارادایە چونکە زۆربەی نووسەران تاڕادەیەکی زۆر حەز بەوە دەکەن بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی فیلمێك کە لەدنیای سیمۆلۆجیادا بەکارهاتووە، بشارنەوە. لەلایەکی ترەوە، ئیشەکەی دۆلۆز لەلایەنی مێژووییەوە شایانی لێکۆڵینەوەیە چونکە ئامانجی ئەو و ڕەنگدانەوەی بەرهەمەکانی لە هەلومەرجێکی زەمانی تایبەتدا بووە کە پەیوەندی بە سەردەمەکانی رابردووەوە هەیە. لە ساڵی 1996 دا کتێبێك چاپ بوو بەناونیشانی – یەکەمین هەوڵی گونجاو بۆ ناساندنی بەرهەمە فەلسەفیەکانی دۆلۆز لەدنیای سینەمای فەرەنسەدا دەمێنێتەوە، لەساڵی 1996 ەوە، زۆر کتێب بەزمانی فەرەنسی، ئینگلیزی، ئەڵمانی دەربارەی فیلم نووسران و بەهۆی هەلومەرجی کاتی چاپکردنیانەوە، زۆر نەفرۆشران. بابەتی بەربەرکانێ و سەرنجڕاکێشیی لە پرۆژەی وێنەو جووڵەو وێنەو کات لەناو سیمۆلۆجیستەکاندا ناوەڕاستی 1990 ، ئاشکرابوو. بەڵگەیەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە کە جەخت لەوە بکاتەوە لە ئیشە سەرەتاییەکانی دۆلۆزدا، داهێنانی نیشانەکان، ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر فەلسەفەو ڕاگەیاندن. بەدڵنیاییەوە بەهای ئەم نوسخە چاپکراوە وەك بەڵگەیەکی جەختکردنەوەیە (شوێن) یان (ڕووداو) لە سینەماو فەلسەفەدا خەریکە لە بوونناسی و جیاوازی لە سینەمادا ڕەنگدەداتەوە. ئەم نوسخەیە وەکو خاڵێکی وەرچەرخانی مێژوویی لە فەرەنسا دەمێنێتەوە، ئەو شوێنەی تیایدا ڕەتکردنەوەو قبوڵکردنی کارەکانی دۆلۆز لە سینەماو فەلسەفەدا پێویستی بە لێکۆڵینەوەی چڕوپڕی زیاترە.

*زانکۆی هارڤارد کیمبریج– ماساچوست، ئەمریکا.

**سەرچاوە:**

سایتی سورە مهر *IRICAP. Com*

# ئێمەی ترساو لە هەموو شت

سلاڤی ژیژەك

لە فارسییەوە: پەری کەریمی نیا

لە فیلمێکی هۆلیودا باکگراوندی مێژووی فیلمەکە لە راستیدا رۆڵی بەڵگەیەکی ساختە و یا هەڵبەستراو یا دیکۆر دەگێڕێت و خزمەت بە راست بەخشینی چیرۆکەکە دەکات کە فیلمەکە دەیگێڕێتەوە: چیرۆکی سەفەری بینینی پاڵەوانی فیلمەکە یا جووتی پاڵەوانی فیلمەکە. لە فیلمی رێدێسدا شۆڕشی ئۆکتۆبەر وەکوو باکگراوندی چیرۆکی سەرەکی فیلمەکەی لێ دێت کە باسی بەیەك گەیشتنەوەی دوو عاشق دەکات و بە جووت بوون و نزیکایەتییەکی وروژێنەری ئەو دووانە کۆتایی پێ دێت. لە فیلمی "کاریگەری قوڵ" شەپۆلێکی گەورە کە تێکڕای کنارەی رۆژهەلاتی ئەمریکا لە ناو خۆیدا هەڵدەلووشێ، دەبێتە باکگراوندی لاوەکی چیرۆکی سەرەکی فیلمەکە کە هەر بەیەك گەیشتنەوەی زینا ئاسای دووبارەی کچ و باوکێکە. لە فیلمی "شەڕی دنیاکان"، هێرشی بوونەوەرە ئاسمانییەکان کردارێکی لاوەکی و باکگراوەندی لە چاو ڕۆڵی پاڵەوانی فیلم "تام کرووز" دەگێڕێ کە وەکوو باوك دێتەوە ناو کایە و.. بەلاّم لە فیلمی منالاّنی پیاوان" لە دەرهێنانی "ئالفونس کارون" باسەکە بەم شێوەیە نییە. لەم فیلمەدا ئەوە باکگراوەندە کە رۆڵی سەرەکی لەئەستۆدایە. لە فیلمێکی تیپێکی زانستی – خەیاڵی ***fancy*** هۆلیود جیهانی داهاتوو رەنگە پڕ لە شت و داهێنانی نەناسراو بێت. تەنانەت بوونەوەری سیبرنتیکی و فەزایی هەر ئەو سروشتە مرۆڤانەی ئێمەیان هەیە و هەر ئەو کارانەش دەکەن کە ئێمە دەیکەین و یا لە رابردوودا، بۆ نموونە لە فیلمەکانی هۆلیودی یا لە ملۆدرامەکان و کردارەکان ***action***، ئەنجامدان دەدا. لە فیلمی "منالاّنی پیاوان" شێوەی سەیرو سەمەرە نابینین. لەندەن هەر ئەو لەندەنەیە. دروست هەر بەم شێوەی ئێستای. بەلاّم دووقات و لە هەمان کاتدا زۆر لەوە زیاتر

کــە لــە ڕەواڵــەتی ئێــستایدا بەدەردەکــەوێت. "ئـالفۆنس و کـارون" بـە سـادەیی سـەرکەوتوو بووە کە لایەنە شاعیرانە و کۆمەڵایەتی شاراوەی شــــارەکە دەربخــــەن. وێرانـــی و رووخــــاوی دەوروبەری شار، کامێرای شاراوە و چاودێر کە لــە هــەموو شــوێنێکدا دەبینرێــت و.. فیلمەکــە ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە خودی واقع لە هەموو ئــەو شــتە ســەیر و سەمەرانەی کە دەتوانین لای خۆمــان وێنــای بکــەین ســـەیر و ســـەمەرەترە. پێـــشتر هێگــل وتبـــووی کـــە وێنای کەسێك زیاتر لە خۆی لە خۆی دەچێت. "منــالآنی پیــاوان" چـیرۆکێکی زانـستی – خـــەیاڵی *Fancy* یـــە لەبارەی ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژین. ساڵی 2027ە و مرۆڤایــەتی نەزۆك بووە و گەنجترین کەسـی سـەرگۆی زەوی کـە بـەس 18 سـاڵیەتی لە دەسپێکی فیلمەکەدا لـە بـۆینێس ئـایرس دەکـوژرێ. لـە بـەریتانیای گـەورە بـۆ کـاتێکی نادیـار قەدەغـەی هاتووچـۆ ڕادەگەیــەنرێ. هێزەکــانی دژە تــیرۆر بــەدوای پەنابــەرە نایاســاییەکاندا دەگــەڕێن ئەمــە لــە کاتێکدایە کە دەوڵـەت خـەریکی ڕێکخستنەوەی ئەو نەتەوەیـە کە بەرەو رووخان و وێـران بـوون دەچێت. خـەڵکانێك کـە لـە لەورگـەی هێدۆنیسم (لــەزەتخوازی) نــەزۆك و تەندروســت و پــاك و خـاوێنی خۆیانـدا دەلـەوەڕێن. ئایا ئەمە بێجگـە لەوەیە کە ئەم دوو دیاردەیە، بێ سەروو بەرەیی هێدۆنیـستی و شـێوازە جیاکـانی ئاپارتایـدیی کۆمەڵایـەتی و کۆنترۆڵی هـەڵقوولاو لـە ترس لـە دیارترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای ئێمەیە؟ ئالێرەدایـە کـە کـارون بەشـە بلیمەتەکـەی خـۆی دەردەخـات.. هــەر بــەو پێیــەی کــە خــۆی لــە وتووێژێکــدا دەڵێــت: زۆربــــەی ئــــەو چـیرۆکانەی بـاس لـە داهــــاتوو دەکــــەن خــــەریکن باســـــی ناوەڕۆکێك هـەر وەکوو (بـرای گـەورە) دەکـەن. بـەڵام مـن پـێم وایـە کـە ئەمــــە تێــــڕوانینی ســـەدەی بیـــستە بـــۆ دیـــسپۆتیزم و ئـــەو دیـــسپۆتیزمەی کـــە ئێـستا خەریکـە بـەهێز دەبێـت رواڵـەتی خـۆی لــــە ژێــــر شــــێواز و دەمــــامکی تــــردا شـــــــــاردۆتەوە. دیـسپۆتیزمی سـەدەی بیـست و یەکـەم نـاوی دیمۆکراسـیە. هـەر بۆیـە بەڕێوەبـەران و بەرپرسـەکانی جیهـانی "کـارون" نـە مرومۆچـن و نـە وەکـو بۆرۆکراتـە تۆتالیتـەرە نمایۆنیفۆرم لە بەرەکانی رۆمانی جۆرج ئۆرۆل. بــەڵکوو ئــەوان مرۆڤگــەلێکی تێگەیــشتوو و بەڕێوەبـەرانێکی دیمـۆکراتی بـە کـەلتوورن. کـە هـەر کامـەیان شـێوازی تایبـەت بـۆ خۆیانیـان بـۆ ژیـان هەیـە. کاتێـك پاڵـەوانی فیلمەکە بۆ داوای



وەرگــرتنی ڕێپێــدان بــۆ مانــەوەی پەنابــەرێك دەچێت بۆ لای هاوڕێیەکی کۆنی کە ئێستا پلە و پایەیەکی لە ناو دەوڵەتدا هەیە، ئێمە لەگەڵ پاڵەوانی فیلمەکە دەچینە شوێنێکەوە کە زیاتر لــە ئاپارتمــانی جــووتێکی هاوڕەگــەزخواز لــە مانهاتان دەچێت. شوێنێك کە کەسە فەرمییەکە بــە جلــی مــاڵ و نافەرمییــەوە لەگــەڵ مێــردە ئیفلیجەکەی دانیشتووە. ئاشکرایە کە "منالأنی پیـاوان" پەیوەندییـەکی بە پرسـی نـەزۆك بـوون وەك کێشەیەکی بایۆلۆژیاییەوە نییە. ئەو نەزۆك بوونـەی کـە لـە فیلمەکـەدا باسـی لێوە دەکرێـت هەر ئەو شێوەیە کە فێردریش نیچە لەوە پێش لێکدانەوە خەسار ناسانەکەی خۆی لە سەری دەربڕی بوو. ئەو کاتەی کە ئەو رایگەیاند کە شارســتانییەتی ڕۆژئــاوا بــەرەو ســەرهەڵدانی دوایین مرۆڤ هەنگاو هەڵدێنێ، بوونەوەرێکی بێ ئیشتیا و بێبەری لە هەست و سۆزی بەهێز و پابەنـدبوو و بـە بـەڵێن. ئـەو بوونــەوەرەی کـە ناتوانێ خەون و ڕۆیا ببینێ و ماندووە لە ژیان، ئـەو بوونـەوەرەی کـە ئامـادە نییـە خـۆ بـەدەم مەترسییەوە بدات و بەس بە دوای هێمنایەتی و ئاشایــــست و خۆشــــی و تەحــــەمولکردنی دوولایەنـە و دانـانی مـەرزی چاکە و خراپـە بـۆ کەسانی ترەوەیە: ماوەیەك شرینقە تۆزی ژار یا مـادەی سڕکەر بـەهۆی شـرینقە لێدان لـە خـۆ، خــەو و خولیــای خۆشــی بەدواوەیــە و پاشــان لێدانی ژارێکـی زیـاتر بـۆ چـوونە نـاو باوەشـی مــــەرگێکی پەســــەند کــراوو خۆشــەوە. ئــەو مرۆڤانەی کە پیاسە و شایی و خۆشی بچووکی ڕۆژانە و شەوانەی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەلأم تەندروستی لـە هـەموو شت بـە گرنگتر دەزانن. دوا مرۆڤــەکان دەڵــێن ئێمــە بــــەختیاریمان دۆزیوەتــەوە و چـاو دادەگــرن. دوا مرۆڤــەکان

نایانەوێ خەوو خولیای ڕۆژانەیان تێك بچێت — هــەر بۆیــە لــە جیهــانی زەیــنی دوا مرۆڤــدا دەســــتدرێژی کردنــــە ســــەر چوارچــــێوەی تاکەکەسی چەمکێکی گرنگە. ئەم چەمکە ئەگەر ماناکـەی لێـك بدەینــەوە ئـەو دیـاردە تونـد و تیژیانـــەی وەکـــوو دەســـتدرێژی، لێـــدان و برینــــدارکردنی لــــەش و شــــێوەکانی تــــری دەســــــتدرێژی و توندوتیــــژی کۆمەلأیــــەتی دەگرێتــەوە. ئــەو دیاردانــەی کــە دەبێــت بــە تونــدترین شــێوە ئیدانــە بکــرێن. بــەلأم لــە ســەردەمی ئێمــەدا ئــەم چــەمکە (دەســتدرێژی کردنــــە ســــەر چوارچــــێوەی تاکەکەســــی) بەشـێوەیەکی هەسـت پێنـەکراو مانایـەکی تـری گرتۆتـە خـۆ و چـەمکی دەستدرێژی کردنـە سـەر چوارچێوەی تاکەکەسی بێجگە لـەوەی دەتوانێ شـتی تـریش بگرێتـەوە بـەڵکوو ئیدانـەی هـەموو چەشنە جووڵەیەکیشە کە گەیەنەری نزیکی لە ڕادەبەدەری لەگەڵ مرۆڤێکی ڕاستەقینەی ترە لە دژایــــەتی لەگــــەڵ حــــەز و هەوەســــکاری و سـەرقاڵییەکانی بێـت و ترسـەکانی بـەرفراوانتر بکات. ئەو لیبرالیسمەی ئێمە کە چاکە و خراپـە دەستنیشان دەکات لە هەنووکەدا دەبێت لەگەڵ دوو قەیرانـدا بـەرەو ڕوو ببێتـەوە کـە ڕۆڵێکـی دەستنیـشانکەری لەســەر هەڵوێـستی دەسـت نیشانکردنی چاکە و خراپەی ئێمە بەرامبەر بە "ئەوی تر" هەیە: ڕێزگرتن لە شتێکی جیاواز و بـە پەسـەند گەیانـدنی لای خـۆ (کـراوە بـوون لـە بەرامبـەر "ئـەوی تـردا") لەلایـەك و لەلایـەکی تریشەوە ترس و دڵەڕاوکێی دەستدرێژی ئەوی تر بۆ سەر چوار چێوەی تاکەکەسی. "ئەوی تر" لـەلا پەسـەند دەبێـت تـا ئـەو کاتـەی بـوونی وەك مــوزاحیم دانــەنرێ تــا ئــەو کاتــەی کــە بــوونی هەست پێنەکراو بێت. دەستنیشانکردنی چاکە

و خراپە لەگەڵ دژەکەیدا دەبێتە هاوڕێ: ئەرکی من لە بەرامبەر "ئەوی تر"دا خۆم سنووردار بکەم بۆ چاکە و خراپە و ئەمە لە پراکتیکدا بەو مانایەیە کە من نابێت لە رادەبەدەر لێی نزیك ببمەوە و نابێت بچمە ناو چوارچێوە و ژیانی تایبەتی ئەوەوە و بە کورتی من دەبێت ئەو مافەی "ئەوی تر" لەسەر تەحەمولنەکردنی من بە هۆی نزیکایەتیم کە دەبێتە هۆی موزاحیمەت بۆی بپارێزم. ئەمە ئەو شتەیە کە رۆژ لە دوای رۆژ لە کۆمەڵگای ئێمەدا وەکوو مافێکی سەرەکی و تەنانەت بووەتە بنەماییترین تێگەیشتنی ئێمە لە ماف مرۆڤ. ماف ئەوەی کە چوارچێوەی تایبەت بە خۆمان پارێزراو بێت و یان بە واتایەکی تر دانان و راگرتنی مەودایەك لەگەڵ ئەوی تردا بۆ بەرگری کردن لە تێکچوونی ئاشایست و هێمنیمان



زۆربەی دادگاکانی کۆمەڵگای رۆژئاوا، ئەوڕۆ ئەگەر کەسێك بەهۆی دەستدرێژی کردنە سەر چوارچێوەی تایبەت بە کەسێك (وەکوو شوێن کەوتنی کەسێك و یا پێشنیاری نابەجێی سێکسی) گازندە بەرز دەکاتەوە، ئەو حوکمەی کە دەردەچێت ئەوەیە کە ئەو مافە لەو کەسە دەستێندرێتەوە کە لەگەڵ ئەو کەسەدا دیداری هەبێت. ئەو کەسەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەر چوارچێوەی تایبەتی کەسێکی تر رەنگە لەلای دادگا مەحکووم بکرێت بەوەی کە نابێت خوازراو لە ئەو کەسەی وا گازندەی لەسەر تۆمار کردووە نزیك ببێتەوە و بەپێی یاسا دەبێت سەد مەتر لەوەوە دوور بێت. ئەم کارە هەرچەندە پێویستیش بێت ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە ئەمە بە پارێزگاری لە خۆ دابنرێت ئەو خودەی کە لەبەرامبەر راستی تراوماتێك خوایشت و یا حەزی "ئەوی تر" چوارچێوەی تایبەتی خۆی سنووردار بکات. ئایا ئەمە لە خۆیدا باسێکی روون نییە کە هەرچەشنە دەربڕینی ئاشکرا و لەبەرچاوی حەزو خواستی بەتین بە مرۆڤێکی تر جۆرێك لە توندوتیژی لەناو خۆیدا شاردۆتەوە؟ حەز و خواست بەپێی پێناسە زیان بە ***object***ی خۆی دەگەیەنێت و تەنانەت ئەگەر بەردڵیش کەوتبێت و لە رووی بەختەوە وەلامی حەز و خواستی ***subject*** بداتەوەو خۆی هەر لەو پێگەیەدا ببینێتەوە هێشتا ئەگەری ئەوە هەیە کە هەردوولا ترس و دڵەڕاوکێیەکیان لە دڵدا هەبێت ئەمە دەتوانرێ لەسەر قەدەغەکردنی جگەرەکێشان لە کۆمەڵگای رۆژئاواشدا راست دەربچێت. لە دایرەکانەوە دەستیان پێکرد تا گەیشتە فرۆکەخانەکان، ریستۆرانتەکان، بارەکان و کلووبە تایبەتییەکان و دواتر لە هەندێ لە زانکۆکاندا بە دووری 50 مەتر لە دەرگای چوونە ژوورەوەیان دانا بۆ ئەو کەسانەی جگەرەیان دەکێشا و ئەمە هەروا درێژەی هەبوو. پاش ئەمەش لە کردەیەکی چاوەڕوان

نـەكراوی سانـسۆری راهێنانـدا – کـە بـیری نەریتـــەکانی ســـتالینییمان دەخاتـــەوە کــــە دەســـتکاری وێنـــەکان دەکـــراوو دەمووچـــاوی نـەخوازراویان لادەبـرد بـە مەبەسـتی سـاختەو گـۆڕینی سیـستماتیکی راسـتییەکان – دایـرەی پۆستی ئەمریکا جگـەرەی لەسـەر ئەو وێنانـەی کە دوو گیتاریستی بلووز، رۆبێرت جۆنسون و جەکسۆن پـوولاك لـە سـەریان کێـشرابوویەوە لابـرد. ئـەم چەشـنە بەرگرییانـە راسـتەوخۆ بـۆ ئـەوە دەکـرا کـە بـەرگری لـە چـێژوەرگرتنی نابەرپرسانە و مەترسیداری تـر لەگـەڵ بەڵگـەی قەدەغـــەکردنی ئـــەو لـــە مـــژینی قـــووڵ و رەزامەندانـــەی لـــە جگەرەکـــە بکرێـــت (بـــە پێچەوانەی ئەو دەوڵەمەندانەی کە جگەرەکەیان بـێ مـژی قـووڵ دەکێـشن و یـا سێکـسیان بـە تەواوی ئەنجام نەدەدا و یا وەکوو ئەو کەسانەی کە شتی چەور ناخۆن) – بەڵێ هـەر بەو شێوەی کە لاکان وتوویە: پاش مردنی خوا ئیتر هیچ شـتێك رێپێـدراو و رەوا نابێـت. لـە بازاڕەکـانی ئەوڕۆدا کالاٌ و زۆر بەرهەمی تر دەبینین کە ئەو تایبەتمەندییانـــەی کـــەوەی هەیـــە لێیـــان سەندراوەتەوە: کافـەی بـێ کـافیین، کرێمـی بـێ چـــەوری بـــیرەی بـــێ ئـــەلکۆل.. ئـــەم پێرســـتە دەتوانیٌ درێژەی هەبێت لەمەڕ سێکسی وێنـەیی واتـە سێکـسی بـێ سـێکس؟ یـا تیـزی "کـالین پـــاوول" لەســـەر شـــەڕی بـــێ وەی و کـــوژراو (هەڵبـەت بـۆ هێزەکـانی خـۆ) واتـە شـەڕی بـێ شـەڕ؟ یـا چـی پـێ دەڵـێن لەسـەر پێناسـەی دووبـــــارەی سیاســـــەت وەکـــــوو هونـــــەری بەڕێوەبـەرانی پـسپۆڕ، واتـە سیاسـەتی بـێ سیاسـەت. هـەروەها چـەند کـەلتووری کۆمەڵگـە لیبراڵـەکان لەبەرچـاو بگـرن وەکـوو ئـەزموونی "ئـەوی تـر" وەکو کەسێك کە سەمای سەرەنج راکـــێش دەزانێـــت و ئـــاوەزێکی باشـــی مامناوەندیـشی بـۆ درك بـە راسـتییەکان هەیـە) ئەمـە لـە کاتێکدایـە کـە دیاردەی وەکوو لێدانی هاوســـەر یـــا دەســـتدرێژی نـــاو خێزانـــی لـــەم کۆمەڵـەدا جێگـای نابێتـەوە. ئێمـە کـە بـە جیهان یەکەمەکان ناوزەد دەکرێین شتێك کە ئامادەبین بۆ بەدەستهێنانی گیانیشمان بخەینە سەری رۆژ لـە دوای رۆژ بـە دژواتـر بەدەسـتی دێنـیین. لـە راستیدا وا پێدەچێت کـە بۆشایی نێوان ئێمـە (جیهان یەکەمـەکان) لەگـەڵ جیهـان سـێهەمەکان لە خراپترین شێوەی خۆیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتـەوە کـە جیهـان سـێهەمەکان ژیـانی خۆیـان بـۆ شـتی تایبـەت بـە خـوا و مۆراڵ تـەرخان کـردووە؟ ئایا ئـەم دوو لایەنییـە هـەر ئـەوە نییـە کـە نیـچە بـە نهێلیسمی چالاك و نهێلیسمی پاسیڤ ناوی لـێ دەبـات. ئێمـە لـە کۆمـەڵگای رۆژئـاوادا هـەر ئـەو دوا مرۆڤانـەین کـە لـە خۆشـییەکانی رۆژانـەی خۆمانـدا نـوقم بـووین ئەمـە لـە کاتێکدایـە کـە موسـڵمانە رادیکاڵـەکان هـەموو شـتێکی خۆیـان دەخەنە سەر دەستیان و پابەند بەوەی کە چاو لـە هـەموو شـتێك بپۆشـن و چالاکانە لـە شـەڕی نهێلیستی خۆیـان تـا تیاچوونی خۆیان دەچنە پێش. سەیرە لە فیلمی "منالاٌنی پیاوان" تـەنیا شوێنێك کە دەتوانرێ هەست بە بوونی ئازادی بکرێت بەس ئەو شوێنە ئازاد بووەیـە کە رزگـار بـــوو لـــە ژێردەســـتی ئـــەو بوونـــە بـــەربلاٌو و خنکێنـــەرەی ســـەرکوتە لـــە ژێـــر نـــاوی "بـــلاك پـوول"دا شارێکی تـەواو و رزگار کە دیوارێکی بە دەور دووره پەرێزی خۆیدا کێشاوە و بووەتـە کامپێکی پەنابەران کە لەلایـەن خودی خەڵکـەوە بەڕێوە دەبرێت. لـە کۆتـایی فیلمەکـەدا دەبینین کـــە شـــار لەلایـــەن بۆمبـــە ئاسمانییەکانـــەوە هێرشـێکی بێبەزەییانـەی دەکرێتـە سـەر. لـەوێ

ژیانی راستەقینە بەڕێوە دەچێت، بە موسڵمانە بونیادخواز و ڕێپێوانەکانیان و بە کارە هاوبەشەکانیان کە ئاماژەیەکە بۆ یەککگرتوویی ڕەسەنیان – پێت سەیر نەبێت کە هەر لێرەدایە کە منداڵی ئادەم (ئەو منداڵەی کە مژدەی لەدایکبوونی دراوە) لەدایك دەبن. لە دیدارێکی تەلەڤزیۆنی لە کاناڵی ئێن بی سی لەسەر زیندانییەکانی گوانتانامو و چارەنووسیان لە ساڵی 2004 دا بەرنامەیەك بڵاوبوویەوە، یەکێك لە سەیرترین ئەو هۆیانەی کە هێنرایەوە و دەویسترا بە ئێمەی پەسەند بکات کە هەلومەرجی ئەوان لە بوارەکانی دادوەری و ئەخلاقی و مرۆڤییەوە پەسەند کراوە ئەمە بوو کە ئەم زیندانییانە هەر ئەوانەن کە لە دەست بۆمبەکان رزگاریان بووە. چونکە ئەوانە ئامانجی بۆمبەکانی ئەمریکا بوون و بە ڕێکەوت هێشتا زیندوون، چونکە ئەم بۆمبارانە بەشێك لە کردەیەکی سەربازی ڕێپێدراو بوو، بە کورتی ئەوان لەو کردە سەربازییەدا دەبوایە بکوژرانایە، کەواتە لە ئەنجامدا ئێمە ناتوانین ڕەخنە لەو شێوە هەڵسوکەوتەی کە لەگەڵ ئەوان ئەنجام دەدرێت بگرین. هەلومەرجی ئەوان بە هەر شێوەیەك کە سەیری بکەین لە مردن باشترە، ئەوان دەبێت سوپاسگوزار بن کە زیندوون. ئەم شێوە هۆ هێنانەوە زۆر زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرێت راستییەکان دەردەخات. بەپێی ئەم وتانە زیندانییەکانی گوانتانامۆ پێگە و هەلومەرجێکی هاوشانی زیندووە مردووەکان و یا مردووە زیندووەکانیان هەیە. کەسانێك کە لە هەندێ لایەنەوە مردوون و ماف دادوەرانەیان ئەتوانیْ پێشێل بکرێت چونکە وا بڕیار درابوو ئەو بۆمبانەی کە بە خوێنیان تینوو بوون لە ناویان ببات. ئەمانە مەدلوولێکی باشن بۆ ئەوەی کە "جۆرجیۆ ئاگامبێن وەکوو *homo sacer* ناویان لیْ دەبات، واتە ئەو کەسانەی کە بە سادەیی دەتوانرێن بکوژرێن بیْ ئەوەی لە ئەنجامە دادوەری یا یاساییەکەی ترسێك هەبێت، چونکە ژیانیان لە گۆشەنیگای یاساوە ئیتر لەبەرچاو ناگیرێت. ئەگەر زیندانییەکانی گوانتانامۆ لە پێگەیەکدا خۆیان دەدۆزنەوە کە لە نێوان دوو جۆری مەرگ و لە پێگە و جێگەی مرۆڤ دانان *homo sacer* دایە واتە ئەو مرۆڤەی کە بەپێی یاسا مردووە و پێگە و جێگە یاساییەکەیشی لێ سەندراوەتەوە دادەبەزێت. ئەمە لە کاتێکدایە کە لە سووچە نیگای بایۆلۆژیاوە هێشتا درێژە بە ژیان دەدات، کەواتە دەبێت بڵێین کە فایل و کەیسی ("تری شیاوو" کە ئێمەی لە مانگی مارسی 2005 ەوە بە خۆیەوە سەرقاڵ کرد ئاماژە بە پێگە و هەلوومەرجێکی ئاوەژوو دەکات. ئێمە لەم کەیسەدا مرۆڤێك دەبینین کە بەپێی بایۆلۆژیا وەکوو مردوو وایە چونکە تری لە ساڵی 1990دا تووشی خوێنرێژی دەماغ بوو و دڵی بە هۆی نەبوونی هاوسەنگییەکی کیمیایی کە پێدەچوو لە بەدخۆراکییەوە تووش بووبێت، وەستا، دوکتۆری یاسایی وتی کە تێری چووەتە ناو کۆماییەکی هەمیشەییەوە و هیوایەکی بۆ هۆشیار بوونەوەی دووبارەی هۆش و بیری بەدی ناکرێت. ئەو بەس لە ڕێگای



ئامێرەوە دەیتوانی بخوات و ئەو شتەیشی کە خواردوویەتی فڕێ بدات. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە مێردەکەی دەیویست تیری لەم هەلوومەرجە ناخۆشە رزگاری ببێت و ئەو یارمەتییە پزیشکیانەی کە ببوە هۆی ئەوەی کە بەرگیری لە مەرگی بکات، بپچڕێت و بوەستێت، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە دایك و باوکی تێری دەیانویست ئەو هەروا بمێنێتەوە چونکە هەر هیوایان بەوە بوو کە چاك ببێتەوە و نکۆلییان لیٚ نەدەکرد. ئەوان دەیانوت کە ئەگەر کچەکەیان لەم بارودۆخەی کۆمادا نەدەبوو هیچ کات بەوە رازی نەدەبوو کە خواردن و خواردنەوەی پیٚ نەدرێت. ئەم کەیسە گەیشتە لای بەرزترین بەرپرسی دادوەری و سیاسی لە ئەمریکا. دیوانی بالاٚی ولاٚت و خودی سەرەك کۆمار بەدواداچوونیان بۆ کێشەکە کرد و کۆنگرێسی ئەمریکا دەستبەجیٚ هەندیٚ داواکاری لەم بارەوە پەسەند کرد. نابەجێیی و بیٚ مانایی ئەم هەلومەرجە ئەگەر کراوەتر سەیری بکەین دەتوانیٚ ببێتە هۆی سیخ بوونی مووی لەشمان: لە کاتێکدا کە دەیان ملیۆن خەڵك بەهۆی نەخۆشی ئایدزەوە خەریکن دەمرن و لە هەموو جیهاندا بەهۆی برسییەتییەوە دەیان ملیۆن خەڵك خەریکن تیا دەچن، بەڵیٚ لە ئاوا جیهانێکدا بیری گشتی خەڵك بەس لەسەر ئەوە وەستا بوو کە یارمەتی بە درێژەدانی ژیانێکی ئیفلیج کە هیچ هۆش و شعوورێکی نەبوو، بدەن. ئەو ژیانەی کە هەموو تایبەتمەندییەکانی مرۆڤانەی خۆی لەدەست دابوو. ئێمە لە ناو دوو جەمسەری لێك دژدا دەژین: لەلایەکەوە ئەو کەسانەی کە بۆمبەکان بە هەڵە رزگاریانیان کرد (لەلایەن فیزیایی و هزرییەوە مرۆڤێکی تەواو و بیٚ کەم و کورتی بەلاٚم لەلایەن یاساوە بێبەری لە مافی مرۆڤایەتی) و لەلایەکی تریشەوە مرۆڤێك کە بەهۆی ئامێرێکی مژێنەری خەستەخانەوە دەژی و تا ئەو رادەیە دابەزییوە بەلاٚم ژیانی لەلایەن هەموو دام و دەزگای دەوڵەتەوە دەپارێزرێت. چی رووی دا کە ئەم رۆژەمان بەسەرهات؟ هیچ کام لە خوێنەرە هۆشیارەکانی "مارکی دۆساد" ناتوانن درك بەم خاڵە نەکەن کە ئەو چەشنە ئازادییە سێکسی و بێسەر و بەرییەی کە مارکی دۆساد بانگەشەی بۆ دەکات لە راستیدا بەتاڵ لە هەرچەشنە ئاماژەیەکی مۆراڵییە. ڕاهێنانەکانی مۆساد کردەی سێکسی دەکاتە کۆمەڵێك جووڵەی بڕیاردراو و میکانیکی کە بێبەری لە هەر چەشنە هەست و گوڕێکی رەسەن و سۆزییە. ئایا ئێستا ئێمە گۆڕان لە کردەی سێکسی بۆ لای بیرۆکەکەی مۆساد نابینین؟ پێگەیەکی مەرگاوی کە "دوا مرۆڤەکانی" سەردەمی ئێمە خۆیانی تێدا دەدۆزنەوە، ئەو تاکییەتە پۆست مۆدێرنەی کە هەموو ئامانجە بەرزەکانی فڕیٚ داوە (لە ئاست هەموو بان گێڕانەوەکان چاوی خۆی نووقانووە) و ژیانی خۆی بۆ هەندیٚ شتی وەکوو سەرقاڵی و خۆ خلەفاندن و خۆشگوزەرانی و گرنگتر لە هەموویشی بۆ مانەوەی تاکەکەسییان تەرخان کردووە، ئەو کەسانەی کە رۆژ لەدوای رۆژ ژیانیان بۆ جوانی و ناسکی و چێژە دەستکردەکان تەرخان دەکەن و لە بەرەکەتی ژیانی مۆدێرن وەکوو کالاٚو بەرهەم لە شێوەیەکی گەورەتر لە شێوە ئاساییەکەیدا بۆیان دابین دەکرێت. ئەگەر سیستەمی کۆمەڵگای زنجیرە پلەیی کۆن هێزە ژیان بەخشە سەرەکییەکانیان سەرکوت دەکردو سیستەمی ئایدۆلۆژیایان دواکەوتووانە بوو و دەسەلاٚتی زاڵیان لە خزمەت راگرتنی ئەو

سیستەمەدا بوو و دژایەتیان لەگەڵ هەر چەشنە گۆڕانێکدا دەکرد لە کۆمەڵگای ئەوروپیدا شتەکە بە پێچەوانەوەیە. چونکە ئەم کۆمەڵگانە بەهۆی بەربەرەڵڵاییەکی چێژبەخشانە و هێدونیستی خەریکە هێزی ژیان بەخشی خۆی لەدەست دەدات هەموو شتێك ڕێپێدراوە، بەڵام بێ کافیین، بە تاڵ بوو لە کرۆکە بنەماییەکەی. هەموو ئەو شتانەی کە بۆ چێژەکان وەراست دەگەڕێت بۆ دیموکراسیەکەیشمان هەر بە راست دەردەچێت: لە راستیدا ئەمە هەر ئەو باسی

دیموکراسی بێ کافیینە، دیموکراسییەك کە لە کرۆکی خۆی بەتاڵ کراوەتەوە تیژی و تایبەتمەندی بڕاوی خۆی لەدەست داوە. سەدەیەك پێش ئێستا "چێستێرتۆن" نووسیبووی: ئەو کەسانەی کە لە ژێر ناوی ئازادی و مرۆڤایەتییەوە دژی کەنیسە دەجەنگن، ئەنجامی شەڕەکەیان ئەوە دەبێت کە هەم ئازادی و هەم مرۆڤایەتی فڕێ دەدەن بۆ ئەوەی بتوانن درێژە بە شەڕ دژی کەنیسە بدەن. یەکەم شتێك کە دەبێت بەم وتەیە زیاد بکرێت ئەوەیە کە ئەم وتەیە لایەنگران و پارێزگارانی ئایینیش دەگرێتەوە: زۆرن ئەو کەسە دەمارگرژو لایەنگرانەی کە لە شەڕی تۆراوییان دژی کۆمەڵگەی سیکۆلار ئەوەندە پێش دەکەون کە لە راستیدا خودی مەزهەبیش دەکەنە قوربانی. (بەو هۆیەی کە بە دەست راگەیشتنیان بە رەگ و ریشەی هەموو ئەزموونە پڕ واتاکانی مەزهەبی وشك کرد و ئەوانی بێ بەری لە ئەزموونی دونیای مۆراڵی کرد (ئایا هەر ئەم باسە ناتوانێت لیبراڵە دیموکراتەکانیش بگرێتەوە کە لە شەڕی دژ بە بونیادخوازەکانی دوژمنی دیموکراسی هەر بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان کرد کە بونیادخوازەکان

دەیانکرد و توندوتیژی و توندڕەوییان دەنواند کە لە ئەنجامدا تێکڕای راهێنانە دیموکراتیەکەیان و بڕوا بە ئازادییان ژێر پێ ناو پێشێلیان کرد بەس بۆئەوەی دژی تیرۆر شەڕ بکەن؟ ئەوان ئەوەندە لەسەر لابردنی هەڕەشەی بونیادخوازی پێداگری دەکەن کە دەیانەوێ هەموو بونیادخوازە بێجگە مەسیحییەکان بە گەورەترین هەڕەشە دابنێن کە هەڕەشە لە ئازادی مرۆڤ دەکات و لەم رێگاییەشدا ئەوەندە ئامادەن کە تەنانەت خودی ئازادیش دەکەنە قوربانی و هەر بە هۆی شەڕ لەگەڵ تیرۆریسمدا دەیانەوێ کە ئێمەیش هەر ئێستا هەر لێرەیشدا ئازادی خۆمان بخەینە ژێر پێمان لەم کۆمەڵگایە بە رواڵەت مەسیحییەدا. ئەگەر تیرۆریستەکان ئامادەن جیهانی لەناوچوو فیدای جیهانی هەرمان بکەن خەباتگێڕانی دژە تیرۆریش لە بەرامبەر ئەمەدا ئامادەن دیموکراسی خۆیان لەبەر ئەو قینەی کە لەوەی تر "موسڵمان" هەیانە لە ناو ببەن "بوناتان ئالتێر"، "ئالان دێرشوویتز" و "سام هێریس" هەموو لەو جۆرە کەسانەن کە رێزگرتنی مرۆڤانەیان ئەوەندە خۆش دەوێت کە ئامادەن لەبەر ئەو، ئەشکەنجە یاسایی بکەن — ئەشکەنجە ئەوپەڕی دەستدرێژی کردنە بۆ سەر رێزگرتن لە مرۆڤ — و پێیان وایە کە لە رێزی مرۆڤ لایەنگری دەکەن. کەلتووری زاڵ بەسەر سیاسەتی رۆژدا سیاسەتی ترسە، سیاسەتی بەرەو رووبوون لەگەڵ دەمارگرژییەك کە بۆی هەیە رووبدات و یا دەستدرێژی کردنە سەر چوارچێوەی تایبەتی: ترس لە کۆچبەران، ترس لە مرۆڤی تاوانبار و بەرژین شکێن، ترس لە تێکەڵاوی سێکسی خوا تۆرینەرانەی نەریت شکانانە، ترس لە سووکایەتی دەوڵەتی (بە

باجە هەرە قورسەکانی) ترس لە کارەساتەکانی ژینگە، ترس لە دەستدرێژی و غەدر، (نیگەرانی بۆ پاراستنی چوارچێوەی تایبەتی هەر ئەو شتەیە کە وا دەینوێنیٚ کە هەر ئەو شتەی کە بەپێی بیرۆکەی سیاسی بە دروست دادەنریٚ بنەماییترین نموونەی لیبراڵ سیاسەتی ترس و یا ترسی سیاسییە) ئەم جۆرە سیاسەتە بەردەوام لەسەر رەشبگیری ترسهێنەری مرۆڤەکان وەستاوە. رووداوێکی گەورە کە لە سەرەتای ساڵی 2006 لە ئەوروپا روویدا ئەوە بوو کە رەوتی پەنابەر تۆران لە لایەنی سیاسییەوە بووە بە یەکێك لە رەوتە بنەماییەکان: هێڵێکی سەرەکی کە دەبووە هۆی جودابوونەوەی هێزە رەگەزپەرستەکانی دەستە راست لە رەوتی ئاسایی سیاسی، پچڕاند لە فەرەنسەوە تا ئاڵمانیا، لە نەمساوە تا هۆڵەندا لە یەکگرتوویەکی نویٚ کە تازە لە شوێنێکی نوێدا سەریهەڵداوە کە سەرچاوە گرتوو لە لووت بەرزی ئەم وڵاتانە لەسەر چییەتی مێژوویی و کەلتووری هاوبەشی خۆیەتی. ئەوەمان بینی کە ئەو حیزبە گەورە سیاسیانە ئەوەی کە لە سەردەمانێکی پێشووتردا بۆیان پەسەند نەدەکرا و وایان دەنواند کە بۆ وتنیش نابێت ئێستا زۆر سادە دەیڵێن: ئەوەی کە پەنابەران میوانێکن کە دەبێت خۆیان لەگەڵ کەلتوور و بەهای ئەو کۆمەڵگایە رێکبخەن و بە باشی بۆی تێبکۆشن – ئێستا "نیشتمانی ئێمە: ئەی پەنابەر یا خۆشت بوێت و یا برۆ بۆ شوێنێکی تر. هەر بۆیە کە "شەڕی شارستانییەکان" نموونەیەکە لە نەخۆشی هانتینگتون کە ئێمە لە سەردەمی ئێستادا هەمانە – هەر بەو شێوەیەی کە "سامۆیل هانتینگتون (28) وتوویەتی: دیواری ئاسنی لە نێوان ئایدۆلۆژیاکان لە دوای شەڕی سارد بووە شەڕی کەلتوورەکان. وا دەنوێنریٚ کە ئەم تیۆرە رەشبینانەیە خاڵی بەرامبەر سیناریۆی خۆش بینانەی فرانسیس فۆکۆیاما لەسەر داهاتووە کەبەپێی ئەوە کۆتایی مێژوو کە کۆتایی مێژوو دیاری دەکات. یا بە واتایەکی تر لێك دژییەکانی قەومی–مەزهەبی دژایەتی گەلێکن کە لەگەڵ بەجیهانی بوونی سەرمایەداری هاوڕیٚ و وەك یەك دێنەوە. لە سەردەمی بان سیاسیی ئێمەدا لە کاتێکدا کە سیاسەتی راستەقینە رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر لەلایەن بەڕێوەبەرە پسپۆڕەکانەوە بەڕێوە دەچێت، تەنیا سەرچاوەیەکی رەوا کە بۆ برەودان بە لێکدژییەکان ماوەتەوە لە راستیدا هەر ئەو لێکدژی و ورووژانە کەلتووری، قەومی، مەزهەبیانەن. کەواتە رێم پێبدەن بۆئەوەی کۆتایی بە بابەتەکەم بهێنم قسەیەك لە هەڵەیەکی لەبیر نەکراوی لەفزی – فرۆیدی سەرەك کۆمار بۆش بهێنمەوە "منالانی پیاوان" ئەوەندە بە نادەستەکەم مەگرن فیلمە نوێکەی ئالفۆنسۆ کارون دەگاتە بنکی بابەت و رەخنە دەکاتە ئەودیوی پێگەی ئازارگەیەنەرەکەی ئێمە.

**سەرچاوە:**

لە سایتی

*http://ramzashoob.com/article,aspx?id=209*

# له هونەری ئەکتەرەوە لەلای ستانسلافسکی بەرەو پێرفۆرمانکار لەلای کرۆتۆفسکی

ڤیرجینی ماینات

له فەرەنسییەوە: مستەفا قەسیم

### بەشی یەکەم

ئەو زنجیرە کۆنفرانسانەی (سیمینارانەی) کە کرۆتۆفسکی لە پاریس لە مانگی مارتی 1997وە، تاکو مانگی کانونی یەکەمی 1998 سازیدان، سەرلەنوێ و بۆ جارێکی دیکە، تیشکیان خستەوە سەر لێکنزیکی بابەتی ئەو پەیوەندییە بنەڕەتیانەی، لە نێوان لێکۆڵینەوەکانی ستانسلافسکی کە، لەسەر هونەری ئەکتەر ئەنجام دراون و توێژینەوەکانی دامەزرێنەری شانۆی (لابۆراتوار – تاقیگا)دا هەن، کە لەسەر پرۆسەی پێرفۆرمانسن لەلای ئەکتەرە.

له ساڵی 1997ەوە کرۆتۆفسکی دەکرێ بە مامۆستای ئەنترۆپۆلۆجی شانۆیی لە کۆلێجی فرانس لە پاریس، سیمینارەکانی رێژیسۆری پۆلۆنی، شێوازی رووبەڕوو و گفتوگۆکردن لەگەڵ جەماوەر لە خۆدەگرێت و پێبەپێ لە چەندین شانۆی بەناوبانگی پاریس ئامادەدەکران. هەر سیمینارێك لە دوو بەش پێکهاتبوو. هەر بەشێکیش دوو کاتژمێری دەخایاند. له بەشی یەکەمدا کرۆتۆفسکی لەسەر بابەتی (رێچکە ئۆرگانیکیەکان له شانۆ و له ریتواڵدا) دەدوا، لە رێگای دۆکیمێنت و ئەرشیفی بینراوو بیستراوەوە، روونکردنەوەو شرۆڤەکردنی دەکرد. بەڵام بەشی دووەم تایبەتکرابوو بۆ پرسیار و گفتوگۆ و ڕا گۆڕینەوە لەگەڵ ئامادەبوان.

ئەو بنەما بنەڕەتیانەی کە دید و بۆچوونەکانی ستانسلافسکی و کرۆتۆفسکی پێکەوە دەبەستنەوە، نەك بە تەنها لە چوارچێوەی توێژینەوەکانیان دەکرێ دیاری

بکرێن، کە تایبەتن بە پرۆسەی گەشەی کاری ئەکتەر، بەڵکو دەتوانرێ لەسەر ئەو ئاستە فراوانەش تەماشا بکرێن، کە پەلدەهاون بۆ تێکڕای توانستە مرۆییەکان. لە ڕاستیدا ڕێچکەی هونەری گرنگ و تایبەتمەندی، هەریەکەیان، لە نێو جەرگەی سەدەی بیستەمدا تۆماردەبێ و ڕیشەدادەکوتێ، هونەرێك لە هەمانکاتدا بە خۆزگەو ئاواتەکان و توانستە تایبەتیە مرۆییەکان جۆشدراوەو لە نێو واقیعێکی کۆمەڵایەتی بەردەوام لە گۆڕاندا ڕیشە دادەکوتێ و بە قووڵی مۆرکی ستەمی سیاسی پێوە دیاردەبێ و لە حاڵەتی کرۆتۆفسکیدا، چەوسانەوەو سانسۆری ئاینیشی دەچێتە پاڵ.

**میراتی منداڵی:**

لە میانەی ئەو دوو کۆنفرانسەی کۆتایی لە پاریس، کرۆتۆفسکی دەگەڕایەوە بۆ سەر هەندێ بنەما و ڕەهەندی بیوگرافی (ژیاننامە) خۆی، کە بەلای ئەوەوە چەندین مانا و ئاماژەی گرنگیان لەخۆ دەگرت و بە شێوەیەکی ئەنتیمیش پەیوەستبوون بە توێژینەوەکانیەوە. ئەو یادەوەریانەی وەك خۆی دەیوت، سەر بە (دەفتەرە چکۆلەی یادەوەریەکانن) و کە زۆربەی هەرە زۆریان دەگەڕێنەوە بۆ تافی منداڵی ئەو لە پۆڵۆنیا، لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا، کە بە سەردەمێکی پڕ تراجیدیا دادەنرێ لە مێژووی ئەو وڵاتەدا.

ئەو کاتە کرۆتۆفسکی لە گوندێکی بچوك دەژیا. جەستەی لە منداڵەکانی تر لاوازتر و بێهێزتر بوو، هەستیدەکرد لە ئەوان جیاوازە و زۆر دەترسا لە دونیای ئەوان دوور بخرێتەوە. لە تەمەنی هەشت نۆ ساڵیدا، بە نهێنیەوە دەستدەکات بە خوێندنەوەی ئینجیل، لەبەرئەوەی ئەو قەشانەی لە قوتابخانەکەیدا وانەکانیان دەووتەوە خوێندنەوەی ئینجیلیان قەدەغە کردبوو.

بەو کتێبە یاساغەوە لە ژێر زەمینی خانۆچکەیەکی لە تەختە دروستکراو، کە وەك تەویلە بۆ ڕاگرتنی بەراز و ئاژەڵەکان تەرخانکرابوو خۆی حەشاردەدا. تیشکی ڕۆژ لە درزی نێوان تەختەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، هەر لەو کونانەوە ئەو منداڵە چکۆلەیە دەیڕوانیە، خانووەکانی دەوروبەری گوندەکە، دەیڕوانیە چیایەکی بچوك بە ئاسۆدا هەڵکشابوو کە چەند درەختێك بە قەدپاڵیەوە بوون، لە دامێنیدا کێڵگەیەك ئەسپێکی شەهیدی لێ ڕاکشابوو، ئەسپێك تەنها یەك چاوی دیار بوو. ئاوێتەبوونی تەواوی ئەو منداڵە لە ساتەوەختێکی وەهادا لە نێو خوێندنەوەدا، خەسڵەتێکی هەنووکەیی بە چیرۆکەکانی نێو ئینجیل دەبەخشی. ئیدی خوێندنەوەی بۆ ئینجیل بەرە بەرە دەگۆڕێ و دەبێ بە ئەفسانەیەکی کەسێتی و تایبەت بە خۆی.

سەرسام و ئەفسون، لە درزی تەختەکانەوە سەیری ئەو شتانەی دەکرد کە لە دەرەوە ڕوویاندەدا. مەسیح وەکو مرۆڤێکی تەحەداکەر دەردەکەوت، مرۆڤێکی بوێر کە نەدەترسا درۆنەکات. پاڵەوانێکی مرۆیی، لەلایەن گشت ئەوانەی ئازاریان دەچەشت، لە وڵاتێکی وەکو پۆڵۆنیای کاولکراو بە جەنگ، چاوەڕوانی هاتنی دەکرا. دەبوو بە هاوڕێی چەوساوەکان و ئەو ئەسپە شەهیدە. لە چاوانی منالیەوە، کرۆتۆفسکی لە بالای ئەو چیایەی بە ئاسۆوە هەڵکشابوو وێنەی مۆنت گۆلگۆتای دەبینی

(*mont golgotha*، ئەو بەرزاییە، ئەو جێگایەی سەرەتا مەسیحی تیا لەخاچدرا. و)

لە یەکەم لاپەڕەی کتێبی (ژیانم لە نێو هونەردا)، کتێبی بیوگرافی ستانسلافسکی، ئەو شتانەی وەکو میراتی و بۆماوە کاریگەریان بەسەریەوە هەبووە دەیانهێنێتەوە یاد. واتە (جیالۆجی) یان واتە ڕەچەڵەکی باوو باپیرانی لە هونەردا، ئەوانەی ئیلهام بەخشی بوون و، ئەوانەی هەرگیز تەواو بە ئامانجەکانیان نەگەیشتوون و مێژووی باوباپیرانی ڕەنگدەکەن. ستانسلافسکی دەڵێ: "خوێنی ئەوان بەنێو دەمارەکانمدا دێن و دەچن" ئەو پەیوەندیە ڕەگەزئامێزانە ڕابووردووی دێننەوە یاد و بە درێژایی هەموو (ژیانی لە نێو هونەردا) ڕێنومایی دەکەن.



(مێژووی باوباپیرانم لەیادناکەم، ئەوانەی بە درێژایی سەدەکان لەسەر خاکێك ژیاون کە هەموو هێزێکی لە خۆکۆکردبوێوە. بەڵام ئەوان پڕاوپڕ ژیانی خۆیان نەژیاندووە، لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە بەهرە سروشتیەکانیان بخەنە بەر ئەزموون و تاقیکردنەوەوە). بیرو هەستێکی لێبڕاوانەی سروشتی و زگماکی، کە بە توانا و لێهاتوییەکی ناوازەوە نەخشێنرابوو، بۆ گەڕان و توێژینەوە هەمیشە لە پەرەسەندندا بوو. بەو مانایەی سووربوون و سازش نەکردن لەسەر بیرۆکەکانی، وەك ئەکتەر بەردەوام تای تەرازووی (بێمتمانەیی) لەلا پارسەنگ دەکردەوە. ژیانی هونەری ئەو، بە ململانێ و تێکۆشان بەرامبەر (ترس و دڵەڕاوکێ- وەك ئەکتەر. و) بە جەنگێکی بێوچان دەستنیشان دەکرێ و لە پێناوی گۆڕینی (جەستەی تەختە) (گوزارشتێکە کرۆتۆفسکی لە نێو باسەکەیدا بەکاری دێنێ) بۆ ئامرازێکی پڕ جوڵە و فرە بەدیقەت. لە ژیاننامەکەیدا ستانسلافسکی تێبینی ئەوە دەکات کە لە ساتەوەختەکانی گواستنەوەی نێوان دوو قۆناغ و دوو سەردەمدا ژیاوە. لەو کاتەدا چەندین سەرچاوەی ماددی دەوڵەمەند کۆببونەوە، ئەنتیلیجەنسیای بۆرژوا کە تازە خۆی پێکهێنابوو، ئارەزوی دەکرد بەشداری مافی ئەو کلتورە بکات، کە بە تەنها لە چوارچێوەی کۆشکی قەیسەردا قۆرغکرابوو. ستانسلافسکی سەر بەو نەوە نوێیەی بیرمەندان بوو، کە گەواهی گۆڕانکاریەکانی ئیمپراتۆریەتی روسیا بوون، کە لە قۆناغی دەرەبەگایەتیەوە دەچوو بەرەو وڵاتێکی مۆدێرنی پڕ هەڵپە. گەشەکردنێکی پیشەسازی، کە لەوەوپێش وێنەی نەبوو، دەبێتە هۆی گۆڕانێکی ڕادیکاڵی شێوازی ژیانی ئەو خەڵکەی بۆ چەندین سەدە بەسەریان بردبوو. بەو جۆرە بنچینەی کۆمەڵگای تەقلیدی رووسیا هەڵدەتەکێ و سەرکەوتن بۆ ئەو پێشەوە چوونە کە وەك بنەمایەکی سەرەکی بۆ ئایدۆلۆجی سۆڤیەت، مسۆگەر دەکات. ستانسلافسکی لە یادەوەریەکانیدا باس لە ڕووداوی دروستبوونی هۆکارە نوێکانی گواستنەوە دەکات، وەکو (شەمەندەفەر و پاپۆر و فرۆکە) هەروەها هۆکارەکانی پەیوەندی بەستن، وەکو (رادیوو تەلەفۆن و تەلگراف) و باس لە پیشەسازی و وێرانکاریەکانی تۆپ و جبەخانە قورسەکانی

جەنگی یەکەمی جیهانی دەکات. هەروەها دەرکەوتنی سیستەمی روناکی ئەلەکتریك لەسەر شانۆ کە بانگەواز بۆ مۆدێرنەکردنی هونەرێکی سادە و لە مێژینە دەکات.

لە تەمەنی چوار ساڵیدا ستانسلافسکی بەشداری شانۆگەریەکی ئەماتۆر دەکات کە لەلایەن خێزانەکەیەوە ئامادەکرابوو. داوای لێدەکرێ (وەها پێشان بدات یان وەکو ئەوە بکات) کە چڵێك دار بخاتە نێو ئاگردانێکەوە کە لە ڕێگای مۆمەوە ئامادەکرابوو. ستانسلافسکی هەر لەو کاتەوە ڕقیدەبۆوە لە بیرۆکەی (فێڵکردن) لەسەر تەختەی شانۆ. هەر لەبەر ئەو هۆیە ئەو دەرفەتە دەقۆزێتەوەو کردارێکی فیزیکی ڕاستەقینەی تیا ئەنجامدەداو بەڕاستی دارەکە دەخاتە نێو ئاگرەکەوەو بەو جۆرە ئاگر لە هەموو شانۆ بەردەدا و کاریگەریەکی وەها بەسەر بینەرانەوە بەرپا دەکات، کە بێگومان ئارتۆ خەونی پێوە بینیوە. مەیلێکی پێشوەختی لەو جۆرە و، گرنگیدان بە پەرچەکرداری هەڵچونئامێزی سروشتیانە، شوێن پەنجەی بەهایەکی ڕەمزی پێوە دیارە. کاتێکیش بڕیارە جێگیرەکانی دەناسین، کە لە نێو کاری لێکۆڵینەوەکانیدا سەلماندونی، دەبینین ئامانجی ئەو توێژینەوانە بریتیبووە لە دامەزراندنی پرۆگرامێکی بەسیستەمکراو، بۆ ئامادەکردنی ئەکتەر، کە گەرەنتی نواندنێك بکات شێوازەکەی ڕاستەقینە و زیندوو بێت.

ئاگربەردان لە شانۆ، بە واتا مەجازیەکەی و بە شێوازە کۆنکرێتیەکەی، دەبێتە ئامانجی تەواوی کاری ئەکتەر لەلای کرۆتۆفسکی.

دیدو بۆچوونەکانی کرۆتۆفسکی، زۆرجار لەلایەن ڕەخنەگران و تیوریستەکانەوە بە دید و بۆچوونەکانی ئارتۆ بەراورد دەکرێن. کرۆتۆفسکی بۆ خۆیشی ئاماژە بە بیر و هزری ئارتۆ دەدات لە کتێبەکەیدا (بەرەو شانۆیەکی هەژار)، ئەوەش لە میانەی ئەو سەردێڕەوەی کە دەڵێ (ئارتۆ تەواو خودی خۆی نەبووە). هەر لەوێدا ئاماژە دەدات بە میتافۆرە بەناوبانگەکەی ئارتۆ کە دەڵێ (ئازارچەشتووەکان لە کاتی سوتاندنیان لەسەر ئاگردانەکان کۆمەڵێ جووڵەو ئاماژە دەردەبڕن). هەروەها پێشنیار دەکات و دەڵێ ئەوەی دەبێ لەلای ئارتۆ سەرنجمان ڕاکێشێ گەڕانەوەیە بۆ ئەو بنەمایانەی شانۆ (تێڕامانئامێزەکەی) لەسەر بنیاتناوە. واتە دەتوانین بڵێین، (ئەوەی ئەکتەر بە ئاکامی دەگەیەنێ، دەبێ کردارێکی گشتگیر بێ، ***action total***، ئەوەی دەیکات دەبێ بە تێکڕای بوونی خۆیەوە جێبەجێی بکات). هەروەها کرۆتۆفسکی دەڵێ: لە ناو جەرگەی پەیامەکەی ئارتۆدا، (خۆرسکی و دیسپلین) لە نێویەکدا کاردەکەن و پێکەوە خۆگرێدەدەن. بوونی ئەو دوو بنەما هاودژە لەتەك یەکدا، دەبێتە هۆکاری لەدایکبوونی کرداری گشتگیر.

ئارتۆ شانۆ دەشوبهێنێ بە (ئەلشیمی – کیمیای کۆن)، لەبەرئەوەی، بەڕای ئەو، ئەلشیمی هاوشێوەیەکی ڕۆحئامێزی کردار و ڕووداوێکە کە هیچ بایەخ و کاریگەریەکی نابێ، تەنها لەسەر ئاستی مادده ڕاستەقینەکان نەبێ، کردارێك تا ئەوپەڕی ڕادە دەبێ بێ هیچ کەموکوڕیەك بێ. هەروەکو لە پرۆسەی کردەی گەشەکردن لە نێو ئەلشیمیدا، شانۆ هاوشێوەیەك بووە بۆ (واقیعێکی دیکەی خەتەرناك).

شانۆ دەبێ گشت ئەو ململانێیانەی لە ئەنجامی بەریەککەوتنی ئەو دوو هێزە

سەرەکیەی مادده و هزر، بیرۆکە و فۆرم، کۆنکرێت و ئەبستراکتەوە لەدایك دەبن، چارەسەر بکات. یاخود بیانسڕێتەوە و لە نێویان بەرێت و گشت دیاردەکانیان لە نێو گوزارشتێکی یەکگرتودا بتوێنێتەوە، کە هاوچەشنی (ئاڵتونێکی ڕوحئامێز کراو بێت).

بەپێی کرۆتۆفسکی ئەو ئەلشیمیە پابەندە بە گۆڕانکاریەك لەلای ئەو ئەکتەرەی کە لەسەر بنچینەی پرۆسەیەکی گەشەکردنی ئۆرگانیکانە کار دەکات. هەروەها دەڵێ: سیحری شانۆ لە نێو گۆڕانکاریەك چڕ دەبێتەوە، هەروەك ئەوەی لە پرۆسەیەکی لەدایکبووندا ڕوودەدات). کەواتە کاری ئەکتەر ئەوەیە کە بتوانێ یەکەیەکی زیندوو جەوهەری بنیاتبنێ، لە نێوان جەستە و هزردا. لە دەرئەنجامدا دەڵێ: (ئەوەتا لە کۆتاییدا، ئێمە باس لە نەتوانینی جیاکردنەوەی هزر و جەستە یان ڕۆح و جەستە دەکەین).



لە ڕێڕەوی سیمینارەکانیدا، کرۆتۆفسکی پێشنیاز دەکات کە، دوا ئاماژە و جووڵەی (ئازار چەشتووەکان–ی ئارتۆ) دەتوانرێ وەکو ترۆپکی کردارێکی ڕاستەقینە تەماشا بکرێ و تەنانەت ویستی گوزارشتکردن تێدەپەڕێنێ). بەو شێوەیە بەلای کرۆتۆفسکیەوە، ئەوانە کۆمەڵێ جوڵە و ئاماژەن کە پێشتر پێشبینیان بۆ نەکراوە، بەڵام وەك کۆمەڵێ جوڵەی میرات و بۆ ماوە، تواناگەلێکی لە ڕادەبەدەر دەگرنە خۆو پێشکەشی دەکەن.

ڕێژیسۆری پۆلۆنی تێبینی دەکات کە ئارتۆ بەردەوام لە یاخیبووندا بووە دژی خودی ئەو کلتورە فەرەنسیەی کە لە ڕادەبەدەر عەقڵانی بووە. بەو شێوەیە ئارتۆ کاریگەری عەقڵێکی وتار ئامێز کە لە ڕێگای زمانی ئاخاوتن یان ماشێنی بیرکردنەوە هەوڵدەدا گوزارشت لە نهێنی و پەرجوەکانی بوون ژیان بکات، دەخاتە ژێر پرسیار و گومانەوە. هەروەها کرۆتۆفسکی وێنەیەکی وروژاند کە تێدا ئارتۆ فۆرمێکی دیکە لە تێگەیشتن وەردەگرێ، (فۆرمێکی تێگەیشتن کە لە ڕێگای پێستەوە گوزەر دەکات)، تێگەیشتنێکی فطری و جەوهەری کە لە منداڵیەوە لێی بەئاگاین.

لە نێوان ساڵانی هەشت تا دوانزەی تەمەنیدا، کرۆتۆفسکی کتێبێك دەخوێنێتەوە بە ناونیشانی، (گەشتێك بەنێو نهێنیەکانی هیندستان)، کە لە نووسینی ***paul brunton*** و لە سییەکاندا نووسراوەو ئەو کتێبە بە ووردی سەرگوزشتەی نووسەر دەگێڕێتەوە، کە چۆن گەڕاوە بەدوای ئەو تاك و کەسایەتیانەی خاوەن ژیریەکی باڵا بوون. ئەو کتێبە لەلایەن دایکیەوە

پێشکەشی کرابوو. سەرباری مەترسی ڕێگا، دایکی توانیبووی بیست کیلۆمەتر بەپێ ڕێبکات، بۆئەوەی نوسخەیەك لەو کتێبە بەدەست بهێنێ کە دوای بۆردومانەکان بەجێمابوون. برانتۆن چیرۆکی ژیانی مرۆڤێکی هۆنیوەتەوە کە لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا ڕووداوێکی سەیری ئەزموون کردووە. ئەو مرۆڤە هەستدەکات، جەستەئاسا ئاوێتەی مەرگ بووە. لەو کاتەدا، کە لەسەر پشت ڕاکشاوە وەك ئەوەی جەستەی لاشەیەك بێ و هیچیتر. بیردەکاتەوەو دەڵێ: من مردووم، بەڵام هەر لەو کاتەدا لە خۆی دەپرسێ ئەی ئەو (منە) لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ؟ ئیدی لەو ساتەدا هەستدەکات کە ئەو نشتەجێی نێو جەستەی خۆی نیە. دوای ئەو ئەزمونە سەختە، واز لە خوێندن دەهێنێ و، خێزانەکەی بەجێدەهێڵێ سەری خۆی هەڵدەگرێ و دووردەکەوێتەوەو، بۆ ماوەی پانزە ساڵ دەچێتە خەڵوەتێکی کپ و بێدەنگ و بێجووڵە، لە دامێنی چیایەك لە باشووری هیندستان کە بە چیایەکی پیرۆز دادەنرا. خەڵکەکە لە فزولی و هەروەها ئارەزویان بۆ زانینی هەندێ نهێنی، بەرەبەرە لەو سۆفیە نزیکدەبوونەوە. ڕۆژئاواییەکان بە نیازی ئەوەی تێبگەن، دەهاتن و پرسیاریان لێدەکرد. ئەو مرۆڤە بەردەوام ئاوێتەی نێو پرۆسەی کردارێکی ناوەکیانە بوو، کە لەسەر بنەمای نەجووڵانەوە دامەزرابوو، کردارێك، هەرکەسێك بەلایدا تێپەڕبووایە، بە ئاسانی دەکەوتە ژێر پەتای کاریگەریەوە. هەروەها سەرنجی ئامادەیی ئەو ئاژەڵە کێوی و ماڵیانەی بۆ لای خۆی کێش دەکرد و، لە دەوری خۆی کۆی دەکردنەوە. لەو نێوانەدا پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ (مانگایەك) دروستکردبوو. ئەو ئاژەڵە پیرۆزە پێدەچوو لە نزیکەوە هاوبەشی ئەو پرۆسەیە بکات. هەندێ لە خەڵکی ئەو دەوروبەرە ئیتر باوەڕیان وەها بوو کە بەرامبەر کەسێکی پیرۆز دەژین. هەندێ خەڵکی تر بە شێتیان دادەنا.

دیاردەیەکی ئاینی لە شێوازی پەرستن و سوجدە بردن، دەستیکرد بە بنیاتنان بە دەوری ئەو مرۆڤەی کە بە ڕامانا — *Ramana* ناویاندەبرد. لەگەڵ هەموو ئەمانە، ئەو قایلنەبوو بەو شێوە پیرۆزکردنە و گوێی نەدەدانێ.

وەکو پێشتر، چۆن چیرۆکەکانی ئینجیل کاریگەریان هەبوو بەسەریەوە، ئەو چیرۆکەش کاریگەریەکی بەهێز بەسەر کرۆتۆفسکی لاو جێدەهێڵێ، هەر بۆیە لەو کاتەدا، تووشی گەرمەتایەکی سەخت دەبێ و نەخۆش و لەجێدەکەوێت. ئەو ئەزموونە لە دونیای منداڵیدا ڕیشەدادەکوتێ و دەبێتە سەرەتای گەشتێکی ناوەکی بۆ گەڕان بە دوای توانستە تازەکان. گەشتێك لە تەك هۆکارە پراکتیکیەکانیدا بەرەو ئەوەی دەبات کە (مرۆڤ بتوانێ لەگەڵ خودی خۆیدا ئەنجامی بدات)، بە لەبەرچاوگرتنی ڕادەی تواناکانی و، تەنیایی و پێویستی ئەو بۆ هاودەمیکردنی کەسانی تر.

### بەرەو ئەزمونی ئاگایی
### *Vers L Experience Consciente*

هەرچەندە وەکو دوو کەس، یەك لەویتر زۆر جیاواز و لە دوو سەردەمی جیاواز و دوو ڕەوشی جودادا ژیاون، بەڵام ستانسلافسکی و کرۆتۆفسکی شتێکی بە واتا و قووڵ کۆیاندەکاتەوە. ئەویش باوەڕ و سوربونیان بووە لەسەر بیر و کارەکانیان، کە بێوچان

ئاراستەکەر و ڕێپیشاندەریان بووە لە کەشف و داهێنان و دۆزینەوەکانیان دەربارەی بوونی مرۆیی. ئەو کەشف و داهێنانەی هانیداونەتەوە هۆکارە کۆنکرێتیەکان بدۆزنەوە، ئەو هۆکارانەی دەتوانرێ لە ڕێگایانەوە، وەك کرۆتۆفسکی دەڵێ (باڵبگرێ و بەرزببێتەوە) بەرزبوونەوەیەك لە پاش خۆیەوە هەموو ئەو شتانە بەجێدەهێڵێ کە بە توندی مرۆڤ ڕاپێچی نێو تورەهاتەکانی ژیانی ڕۆژانە دەکەن. هەروەها شانۆ پانتاییەکی خستۆتە بەردەم ئەو دوو کەسە، بۆ توێژینەوەیەکی قووڵ و بەردەوامو پراکتیك، دەربارەی توانستە مرۆییەکان و، لێکۆڵینەوە گرنگەکانیان دەربارەی پرۆسەی کاری ئەکتەر، کە لەسەر توانای ڕووبەڕووبوونەوەیان، لە بەرامبەر بواری پێرفۆرمانس دامەزراوە، بوارێك وەك شوێنێکی لەبارو شایستە بۆ ئەزموونە مرۆییەکان، ئەو شوێنەی چەندین قەوارەی جەوهەری مرۆڤ لە تواناياندايە ئازادانە خۆيان پێشانبدەن.

ئەزموونی ئاگاییانەی ئەکتەر گوزارشتێکە کە مارتا کورتن *martin Kurten* لە بەرامبەر وشەی ڕووسی *perezivanie* دایناوە. ئەم وشەیە کۆنسێپتێکی گرنگە و بە بەردەوامی لە نێو نووسینەکانی ستانسلافسکی دووپاتدەبێتەوە. لە کاتێکدا کە باس لە دید و بۆچوونەکانی دەکات دەربارەی پرۆسەی گەشەکردنی کاری ئەکتەر.

لە وتارەکەیدا، بە ناونیشانی، زانستی وشەسازی لای ستانسلافسکی، کورتن تێبینی دەکات کە لە نێو زمانە سکەندنافیەکاندا، ئەو وشەیە بەهاوتای گوێگرتنێکی سۆزئامێز، وریا ئامێز، تەرجەمە کراوە. کەچی لە تەرجەمە ئینگلیزیەکەیدا، لەلای *Elizabeth Reynolds hapgood* وشەکە *perezivanie* دەبێت بە *feeling* واتا هەستکردن و گرێدراوی سۆزەکان دەبێ. هەر بە هەمان شێوە وشەی *feeling* لەلایەن هاپگۆدەوە بەکارهاتووە لە بەرامبەر تەرجەمەی وشەی *custrovat*ی ڕووسی، کە مانا و مەبەستەکەی، جێگۆڕکێ دەکات لە نێوان (هەستکردن) و (درککردن) و (تێبینیکردن) و (بەئاگاهاتن لە) و (بینین) بە مانای تێگەیشتن. لە دەرئەنجامدا دەبینین کە ووردی و دیقەتی کۆنسێپتەکانی نێو لێکۆڵینەوەکانی ستانسلافسکی، بەشێکیان ووندەبن و بەو پێیەش ئەو مانا و مەبەستانەی ڕوونیکردوونەوە، دەربارەی (ئاگاییەکی ئەکتیف و وریا ئامێز) پەردەیەکی لێڵ و تاریکی بەسەردەدرێ، ئەو کۆنسێپتانەی، دەتوانرێ بە بەردی بناغەی لێکۆڵینەوەکانی کرۆتۆفسکی دابنرێ.



پرۆسەی پێرفۆرمانس، لەلای ڕێژیسۆری پۆڵۆنی، لە هەمان کاتدا دەخوازێ (پاسیف بێن لە کردار و ئەکتیف بێن لە تێڕوانیندا). واتە بە (پێچەوانەی ڕەوشی ئاساییەوە) ئەمەش ئەو مانایە دەگەیەنێ کە ئامادەگی و درککردن، لە پەیوەندیەکی پێکەوە گرێدراودان. لە ناواخنی ئەو دوو ئەرکەی کە پێرفۆرمانس کردن ئەنجامدەدەن، پاسیف واتای (ئامادەیی

وەرگـرتن، کراوەیـی – *Receptif*) دەگەیـەنێت و ئـــەکتیفیش واتـــە (ئامـــادەگی – حـــضور – *present*)ە.

لەو تێکستەیدا، کە لـە ژێر ناوی (مـن – من *je- je*)وەیـە، کرۆتۆفـسکی دەگەڕێتــەوە بـۆ میتـــافۆرێکی کـــۆن و ئامـــاژە دەکـــات بـــۆ کاریگـــەری و کاردانـــەوەی هاوبەشـــی نێـــوان کرداری وەرگرتن و ئامادەگی ئەکتیف.

(ئێمـــە دوانـــیین. وەك، تـــەیرێك کـــە دان دەچنێتەوە و، تەماشا دەکات.

یـــــەکێکیان دەمـــــرێ و ئـــــەویتر دەژی. هەستبکەیت لەلایەن بەشەکەی دیکەی خۆتـەوە تەماشـا دەکرێــت، ئــەوی شــتێکی ناوازەیــە، قەوارەیـەکی دیکـە دەدات بـە دەسـتەوە. (مـن – مـن)ێك هەیـە، کـە مـنی دووەم بـە زینـدە ئـامێز دەشـوبهێنێ، وەکـو تەماشـاکردنێکی وەسـتاو وایە، ئامادەگیەکی بێدەنگە، وەك خۆر وایـە کە شتەکان ڕۆشندەکاتەوە. پرۆسەی گەشەی هەر یەکـەیان دەتـوانرێ بـەئاکام بگـات، بـە تـەنها لـە چوارچـێوەی ئـەو ئامادەگیـە وەسـتاوە. (مـن – من) لە نێو ئەزمونی دوو کەسدا وەك دوو شتی جودا سەیر ناکرێ، بەڵکو وەکو یەکەیـەکی پڕاو پڕی یەکگرتووە. (من – من) ئەوە ناگەیـەنێ کە بـــبین بـــە دوو کەرتـــەوە، بـــەڵکو بـــبین بـــە هاوشـــێوەیەك (قـــرین، *Double*) هـــەبوونی پێویستیەك بە پێرفۆرمانس، بە کەسێك پڕاوپڕ بە ئاگابێ لە بەرامبەر (ئامادەگی)، لە بەرامبەر (مـــنی دووەم)، پـــێش هـــەموو شـــتێك لـــە ویستێکەوە سەرچاوە دەگـرێ کـە دەخـوازێ لـە دەرەوەی زەمەندا بە زیندوویی بمێنێتەوە.

بە تێڕوانینی کرۆتۆفسکی وشەی *awarens* واتـای ئـەو ئاگاییـە ناگرێتـەوە کـە پەیوەنـدە بـە زمانی ئاخاوتنەوە، (بە ماشێنی بیرکردنـەوەوە)، بـــەڵکو گرێـــدراوی کـــردەی (ئامادەگییـــە – *presence*) چـــەمکی ئاگـــایی – *conscience* دەتـوانێ، یەکێتیـەك لـە نێـوان درکپێکردنـی هەسـتئامێز و، ئامـادەگیی وەك دیاردەیـەك لـە ناوجەرگـەی کـردەی پێرفۆرمـانس، پێکبهـێنێ، ئـەم کـارەش هـەروەك *richaed schechner* ئامـاژەی بـۆ دەکـات و بـە خـاڵی دەسـپێك دایدەنێ و وەك دەروازەیەك و وەك پانتاییەك، کە لـە هـەمان کاتـدا پانتایـەکان لێکجیادەکاتـەوەو پێکـەوەیان دەبەسـتێتەوە، ئـەو شـتەی گـرنگ و سەرەکیە لە نابـەینی ئـەو دوو لایەنـە وابەسـتەی هەڵچون و تەوژمەکان و دیاردە و سات و هەستە نادیارەکـان و و تێپـەڕەکانی ژیـانی مرۆیـە، وەك ئاگاییەك لە بەرامبەر خۆی.

کاتێـك ئـەو پرۆسـەی پێرفۆرمانکردنـە تـا دواتواناکان دەخرێتە کار پێدەچێ بتوانێ بگـات بـە ئاسـتی بەگەڕخـستنەوەو تەئکیـدکردن لـە ئاگاییمـان لـە بەرامبـەر قەوارەکـەی دیکـەمان، بە کـــورتی، ســـاتەوەختە بەسەرچـــووەکانی ئەبەدییـەت، کـە بـەهۆی ئـەو هەوڵانـەوەی دراون بـــۆ تێگەیـــشتنی پرۆســـەکە لـــەنێوبراون، کەشفکردن دەبێ جارێکی دیکە و سەرلەنوێ لە ڕێگای تەمومژی تاریکی و فەوزاوە بقۆزرێتەوە.

کەواتـە دەبیـنین کـە کرۆتۆفـسکی کۆمـەڵێ دەستەواژەی تایبـەت بـە خـۆی (تێرمینۆلـۆجی)، چ لـە زمـانی فەرەنسی و چ لـە زمـانی ئینگلیـزی داڕشتووە. تـەواو هـەروەکو ستانسلافسکی کـە دەســــــتەواژەکانی زۆر بـــــە زەحمـــــەت و بەهەســـــتیاریەوە دەتـــــوانرێ ماناکانیـــــان لێکجیابکرێنـــەوە. ئـــەو دەســـتەواژانە بـــە شـێوەیەکی زۆر تایبەتمەندانـە لـە نێـو بـاس و لێکۆڵینەوەکانیدا بـەکار براون، هەربۆیـە کاتێك لـــە دەرەوەی چـــێوەو مەبەســـتی خۆیـــان

بەکاردەهێنرێن کار ناکەن و مەبەست ناپێکن. دەرئەنجام تێگەیشتنی ئەو دەستەواژانە پەیوەستن بە ئەزمونێکی پراکتیکییەوە کە ئەوانەی هێناوەتە کایەوە. هەروەها کرۆتۆفسکی تێبینی دەکات کە ڕونکردنەوەیەك بۆ نمونە لەسەر بەکارهێنانی وشەی هەست ***sentiment*** و هەستیاری ***sensation*** دەکرێ تێنەگەیشتنێك و ئاڵۆزیەك دروستبکات، وەك لە حاڵەتی چەمکی (ئەزمونی ئاگاییانە)ی ستانسلافسکی کە ***Kurten*** ئاماژەی پێداوە.

(زۆر شتی بچوك هەن کە بە ڕواڵەت تیورین بەلأم لە ڕاستیدا زۆر بنەڕەتی و پراکتیکین. بۆ نموونە جیاوازی نێوان مانای هەست و هەستیاری ***sensing/ feeling***.

کە شتێکی زۆر بنەڕەتیە و لە هەمان کاتدا زۆر ئەستەمە بۆ هاوچەرخەکانمان تێبگەن و بەشێوەیەکی ڕاست وەریبگرن).

(ئەزموونی ئاگایی) ئەکتەر، کەواتە لەسەر تواناکانی ئەو دامەزراوە کە بتوانێ لە کارەکەیدا ئەو شتانەی کە لە ژیاندا دابەشبوون یەکیانبگرێتەوە، وەك ماددی نامادی، ڕۆح و جەستە، مەرگ و خواوەند، ئەبەدیەت و ڕەها.

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی زۆری حەزو ویستە تایبەتی و کەسێتیەکانی بە درێژی تەمەنی نهێنی و شاراوەبوون بەلأم خوێندنەوەی نوسینەکانی چەندین ئاماژەی ئاشکرائامێز پێشاندەدەن کە توانیویانە لە ژێر سانسۆری سۆفیەتی دەربازبن. بۆ نمونە ستانسلافسکی گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە دەیوت پێویستە بگەین بەوەی کە خۆی پێی دەوت (ڕیالیزمی ڕۆحی). ئەو دەمەی کە ئارەزوو دەکرا ئەو دەقانە بخرێنە سەر شانۆ کە بە تایبەتی دەرئەنجامی بزوتنەوەی سەمبۆلیزم بوون. لە ساڵی 1904 ستانسلافسکی داوا لە مایەرهۆڵد دەکات کە ئەو توێژینەوانەی لەسەر ئامادەکردنی فۆرمی نا-ڕیالیزمن، لە شانۆی هونەری مۆسکۆ بخاتەبەر کارکردن و بباتەبەڕێوە. بەلأم ساڵێك دواتر ئەو ستۆدیۆیەی کە دەکەوتە شەقامی پۆڤارسکایەوە، بە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە، دەرگاکانی داخران. بەلأم ئەنجامەکانی ئەو ئەزموونە توانیان ئەو بڕوایە لەلای ستانسلافسکی دروستبکەن، کە بەهرەو لێهاتوویی مایەرهۆڵد لە بواری ڕێژیسۆریدا بێوێنەن و هاوشێوەیان نییە، مەگەر لە نێو نەوەکانی داهاتوودا، لە نێو نەوەیەکی تازەی ئەکتەراندا نەبێ، لەو سەردەمەدا ئامادەکردنێك بۆ ئەکتەر لە ئارادا نەبوو بتوانێ ئەکتەر، لە چەشنی (ئەکتەر - خوڵقێنەر) بەرهەمبهێنێ.

لە ساڵی 1908 هاوکاری نێوان ستانسلافسکی و گۆردن گریك لە پرۆژەی بەرهەمهێنانی هاملێتدا ئەوە دەسەلمێنێ کە بەڕێوەبەری شانۆی مۆسکۆ هەمیشە لە هەوڵی چاکسازیدا بووە سەبارەت بە بابەتی سنوری تواناکانی سیستەمەکەی. هەمیشە ئامادەبووە بواری توێژینەوەکانی بەرفراوانتر بکات، بەو مەبەستەی هەنگاوبنێ بەرەو توێژینەوەو کەشفکردن سەبارەت بە دیاردە و ڕواڵەتە ناعەقڵأنیەکان و بێئاگاییەکانی ژیانی مرۆڤ. ئەو دەیوت:

(کاتی ئەوە هاتووە ئەوەی (نا- واقعیە ***ireele***) بخرێتە سەر شانۆ. مەبەست ئەو ژیانە نیە وەك خۆی چۆنە بەو شێوەیە بێ، یان وەك ئەوەی چۆن بە ڕاستی گوزەر دەکات، کە شانۆ دەبێ بینەخشێنێ. بەڵکو ئەو ژیانەی کە بە شێوەیەکی لێڵ ئاوێزانی حەدەس و

زیندەخەونەکانمانن، ئاویزانی ڕامان و هەڵچونەکانمانن).

لە (ژیانم لە نێو هونەردا) ئەو ستایشە پڕ میهرانەی ستانسلافسکی دەیانکات لە بەرامبەر لیوپۆڵد سولەرجیتسکی، کە یەکێك بوو لە هاوکارە هەرە نزیکەکانی، سەر لە نوێ لە سروشتی ویست و خۆزگەکانی ڕێجیسۆری روسی ئاگادارمان دەکەنەوە. لەگەڵ ئەو داهێنەرە بوێرەی بواری توانا خوڵقێنەرە مرۆیەکان ستانسلافسکی دید و تێڕوانینەکانی خۆی لەسەر (ڕێسا ڕۆحیەکانی ئەکتەران) بەشدەکات. بەو شێوەیە پێکەوە پرۆژەیەك دادەمەزرێنن بۆئەوەی کۆمەڵێ لە ئەکتەرە لاوەکان ببەن بۆ دەرەوەی شار، بۆ لادێ، تا لەوێ بتوانن زیاتر تەرکیز لەسەر هونەرەکەیان بکەن و بەشێوەیەکی قووڵ و بە پەرۆشیەوە بیروباوەڕە (بیرۆکە) هونەریەکانیان بخەنە کار. ئەو دید و تێڕوانینە دەربارەی کاری شانۆیی دەتوانێ ببێ بە میتافۆرێك بۆ ئەو (ژیانەی لە نێو هونەردایە) کە خودی ژیان و بوونی ستانسلافسکی بووە.

فاختانگۆف (کوڕی ڕوحی) ستانسلافسکی، کە هەمیشە لەگەڵ بیر و بۆچونەکانی ئەودا هاوبیر بوو. مارجۆری هۆڤەر سەبارەت بەو دەڵێت: (فاختانگۆڤ خەونی بە گروپێ ئەکتەرەوە دەبینی کە هاوشێوەی گروپێکی ئاینی بن، ئەوانەی لە دەقێکدا ڕۆڵە جیاوازەکان دەگێڕن دەبێ تەواو بێ درۆ و دەلەسە، دڵ و دەرونی خۆیان بۆ یەکتر والاَ بکەن).

لێکچوونێکی سەرنجڕاکێش بەدیدەکرێ لە نێوان، ئەو (ئاواتەی) ستانسلافسکی هەیبوو بۆ خوڵقاندنی (ڕێسا روحیەکانی ئەکتەر) و، ئەو خەونەی فاختاگۆڤ و، ئەو ئیدیاڵەی کرۆتۆفسکی کە لە ساڵی 1970 دا لە کاتی کۆنفرانسەکەیدا لە فیستیفاڵی شانۆی لاتینۆ – ئەمریکا لە کۆڵۆمبیا گوزارشتی لێدەکرد.

(شانۆی تاقیگە بۆ من مانای چی دەگەیەنێ؟ لە سەرەتادا هەر شانۆیەکی سادە و ساکار بوو، بەڵام دواتر بوو بە تاقیگەیەك، ئێستاش جێگایەکە کە ئاواتەخوازم بتوانم لەوێدا تەواو ڕاستگۆبم لەگەڵ خۆم. ئەو شوێنەیە کە چاوەڕواندەکەم هەریەکێك لە هاوکارەکانم ڕاستگۆ و بەوەفابن لەگەڵ خودی خۆیان. ئەو شوێنەی کە کردارێك، شایەتیەك لەلایەن کەسێکەوە ئەنجامدەدرێ، دەبێ کۆنکرێت و جەستەئامێزبێ. شوێنێکی لەو جۆرە پێویستیەکی لەڕادەبەدەرە بۆ ئێمە. ئەگەر شانۆش نەبوایە دەمانتوانی هۆکارێکی دیکە بدۆزینەوە).

گەڕان و بەدواچوونە بەردەوامەکانی ستانسلافسکی لە بواری پرۆسەی ئەکتەری ڕەسەن، دەبنە سەرچاوەیەکی گەورەی ئیلهام بەخشین بۆ کرۆتۆفسکی. بەڵام ڕێژیسۆری پۆلۆنی زەمینەیەکی دیکە سەرنجی رادەکێشێ، بوارێك جیاواز لەو کارە ریالیستیانەی ئازیز و لەبەردڵان بوون لە شانۆی هونەری مۆسکۆ. ئەو گرنگی دەدا بەو جۆرە هەڵسوکەوتە مرۆییە یان ئاساییەی کە ساتەوەختە هەرە چڕەکانی ژیان دەستنیشاندەکات. لەبەرئەوەی بەڕای کرۆتۆفسکی، ئەو جووڵە و هەڵسوکەوتانە توانستی درکپێکردنێك و ئاگاییەك تیژتر لەوەی ئاساییە لەگەڵ خۆیان دەهێنن. ئەم کارە کرۆتۆفسکی دەبرد بەرەو کەشفکردنێکی قوڵتری ئەوەی کە ستانسلافسکی لەو باوەڕەدابوو بتوانێ نمایشبکرێ لە بواری ئەو ئەزموونە مرۆیانەی شیاوی ئاشکراکردن و

پێشاندانن لە ڕێگای ریالیزمی روحیەوە. واتە (ئەو ژیانەی کە بەشێوەیەکی لێڵ ئاوێزانی حەدەس و خەون و ئەندێشەکانمانن، ئاوێزانی هەڵچونەکانمانن).

لە کتێبەکەیدا (ڕووەو شانۆیەکی هەژار) ڕێژیسۆری پۆلۆنی ئاماژە دەدات بە جۆری ئەو جووڵە هەڵچوو ئامێزانەی پابەندی کارەکەین.

(لە ساتەوەختی شۆکێکی دەروونی، ترسێکی کوشندە، یان خۆشیەکی لە ڕادەبەدەر، مرۆۋ بە شێوەیەکی ئاسایی هەڵسوکەوت ناکات. مرۆۋ لەو کاتانەدا ئاماژە ریتمئامێزەکان بەکاردەهێنێ، دەستدەکات بە (سەما) کردن، بە گۆرانی وتن. ئاماژە ئۆرگانیەکان، نەك جووڵە گشتی و هاوبەشەکان، بۆ ئێمە بنەماگەلێکی گوزارشت ئامێزن و، هەوڵی پالاوتنێك دەدەین کە بنەما ئاسایی و رۆژانەییەکان دووربخەینەوە کە تەوژمی هەڵچوونە بێخەوشەکانی ناوەوە تەڵخ دەکەن).

لە ساڵی 1938دا کاتێك ستانسلافسکی بۆ چارەسەرکردن لە نەخۆشخانەیەکی مۆسکۆ دەبێت، ئەندامانی ستۆدیۆکەی بەردەوام سەردانی دەکەن و هەواڵ و دەنگ و باسی کارەکانیان پێڕادەگەیاند، ئەو کات تەنها سێ ساڵ تەمەنی لەبەردەم مابوو، ئەم پێشبینیەی لێدەگێڕنەوە.

(شەپۆلەکانی دەریای نەستمان لە کاتی پێویستدا دەمانگەنێ. تەنها لە نێو ساتە پڕ جۆش و خرۆشە چڕەکانی خولقاندا دەتوانن بگەنە لامان، بەلاَم ئەکتەری دوا رۆژ، بە زاڵبوونی بەسەر تەکنیکی هونەرەکەیدا، دەتوانێ بە ئازادیەوە خۆنوقمی نێو ئەو دەریایە بکات)

کاتێك ستانسلافسکی بە پێویستی دەزانی کە دەبێ ئەکتەر لە پەیوەندیەکی راستەوخۆدابێ لەگەڵ نەستدا، بەلاَم باوەڕیشی وا بوو، ئەو فۆرمانەی کە دەتوانن بەشێوەیەکی چاکتر نهێنیە هەرە قوڵەکان ناخی مرۆۋ گوزارشتبکەن، دەبێ لە نێو ریالیزمدا جێگیر بکرێن. بەلاَم جۆری ئەو ریالیزمەی کە لەوەودا دەگەڕایەوە سەری، راستیەکی یەکەمی ئەوە بوو کە ئامادەگیەکی زیندووی ئەکتەری لەسەر شانۆ لە خۆ دەگرت. واتە (پالاَوتنێك) ی پەرەسەندوی لە ستایلی نواندنی ریالیزمی دەگرتەوە. هەر ئەم کارەش شانۆی هونەری مۆسکۆی گەیاندە ترۆپك.

ئەو دەلاقە نوێیانەی ستانسلافسکی دەیکردنەوە لە ڕەوتی کار و داهێنانەکانی کە سروشتی دیاردە پێرفۆرمانسەکانیان لە خۆ دەگرت، بانگەوازی ئەوەیان دەکرد کە نەوەی نوێ ناوی (واقیعی پێرفۆرمانئامێز – *Realite performatif*) لێبنێن و دواتر دەبێتە بەردی بناغەی تیوری پێرفۆرمانسی مۆدێرن.

*Timothy wiles* لە کتێبەکەی کە بە ناوی *the theatre event* ئاماژە بەوە دەدات کە سروشتی حەدەسەکانی ستانسلافسکی، هەرچەندە سیمایەکی زۆر ڕون و ئاشکرایان نەبووە، لە دووتوێی نوسینەکانی، بەلاَم هەمیشە پێش توێژینەوەکانی داهاتوو کەوتوون. بەپێی ئەو حەدەسانە ئەکتەر (وەك ڕەگەزێکی سەرەکی لە کاری شانۆییدا) دیاریکراوە، لە کاتێکدا کە (هونەر وەك پرۆسەیەك لە گەشەکردندا، نەك وەك ئامانج) تەماشا کراوە.

وایڵز لە ئاکامدا دەڵێت: ستانسلافسکی یەکەم کەس بووە (بێئەوەی خۆی ئەو تایبەتمەندیە دیاری بکات) هەستی کردووە، کە

لە نێو ریالیزمی شانۆییدا ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی حەقیقیە – *reel*، بە هەمان ئەندازە لە نێو خودی واقعی پێرفۆرمانسدا نیشتەجێیە، نەك لە نێو کاریگەریەکانی واقیعێك کە لە ڕێگای وردەکاریەکانی دەقێکەوە لە ستایلی ریالیزمدا بەرهەمدەهێنرێنەوە.

لە ڕاستیدا حەدەسەکانی ستانسلافسکی ئەوە لە خۆ دەگرن کە شانۆ بریتیە لە فۆرمی هونەرێکی زیندوو پابەندی ئامادەگی مرۆییە، ئامادەگی ئەکتەر و بینەرە، دەرئەنجام مرۆڤ دەخاتە نێو بازنەی پەیوەندیەکانەوە. کەواتە یەکەم ئامانجی ئەکتەر و ڕێژیسۆر دەبێ خوڵقاندن و تەغزیەکردنی ژیان بێ لەسەر شانۆ. بەڵام ئەی چۆن دیاردەی (زیندوویی) پێرفۆرمانس دەتوانرێ پارێزگاری لێبکرێ، ئەگەر هەریەك لە وردەکارەکانی کارەکە لەلایەن ڕێژیسۆرەوە دیاریبکرێ و، بەوردیەوە لەلایەن ئەکتەرەوە دووبارە بکرێتەوەو، دڵسۆزانە ئێوارەو دوای ئێوارە بۆ بینەر دووبارە پێشکەش بکرێتەوە؟

ڕیشارد سچێچنەر لە کتێبەکەی کە بە ناوی (لە نێوان شانۆ و ئەنرۆپۆلۆجی) دایە، پێناسەیەك بۆ وشەی پێرفۆرمانس دەکات. (هەرگیز بۆ جاری یەکەم) یان هەروەها (دووجار ژیانراوە). بەپێی دابونەریتە شانۆییە ئەورووپی و ئەمەریکیەکان، نواندن بە واتای شوبهاندن یان تەنانەت مانای درۆکردنیش دەگرێتەوە. لەگەڵ ئەوەش ریشارد تێبینی دەکات کە ئامانجی سەرەکی گەورە ئامادەکارانی ئەکتەر، لە سەدەی بیستەمدا، لە ستانسلافسکیەوە تا دەگات بە کرۆتۆفسکی، بریتیبووە لەوەی نواندنی ئەکتەر زیاتر رەسەن (*autenthique*) بکرێ. کەواتە دەتوانین پرۆسەی پێرفۆرمانس، بەو شێوەیەی ستانسلافسکی تێڕوانیوە، بەو جۆرە پێناسە بکەین، هەمیشە بۆ جاری یەکەمو، نەك وەکو ئەوەش بۆ یەکەم جار بێت. لەبەرئەوەی لە نێو ئەو راڤەکردنەی کرۆتۆفسکی دەیکات لەسەر بۆچوونەکانی ستانسلافسکی دەڵێت، مەسەلەکە پەیوەندی بە هاندانی ئەکتەرەوە هەیە کە (بەڕاستی کردارێك بکات، ئێستا، لە زەمەنی ئێستادا).

مێتۆدی کرداره فیزیکیەکان کە لەلایەن ستانسلافسکیەوە داڕێژراوە لە لایەن کرۆتۆفسکیەوە قووڵکراوەتەوە، بە شێوەیەکی دروست ئەو هاودژیەی (پارادۆکسەی) پابەندی سروشتی شانۆیە (سروشتی کاری ئەکتەرە. وەرگێر) لەبەرچاو دەگرێ. ئەم کێشەیەش پێشتر لەلایەن دیدرۆ دەستنیشان کراوەو خراوەتە ڕوو، لە کتێبە بەناوبانگەکەی (پارادۆکسی ئەکتەر).

کارکردن لەسەر میتۆدی کرداره فیزیکیەکان، هەوڵدەدات بەشێوەیەکی بنەڕەتیی ڕێگا بۆ ئەکتەر خۆش بکات، ڕشتەیەکی جەستەیی و بەدیقەت *partition* پێکبهێنێ کە بتوانرێ بەرهەمبهێنرێتەوە، دووبارە بکرێتەوەو هەرجارێکیش ئەکتەر بتوانێ هەست و سۆزە هەڵچووە تازەکان و بیر و وێنە بانگەوازکراوەکان لە نێو جەستەیەوە بخوڵقێنێتەوەو، بە شێوەیەکیش کاریگەریان بەسەریەوە بنوێنن وەك ئەوەی پێشتر پێشبینیان بۆ نەکرابێ و تێڕوانینیان بۆ نەکرابێ. ئەگەر لەدەستدانی ڕواڵەتی (زیندوویی) لە پێرفۆرمانسدا هاوتای هەڵەیەکی تەکنیکی بێت، هەڵەیەکی لەو جۆرە، بەڕای کرۆتۆفسکی دەرئەنجامی ئەزمونی کارێکی

مەعنەوی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی نییە، لەبەرئەوەی "ژیان" تەنها ئیعتبارکردنێکی پراکتیکی بۆ دەکرێ کە پابەندی کاری شانۆییە. ئەگەر ژیان ئامادەیی نەبێت ئەوا کارەکە بە کارێکی مردوو دادەنرێت. واتە ئامانجی دەسپێك کە بریتیبووە لە خوڵقاندنی نمایشێکی (زیندوو) بەدەست نەهاتووە، واتە پێش هەموو شتێك ئەوە شکستێکی تەکنیکیە. لە درێژەی کۆنفرانسەکاندا کرۆتۆفسکی تەئکیدی دەکردەوە لەسەر ئەوەی کە ئاماژەی بەکام سەرچاوە داوە، کە ڕۆژێکیان باسی (ژیان)ی کردووە، لەو کاتەی کە ئەکتەری بەناوبانگی شانۆکەی (ریزارد)، کە بەشێوەیەکی زۆر تایبەتی و بە زمانێکی ڕەوان ئەو بابەتەی وروژاندووە. ئەو ئەکتەرە، لە نمایشی میری کۆڵنەدەر، ژیانی شاراوەی ڕۆڵەکەی کە بە شێوەیەکی لە ڕادەبەدەر سەخت و پڕ دیقەت بوو، بەراورد دەکرد بە گڕی مۆمێکی داگیرساوی ناو شوشەیەك، بەو پێیەی کە گڕی ئەو مۆمە لە گۆڕاندا بووە لە نێو ئەو شوشەیەدا.

لە میانەی کاری گەڕان و بەدواداچوونێکی دوور و درێژدا، کەشفکردنی هەست و سۆزە هەڵچووەکان و بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان، لە ساتەوەختی ئێستادا، دەکرایە ئامانج، ئەکتەرانی شانۆی تاقیگە بەو شێوەیە سووربوون و کۆڵنەدانی خۆیان پێشاندەدا، کە هەمان شێوەی هەوڵ و کۆششەکانی ستانسلافسکی بوون بۆئەوەی نواندنی ئەکتەر زیاتر ڕەسەنی پێبدرێت. بەڕای کرۆتۆفسکی هەر ئەو کارە ستانسلافسکی کێشدەکات بۆ ئەوەی (مەحکوم ببێ بە فێڵ نەکردن) وەك ئەوەی بە دەستی ئەنقەست خۆی تەڵەیەکی بۆ خۆی و میراتگیرانی نابێتەوە.

## میتۆدی کردارە فیزیکییەکان

لە تەمەنی لاویدا کرۆتۆفسکی گەشتێك دەکات بۆ مۆسکۆ و لەوێ بۆ ماوەی یەك ساڵ مێژووی دەرهێنانی شانۆی ڕوسی دەخوێنێ. لەو کاتەدا بەشێوەیەکی قووڵ دەکەوێتە ژێر کاریگەری لێکۆڵینەوەکانی ستانسلافسکیەوە. هەروەها گرنگیەکی تایبەتی زۆر دەدات بە دوا قۆناغی کارەکانی، واتە میتۆدی کردارە فیزیکیەکان، بەو شێوەیەی کە لەلایەن فازیلی ئۆزیپۆفیچ تۆرپۆرکۆفەوە، لە کتێبی (ستانسلافسکی لە کاتی راهێناندا) باسکراوە. فازیلی یەکێك بووە لەو ئەکتەرانەی بەشداری دوا کاری ئەو ستۆدیۆیەی کردووە کە لەلایەن ستانسلافسکیەوە سەرپەرشتیکراوە. کرۆتۆفسکی باوەڕی وابوو کە ئەو لێکۆڵینەوە تازانەی لە ساڵانی سیەکاندا دەستیان دراوەتێ دەیانتوانی ستانسلافسکی بەرەو قووڵبوونەوەیەکی زیاتر ببەن لەسەر کردارە فیزیکیەکان ئەگەر تەمەن بواری بدابا. کرۆتۆفسکی بڕیار دەدات لەگەڵ ئەکتەرەکانی لە شانۆی تاقیگە دوا لێکۆڵینەوەکانی ستانسلافسکی پەیڕەو پیادە بکات. هەر ئەمەش زەمینەیەکی پتەو بە دەسپێکی لێکۆڵینەوەکانی دەبەخشێ و ڕێگای بۆ دەکاتەوە کە دواتر گەشەیان پێبدات و نوێکاریان تێدا بکات. پێش داڕشتنی میتۆدی کردارە فیزیکیەکان، بۆ گیانبەرکردنی کەسایەتیەکان، ستانسلافسکی پشتی بەستبوو بە سایکۆلۆژی و سۆزەکان.

لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو سۆزانەی لەلایەن یادەوەریەکانـــەوە تۆمـــارکراون دەتـــوانرێ جیاکرێنـــەوە لـــە هۆکـــارە خولقێنـــەرە بنەڕەتیـــەکانیان، بـــە ئامـــانجی دووبـــارە بەکارهێنانەوەیان. بەشێوەیەك لە شێوەکان بۆ ئـــەوەی لـــە ڕەوشـــی ڕۆڵێکـــی دیـــاریکراودا پیادەبکرێنـەوە. وەك ریشارد تێبینی کـردووە، واتـە (زۆرلێکـردن) لـەو سـۆزانەی پەیوەسـتی ڕووداوەکـــانی رابـــووردوون، بـــۆ دووبـــارە دەرخستنیان و ژیانەوەیان لەسەر شانۆ و، واتە خولقاندنی (کاریگەریەك بەبێ هۆکار). سەرباری ئـــەوەش، ئـــەو کاریگـــەرە نـــاتوانرێ بەدەستبهێنرێتەوە تەنها لە میانەی پرۆسەیەکی مۆنتالی ناوەکی و بەکاربراوە نەبێ (کە ساتێکی کـــەم دەخایـــەنێ، وەك تەزویـــەکی کـــورت تێدەپـــەڕێ) لـــە نێـــو داهێنانـــە ئەکتیفـــەکانی ئەکتـەردا، لـە سـاتەوەختێکی ئێستای رەوشـە دیاریکراوەکـان، کـە ئەکتـەر بەشێوەیەکی کاتی دادەبڕێ لە ژیانێکی ناوەکیانەی دینامیکی تر و راستەوخۆتر.

لـــە ســـاڵانی کۆتـــایی ژیـــانی هونەریـــدا، ستانسلافـــــسکی کۆمـــــەڵێ دەرئـــــەنجام بەدەستدەهێنێ لەسـەر پرۆسـەی کـاری ئەکتـەر کە، بەشداربوونی دەروونـاسی ئەمەریکی ولیەم جێمس و هاوتا روسیەکانی ڤلادیمی باختێرێڤ و ئیڤـان پـاپلۆڤ تێـدا لەبەرچـاو دەگـرێ. ئـەو دەروونناســـانە لـــە بوارەکـــانی زانـــستی دەروونناســـی بابـــەتی و زانـــستی کاردانـــەوە *Reflexologie* زۆر پێـــشکەوتووبوون. ئـــەو زانایانـــە تەئکیـــدیان دەکـــرد کـــە جەســـتە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە بەرامبەر هانـدەرە دەرەکیەکان کاردانەوە دەنوێنێ و، هەریەك لەو کاردانەوانـەش خـاوەنی سـۆزێکی تایبـەتن بـە خۆیان و، تا ئەو ڕادەیەش تەنانەت پێشئەوەی خـودی مێـشك بتـوانێ فریابکـەوێ جـۆری ئـەو سـۆزە دیاریبکـات کـە، خـۆی پێـشاندەدات. *Gastev A K* کە یەکێك بوو لە تایلۆریستەکان، لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە جووڵە بگەڕێنێتەوە بۆ جەوهـەری سەرچـاوەکەی، بـە ئامـانجی ئـەوەی یارمـەتی کرێکـاران بـدات بـۆ گەیشتن بەوپـەڕی کـارایی لـە کارەکانیـان و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی بەرهـەمهێنان. *Mel Gordon* تێبینی دەکات کە ئەو بیر و بۆچوونانە سەرچاوەی ئیلهام بەخشین بـــوون بـــۆ مایـــەر هۆڵـــد، کاتێـــك میتـــۆدی بیومیکانیکی دادەڕشت.

(بەشبەشـکردنی هـەر لێکۆڵینەوەیـەك بەسـەر ئـەو جووڵانـەی دروسـتن و لـە جێگـای خۆیـانن، مایـــەر هۆڵـــد لـــە هـــەمان کاتـــدا بنـــەماکانی تایلۆریـستی کـە دەربـارەی ئیقتسادکردن بـوون لە جووڵە، واتە دەستگرتنەوە لە جووڵەکردن و، تیـۆری جیمـیس دەربـارەی سـۆزداری، لـە کـاری ئەکتـــەر پیـــادە دەکـــرد. ئـــەم کـــارەش ئەکتـــەری ڕادەکێشا بۆ نێو بوارێك کە بتوانێ بەشێوەیەکی ئۆتۆمـــاتیکی هـــەموو ســـولەمە ســـۆزداریەکان، ئـــەزمون بکـــات و بەئەنجامبگەیـــەنێ، کـــە لـــە دەرئـــەنجامی بـــەرەو پێشـــچوونی وەزعیـــەتی جەستەو ماسولکەکانەوە دروستبوون).

لـە ژیاننامەکەیـدا، لـەو بەشـەی کـە لەسـەر ستانسلافسکیە، *jean Benedetti* دەگێڕێتـەوە کـــە ( لـــە دوا مانگـــەکانی کۆتـــایی ژیانیـــدا ڕێژیسۆری ڕوسـی و قوتابیـە دێرینەکەی مایـەر هۆڵـد، کاریـــان دەکـــرد لەســـەر ئاوێتـــەکردنی (لێکـــــدان و تێهەڵکێـــــشکردن *synthese*) بیومیکانیـــك و میتـــۆدی کـــردارە فیزیکیـــەکان) لەگـــەڵ ئـــەوەی ستانسلافـــسکی لـــەو کاتـــەدا مایەرهۆڵـدی بـە تاکـە میراتگـری خـۆی دادەنـا،

لەبەرئەوەی فاختانگۆڤ سالأنیٚ بوو کۆچی کردبوو، بەلاٚم ستانسلافسکی ئیتر هێندە نەژیا بتوانیٚ ئەو پرۆژەیە بەکام بگەیەنیٚ. بەلاٚم پێشوەخت بەهۆی دارشتنی میتۆدی کردارە فیزیکیەکانەوە ستانسلافسکی توانیبووی پرۆژەیەکی سەرکەوتوو سەبارەت بە کاری ئەکتەر گەلاٚلە بکات، کە بیٚ هیچ گومانێك لەسەر تەوژمی هەلٚچوونە ناوەکیەکان دامەزرابوو، هەروەها ئەو بنەمایانەی تێدا دەرخستبوو کە، تەوژمە ناوەکیەکان کردارە جەستەییە ئۆرگانیکیەکان دەخولٚقێنن، ئەمانیش بە رۆلٚی خۆیان بیر و وێنە بانگەوازکراوەکان و یادەوەریەکان و سۆزەکان پێشاندەدەن.

### تەوژمە ناوەکیەکان

### *LES IMPULSION*

لە بەشی هەشتەمی کتێبی خولٚقاندنی رۆلٚێك ***Creating a role*** کە لە ژێر ناونیشانی (لە کرداری جەستەییەوە بەرەو وێنەی زیندوو)دایە، تۆرتسۆڤ/ ستانسلافسکی دەستەواژەیەکی گرنگ و سەرەکی سەبارەت بە میتۆدی کردارە فیزیکیەکان دەورووژێنیٚ، ئەویش (تەوژمی هەلٚچوونە ناوەکیەکانە) و بەم جۆرە بۆ قوتابیەکانی روندەکاتەوە:

(لەم ساتەوەختەدا، بۆ خولٚقاندنی کردارەکان، هەولٚدەدەم تەنها تەوژمە ناوەکیەکان تەحفیزبکەم و، پاشان بەهۆی پرۆڤەکانەوە جێگیر بکرێن. بەلاٚم سەبارەت بە خودی کردارەکان ئەوا ئەوانە دواتر خۆیان بە شێوەیەکی سروشتی گەشە دەکەن)

ئێستا دەبا ئەم وتانەی تۆرستۆف بە ئەوانەی کرۆتۆفسکی بەراورد بکەین.

(دەتوانن مەشق بە خۆتان بکەن لەسەر کردارە فیزیکیەکان و، هەولٚبدەن پێکهاتەیەکی کردارە فیزیکیەکان دروستبکەن بە مانەوەتان لەسەر هەمان ئاستی تەوژمەکان، واتە کردارە فیزیکیەکان جاریٚ دەرناکەون بەلاٚم ئەوەتان لەنێو جەستەدان، لە حالٚەتی ترپەدان. پێش هەموو کردارێکی فیزیکی تەوژمێك هەیە کە لە ناخی جەستەوە سەردەردێنیٚ، دەتوانین لەسەر ئەوە کار بکەین).

لێرەدا روون و ئاشکرایە کە ستانسلافسکی و کرۆتۆفسکی باس لە پرۆسەیەکی هاوشێوە دەکەن، کە رێگا بە ئەکتەر دەدات رشتەیەکی فیزیکی زیندوو بخولٚقێنیٚ. هەر لە هەمان بەشی ئەو کتێبەدا تۆرۆستۆف تێبینی دەکات کە تەوژمەکان توانای خولٚقاندنی کردارە فیزیکیەکانیان هەیەو توانای بەشداریکردن دەکەن لە دینامیکیەتی خولٚقاندن لەلای ئەکتەر:

(هەستدەکەم کە کردارە کەسایەتیە جۆراوجۆرەکان وا خەریکن دەبن بە کۆمەلٚە یەکەیەکی فراوانتر کە، هەموو ئەو یەکانە، هێلٚێك بۆ کردارە بەدوایەك هاتووەکان و مەنتیقیەکان پێکدەهێنن و ئەو هێلٚە سەردەردەهێنیٚ. ئەو یەکانە بۆ پێشەوە هوروژم دەبەن، جولٚەیەك دەخولٚقێن، ئەو جولٚەیەش ژیانێکی ناوەکیانەی رەسەن دێنێتە ئاراوە. چەند بەردەوام ئەو دیمەنە دووبارە بکەمەوە هێندە زیاتر ئەو هێلٚە خۆی قایم دەکات و هێندەش زیاتر هێزی ئەو جولٚەیە و هێزی ئەو ژیانە چر دەبێتەوە).

بە هەمان شێواز، تۆماس ریشارد دەلٚیٚ کە کرۆتۆفسکی ئاماژە دەکات و دەلٚیٚ ( تەوژمە ناوەکیەکان یەکە سەرەتایەکانی نواندن

پێکدەهێنن. هەروەها ئاست و توانا بنچینەیەکانی نواندن بریتین لەو تەوژمانەی لە نێو کردارەکاندا درێژەیان پێدراوە) لێکچوونێکی ئاشکرا بەدیدەکرێ لە نێوان ئەو دوو شێوازەی راڤەکراوە سەبارەت بەوەی کە تەوژمەکان چ مانایەك دەبەخشن لە ناوەرۆکی پرۆسەی کاری ئەکتەردا. بە بۆچوونی ستانسلافسکی کردارە فیزیکیە ئۆرگانیکیەکان کاتێك لەدایك دەبن کە هەوڵبدرێ (تەوژمە ناوەکیەکان بۆ کردار تەحفیزبکەین) کرۆتۆفسکی لە نێو دەستەواژە تایبەتیەکانیدا بەم شێوەیە ئاماژە بۆ تەوژمەکان دەکات، (تەوژمەکان پێشتر لە نێو جەستەدان) و هەروەها دەربارەیان دەڵێ (لە ناخی جەستەوە هوروژم دێنن) لە کاتێکدا لەلای ستانسلافسکی دەوترێ (تەوژمەکان بۆ پێشەوە هوروژم دەبەن و جوڵەیەك دەخولقێنن) واتە ژیانێك دەخولقێنن.

وەك ریشارد ئاماژەی پێدەدات، کرۆتۆفسکی بە جۆرێك دەڕوانێتە تەوژمەکان وەك ئەوەی لە گرژبونێکی ماسولکەییەوە هاتبن. دەڵێ، کاتێك کە دەمانەوێ کارێك بکەین، گرژبوون و پاڵەپەستۆیەکی دروست لە ناخدا هەیە و ئاڕاستەی دەرەوە دەبێ) ریشارد رونیدەکاتەوەو دەڵێ، کردار لە هاندەرێکی فیزیکیەوە لەدایك دەبێت، کە لە ڕاستیدا، لە ئەنجامی گرژبوون و فشاری هەندێ ماسولکەی جەستەوە دروست دەبێ و، دەبنە پاڵپشت بۆ کردار. کەواتە کرۆتۆفسکی پەیوەندیەکی فیزیکی لە نێوان و کردار و ویستدا بنیاتدەنێ.

(لە نێو/ گرژبوون و ویستدا).. بە هیچ جۆرێك ویستێك بوونی نیە ئەگەر هاندەر یان خرۆشەرێکی ماسولکەیی تایبەت بەو ویستە لە ئارادا نەبێ، هەر ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەشێکە لە ویست. تەنانەت ویست لەسەر ئاستی ماسولکەیی جەستەیش بوونی هەیە و پەیوەندە بە ئامانجێکەوە کە دەکەوێتە دەرەوەی ئێوەوە. هەروەها ویستەکان بەستراونەتەوە بە یادەوەریەکانی جەستەوە) بە بیرو وێنە بانگەوازکراوەکانەوە، بە خۆزگەکانەوە، بە پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی تردا و، بەڵام بێگومان بەستراونەتەوە بە گرژبوونە ماسولکەیەکانەوە).

کەواتە دەکرێ لە نێوان کرژبوون و تەوژمەکان پەیوەندیەکی نزیك کە لەلایەن کرۆتۆفسکیەوە بنیاتنراوە بخەینە روو کە پرۆسەکەی لەسەر بنچینەی تەوژمەکان دامەزراوەو لەگەڵ ئەوەی پێشتریش لەلایەن ستانسلافسکیەوە کاری لەسەر کراوە بەڵام نابێ تێکەڵ بکرێ نە لەگەڵ جڵەو شلکردنێکی خۆرسکی و نە لەگەڵ خاوبونەوەیەکی قووڵ وەکئەوەی زۆر جار بەهەڵە تێدەگەین. کرۆتۆفسکی تەئکید دەکات کە (پرۆسەی ژیان بریتیە لە بەردەوامی بەدوایەکهاتنی گرژبوون و خاوبوونەوە. کەواتە نەك بە تەنها ئەو مەسەلەیە پەیوەندی هەیە بە گرژکردن و خاوکردنەوە بەڵکو بە دۆزینەوەی ئەو رووبارە، ئەو هەڵچوونەی بزانرێ لە کوێدا پێویستە گرژبکرێ‌و لە کوێدا ئەوەی پێویست نیە بەرەڵا بکرێ) لە لایەکی ترەوە دەتوانین لێکچوونێك بخولقێنین لە نێوان ئەو چەمکەی لەلای کرۆتۆفسکی هەیە لەسەر (لە نێوان/ گرژبوون و ویستدا) و لە نێوان بنەمای بیومیکانیك لەلای مایەر هۆڵد بەو پێیەی دەڵێ ئەکتەر کار دەکات لەسەر (وەزعیەتێکی جەستەیی یان بارێکی جەستەیی کە بەردەوام ماسولکەکان تێدا لە

گەشەکردندان و بەرەو پێشچووندان) واتە بە هاوتای ئەوەی کە دەڵێ (خرۆشاندنی ماسولکەکان یان مۆبیلیزەکردنی ماسولکەکان) بەپێی دەستەواژەکانی کرۆتۆفسکی.

لە بەشی شەشەم لە کتێبی ئامادەکردنی ئەکتەردا ستانسلافسکی چەند مەشق و ڕاهێنانێکی سادە بە مەبەستی فێرکردنی قوتابییەکانی دەخاتە ڕوو بۆ ئەوەی بتوانن هەندێك لە ئەندامەکانی لەشیان پەراوێز بکەن و لە هەمان کاتدا هەندێکی تریان بەخاوی ڕاگرن. سالآنێك دواتر کە گەڕان و لێکۆڵینەوە دوورو درێژەکەی ئەنجامدەدات و ناویدەنێت (کاری ئەکتەر لەگەڵ خودی خۆی) دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە، ئەزموونە پراکتیکەکان ئەو ڕاستیەیان بۆ سەلماندووە کە پێچەوانەی ئەوە بوون کە ماوەیەکی دوور و درێژ لەوەوبەر باوەڕی پێیان هەبووە، ئەویش ئەوەیە کە سۆزو یادەوەرییەکان ناتوانرێ کۆنترۆڵ بکرێن یان دەستیان تێوەربدرێ. لە بەرامبەردا نەدەبوو ئەکتەرەکان یەکسەر (پەلاماری سۆزەکان بدەن)، لەبەرئەوە بەڕای کرۆتۆفسکی خۆی کە لە یەکێ لە کۆنفرانسەکانیدا دەڵێ (ئەوانە وەکو ئاژەڵی کێوین). ئیتر ئەو شتەی لە چوارچێوەی دەقێکدا ئەکتەرەکان دەبوو تەرکیزیان لەسەر کردبا کردار بوو. لەبەرئەوەی لەو کاتە بەدواوە بەلای ستانسلافسکیەوە هەموو شتەکان لە (کردارێکی کاریگەر و داهێنەر و زیندوو ڕەسەنەوە) بەدەستدەهات. ڕێژیسۆری ڕوسی دواجار دەگات بە نهێنی پرۆسەی کاری ئەکتەر، ئیدی هۆکار و ئیعتباراتە سایکۆلۆژیەکان تێدەپەڕێنێ و هەروەها بۆی ئاشکرا دەبێ کە ئەو کردارانەی لە ڕێگای تەوژمە ناوەکیەکانەوە لەدایکبوون لە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆدان لەگەڵ یادەوەری و سۆز و ڕوحی ئەکتەردا. (کورتکردنەوەی ئەو ڕێگایە) بواری دەدا بە ئەکتەر تا بتوانێ لە ڕێچکەی بیرکردنەوەیەکی عەقلآنی و شیکارانە دوورکەوێتەوە، ئەمەش کە پرۆسەیەکی عەقلآنیەوە و لەگەڵ ژیانی ناوەوەی ئەکتەر بەنێویەکدا دەچن کە سەربەستی پێشاندانی بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان ڕۆڵێکی سەرەکی تێدا دەگێڕن. کەواتە سروشتی خوڵقێنەرانەی مرۆڤ تەنها دەتوانرێ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کێشی نێو پرسیار و تێگەیشتن بکرێ، بەمەرجێ دەبێ ئەکتەر یارمەتی بدرێ بۆ خۆئامادەکردنێك بەشێوەیەکی دروست. (کارکردنی ئەکتەر لەگەڵ خودی خۆی) دەبێ بوارێکی بداتێ کە ببێت بە کەناڵێکی کراوە لەبەردەم تێپەڕبوونی هێزە پێشبینەکراوەکانی سروشتی مرۆڤ. ستانسلافسکی دەڵێ:

(لە کاتێکدا سەرقاڵی ئەنجامدانی کردارە فیزیکیەکانن، خۆتان لە ژیانی نەستەکانتان ئازاد بکەن (دوور بکەونەوە). بەو چەشنە دەتوانن ئازادی کاردانەوەکانی ژیانی نەستەکان دابین بکەن و، هەروەها هاندەری بن بە شێوەیەکی خوڵقێنەرانە کار بکات. ئەو کردارەی کە لە سروشتی مرۆیی و لە سەرچاوەی نەستیەوە سەرچاوە دەگرێ هێندە بانئاسایی ووردوو قووڵە کە ئەو کەسەی دەیخوڵقێنێ دركی پێناکات. میتۆدەکەی من، لە ڕێگای هۆکارە ئاسایی و سروشتیەکانەوە، هێزە خوڵقێنەرەکانی سروشتی مرۆیی، ئەوانەی لە ڕادەبەدەر وردوو بانئاساین، کە ملکەچی هیچ جۆرە تێڕامانێکی پێشوەخت نین، لە نێو کردارێکدا دەوروژێنێ، دەخاتە ڕوو).

بە پێچەوانەوە، هەر چەمکی (تەوژمەکان) بیروبۆچوونەکانی هەریەك لە ستانیسلافسکی و کرۆتۆفسکی لە یەکتر جیادەکاتەوە. ڕیشارد روونیدەکاتەوە کە بەلای کرۆتۆفسکیەوە (جیاوازی بنەڕەتی) لە نێوان میتۆدی کردارە فیزیکیەکان و لە نێوان کارەکانی ئەودا خۆی دەبینێتەوە لە تێڕوانینە تایبەتیەکانی هەر یەك لە ڕێژیسۆری ڕوسی و ڕێیسۆری پۆلۆنی کە سەبارەت بە تەوژمەکان هەیانە. (لە ڕاڤەکردنێکی کرۆتۆفسکیەوە، کارکردن لەسەر کردارە فیزیکیەکان تەنها دەرگایەکە بۆ چوونە نێو تەزووە زیندووەکانی تەوژمەکان و بە هیچ شێوەیەك بۆ بنیاتنانەوەی ژیانێکی رۆژانەیی نییە). بەلاّم وەك ڕیشارد روونیدەکاتەوە، بەلای ستانیسلافسکیەوە، تەوژمەکان بە تەنها لەسەر رووبەری دەرەوەی جەستە (وەك چاوو جوولّەکان – میمیك) خۆیان پیشاندەدەن. کەچی بۆ کرۆتۆفسکی (ئەکتەر دەگەڕێ بە دوای جەوهەری تەزوویەکی ژیان) تەوژمەکان لە ناوەوە ڕیشەیان داکوتیوە، لە جەستەدا و دواتر بەرەو دەرەوە پەلدەهاون و بلاّودەبنەوە. ریشارد هەروەها تێبینی دەکات کە، (بەرەو پێشچوون و پەرەسەندنی کارەکان لەسەر تەوژمەکان شتێکی لۆجیك و دروستە ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە کرۆتۆفسکی لە نێو جەستەیەکی ئازاد، کە بلۆك نەبێ، لێکۆڵینەوەو گەڕان بە دوای تەوژمە زیندووەکان دەکات، کە بەرەو کەمال و گشتگیریەك جیاواز لە کەمال و گشتگیری نێو ژیانی رۆژانە خۆی ئاراستە دەکات. لە کاتێکدا لەلای کرۆتۆفسکی، پرۆسەی کارکردنی ئەکتەر، کەلەسەر تەوژمەکان دامەزراوە، بەسەر پانتایەکی نائاسایی ژیانی رۆژانەوە خۆی پیادە دەکات، بەلاّم لەلای ستانیسلافسکی تەوژمەکان سنوردار کراون بەو کردارە فیزیکیانەی کە جوولّە و هەڵسوکەوتە کۆمەلاّیەتیەکان و رۆژانەیەکان دەکات بە ئامانج و لە چوارچێوەیەکی ڕیالیستدا دێنە ئاراوە.

لەگەلّ ئەوەشدا ڕێژیسۆری روسیش بەهاگەلێکی زۆر بە (ئۆرگانیستیەوە) دەبەستێتەوە کە چەمکێکە پەیوەستە بە تەوژمەکانەوەو تێکەلّ بە ژیانی جەستە دەبێ و هەروەها چەمکێکە لەلایە کرۆتۆفسکیشەوە بەکارهاتووە لە کاتی ناساندنی (شەپۆلی تەوژمەکان)، کرۆتۆفسکی تەئکید دەکات کە (جەستە بریتیە لە ژیانی ئێمە) و ئاماژە دەدات کە (کاتێك جەستە دەگەڕێ بە دوای ئەو شتەی ئەنتیمە، واتە تەوژمەکان، ئەو دەگەڕێ بەدوای بەیەکگەیشتنێك و، لە نێو ئەو بەیەکگەیشتنەدا ئەو بەردەوامی دەدات بە گەڕان، کاتێك بەریدەکەوم، هەناسەم دەوەستێ، شتێك لە مندا دەوەستێ، بەردەوام بەیەکگەیشتنێك هەیە لەوێ – لە ناوەوە، هەمیشە ئەوی دیکە.. ئەو کات ئەوەی پێی دەڵێن تەوژمەکان دەردەکەون).

دەرئەنجام سەرباری جیاوازیان سەبارەت بە شێوازی پیادەکردنی چەمکی تەوژمەکان لە کارەکانیان، بەلاّم ئەم دوو بۆچوونەی لەلایەن ستانیسلافسکی و کرۆتۆفسکیەوە بەردەوام لە گەشەکردن و بەرەو پێشوەچوون بوون لەسەر باوەڕێك دامەزرابوون کە هەردووکیان کۆك و هاوبیر بوون لەسەری. بە پێی ئەو باوەڕەش تەوژمەکان سەرچاوەن بۆ کردارە فیزیکیەکان و سۆزەکانیش دەرئەنجامێکی سروشتی پرۆسەی ئۆرگانیکی ئەکتەرە کە لەسەر تەوژمەکان دامەزراوە.

### سەرچاوە:

*Cette Vie nest pas suffisante de L Acterur selon Stanislavski au perfopmer selon grotoeski*

# ئەو دە فیلمەی
# لە یادەوەری ئۆسکاردا بەنەمری ماونەتەوە

ئامادەکردنی: باوکی پایان

گەیشتن بە بەشداریکردن لە فیستیڤاڵی ئۆسکاردا، خەونی هەموو ئەو کەسانەیە کە پێدەخەنە ناو جیهانی سینەماوە، خەونێکە لەلایەن سینەماکارانەوە ڕۆژ دوای ڕۆژو سات دوای سات گەورە دەبێت. گەیشتن بە ئۆسکارو وەرگرتنی خەڵاتێك لە خەڵاتەکانی، هیوایەکە هەمو ئەوانەی لە بواری سینەمادا کاردەکەن، ئاواتەخوازن پێیبگەن. ئەم فیستیڤاڵە لە ساڵی 1929 هاتووەتەئارا، وەلێ ئەو ئاهەنگەی لە کۆتایی ئەو ساڵەدا سازکرا، تەرخانکرابوو بۆ بەخشینی خەڵات بەو فیلمانەی لە هەردوو ساڵی 1928-1929 هاتبونە بەرهەم. لە ساڵانی سەرەتای ئەم فیستیڤاڵەدا مەرجەکانی پاڵاوتنی فیلم زۆر جیاواز بووە لەوەی ئێستا، هەروەها ئاهەنگی کۆتایی و ڕاگەیاندنی فیلمە سەرکەوتووەکان ئاهەنگێکی بچوك بووەو ئەو ئەندامانەی ئەکادیمیای زانستو هونەری سینەمایی کە خەڵاتەکانیان دەبەخشی ژمارەیان کەم بووە.

لە مێژوی ئۆسکاردا گەلێك فیلمی مەزن و نەمر خەڵاتیان وەرگرتووە، لێرەدا زۆر بەکورتی ئاماژە بە دە فیلم دەدەین کە شایەنی وەرگرتنی ئەو خەڵاتانە بوون و لە یادەوەری ئۆسکاردا بە نەمری ماونەتەوە.

### 1- باڵەکان *Wings* 1927

یەکەم فیلمە خەڵاتی ئۆسکار بەدەستبهێنێ، ئەم فیلمە فیلمێکی حەربییە، باس لە فڕۆکەوانێك دەکات خۆشەویستەکەی بەجێدەهێڵێ و بەشداری جەنگی جیهانی یەکەم دەکات، پاشان هەواڵی مردنی فڕۆکەوانەکە دەگاتەوە بە خۆشەویستەکەی و ئەویش شوو بە

کەسێکی دیکە دەکات. دیمەنی بۆردومان و شەڕی نێوان فڕۆکەکان تاکو ئەمڕۆش بە یەکێک لە دیمەنە هەرە سەرکەوتووەکان دادەنرێ. "ویلیام ولمان" زۆر بە لێهاتویی کاری دەرهێنانی بۆ ئەم فیلمە ئەنجامداوە، هەر ئەم دەرهێنانەش بوو وایکرد "ویلیام" ببێتە یەکێک لە دەرهێنەرە باشەکانی ئەو سەردەمەو تاکو سەرەتای پەنجاکان وەك دەرهێنەرێکی سەرکەوتوو ناوی دەرکرد. ئەم فیلمە لە نواندنی "کلارا بۆ"و "ریچارد ئارلین"و "کاری کۆپەر" بووە.

2-لەگەڵ بادا ڕۆشت 1939 ***Gone With the Wind***

یەکێکە لە فیلمە کلاسیکیە بەناوبانگەکانی مێژو، بەهەمو پێوەرێکی ئەو سەردەمە یەکێك بووە لە فیلمە زەخم و گەورەکان کە وایکردووە ئەندامانی ئەکادیمیا ئەوکات نەیانتوانیوە پشتگوێی بخەن. چیرۆکی ئەم فیلمە لە ڕۆمانێکەوە بە هەمان ناو وەرگێراوە، بەسەرهاتی ڕۆمانەکەو لەویشەوە بەسەرهاتی فیلمەکە بریتییە لە گێڕانەوەی خۆشەویستی نێوان "کلارك گابیل"و "ڤیڤیان لی" لەکاتی جەنگی ناوخۆی ئەمریکادا. دەرهێنەری فیلمەکە "فیکتۆر فلیمنگ" بووە، ئەم فیلمە بۆ سیازدە خەڵات پاڵێورابوو، وەلێ توانی هەشت خەڵات لەو سیازدە خەڵاتە بەدەستبێنێت، لەوانە خەڵاتی باشترین فیلم، باشترین دەرهێنەر، باشترین سیناریۆی سینەمایی، باشترین وێنەگرتن، باشترین ئەکتەر کە "ڤیڤیان لی" بوو.

3-ڕیبیکا 1940 ***Rebecca***



تاقە فیلمێکی دەرهێنەری ناودار "ئەلفرێد هیتشکۆك"ە کە خەڵاتی ئۆسکاری بەدەستهێناوە، ئاشکرایە ئەم دەرهێنەرە ناودارو مەزنە تاکو لە ژیاندا بوو خەڵاتی ئۆسکاری وەرنەگرت، بەڵکو وەرگرتنی خەڵاتەکە کەوتە دوای مردنی. دیسانەوە ئەم فیلمەش لە ڕۆمانێکەوە وەرگیراوە کە باس لە چیرۆکێکی خۆشەویستی نامرادو پڕ حەسرەت دەکات. ڕۆمانەکە لەلایەن نوسەری بەناوبانگ خانم "دافنی د مۆرییە" نوسراوەو باس لە بەسەرهاتی ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ دەکات، ئەم ئافرەتە شوو بە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند دەکات و لەگەڵیدا دەڕوات تاکو لە کۆشکە گەورەکەیدا بژی، لەوێ بۆی دەردەکەوێ ئەم پیاوە هێشتا هەر لەسەر یادگاری ژنی یەکەمی دەژی، پیاوەکە دەیەوێ ژنە تازەکەی هەمان ڕۆڵی ژنی

یەکەمی ببینیٚ. فیلمەکە لە دەرهێنانی "ئەلفرێد هیتشکۆک"و نواندنی "جوان فۆنتین"و "لۆرانس ئۆلیڤییە"و "جۆرج ساندرز"و "جۆدیس ئەندرسۆن"ە.

4-هەمو شتیٚ دەربارەی حەوا 1950 *All About Eve*

درامایەکە لە دەرهێنانی "جۆزێف مانکوفیتش"، ئەم فیلمە پاڵێورا بۆ وەرگرتنی سیازدە خەڵات، بەڵام توانی شەش خەڵات بەدەستبێنێت، لەوانە خەڵاتی باشترین فیلم، باشترین ئەکتەری هاوکار "جۆرج ساندرز"، باشترین دەرهێنەر، باشترین سیناریۆ، باشترین تۆماری دەنگ، باشترین دیزاین بۆ فیلمێکی ڕەش و سپی. ئەم فیلمە باس لەو کێشەو گیروگرفت و سەرنەکەوتنانە دەکات کە لە جیهانی نواندنی شانۆدا ڕووبەڕووی ژیانی ئەکتەرەکان دەبێتەوە. ئەم فیلمە زۆر بەخێرایی وەك یەکێك لە باشترین فیلمە کلاسیکییە گرنگەکانی مێژووی هۆلیۆد پۆلینکرا.

5-بێن هۆر 1959 *Ben Hur*

ئەم فیلمە پاڵێورابوو بۆ وەرگرتنی دوازدە خەڵات و توانی یازدە خەڵات بەدەستبێنێت، لەوانە خەڵاتی باشترین فیلم، باشترین دەرهێنان، باشترین دانەر..هتد.

6-لۆرانسی عەرەب 1962 *Lawrence of Arabia*

یەکێکە لە بەناوبانگترین فیلمەکانی مێژوو. ئەم فیلمە باس لە سیاسی و گەشتیاری بەریتانی "لۆرانس" دەکات، فیلمەکە موعاناتی لۆرانس لە بارودۆخێکی قەیراناوی ناهەمواردا پیشاندەدات، هەروەها باس لە ناخۆشی و ئێش و ئازارەکانی لۆرانس و دەستدرێژیکردنە سەری لەلایەن تورکەکانەوە دەکات. وەلێ بەبێ لەبەرچاوگرتنی سیاسەتی فیلمەکە کە بەرگری لە بەریتانیا دەکات، وەك کارێکی گرنگ دەمێنێتەوە کە باس لە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراو دەکات. ئەم فیلمە گەلیٚ نازناوی وەرگرتووە، لەوانە نازناوی (جوانترین بیابان کە لەسەر شاشە پیشاندرابێت).




7-عەرِاب 1970 *The Godfather*

بەسەرهاتی ئەم فیلمە باس لە خێزانێکی زۆر باش و دادپەروەری نێو خێزانە مافیاییەکان دەکات، باس لە ململانێی ئەم خێزانە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەکات. دەرهێنەری فیلمەکە "فرەنسیس فۆرد کۆبولا"یە، ئەم فیلمە گەرچی

ماوەی پیشاندانی دوو کاتژمێرو نیو دەخایەنێت، بەڵام بینەر لەو ماوە زۆرەدا هەست بە بێزاریو خاوبونەوە ناکات. هەروەها بەشی دووەمی ئەم فیلمە دوای دوو ساڵی دیکە دیسانەوە خەڵاتی ئۆسکاری بەدەستهێنا.

### 8-یەکێک بەسەر هێلانەی شێتەکاندا فڕی
### *One Flew Over Cuckoo* 1975

کۆمیدیایەکی ڕەشە، "مایکل مۆرمان"ی دەرهێنەری فیلمەکە بیمارستانێکی شێتەکان دەگۆڕێ بە شوێنێك تاکو چەند نمونەیەکی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتو هاولاتی ئاشکرابکات. "جاك نیکۆلسۆن" کە لەم فیلمەدا خەڵاتی باشترین ئەکتەری وەرگرت، ڕۆڵی نەخۆشێك دەگێڕێ کە هێشتا دەتوانێ بیربکاتەوەو تێبینی دەکات هەڵسوکەوتی ئیدارەی بیمارستانەکە لەبەرامبەر نەخۆشەکاندا، دڵڕەقانەیەو ئازار بە نەخۆشەکان دەگەیەنێ. فیلمەکە وا دەرناکەوێت کە فیلمێکی گەورەبێت، بەڵام مەفهومی فیلمەکە تاڕادەیەکی زۆر گەورەیەو فیلمەکە بەو پەیامەی هەڵیگرتووە، وەك چۆن لە دوێنێدا ئامادەیی هەبووە، لەمڕۆشدا بەهەمان شێوە ئامادەیی هەیە.




### 9-فەیلەق *Platoon*

ئەم فیلمە باس لە جەنگی ئەمریکاو ڤێتنام دەکات، جەنگێك کە لەسەر زەمینی واقیع ڕویداوەو لەڕێگەی کامیراوە گواستراوەتەوە بۆ سەر شاشە، کامێرا لە ناوەڕاستی جەنگو پێکدادانەکاندایەو لە نزیکەوە قیڕەقیڕو دەمبۆڵەی سەربازەکانو ئارەزوی تۆڵەکردنەوەیان وێنەدەگرێ. بەم شێوەیە دەرهێنەر جیهانە تاریكو دژوارەکەی جەنگ دەگوێزێتەوەو وێنەیەکی دۆزەخیانەی جەنگ دەکێشێ.

### 10-نالێکبوردن
### *Unforgiven* 1992

ئەم فیلمە باس لە کەسێکی خاوەن ڕابردوویەکی خراپ دەکات، ئەمە وادەکات دواجار لە کێڵگەیەکی بەرازدا جێگیرببێتو ژنەکەی لەدەستبداتو دوو منداڵی بۆ جێدەمێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا تۆبە ناکاتو هەوڵدەدا کارێکی خراپی دیکە ئەنجامبدات. "کلێنت ئیستوود" هەم دەرهێنەری فیلمەکەیەو هەم ئەکتەری سەرەکی.

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕی الفن السابع

# دیسانەوە هەر زوو ئۆغرکردنەوە

ئیتالۆ کالڤینۆ

لە ئینگلیزیەوە: ئەدیب نادر

**کورتە بەیۆگرافیەک:**

ئیتالۆ کالڤینۆ لە ساڵی 1923 لە کووبا لەدایك بووەو لە ئیتالیادا گەشونمای کردووە. گوتارنووس و رۆژنامەگەر و ئەندامی دەستەی ئێدیتۆریەڵی ئیناوودی *Einaudi* بووە لە تۆریندا. گرنگترین نۆڤلەکانی بریتین لە "شارە پێوارەکان *Invisible cities*"، قەڵای سەر نوێشتە یەکبڕەکان *The castle of crossed Destinies*. کالڤینۆ لە ساڵی 1973 دا خەڵاتی بە نێوبانگی پریمیۆ فێلترینناڵی *Premio Feltrinelli* بەدەست هێناوەو لە ساڵی 1985 یشدا کۆچی دوایی کردووە.

**دەقی چیرۆکەکە:**

بۆ چەندەها مانگ، هەندێجاریش بۆ چەندەها ساڵ، من لە ماڵەوە بە دوورم. جاروبار دێمەوە و ماڵەکەم هەمیشە هەر لە هەمان شوێنە، لە سەرو زورگەکەدایە، دیوارە کەونارا سوورەکانی لە نابەینی دار زەیتوونە چڕو پڕە دوو کەڵفامەکاندا دەرپۆقیوون. خانوویەکی کەونینەیە، کۆمەڵە میحێکی تاقانەمای چەشنی پەردی هەیە و کۆمەڵە سیمبۆڵێکی ماسۆنیانەیش بۆ تەرەکردنی کەشیشەکان لەسەر دیوارەکانیدان کە لە ڕابردوودا لەلایەن خەڵك و کەسوکارەکەمەوە دانراون. براکەیشم هەروەها سەرومڕ مژۆڵی گەڕان و سووڕانە، وەلێ ئەو گەلێك لە من زیاتر دێتەوەو کاتێك کە منیش دێمەوە هەمیشە ئەو لێرەدا دەبینمەوە. هەر کە دەگەڕێتەوە سۆراغێکی دەروزێوار دەکات هەتاکو فەرەنجی شکار کردنەکەی و جێرکینە[1] بە قوماشی خۆماڵی ڕێسراو دروستکراوەکەی و پانتۆڵە دەرقووون — چەرمینەکەی دەدۆزێتەوەو، ئەودەم ئەو پایپە هەڵدەبژێرێت کە چاکترین هەڵمژینی هەیە و بۆ کێشانێك قەرارگیر دەبێت.

"ئۆه"، ئەو کاتێك کە من دەگەمەجیٚ هاوار دەکات، لەگەڵ ئەوەیشدا دەشێت ساڵانێك بێت لەوەتەی یەکترمان دیتووەو، ئەو چاوەدووی هاتنی منی نەکردووە. "سڵاو" دەکەم و، ئا ئەمەیش لە سۆنگەی ئەوەوە نیە کە لە میانماندا جۆرە ساردیەك هەیە، چونکە ئەگەرەکو لە شوێنێکی دیکەیشدا پێك بگەین ئەوا جاڕ و جەنجاڵێکی مەزن بەرپا دەکەین و دەست بە پشتی یەکتردا دەکێشین. دەڵێین "باشە! باشە!"

وەلیٚ لە ماڵەوە شتێکی جیاوازە، لە ماڵەوە هەردەم ئا بەمجۆرە رەفتار دەکەین.

ئینجا هەردووکمان دەستەکانمان لەبەرکماندا، بە بێدەنگی، بە نەختۆکە شەرمێکەوە دەچینە خانووەکەوەو هەر لەنکاوڕا براکەم دەکەوێتە چەنە لێدان وەکو بڵێیت ئێمە هەر تەنها ئەو چرکەساتە گفتوگۆیەکمان راگرتبێت.

"دوێنیٚ شەو"، ئەو دەڵێت، "کوڕەکەی جیا سینتۆ هێندەی نەمابوو بە ئاکامێکی خراپ بگات".

"دەبوایە تەقەی لێبکەیت، دەبوایە، "من ئەمە دەڵێم، ئەگەر چیش نازانم سەبارەت بەچی قسان دەکات. بەم حاڵەیشەوە تاسەی ئەوە دەکەین لە ئێکدی بپرسین کە لە کوێندەرێوە هاتووین، بە چ جۆرە ئیش و کارێکەوە سەرقاڵین، ئاخۆ پارەی باشمان چنگگیر دەبێت، ئاخۆ هاوسەرگیریمان کردووە، وەلیٚ دواتر وەخت هەر هەیە بۆ پرسینی هەموو ئەمانە — چونکە دەبێتە پێچەوانەی نەریتەکانمان ئەگەر ئێستاکیٚ وا بکەین. ئەو دەڵێت: "تۆ دەزانیت کە شەوی هەینی نۆرەی ئێمەیە تا ئاوی لۆنگ وێڵەکە[2] بەکاربهێنین؟"

"شەوی هەینی، بە دڵنیاییەوە" دووپاتی دەکەمەوە، ئەگەرچیش وەبیرم نایەتەوەو ڕەنگە هەرگیزیش نەمزانیبیٚ.

ئەو دەڵێت: "تۆ لەو بڕوایەدایت کە ئێمە هەموو شەوانێکی هەینی ئاوەکە بەلای خۆماندا وەربسوڕێنین؟ ئەوان بەلای خۆیاندا وەریدەگێڕن گەر بێت و ئێمە بۆ چاوەدێری کردنی لەویٚ نەبین. دوێنیٚ شەو لە دەوروبەری سەعات یازدە بەوێدا ڕابوردم و، یەکێکم بینی بێڵچەیەك بەدەستیەوە بوو ڕایدەکرد، ئاوەڕۆکەیش بۆ نێو جێگاکەی جیاسینتۆ لادانی پێکرا بوو."

من دەڵێم: "دەبوایە تەقەی لێبکەیت، دەبوایە ئا ئەوە بکەیت". و پێشوەختیش بەشێتگیریەوە جۆشم سەندووە، بۆ چەندین مانگ و چەندین مانگی دیش هەموو شتێکم لەبارەی گیروگرفتی ئاوی لۆنگ وێڵەکەوە لە بیر چبووەوە، لە یەك حەوتوودا ئۆغر دەکەمەوەو هەمدیسانەوە هەموو شتێکی لەبارەوە لە یاد دەکەم، لەگەڵ ئەوەیشدا ئێستاکە لە سۆنگەی ئەو ئاوەوە بە شێتگیرییەوە جۆشم سەندووە کە لەم چەند مانگەی دواییدا دزراوەو لە چەند مانگێکی دواتریشدا هەر دەدزرێت.

لە کاتێکدا کە براکەم لە پشتەوەڕا مژی لە پایپەکەی دەدا، من بە پێپلیکانەکان و ئەو ژوورانەدا دەگەڕام کە بە چەکی کۆن و نویٚ، بە شووشەهای پۆدرە، بە کۆمەڵیٚ قۆچ و کۆمەڵیٚ رووبەندی ئاسکی شکارکراو داپۆشرا بوون. پێپلیکانەکان و ژوورەکان بۆنی کەڕەکیفە و مۆرانەزەدەییان لێوە دەهات، بەو هەموو سیمبۆڵە ماسۆنییانەیش داپۆشرابوون کە لەبری خاچەکان لە هەموو جێگایەکدا هەبوون. براکەم دەربارەی دزیی کارگەرەکان، دەربارەی بەروبوومی وێرانکراو، دەربارەی لەوەڕینی

بزنـــی دراوســـێکان لـــه پاوانەکـــەی خۆمانـــدا، دەربـــارەی کۆکردنـــەوەی دار لەلایـــەن تـــەواوی خـەڵکی نـشێوەکە لـە لێرەکـانی خۆمانـەوەم پـێ رادەگەیـەنیٚ. منـیش دەچمە لای کۆمادینـەکان و جێرکینـەکان، دەرەلینگانـەکان و ئـەو پاڵتۆیانـە دەردەهێـنم کـە کۆمەڵـە گیرفـانێکی درێژکۆڵـەیان بـۆ فیـشەك پێـوە ئاوقایـە و جلوبەرگـە خـاك و خۆڵینـــە شـــارییەکەم دادەکـــەنم و ئەوســـا لـــە هاوێنەکانـدا تەماشـای خـۆم دەکـەم، هـەر لـە تەوقی سەرەوە هەتا پێم بە چەرم و هۆمسپان[3] داپۆشـراوم. قـەدەرێکی کەمخایـەن دوای ئـەوە وەڕێ دەکـەوین و بـە ساچـمەزەنە ئاوێزەکـانی سەرشـــانمانەوە بەرێـــچکەی ئێـــستراندا خلدەبینـــەوە، هـــەتاکو لـــە هـــەر باڵندەیـــەکی هەڵفڕیوو یاخود هەڵنیشتوو دەستڕێژ بکەین کە کتوپڕ دەیبینین. بەڵام بەرلەوەی سەد یاردنمان بڕیبێـت لەلایـەن تـەرزە بەردێکـەوە ئێخـەگیر دەبـین، بـە تونـدی تێـدەگیران، وەك بڵێیـت لـە قۆچـــەقانییەکەوە هاتبێـــت. لـــەبری ئـــەوەی دەســـتبەجێ ئـــاووڕی دواوە بدەینـــەوە، وای بـەدیار دەخـەین کـە تێبـینی هـیچ شـتێکمان نـەکردووەو بـەردەوام دەبینـەوە لـە ڕۆیـشتن، چاوێکیـــشمان هـــەر لـــە دیـــواری ڕەزەکـــەی ســەرەوەی ڕێگاوبانەکەیـە. ئـا لەوێیـشدا، لـە نابەینی گەڵاکانەوە کە بە لقوپۆپی گۆگردییـەوە دێـز بوونەتـەوە، سـیمای کـوڕێکی بـچکۆلانە نومایـــان دەبێـــت، ڕووخـــسارێکی خڕکەڵـــەی ســـوورفل کـــە کۆمـــەڵێ ووردەخـــاڵی چەشـــنی قـۆخێکی مەگەزلێـداو لـەژێر چاوەکانیەوە گـرد بوونەتەوە.

"نامـەخوا، ئەوانـە تەنانـەت زاڕۆڵەکانیـشیان لـە دژی ئێمـە هانـداوە!" ئەمـە دەڵێم و دەکەومـە لەحنەت کردنیان.

کوڕەکــە تەماشــایەکی تــر دەکــات، زمــانی دەردەهـــێنێ و تێـــی دەتـــەقێنێت. براکـــەم لـــە میانەی دەروازەی ڕەزەکەوە هەڵمەت دەبات و بە پاڵـدێمی ڕیـزە دار مێوەکانـدا بـە دوویـدا دەسـت بـە غـاردان دەکـات، ئـەو شـاپ لـە بەروبوومەکـە دەوەشێنێت و منیش بەدوایەوەم. سـەرەنجام لـە بـەینی هەردووکمانـدا بـەگیری دەهێـنین. براکـەم بەقژ ڕاپێچی دەکات، منیش بـە گوێـچکە و تونـد تونـــد دەیچـــەڕێنم، ئەگەرچـــیش دەزانم کـــە عەزیەتی دەدەم، وەلێ هەرچەنێ ئازاری زیـاتری پیێدەگەیـەنم هێنـدەی تـر هەسـت بـە تـووڕەیی دەکـەم. بەسـەریدا دەشـیڕێنین: "ئـەوە بـۆ تۆیـە و باقییەکەیـشی بـۆ ئـەو باوکـەت دەبێـت کـە تـۆی ناردووە."

کوڕەکـــە دەگریـــەت، دواســـا دانەیـــەك لـــە قامکەکانم دەگەزێت و بۆی دەردەچێت. قووڵ لـە میـان دارمێوەکانـەوە ژنێکی ڕەشتاڵە کە سـەری کوڕەکەی لـە نێـو توێکانی بەرکۆشـەکەی خۆیـدا شـاردۆتەوە پەیـدا دەبێـت، مـستی تـەکان دەداو دەیکاتەشیڕە شیڕ بەسەرماندا.

"ترسنۆکینە! هـەق لـە منـاڵێك دەستێننەوە! هەمیشە هـەر هـەمان غـەدرکارانن! هـیچ نیگـەران مەبن، هەقی خۆتان وەردەگرنەوە".

وەلیٚ کەس پاسـقی ئافرەتـان ناداتـەوە، بۆیـە شـــانەکانمان هەڵدەتـــەکێنین و بەرێگاکـــەی خۆماندا بەردەوام دەبینەوە.

دواتـر ڕوواوڕووی دوو پیـاو دەبینـەوە کـە بـە دەســـکەنەی لقـــو چـــڵەدارەکانەوە بـــارکراون و بەرەو ڕوومـان دێـن و لـە ژێـر قورسـاییەکەدا دوو هێندەی تر چەماونەتەوە.

"هـــۆ، لەگـــەڵ ئێوەمانـــە"، هـــەردووکیان ڕادەگـــرین. "ئـــا ئـــەو دارەتـــان لـــە کوێـــوە هێناوە؟"

"له هەر کوێیەك کە مەیلمان لێبوو بێت"، وا دەڵێن و تەقەلا دەدەن لە ڕۆیشتن بەردەوامبن.
"ئەگــەرەکو لـــە بێـــشەڵانەکانی ئێمـــەوە هێناوتانە واتان لێدەکەین بۆ ئەوێی بگێڕنەوەو، بێجگــە لــەوەیش بــە دارەکانــەوە شــەتەکتان دەدەین".

هــەردوو پیاوەکــە بارەکــانی خۆیــان لەســەر دیــوارێکی نزمــدا ڕۆنــاو بەچــڕ و چــاوێکی ئارەقاوییــەوە لــە ژێــر گونیــەی پــارێزەری سەروشەپیلکیانەوە سەیریان کردین.
"چی هینی ئێوەیە و چیش هینی ئێوە نیە ئــەوە بزنــزی[4] ئێمــە نیــە. چــونکە ئێمــە ناتانناسین".
ئەوەی ڕاستی بێت وێدەچێ ئەمانە خەڵکی نوێ بن. ڕەنگیشە بێکار بن و هەر خۆبەخۆیش خەریکی دارکۆکردنەوە بن. ئەمانە هەموو هۆی دیکەن بۆ ئەوەی خۆمان بناسێنین.
"ئێمـــە برایـــانی باگناســـکۆین. هـــیچ بیستووتانن؟"
"ئێمە هیچ شتێك لە بارەی هیچ کەسێکەوە نـــازانین. ئەمەیـــشمان لـــە بێـــشەڵانەکانی کۆمیوونەوە[5] هێناوە."
"ئائـــەوە لـــە بێـــشەڵانەکانی کۆمیوونـــدا قەدەغەیـــە. ئێمـــە گاردێـــك بانگدەکـــەین و دەتانخەینە ژوورەوە".
"دەباشــە دەی، ئێمــە دەزانــین ئێــوە کــێن"، یــەکێکیان یەکسەر ووتــی: "ناتوانین خودداریی لەوە بکەین کە ئێوە هەمیشە یەخە بە هەژاران دەگرن. بەڵام ڕۆژێك حاسڵی دەکەن!"
منیش تێهەڵدەچم: "چی حاسڵ دەکەین؟"
ئەوســا بڕیــار دەدەیــن کــە لــە ســەبژێکتەکە وازبهێــنین و هــەر بــە جنێــو بەیەکــدی دانــەوە دووربکەوینــەوە. هەنووکــە ئیــدی کــە ئێمــە لــە جێگایــەکی دیکــەداین، مــن و براکــەم لەگــەڵ شــۆفێری ترامــەکان و فرۆشــیارەکاندا دەدوێــین، هەرکەسێك پەیجۆری مژە جگەرەیەکمان لێبکات دەیــدەینێ چــونکە ئێمــە خۆشمــان هەنــدێجار داوای مژە جگەرەیەك لــە خــەڵك دەکــەین. کەچی ئالێرانــەدا جوادایــە، ئالێرانــەدا ئێمــە هــەردەم ئاوەهــا هەڵــسوکەوتمان کــردووە، دەڕۆیــن بــە ساچــمە زەنەکانمانــەوە دەگــەڕێین و لــە گــشت شوێنێکدا دەمەقاڵێ بەرپا دەکەین.
لــە نزیــك مەیخانەکــەی ســەر گوزەرگاکــەدا خانەی کۆمۆنیستە لۆکاڵەکان هەیە، بۆردێك کە بــە دەمبــووس چــەردە کلیپێکــی[6] ڕۆژنامــە و چــەردە تێبینییــەکی پێــوە چەســپێنرابوو لــە دەرەوەدا هەڵواســـرابوو. لـــە ســـاتەوەختی ڕابوردنماندا چامەیەکی داچەسپاو لە سەریدا دەبیـــنین کـــە لـــە بـــارەی ئەوەوەیـــە چـــلۆن موڵکـــدارەکان هەمیـــشە هـــەروەکو خۆیـــانن، ئەوانەیش کە لە ڕابردوودا زوڵم و ستەملێکراو بوونــە براگــەلی ئەوانــەن کــە هەنووکــە جــەور و ســتەم دەچــێژن. "براگــەل" هێڵــی بــەژێردا کێشراوە چونکە هەر هەموو ئەمانە مانایەکی دوو قولوویـــان هەیـــە و بەگـــژ ئێمـــەدا ئاڕاســـتەکراون. ئێمـــەیش لـــە ســـەر پـــەڕەی کاغەزەکـــەدا دەنووســـین "هـــەی بـــەراز و درۆزنــەکان" و، ئــەنجا ئیمــزای نــاوی "باگناسکۆ جیاکۆمۆ و باگناسکۆ میشێل" دەکــەین. هــەتا لەگەڵ ئەوەیشدا کاتێك کە لێرە دووریـن لەسـەر مێزگەلێکدا نـان دەخـۆین کـە بـە قوماشـی مێـوی سارد تـێ ساوراو داپۆشراون کە ئەو پیاوانـەی دیش کە دوور لـە ماڵـەوە ئیشوکار دەکـەن و لـە سـەریدا نـان دەخـۆن و ئـەو بەشـە نەرمـەی نـانی بۆری ناسکونیانیان لێدەکەنەوەو هاوسێی سـەر مێزەکەیـشمان لەمـەڕ هـەواڵی نێـو ڕۆژنامـەوە

دەئاخفێت و ئێمەیش هەروەها دەڵێین: "هێشتاکونێش خەڵکانێکی ستەمدیدە لە دەوروبەردا هەن. بەڵام رۆژێك شتەکان دەگۆڕێن". بەڵام ئێمە لە توانامان‌دا نیە لێرووکانەدا ئەوە ئەنجام بدەین. لێرووکانە زەوی و زارێك هەیە بەروبووم نادات، کارگەرانێك هەن دزی دەکەن و لەسەرجیٚ کارەکەی خۆیاندا دەنوون، ئەو خەڵکەیش کە ئێمە تێدەپەڕین و بەدوومان‌دا تف هەڵدەدەن لەبەرئەوەیە کە نایانەوێ زەوی و زارەکەمان بهێننە بەرهەم، هەرچییەکیش کە پێی هەڵدەستین، ئەوان دەڵێن ئەوە چەوساندنەوەی خەڵکی ترە.

دەگەینە ئەو شوێنەی کە قەرارە کۆترەکان تیایدا هەڵفڕن و بۆ دوو جێگایش چاو بگێڕین هەتا تیایاندا چاوەڕوان بین. وەلیٚ هێند نابات لەو ڕاوەستانە کرەکە شەکەت دەبین و براکەم ئەو خانووەم پیٚ نیشان دەدات کە جووتە خوشکێك تیایدا دەژین. بۆ یەکێکیان فیکە دەکێشێت کە لەگەڵیدا پەیوەندی هەبووە. بۆ لامان دێتە خواریٚ، جووتە مەمکێکی زلحۆرت و جووتە لاقێکی تووکنی هەن.

"هۆ لەگەڵ تۆمە، بزانە داخۆ ئادەلینای خوشکیشت دێتە خواریٚ، براکەم لێرەدایە".

کیژەکە دەگەڕێتەوە بۆ نێو خانووەکە و من لە براکەم دەپرسم: "ئایا جوانکیلەیە، خوشکەکەی، جوانکیلەیە؟"

براکەم ڕاوبۆچوونێك بەدەستەوە نادات. "کچێکی قەڵەوە. خراپ نیە". جووتە خوشکەکە دەگەن و، ئەوەکەی من بە ڕاستی زلحۆرت و قەبەیە، گەلێك باشیشە بۆ دوانیوەڕۆیەکی ئائەوها. سەرەتا هەولی ئەوە دەدەن دژواربن و دەڵێن ناتوانن لەگەڵ ئێمەدا بەملاولادا بڕۆن و ببینرێن ئەگینا هەموو کەسێکی نشێوەکە دەکەن بە نەیاری خۆیان، وەلیٚ ئێمە پێیان دەڵێین گەمژە نەبن و دەیانبەینە دەرەوە بۆ نێو کێڵگە و ئەو جێگایانەی کە تیایاندا چاوەڕوانی تێپەڕینی کۆترەکان بووین. براکەم هەتاکو جاروبار لە دەرپەڕاندنی تەقەیەکیش سەرفیراز دەبێت، ئەو بەوە ڕاهاتووە کە بۆ ڕاوکردن کچ لەگەڵ خۆیدا بەرێتە دەرەوە.

پاش ئەوەی کە بۆ ماوەیەکی کەمخایەن لەگەڵ ئادەلینادا لەویٚ بووم، تەرزە بەردێکی دیکە بەر پۆقەتەی ملم دەکەوێت. پەی بە دیمەنی ئەو کوڕە خاڵخالاوییە دەبەم کە بە پەلەپرووزیٚ هەڵدێت. بەلام من حەز بەوە ناکەم کە بە دوویدا ڕابکەم و هەر تەنها جنێوی پێدەدەم.

لە کۆتاییدا کچەکان دەڵێن دەبیٚ بۆ بەنیدیکشن[7] بچن.

"دەبڕۆن و ئیدی جارێکی تر جاڕسمان مەکەنەوە".

دواجار براکەم بۆ منی ڕاڤە دەکاتەوە کە ئەوانە سووك و ئاسانترین دوو سۆزانی نێو نشێوەکەن و لەوە دەترسن کە ڕەنگە تولاَزانی دیکە لەگەڵ ئێمەدا بیانبینن و چیدیکە لەگەڵیاندا نەڕۆن. "قەحپانە"، من بەسەر هەوادا دەشیرێنم، بەلام لە دڵەوە ئەفسووسمەندم کەوا تەنها ئەو کچانەی کە لەگەڵ ئێمەدا دەڕۆن سووکترین ئەو دوو سۆزانییەی نێو نشێوەکەن.

لە هەیوانەکەی دەرەوەی کلێسەی سان کۆزیمۆ و دامیانۆدا ئاپۆرە خەڵکێك چاوەڕوانی بەنیدیکشنن. پاشەکشە دەکەن و هەموو کەسێك بە چاوی گوماناوییەوە تەماشامان دەکات، هەتاکو کەشیشەکەیش، چونکە بۆ سیٚ نەوە دەچێت باگناسکۆکان نەچوونەتە ماسەوە[8].

بەردەوام دەبین و هەست دەکەین شتێك لە نزیکمانەوە بەردەبێتە خوارەوە. "ئەو کوڕە،" دەقیژێنین، ئامادەی ئەوەین کە باز بە دەوروبەردا بدەین و دەستگیری بکەین. وەلێ ئەوە تەنها گوێژێکی گەنیووەو لە چڵێکەوە کەوتووەتە خوارەوە. ئیدی لە ڕۆیشتن سەرمڕ دەبینەوەو شەق لە بەردەکان هەڵدەدەین.

## پەراوێزەکان:

1–جیڕکین: جۆرێکە لە هێلەگ.

2–*Long well*: ناوی کانییە. دوورە کانی.

3–*Homespun*: ڕێسکراو. شتێك ڕێسرا بێت. بەرگێك کە لە قوماشی ڕێسراو دروست کرابێ.

4–*Business*: کاروبار.

5–*Commune*: بەش یاخود خانەی هاوکاری.

6–*Clipping*: بڕین و دەرکردنی پارچەی ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنی لەسەر بۆرد و لەوحە جامخانەییەکان.

7–*Benediction*: دوعای خێر و بەرەکەت.

8–*Mass*: شێوی ڕەببانی.

## سەرچاوە:

***Italo Calvino***

***Adam, One afternoon.***

***London.***

***Minerva – 1994.***

# عەسر

شیوا ئەرستویی

لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

کچەکە لە لێواری سەربانەکەوە دانەوییەوەو جوان سەیری حەوشەکەی کرد. شووتییەکە لە حەوزەکەدا بوو. دایکەکە خەریکبوو جلی هەڵدەخست. لە پشت دیواری ئەوسەری حەوشەوە، شەهاب لەگەڵ منالاّندا خەریکبوو لە کۆلاّن تۆپێنی دەکرد. کچە راست بووەوە و چوو لە ناوەڕاستی سەربانەکەدا وەستاو دووبارە سەیرێکی کۆلاّنی کردەوەو چووەوە ئەوسەری سەربانەکە. ئەودیو حەوشەیەکی تر بوو، رێك بەقەد حەوشەکەی خۆیان. بە دزییەوە سەیری حەوشەکەی کرد. حەوشەکە باخێکی گەورەی تێدا بوو. کە سەرتاسەری مێو داپیۆشیبوو. لە ژێر کەپری مێوەکەدا دەستێ مێز و کورسی بچوکی کانزاییان دانابوو. ژنێك خەریکبوو باخەکەی ئاودەدا. کوڕێك لەسەر پلیکانەکە دانیشتبوو، وێنەی دەکێشا. ژنە بەردەوام لە کوڕە بچکۆلەکەی دەپرسی:

"شارەزاد لە کوێیە؟"

کوڕەش بە هێواشی دەیووت: "لە ژوورەکەی تۆو باوکمدایە، خەریکە بووك بووکێن دەکات."

ژنە سۆندەی ئاوەکەی گرتە مێز و کورسییەکان و پاش شتنی. کچە سەیرێکی کوڕەکەی کرد و چوو لە ناوەڕاستی سەربانەکەدا وەستا. دووبارە گەڕایەوەو سەیرێکی کەپری مێوەکەی کرد، ئەوسا چووەوە بۆ ئەوسەری سەربانەکە. لە لێواری سەربانەکەوە دانەوییەوە و سەرگەرمی سەیرکردنی حەوشەی خۆیان بوو. دایکی حەوشەکەی پاك کردبووەوە، خەریکبوو قالیچەیەکی لە حەوشەکەدا رادەخست و بەدەنگی بەرزیش شەهابی لە کۆلاّن بانگ دەکردەوە. کچە هێشتا چاوی لە شەهاب بوو کە خەریکبوو لە کۆلاّن تۆپێنی دەکرد. ویستی لەوسەرەوە یارمەتی دایکی بدات. بە دەنگی بەرز بانگی لە شەهاب کرد و دەستی بۆ راوەشاند. شەهاب سەیرێکی کچەی کرد و

شـانەکانی هەڵتەکانـدا و رووی وەرگێـڕا. کـچە جارێکی تـریش بـانگی شـەهابی کـرد، شـەهاب لایکـردەوە و سـەیرێکی سـەربانی کـرد. ئینجـا لـوتێکی هـەڵبڕی و بـێ گـوێ پێـدان سـەرگەرمی یارییەکـەی بـووەوە. دایکەکـە سـەری بـەرەو لای کــچەکە هــەڵبڕی و وتــی: "شــارەزاد، وەرە خـوارەوە، دەکـەویت!" کـچەکە هەسـتاو چـوو لـە ناوەڕاســتی ســەربانەکەدا وەســتا. دووبــارە سەیرێکی کۆڵان و شەهابی کـرد، ئینجا ڕۆشتە ئەوســەری ســەربانەکە، وەســتاو بــە دزییــەوە سـەیری حەوشـەکەی ئـەودیوی سـەربانی کـرد. ژنـە چەرچـەفێکی دابـوو بەسـەر مێـزە کانزاییـە بچووکەکەدا، قـاپێکی گەورەشـی پـڕ کردبـوو لـە شــووتی ســوور و لــە ناوەڕاســتی مێزەکــەدا دانـابوو. کـوڕە بـچکۆلەکە وازی لـە وێنەکێـشان هێنـا بـوو و خـەریکبوو بـە ئوتۆمبیـل یـاری دەکرد. ژنە لە ناو ماڵەکەوە هاتە حەوشە، چوار قـاپی میـوە خـواردن و چـەقۆو چـنگاڵی بـە دەستەوە بـوو، هـەموویانی لەسـەر مێزەکە و لـە پەنای قاپی شووتییەکە دانا. دووبارە لـە کوڕە بچکۆلەکەی پرسییەوە: "شارەزاد نەهات؟"

کوڕەکـە ئۆتـۆمبیلی یاریکردنەکـەی لەسـەر کاشــییەکانی حەوشــەکە دانــا، ســەری رووەو ئاسمــان هــەڵبڕی و وتــی "کــاتی نوانــدنی بووکەکەیــەتی، لێیگــەڕێن، بــا ئــەو بخــەوێنێ. دێت."

کچە سەیرێکی کوڕە و ئوتۆمبیلەکەی کرد و چــوو لــە ناوەڕاســتی ســەربانەکەدا وەســتا. دووبـارە ئـاوڕێکی دایـەوەو سـەیرێکی کـەپری دارمێوەکــەی کــرد و چــووەوە ئەوســەری سەربانەکە، لە لێواری سەربانەکەوە دانەوییەوە. دایکـی چـاوی لێبـوو، بەبێتاقەتییـەوە وتـی: "شارەزاد، وەرە خوارەوە! وتم دەکەوی!"

کچە وتی "باوکم نەهاتووەتەوە؟"

"نە هێشتا!"

"شووتییەکە سارد بوو؟"

"چووزانم، دەتۆ وەرە خوارەوە. دەکەوی!"

کچە قیژاندی و بـانگی شـەهابی کـرد: "وەرە شووتی بخۆین!" شەهاب گوێی نەدایێ

کچە دووبارە بانگی کردەوە.

شەهاب چاوێکی لە کچە زەق کـردەوە و پێـی وت "هــەر ئێـستا دێـم." کـوڕە بـچوکەکانی تـر یەکـە یەکـە چـوونەوە بـۆ مـاڵی خۆیـان. شـەهاب دەسـتبەرداری تۆپەکـە نـەدەبوو، هـەیتا هـەیتا تۆپەکـــەی لـــە دەروازە بـــچووکەکە نزیـــک دەخـــستەوەو گـــۆڵی دەکـــرد. دنیـــا وردە وردە تاریـك دادەهـات. دایکەکـە دەرگـای حەوشـەکەی کـردەوە و شـەهابی بـە زۆر لـە کۆڵانـەوە هێنایـە ژوورەوە، بردییــە قــەراغ حەوزەکــەو دەســت و دەموچاوی پاك شت. روویکردە سـەربان و وتی "شـارەزاد! راکە تـۆش وەرە خـوارەوە، دەسـت و دەموچـاوت بـشۆ، دەکـەوی هـا! ئەوەنـدە خـۆت لەو سەرەوە شۆڕمەکەرەوە، ڕۆڵە!"

کــچە هەســتایەوەو چــوو لــە ناوەڕاســتی سەربانەکەدا وەستا سەیرێکی کۆڵانە چۆڵەکەی کــرد و ئینجــا چــووە ئەوســەری ســەربانەکە. حەوشـەی ئـەودیوی سـەربانەکە روونـاك بـوو، گڵۆپێـك لـە ناوەڕاسـتی گـەڵا مێوەکانـەوە و لـە کەپرەکـەوە شـۆڕببووەوە و حەوشـەکەی روونـاك دەکردەوە. سـەر مێزەکـە چیدی قاپ و شـووتی لێنـەبوو. قـاپێکی بـچووکی زەڵاتـەی لێبـوو کـە تەماتـەو خـەیار و پیـازی جنـراوی تێـدا بـوو، هەروەها چوار قاپی چێشت خواردن و کەوچك و چنگاڵ و سەبەتەیەکی نـان و سوراحییەك ئـاوو چـوار پەرداخیـشی لێبـوو. کـوڕە بـچکۆلەکە کراسێکی سپی پاکوتـەمیز و پـانتۆڵێکی رەشـی

کورتی ئوتوکراوی لەبەردا بوو. هێشتا بە ئوتۆمبیلەکەی یاری دەکرد. ژنە لە ناو ماڵەکەوە هات بۆ حەوشە، کراسێکی فانیلەیی پەڕ پەڕەداری لەبەردابوو. سەیرێکی سەر مێزەکەی کرد و دووبارە گەڕایەوە بۆ ناو ماڵەکە. کوڕەکە قیژاندی: "شارەزاد دەوەرە ئیتر، مەگەر بووکەکەت نەخەوتووە؟"

ژنە دووبارە هاتەوە بۆ حەوشە. زڕەی زەنگەکە لە ماڵەکەدا دەنگی دایەوە. بە کوڕە بچکۆلەکەی وت "ڕاکە، باوکتە. ئێستا ئەو شارەزاد دەهێنێتە سەر سفرەکە، تۆ بڕۆ دەرگاکە بکەرەوە!"

کوڕەکە بەرەو دەرگاکە رایکرد. کچەکە سەیرێکی حەوشە و مێز و کەپری مێوەکەی کرد و ڕۆشت لە ناوەڕاستی سەربانەکەدا وەستا. ئینجا چووە وە ئەوسەری سەربانەکە و لە لێوارەکەوە دانەوییەوە، سەیری کرد دایکی و براکەی لەسەر قالیچەکە دانیشتوون، لۆکسەکەی حەوشەیان داگیرساندووە. دایکی خەریکبوو شووتییەکەی قاش دەکرد. دایکەکە هاواریکرد "شارەزاد! دەشەوە ئیتر ڕۆڵە! وەرە خوارەوە! دەکەوی!"

کچە وتی "باوکم نەهاتەوە؟"

"هێشتا نە"

کچە راستبووەوە چوو لە ناوەڕاستی سەربانەکەدا وەستا سەیری کۆڵانە چۆڵەکەی کرد بەڵکو باوکی ببینێ. نەیدی، چووە ئەوسەری سەربانەکە. بە دزییەوە کەوتە تەماشاکردنی حەوشەکەی ئەودیوی سەربان. ژنە بەلەمی خواردنەکەی خستبووە سەر مێزەکەو خەریکبوو قاپەکانی لێ پڕ دەکرد.

کوڕە بچکۆلەکە لە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو، چاوەڕێی دەکرد قاپەکەی پڕ بکرێ. کچە سەیرێکی ناو ماڵەکەی کرد. تارمایی پیاوێکی دیت کە دەستی کچۆڵەیەکی گرتبوو و خەریکبوو دەیهێنایە حەوشە.

کچە ئەوانی بەجێهێشت و ڕۆشت لە ناوەڕاستی سەربانەکەدا وەستا. تاوێك جگە لە بەرامبەر خۆی زیاتر سەیری هیچ لایەکی نەکرد، دوایی بەرەو حەوشەکەی خۆیان کەوتە ڕێ. لە لێوار سەربانەکەوە خۆی دانەواندەوە، باوکی هێشتا نەهاتبوەوە. دایکی و براکەشی لەسەر قاڵیچەکە دانیشتبوون. خوانی ئێوارەیان لە تەنیشت قالیچەکەوە بوو. بەڵام هێشتا سفرەکەیان رانەخستبوو، دایکە خەریکبوو شتێکی بە شتێکی ترەوە دەدووری. شەهاب باوێشکی دەدا. کچە هات بپرسێ کە باوکی بۆچی درەنگی کرد و نەهاتەوە، بەڵام دەتووت کەسێك پاڵی پێوە ناو کەوتە حەوشەکەوە. دایکە زریکاندی.

کچە خەوی لێکەوت، کە خەبەری بووەوە بە شەهابی وت: "تۆ حەوشەی ئەودیوی سەربانت دیبوو؟"

شەهاب گەورە ببوو، خەریکبوو کتێبی دەخوێندەوە، سەری لەسەر کتێبەکە هەڵبڕی و وتی "ئاخر چەنێك بڵێم کە ئەودیوی سەربانەکەی ئێمە هەر کەلاوەیەکی چۆڵ بووە".

**سەرچاوە:**

لە کۆمەڵە چیرۆکی (امده بودم با دخترم چای بخورم) وەرگێراوە.

# منەکەی تر

گابریل گارسیا مارکیز

لە فارسیەوە: حەمەرەسوڵ حەسەن پوور

کازیوەی بەیانییەکی چەند رۆژ لەمەوبەرە کاتێ لە خەو ڕابووم، لە رۆژنامەیەکدا خوێندمەوە:

–گابرێل گارسیا مارکیز رۆژی رابووردوو وتاربێژیەکی ئەدەبی لە شاری "پاڵما دیگران کاناریا" کە کەوتۆتە دوورگەی "کەناری"ی ئەولای ئۆقیانووسەکان پێشکەشکرد!

هەواڵدەر نەک تەنیا زۆر بە جەختەوە باسی وتارەکەی کرد بوو بگرە چیرۆکێکی دوورودرێژی لێدروستکردبوو، پاشانیش ئاماژەی بە کورتەیەك لە وتارەکە کرد بوو.

ئەوەی دووچاری سەرسامی کردم ئەو بابەتانە بوو کە لە وتارەکەدا هاتبوونە ئاراوە، چونکی پرسیارەکان، لەوە هوشیارانەتر بوون کە بە مێشکی مندابێن! هەروەها پێی لێدەنێم رۆنانی و شێوەکەی لەوە سەرنج راکێشتر بوون کە من بتوانم.

ئەو رووداوە تەنیا کەموو کوورییەکی تێدا بوو.. ئەوەی کە من هەر لە "پاڵما" نەبووم! نەك رۆژی پێشتر تەنانەت لە بیست و دوو ساڵی رابووردووش بۆ ئەوێ نەچووم!! جگە لەمە ئەگەر گارسیا مارکیز من بم – کە هەوم– لە ماوەی ژیانمدا هیچ وتارێك، (تەنانەت وتارێکیش)م لە مەر هەرشتێ بێت – لە هیچ کوێیەکی دونیادا بێت نەمبووە!

زۆر جاری وا روودەدات کە رایدەگەیەنن من لە جێیەك وتار پێشکەش دەکەم لە کاتێکا هەر بڕیار نییە ئەوێ بچم!

لەگەڵ ئەوەیدا تا ئێستا چەند جار رامگەیاندووە کە بە داخەوە لە بۆنە گشتییەکاندا بەشداری ناکەم، بەرگی مامۆستایەتی زانکۆ ناپۆشم، لە تەلەفیزیۆن دەرناکەوم و لە هیچ ریکلامێکی فرۆشتنی کتێبەکانمدا بەشداریناکەم و لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی نواندندا ئامادە نابم، بەلاّم بە داخەوە جاری وا هەیە بەبێ ئامادەبوونی فیزیکیم سەر لەو چەشنە شوێنانە دەردەهێنم!

پەسەندنەکردنی ئەمجۆرە چاوپێکەوتنانە لە رووی تەوازوعەوە نییە، بەڵکوو لەبەر هۆیەکی خراپترە.. من پیاوێکی شەرمنم.. و ئەمەیان بارێکی قورسە، چونکی تەنیا شتێکی لە چل ساڵ لەمەوبەرەوەی ئەزموونەکانم فێری بووم ئەمەیە کە بڵێم "نا" ئەو کاتەی کە پێویستە بڵێم "نا":

بەهەر حاڵ یەکێك هەڵدەکەوێت هاتوو هاوار رێبخات و بە رۆژنامە یان کۆبوونەوەی تایبەتی بڵێت کە من کاتژمێر چواری دوای نیوەرۆی رۆژی چوارشەممەی دادێ لە بۆنەیەکدا کە نازانم چییە، بەشداربم!

لە کاتی دیاریکراودا ئەو پیاوەی عاشقی هەراو هوریایە داوای لێبوردن لە میوانەکان دەکات، دەڵێت نووسەرەکە وەفای بە بەڵێنەکەی نەکردووە. هێندێکیش بۆ کارمەندی تەلەفوونات تێدەچێنێت و سەرەنجام سەردەکەوێت و دڵی ئامادەبوان بەدەست دەهێنێت و ئەوەی بەنیازە ئەنجامیدەدات!

لە سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی هونەریمدا ئەم ئیشە قێزەونانە دڵی ئازاردەدام، بەلآم من بە خوێندنەوەی دوایین بەشی بیرەوەرییەکانی "گراهام گرین" کە ئەویش سکالآی لەم بابەتەوە دەربڕیوە، دڵم سوکنایی پێداهات و تێگەیاندم ئەم دەردە هیچ عیلاجی بۆ نییە. ئەمەشیان تاوانی کەس نییە، چونکی یەکێ لەم دونیایەدا هەیەکە بەئازادیو بێ کۆسپ وتەگەرە کارێ دەکات کە ئێمە پێویستە ئەنجامی بدەین.

وتاربێژی بە درۆی شاری پالمای دورگەی کەناری تەنیا شتی سەیر و سەمەرەی ئەم شەرگەیە نیە، بەڵکو سەیرتر لەم رووداوێکە کە چەند ساڵ بەر لە ئێستا بۆ من و کۆمپانیایەکی فرۆکەوانی بە ناوی "ئێرفرانس" لەمەر نامەیەك کە هەرگیز نەمنووسیبوو روویدا. چیرۆکەکە بەم چەشنە بوو:

نامەیەکی توند بۆ واژۆی من بۆ کۆمپانیای ئێرفرانسی فرۆکەوانی میللی فەرانسا چوو بوو کە تێیدا سکالآم لە هەڵسوکەوت و مامەڵەی میواندارێك لە ماوەی گەشتێکی ئاسایی و لە رێکەوتی دیاریکراو لەمەدریدەوە بۆ پاریس، کردبوو. دوای لێکۆڵینەوەی بەربلاو، کۆمپانیاکە بە توندی میواندارەکەی سەرکۆنەکردبوو، نامەیەك لە پێوەندی گشتی شەریکەکەوە بۆ من هات و بە درێژی داوای لێبوردنی لێم کردبوو، بەداخبوون لەو شتەی روویداوە. ئەم نامەیە خستمیە بارێکی سەرسامهێنەرەوە چونکی ئەو رێکەوتە گەشتم نەکردبوو و گرنگتر لەمەش هەر لە گەشتی فرۆکە دەترسم بە چەشنێك لە ماوەی گەشتەکەمدا ئاگام لە هەڵسووکەوتی خەڵکی نییە بەڵکو هەموو بیر و هۆشم ئەوەیە کە خۆم بە کورسییەکەوە بنووسێنم و دەستگیرەکە بکێشم بۆ ئەوەی فرۆکەکە بە ئاسمانەوە بمێنێت.. یاخود ئەو منالآنەی بەنێو کورسییەکاندا هەڵدێن، پێشیان پێبگرم و نەهێڵم رابکەن نەکا فرۆکەکە لە ژێر پێیاندا کون بێت!

رووداوێکی ناخۆشترم بیرە، ئەویش ئەمەیە کە رۆژێك لە نیویۆرکدا سواری فرۆکە بووم، هێندە جەنجاڵ و پڕ بوو کە نەمدەتوانی هەناسە بدەم، لە کاتی فڕیندا خاتوونی میواندار بە هەر موسافیرەو چەڵێك گوڵی دەدا، من هێندە ترسابووم نەمتوانی ئەوەی لە مێشکمدایە بە میواندارەکەی نەڵێم:

"خانم! بە جێگەی ئەم چڵە گوڵە وا باشتر نییە پینج سانت جێگەمان بدەیتێ بۆ ئەوەی قاچی تێدا راکێشین؟!".

کیژە جوانەکە کە لە نەوەی شەیتان بوو پێی وتم:

"ئەگەر حەزناکەیت، فەرموو دابەزە!"

هەڵبەت بە بیرمدا نەهات سکاڵانامە بۆ ئەو کومپانیایە – کە هەر نامەوێت ناوەکەییم بیر بێتەوە – بنووسم، بە جێگەی پەلکی گوڵەکانم لە زارمدا جوو، زۆر لە سەرخۆ پەلك پەلك، تا ئەوەی بۆنی پزیشکی گوڵەکە کە هێنامیەوە سەرخۆم و هەناسەم ئاسایی بوەوە.

بەم هۆیەوە لەوەی ئەو کۆمپانیا فەرانسەییە لەو سکاڵایەی من نەمکردووە داوای لێبوردنی کردبوو، تەریق بوومەوە، خۆم بۆ نوسینگەی کۆمپانیاکە چووم و بۆم شەرحکردن. کۆمپانیاکە سکاڵانامەکەیان نیشاندام و نەمتوانی ئینکاری بکەم نەك تەنیا شێوەی نووسینەکەی بەڵکو ناشیانە تەزویر کردنی واژۆیەکەم، بوو بەهۆی هەرچی زیاتر ناڕەحەتبوونم.

گومانی تێدا نیە ئەوەی نامەکەی نووسیوە، هەر ئەو کابرایەیە کە بە ناوی منەوە لە دوورگەی کەناریدا وتاری پێشکەش کردووە.. کاری تریش کە من ئاگام لێیان نییە، بەلاّم بە هەڵە تووشیان دەبم.

زۆر جاریوایە کە دەچمە سەردانی ماڵی برادەرانم. دەست بە دۆزینەوەی کتێبەکانم لە کتێبخانەکانیاندا دەکەم و رستەی "دیاری"یان لەسەر دەنووسم.. بەلاّم بێئەوەی ئەوان پێ بزانن! بەلاّم دوو جارم دیوە لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکاندا نووسیومە و واژۆمکردووە! رێك بەو مەرەکەبە رەشەی کە هەمیشە پێی دەنووسم و ئەو خەتە بە پەلەیەی کە ناخوێندرێتەوە!

چەند جار ئەو رۆژنامانەی بیرم نایەنەوە، خوێندومنەوە و دیومە لەوێدا وتووێژی منیان چاپکردووە! وتووێژێ کە هەر بەشداریم تێدا نەکردووە! بەلاّم نەمتوانیوە نکووڵیان لێ بکەم، چونکی دێڕ بە دێڕ بۆچوونەکانمی تێدا ڕەنگی داوەتەوە!

باشترین وتوێژێ تا ئەمڕۆ چاپکراوە بە ڕستەی زۆر رۆشن و شێوە نووسینی زۆر باش لەبارەی ژیانمەوە نەك تەنیا لەمەر ئەدەبیاتدا، بەڵکو لەبارەی بیروڕای سیاسی، چێژ و خۆشی و ناخۆشییەکان دواوە، دوو ساڵ لەمەوبەر لە رۆژنامەیەکی نەناسراودا بە تیراژی کەم لە شاری کاراکاسدا بەچاپ گەیشت.

ئەم وتووێژە لە سەرەوە تا خوارێ تەزویر بوو، بەلاّم زۆر کەیف خۆشیکردم، نەك لەبەرئەوەی زۆر رێکبوو بێت، تەنیا لەم رووەوە کە بە ناوی ئافرەتێکەوە بلاّوکرابۆوە کە هیچ کاتێ ناویم نەبیستووە.. بەلاّم دڵنیام زۆری خۆشدەوێم، چونکی تا ئەم رادەیە دەمناسێت. تەنانەت ئەگەر "من"ێکی تر بێت.

هەر ئەم رووداوەم لەگەڵ کەسانی خۆشەویستی تر کە لە دەوروبەری دونیادا تووشیاندەبم، روودەدەن، و هەمیشە یەکێ لە جێیەکی کە هەر نەچووم، لەگەڵمدایە! بیرەوەرییەکی باشی لەم دیدارە هەیە. ئەو "من"انەی تر کە بە رواڵەت خزم و کەسی زۆریان هەیە، تەنانەت ئەگەر بەراستیش خزم نەبن، بەڵکو بەر نووسێکی خزمەکانمن!

زۆر جاری وابووە کە ئەم چەشنە برادەرانەم لە نێوان بنەماڵەکەمدا نەدۆزیوەتەوە!

زۆر جار هەڵدەکەوێت من ئەوان لە شەقامی "فوئگۆ"دا دەبینم. ئەوان سەبارەت بە شلۆقی ئەو بۆنانەی کە لەگەڵ برایەکەم "ئۆمبرتۆ" دا لە "ئاکابولکو" بەشداربوین دەدوێن!!. لەم دواییانە لە یەکێك لەم چاوپێکەوتنانەدا نەناسراوێك سوپاسی کردم، چونکی لە رێگەی براکەمەوە خزمەتێکی

گەورەم پێکردبوو!!(؟). و من بە ناچاری پێموت:

"برا، شتێك نەبوە تا تۆ سوپاسی بکەیت، ئەرکی سەرشانم بوو!". ئەمەی دەڵێم چونکی دڵمنایەت بلێم من هەر بە ناوی "ئومبەرتۆ"وە برام نیە کە لە "ئاکابولکۆ" بژی.

سێ ساڵ لەمەوبەر تازە نانم خواردبوو کە لە دەرگایان دا. پاشان یەکێ لە کوڕەکانم بە پێکەنینەوە هات و وتی:

"باوکە، "تۆ" خۆتی دەوێت!"

لەسەر کورسییەم رابووم و بە سۆز و خرۆشەوە بە خۆم وت:

"ئاخرەکەی هات!"

بەلاّم ئەو "من" یکی تر نەبوو، بەڵکوو "گابریل گارسیا مارکیز" بوو، ئەو ئەندازیارێکی مەکزیکی بوو! گەنجێکی بە ئەدەب و ئارام بوو. ئەو بەسەبر و ئارامیەکی زۆرەوە وەلاّمی تەلەفوونەکانی هاوشێوەی دابۆوە و دواجار بۆ دایرەی بەرید چووبوو بۆئەوەی ناوەکەی لە ریزی بەشداربووانی تەلەفوون وەك گابریێل گارسیا مارکیز لە دەفتەری تەلەفوونەکاندا پاکبکاتەوە. ئەم پیاوە بە ئەدەبە ئەو نامانەی لە ماوەی سێ ساڵدا لە نووسینگەکەی کەڵەکە ببوون بۆی هێنابووم!

ماوەیەك لەمەوپێش رۆژنامەوانێك کە بە مەکزیکدا گوزەری دەکرد، لە دەفتەری تەلەفوونە گشتییەکاندا بە شوێن ژمارەی ئێمەدا دەگەڕا، ژمارەی "گابریل گارسیا مارکیز"ی دۆزییەوە و پێوەندی گرت. پێیان وت کە چۆتە خەستەخانە چونکی ژنەکەی زاوەو کچێکی بووە!

"چ خۆشبەختی و قدوومێکی گەورەیە! من لە هەموو ژیانمدا لە ئارەزۆی بوونی کچێکدا بووم بەلاّم بەداخەوە بوومە خاوەنی دوو کوڕ"!.

بەلاّم ئەم شتەی روویدا ئەمەبوو کە خانمی ئەندازیار گابریا مارکیز، ئەو گەنجە بەئەدەبەی ناوەکەمان وێکدەچوو، چەپکە گوڵێکی قەشەنگی پێبڕا.. لە راستیدا بە قدوومی ئەو کۆرپەیەی کچ بوو من هەمیشە ئارەزومەندی بووم و بە نەسیبم نەبووە شیاوی ئەو چەپکە گوڵە بوو.

نە ئەندازیاری گەنج "من"ێکی تر بوو و نە کەسێکی جێگەی رێزی تر، کە ئەویش چەشنی ئێمە ناوی گابریێل گارسیا مارکیزە. بێشك "من"ێکی تر هیچ کات نامدۆزێتەوە، چونکی نازانێت لە کوێ دەژیم و چۆن بنیادەمێکم، و ناتوانێت تێبگات کە ئێمە چەندە لێك جیاین. ئەو هەمیشە بە بوونی خۆی و تەنیا ئەم شتەوە خۆشحاڵ دەبێت، لە دونیای خۆیدا، فرۆکەی تایبەتی و قەسری بە شکۆی دەبن کە دڵدارەکانیان بە شامپاین دەشۆن و دوژمنەکانیان بە هێزەوە لەناو دەبن.

ئەو ژیانی بەختەوەرانەی درێژە پێدەدات، ساماندار تا ئەوپەڕی خۆی، قەشەنگ و زۆر جوان، بێبەداخبوون لە پشت کۆمپیوتەرەکەم رۆدەنیشم، بێئەوەی گوێبدەمە هەراو هوریاکەی. هەموو شەوێ بە شوێن برادەرەکانمدا دەگەڕێم، بۆئەوەی بەیەکەوە پێکێك بنۆشین، وەك هەمیشە.. و ئەمە گەورەترین ستەمکاری لەم دونیایەدایە. "من"ێکی خۆشگوزەران و ناوبەدەرەوە ژیان دەکات، و تەنیا منم کە فریوم خواردووە.

**سەرچاوە:**

(یاداشت های روزهای تنهایی – گابریل گارسیا مارکیز – ترجمه محمد رضا راهور، انتشارات اریا بان / 1382).

# کۆماری ترس

سەمیر خەلیل (کەنعان مەکییە)

لە عەرەبییەوە: حەمە رەشید

## بەشی دووەم

### هاوڵاتی تومەتبارە ئەگەر چی هێشتا تاوانیشی نەکردبێت!

بەهەر حاڵ سالم بە هەڵەدا چوبو، چونکە لە واقیعــدا پۆلیــسی نهــێنی حــوکمی عراقــی هاوچەرخی نەدەکرد، ئەوان تەنها بەو شێوەیە خۆیــان دەردەخــست کــە ئــەو کــارە دەکــەن، لەبەرئەوەی تەنها ئەوان بە تەواوەتی جێ بڕوای دەســەڵاتی بــاڵابون، بــەڵکو لــە راســتیدا جێبەجێکاری سیاسەتەکانی ئەو دەسەڵاتە بون. ئەو شتانەش پۆلیسی نهێنی بەعسی لە هەمو دەزگاکـانی دی جیـادەکردەوە کـە کـەمتر جێـی متمانـەبون، بەڕاك نەیدەویست دوژمنی نـاوخۆ لــــە قاڵبێکـــدا دابڕێـــژێت، لەبەرئـــەوەی ئایـدیۆلۆجیای بـەعس ئامـاژەی پێـدەکرد کـە سەدام حسین دایڕشـتوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە هەمو ئایدیۆلۆجییەکی گشتیەوە لیستێك ناوی یــەهودیو ئێرانــی هەڵــدەگۆزی. بــەڕاك بــەم کارەشـــی فـــۆڕمێکی تایبـــەتی بـــە دوژمـــن دەبەخشی. ئیدی خەڵکی بە خوێندنەوەی ئەم کتێبــە دەیزانــی لــە چ کەســێك پێویــستە دوور بکەوێتـــەوەو نـــەفرەتی لێبکـــات، لـــەوەش گـــــرنگتر خـــــەڵکی دەیـــــانزانی کـــــە دوژمـــنو گومـــانلێکراو لـــە هـــەمو شـــوێنێك بوونیـــــان هەیـــــە تەنانـــــەت ئەگەرچـــــی هێـــشتا تاوانیـــشیان نـــەکردبێت. ئەمـــەش جەوهــەری وتەیــەکی ســاڵی 1979 ســەدام حـسینە کـە وردبـینیو زوو پـەیپێبردنی ئـەو دەســەلمێنێت، چــونکە ئــەوە دەردەخــات کــە ســـەدام پـــێش روداوەکـــان دەکـــەوێت، هــیچ دەزگایــەکی پــۆلیس لــە هــیچ کــام لــە حکومەتــەکانی پێــشوی عــراق دەســکەوتی لەوجۆرەی بەدەست نەهێناوە.

**سوپا، ئەفسەری سەرکوتکردن، نەک ئەفسەری نەبەرد**

سوپای عیراق بۆ ماوەی شەش دەیە ئامرازی سەرکوتکردنی هاوڵاتیانی خۆی بو، پێش جەنگی عیراق. ئێران گشت جەنگەکانی لەگەڵ هێزە دەرەکییەکان، تەنها ئەو جەنگە دۆڕاوەی بو کە لە مایسی 1941دا دژی ژمارەیەکی دیاریکراوی سوپای بریتانیا کردی و ئەو شەڕەش بە داگیرکردنی عیراق کۆتایی هات. بەشداری سوپای عیراق لە جەنگەکانی عەرەب- ئیسرائیل لە ساڵانی 1956 . 1948 . 1967دا بەشدارییەکی رەمزی بو، ساڵی 1973 دوو تیم و بەشێك بە هێزی ئاسمانی رەوانەی بەرەی سوریا کرد، بەڵام زۆرینەی سوپای عیراق بۆ سەرکوتکردنی کوردە عیراقییەکان بەکاردەهێنرا. رژێم زۆر بە شانوباڵی بەشداربونی سوپای عیراقی هەڵدەدا لە جەنگی ئۆکتۆبەردا، ئەوەش لەبەرئەوەی دەیانویست هەڵوێستی ناشایستەی یەکەکانیان لە ئوردن لە شەڕی سێپتەمبەری 1970دا (سێپتەمبەری رەش) دژی فەڵەستینییەکان بشارنەوە. سوپای عیراق لە رۆژی سەربەخۆیی عیراقەوە تەنها لە سەرکوتکردنی خێڵ و هاوڵاتیانی مەدەنی سەرکەوتو بوە. ئەو روداوانە عەقلییەتی ئەفسەرانی عیراقی زۆر بەوردی داڕشتبوو.

**سوپاو کودەتا سەربازییەکان:**

یەکەمین کودەتا لە جیهانی عەرەبیدا ساڵی 1936 لەسەر دەستی بەکر سدقی رویدا، ئەو یەکێك بو لەو ئەفسەرانەی کە سێ ساڵ پێش کودەتا، قەسابخانەیەکی لە دژی ئاشورییەکان ئەنجامدا. لەو رۆژەوە تا پەلاماری ئینگلیز لە ساڵی 1941 بۆ سەر عیراق، زنجیرەیەك کودەتا رویدا. رژێمی پاشایەتی لە رێگەی دووکەرتکردنی سوپاوە توانی بەر بەو کودەتایانە بگرێت، ساڵی 1940، عیراق 1745 ئەفسەرو 44217 سەربازی هەبو، ساڵی 1943 بەسەدان ئەفسەر یا زیندانی کران یا خانەنشین و ژمارەی سەربازانیش بۆ 30 هەزار کەمکرایەوەو دوو لەسەر سێی ئەو ژمارەیەش لە خزمەت رایانکردبو[28]. لە دەیەی دوای جەنگی ساڵی 1948 (جەنگی عەرەب- ئیسرائیل) جارێکی دی چاکسازی لە سوپای عیراق کرا، بەڵام مادامەکی ئەو بارودۆخەی سوپای بەرەو سیاسەت کێش دەکرد هەر لەئارادا بو، پاکتاوکردنە ناکۆتاکانیش بێئەنجام دەبون. زۆرێك لەو گەمەکارە سەرەکییانەی سەر شانۆی سیاسی عیراق لە دوای ساڵی 1958 لەو کەسانە بون کە لە پاکتاوکردنەکەی ساڵی 1941 رزگاریان ببو. عەبدولکەریم قاسم کە دینەمۆی سەرەکی لەناوبردنی رژێمی پاشایەتی بو لە ساڵی 1958دا، وەك سەربازێك لەژێر فەرماندەیی سدقی خزمەتی کردبو، بۆیە هەمیشە ستایشی سدقی دەکرد. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، سەرکۆماری دووەم دەورەی حوکمی بەعس، ساڵی 1938 پەیوەندی بە سوپاوە کردوەو ساڵی 1942 ئاکادیمی سەربازی تەواو کردوە.

لە نێوان ساڵانی 1958- 1968 عیراق دە کودەتاو هەوڵی کودەتای بەخۆیەوە بینی، لەپاڵ دوو شۆڕشی چەکداری و جەنگێکی نیمچە بەردەوام لەگەڵ کوردەکانی وڵات. سەربازەکان لە 25- 35٪ پۆستە وەزارییەکانیان بەدەستەوە بو، "لەنێوان 50٪ تا دوو لەسەر سێی پۆستە باڵا بڕیار بەدەستەکانیشیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبو.سێ

سەرکۆمار، هەمو سەرەك وەزیرەکان، جگە لە یەکێك، هەمو جێگری سەر کۆمارەکان، جگە لە یەکێکیان، گشت وەزیرە ناوخۆو بەرگرییەکان و زۆریك لە وەزیرەکانی راگەیاندن، سەرباز بون"[29]، ئەفسەرەکان لە فەرمانگە پیشەسازییە حکومی، کارخانەکان دادەمەزران و هێندێکیشیان وەك بریکاری وەزیر لە وەزارەتی پیشەسازی دادەمەزران. ئەو سەربازانە یەکراست لە سەربازگەکانیانەوە دەگوێزرانەوە بۆ ئەو شوێنانە، ئەمە لە حاڵێکدا لە ژیانیاندا جگە لە مانۆر، مەشقی سەربازی و کوشتنی هاولاتیانی عراقی ئەزمونێکی دییان نەبوو. جگە لە بەکرو چەند ئەفسەرێکی دی، ئەوا باقی ئەوانی دی نە بە فلتەری حیزبدا تێپەریبون، نە هیچ شارەزاییەکیان لە کاری مەدەنیدا هەبوو. بودجەی سوپا لە سالانی نێوان 1958 تا 1966دا دوو بەرابەر زیادی کرد، ئەمە لە حاڵێکدا بودجەی بەرنامەی ئاوەدانکردنەوە وەك خۆی مایەوە، یا کەمیدەکرد[30]. بەهەمان رێژەی زیادبوونی بودجەی سوپا، کارایی پیشەیی رووی لە کزی دەکردو جەنگی 1967یش ئەم ناکارایی و کەموکورتییەی بەجوانی دەرخست[31]. جەنگی شەش رۆژە سیمای ئەو داڕوخانەی سوپای بەجوانی خستەروو، ئەوەش رۆڵیکی مەزنی بینی بۆ ئەوەی حیزبی بەعس رەخنە لە رژێمی سەربازی بگرێت، تا سەرئەنجام ساڵی 1968 بە سەرنگوم کردنی ئەو رژێمە، دوەمین رژێمی بەعس حوکمی گرتەدەست.

### سوپا لە ژێر دوەم حوکمرانی بەعسدا:

لە دوەم حوکمڕانی بەعسدا چی بەسەر سوپادا هات؟ لە ناوەراستی حەفتاکاندا گۆڕانکاری بەسەر ئەرکی سەرەکی سوپادا هات، کە تایبەت بو بە سەرکوتکردنی شۆڕشە ناوخۆییەکان و بەشێوەیەکی سەرەکی توندوتیژی دژی کورد زیادی کرد، ئەو توندوتیژییەی بەپێی گوزارەی حیزبی دیموکراتی کوردستان گۆڕا بە "شەڕی دەمارگیری لەناوبردن"[32]. یەکێك لەو روداوانەی ئاراستەی نەتەوە یەکگرتوەکان کرا، روداوی 8 / ئاب / 1969 گوندی "دێکان"ی سەر بە موسڵ بو، شەست و حەوت مرۆڤی کورد لە ژن و منالّ و پیرەمێرد لە ترسی تۆپبارانی سوپای عراق بەرەو ئەشکەوتێك دەچن، سوپاش ئاگر لەئەشکەوتەکە بەردەدا و بەزیندوێتی دەیانسوتێنێت[33].

### شەڕی لەناوبردنی کورد:

لە ئازاری 1974دا دوا قۆناغی شەڕی کورد هەلایسا. لە یەکەمین مانگی ئەو شەڕەدا شارۆچکەی زاخۆو قەلادزێ کە ژمارەی دانیشتوانەکەیان 25000و20000 هەزار کەس دەبون، لەگەڵ خاکدا یەکسان کران. فرۆکەکان بەشێوەیەکی رێکوپێك و رۆتینی بە بۆمبی ناپاڵم و چەندین بۆمبی دی گوندەکانی کوردستانیان بۆردمان دەکرد. بەسەدان هەزار کورد لە شاروشارۆچکەو پێدەشتەکانەوە بەرەو چیاکانی کوردستان هەلاتن[34]. لە نێو خەڵکە راکردوەکاندا بەدەیان مامۆستا، کرێکار، پزیشك، یاسازان، خوێندکار بە خۆیان و سەرلەبەری خێزانەکانیانەوە دەبینران[35]، لەئەنجامی ئەو روداوانەی ولاتی تەنیووە، شەپۆلێك لە گرتن و راگواستن و لەسێدارەدانی هەرەمەکی (بۆ نمونە لەسێدارەدانی پێنج خوێندکاری کورد لە زانکۆی بەغدا)، تیرۆر،

لەسێدارەدانی ئاشکرا (لەوانە هەڵواسینی 11 نوێنەری کورد لە هەولێر)، ئەمە لە پاڵ ئەوەی کە هەزاران کەس لەشەڕی یەکساڵەدا برینداری بون، سەرچاوە کوردییەکان پێیانوایە لەکاتی داڕوخانی شۆڕشی کورددا، پێنج هەزار کەس لە ژن و منداڵ و پیرەمێرد، ئەوانەی توانای هەڵگرتنی چەکیان نەبو، لەکاتی راکردندا گیانیان لەدەست داوە، هەروەها هەزاران پێشمەرگەش لەکاتی خۆدانەدەستەوەیان بە حکومەتی عێراق، دەمودەست گولەباران دەکران[36]، ژمارەیەکی زیاتریش روویان لە ئێران کرد.

**حەکایەتی عەلی عەباس:**

"عەلی عەباس یەکێك بو لەو پێشمەرگانەی لەریزی پێشمەرگەکانی مستەفا بارزانی پێشمەرگایەتی کردوە. لەدوای داڕوخانی شۆڕشی کورد، بەهاورێیەتی هەزاران پێشمەرگەی دی روویکردە ئێران و لە ئەسفەهان جیشتەجێ بوو، لەکاتی راوکردندا ئاشنایەتی لەگەڵ ئەفسەرە ئێرانیەکان پەیدا کرد، کچە تازە لەدایك بوەکەی ناونا " غەریبە"، کە حکومەتی عێراقی جارێکی دی لێبوردنی دەرکرد لەگەڵ بیست خێزان بۆ عێراق گەڕایەوە.

هەر لە سنور بەرەو عێراق پەڕییەوە، هەستی بە نیگەرانی دەکرد، دەترسا لەوەی کەوتبێتە داوەوە، تێگەیشت کە حکومەتی عێراق دەستی کردوە بە دەرکردن و راگواستنی هەزاران کورد، ئەوانەی بۆ نیشتمان گەڕاونەتەوە، لەوپەری باشورو ناوچە عەرەبنیشینەکان نیشتەجێ کراونەتەوە، بەڵام عەباس لەوە نەدەترسا هەروەکو بە لیژنەی پێشوازی راگەیاند، بەڵکو لە خراپتر دەترسا، وەك دەست بەسەراگرتن و ئەشکەنجەدان و تەنانەت لەسێدارەدانیشی، ئەمەش بەتەنها دڵەڕاوکێی ئەو نەبو، بەڵکو هەموو گەڕاوەکان ئەو ترسەیان هەبوو، بەدڵنیاییشەوە باوەڕی بە وتەی پیاوانی دەوڵەت نەدەکرد، کە ئەو شتانە هیچی روناداتو هەمان رۆژ دەگەڕێنەوە گوندەکانی خۆیان"[37].

خۆزگە نەدەگەڕایەوە، راستی و دروستی هەستو بۆچونەکانی لەدەست دابو!

**تراژیدیای نیشتەجێ کردنەوەی کوردەکان:**

پێوەری ر استەقینەی هەر رژێمێکی تیرۆریستی لە ژمارەی قوربانیەکانی سەردەمی ئاشتیدا دەردەکەوێت، نەك ژمارەی ئەو قوربانیانەی لە ئەنجامی شەڕەکانی رژێم گیان لەدەستدەدەن. شۆڕشی رزگاریخوازی کورد لە ئەنجامی پشتتێکردنی شا لە رێکەوتنامەی جەزائیر، لەنێوان ئێران و عێراق لە ئازاری ساڵی 1975دا، داڕوخا. بەوەش رێگە لەبەردەم سوپای عێراق ئاواڵەبو تا بە کۆمەڵ کورد بۆ ئەو ئۆردوگایانە بگوێزێتەوە کە لە ناوچە بیابانیەکانی باشوری رۆژئاوای عێراق بۆیان ئامادەکرابو. خێزانە کوردە هەشبەسەرەکانیان بەسواری ماشینی سەربازی بۆ رۆژئاوای روباری فورات گواستەوە.

بەئاگاداری "ئەنجومەنی باڵای کاروباری باکور" کە سەدام حسێن، سەرۆکایەتی دەکرد، شوێنی نیشتەجێکردنی کوردەکان دەستنیشان دەکرا. سوپا شەوانە خێزانە لادێیەکانی بەسواری ئۆتۆمۆبیل لەشێوەی کاروانی سەربازی دەگواستەوە و کاتێك دەگەیشتنە شوێنی مەبەست، هەر پێنج خێزانیان لە گوندێکی بچوك نیشتەجێ دەکرد، پارەیەکی

ناچـــیزیان بـــە هـــەر خێزانێـــك دەدا، ئنجـــا پیاوەکانیان لەسەر ئەو پیشەو وەزیفانە دانا کە حکومەت دیاری دەکرد و ڕێوشوێنی توندیشیان بۆ جوڵەو جێگۆڕکێیان گرتەبەر. لە 85٪ی ئەو کوردانـــەی لـــەدوای لێبوردنـــەوە گەڕانـــەوە بـــۆ عێراق، یا لەلایەن شاوە دەرکران، ڕەوانەی ئەو ئۆردوگایانە کران.

بەعسیەکان هەوڵیانـدا کـوردی پارێزگاکـانی دیالە (سەعدیە، خانەقین، شارەبان و مەندەلی)، کەرکوك (کفری و توزخورماتو) و موسڵ (سەفین، سـنجارو عـەین زالـە) بـۆ ئـەو ئۆردوگایانـە بگوێزنەوە کە لانی کەمی خزمەتگوزارییان تێیدا نـەبوو، ئـەو هەواڵانـەی لەرێگـەی ئـەو سـەربازە عراقیانـەی پاسـەوانی ئۆردوگاکانیـان دەکـرد دزەیان دەکرد، باسیان لەوە دەکرد کە چۆن ئەم میللەتە سەرفرازە چیاییە لەو بیابانەدا بەدوای تانکەری ئاودا رایاندەکرد تا ئەو بەشە ئاوەی حکومـەت بۆیـانی دیـاریکردوەو بەشـی هـیچ ناکات، وەربگرن[38].

تـا دۆسـیەی مەسـەلەی کـورد نەخرێتـەروو، نـــاتوانرێ ژمـــارەی راســـتەقینەی کـــوردە دورخراوەکـان بزانرێـت. بـەڵام خەمڵاندنـەکان جیاوازن، گۆڤاری ئیکۆنۆمیست ئەو ژمارەیە بە 50000 کەس دەقەبڵێنێ، ئەویش لە وتارێکدا کە ستایشی حیزبی بەعس دەکات، سەبارەت بـەو ریفۆرمـە ناوخۆیانـەی کـە لـە عراقـدا جێبەجێی کردوە، کەچی ئاماری ئۆپۆزیسیۆنی کـوردو بـەرەی نـەیاری حیزبـی بـەعس ئـەو ژمارەیە بە 300000– 350000 کەس لەقەڵەم دەدا[39]. لە راستیدا تاوانێکی بەو قەوارەیە کە دوای چـەندین سـاڵ هێـشتا هـەر بـە ئـاڵۆزی ماوەتەوە، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر سروشتی تاوانکارانەی رژێمی بەعس. بەڵام ئەو سوپایەی

کـە لـە نیـوەی دوەمـی حەفتاکانـدا سیاسـەتی حیزبی بەعسی پیادە دەکرد زۆر جیاوازە لەو سوپا کۆنەی کە لە شەستەکاندا لە چوارچێوەی حکومـەت یـا لـە دەرەوەی حکومـەت ئەرکـەکانی ئەنجام دەدا. سوپای دەیەی شەستەکانی عراق بە ئامرازێکی رامکراوی حیزبی بەعس گـۆڕا. لێرەدا سێ هۆکار ئەم گۆڕانە راڤەدەکات:

یەکـەم گـۆڕان هەڵمـەتی پاکتـاوکردنی پلـە باڵاکانی ناو سوپای عراقی گرتەوە، کە لە کۆی سی و پێنج کەس شازدە کەسیان پاکتاوکران، ئنجا پاکتاوکردنە ئەو کەسانەی گرتەوە کە لە دەرەوەی حیزبی بەعس بـون، پاشـان ئەوانـەی هاوسـۆزییان لەگـەڵ حیزبی بەعسدا نـەبو، وەك نــایف، داود، ئەنــساری و عوقــەیلی، دواتــر پاکتــاوکردن ئەندامــە ناودارەکــانی سوپاشــی گرتـەوە، ئەوانـەی هێـزو توانایـان لـەناو خـودی ســوپاوە سەرچــاوەی دەگــرت، وەك حــەردان تکــــریتی، عــــەماش، نــــەقیب و نوســــرەت، ســـەرئەنجام پاکتـــاوکردن گەیـــشتە ئەحمـــەد حەسەن ئەلبەکرو تاقمەکەی لە ساڵی 1979دا (بڕوانە بەشی دوەم). گشت ئەو رێوشوێنانە جـــەخت لەســـەر قۆناغـــەکانی دامەزرانـــدن و بەهێزکردنی حیزبی بەعس لە عراق دەکەنەوە.

هەڵبەتـە پاکتـاوکردنی گروپـی یەکـەم کـە ئەفـسەرگەلێکی لەبابـەت نـایف و داودی لـە خۆدەگرت، کارێکی حەتمی و قابیلی پێشبینی کردن بو، چونکە چۆن دەبێ ئەو ئەفسەرانەی رۆڵێکی بەرچاویان لە سەرنگونکردنی رژێمـی عەبدولـــسەلام عـــارف هـــەبو، ئەوەنـــدە ساکاروســاوێلکە بــن کــە فــەرمان لــە حیزبــی بەعسەوە وەربگـرن، بێئـەوەی ئینتمایـان بـۆی هـەبێت و بیـشیانەوێت لەدەسـەڵات بمێننـەوە. بـــەڵام لایـــەنی یەکلاکـــەرەوەی گروپـــی دوەم

حەردان تکریتی بو، کە لە ساڵی 1963دا فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەعسیەکان بوو، ساڵی 1968یش بوە سەرۆکی ئەرکان و وەزیری بەرگری، هەروەکو زانراوە حەردان تکریتی، وەك ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو سەدام حسێن خەڵکی تکریت بو، کاتێك حەردان بوە لایەنگری باڵی میلیتاری ناو بەعس لە دژی باڵی مەدەنی، ئیدی بیر لەدەرکردنی کرایەوە، ئەوەش بە ناکۆکی خستنە نێوان خۆی و عەماشی نەیاری بو، عەماشی وەزیری ناوخۆو ئەندامی بەرجەستەی حیزبی بەعس، باڵی مەدەنی بەرێبەری سەدام حسێن لایەنگری لە عەماش دەکرد، بەوەش هەردوولایان لاوازبون.

دوودڵی و دڵەڕاوکێ کەوتە نێو ریزەکانی حیزبەوە، ئەمەش بەکری والێکرد لە 3 / نیسانی / 1970دا حەردان و عەماش وەك دوو جیگری خۆی دامەزرێنێت، بەوەش لە دوو هەستیارترین وەزارەتی دوورخستنەوە (وەزارەتی ناوخۆو بەرگری)، بەڵام بەوە کێشەکان کۆتایی نەهات، لەکاتێکدا حەردان لە دەرەوەی وڵات بو، لە پۆستەکەی لابراو کرا بە باڵیۆزی عراق لە کوێت، بەڵام حەردان ئەو پۆستەی رەتکردەوە، بۆیە دوای ماوەیەك لە رێگەی چوار چەکدارەوە کە نە دەستگیرکراون، نە ناسراونەتەوە لە کوێت تیرۆرکرا[40]. بەڵام ئەفسەرو پلەدارو سەربازەکانی دی زۆر بەسانایی پاکتاوکران. لەسەرەتای گەیشتنی بەعس بەحوکم پاکتاوکردنی ئەفسەرو سەربازان کارێکی زۆر ئاسایی بو. تا کار گەیشتە ئەوەی یەکێك لە ئەندامانی حیزبی بەعس بە "داڤید هێرست"ی راگەیاند "کاتێك دەمبینی بەهەزاران سەربازی پیشەیی پاکتاودەکرێن، سەبارەت بەتوانای سەربازیی توشی نیگەرانی دەبوم، بەڵام جەنگی ئۆکتۆبەرو سەرکوتکردنی کوردەکان نادروستی ئەم بۆچونەمی سەلماند"[41].

راپۆرتی سیاسی ساڵی 1974 بیرۆکەی سیاسەتی پاکتاوکردن لە نێو ریزەکای سوپای عراقدا روونده‌کاتەوە:

"زۆر دەمێکە حیزب بەپەرۆشەوە هەوڵدەدا سەرکردایەتی لەناو هێزە چەکدارەکاندا پتەوبکات و هەمو پیلانگێرو گومانلێکراوێکیش پاکتاو بکات و پرەنسیپی نەتەوەیی عەرەب و سۆسیالیستی لەنێو سەربازەکاندا بچێنێت، فیکری سیاسی و سەربازی بەجۆرێك بونیات بنێتەوە تا یەکە سەربازییەکانی عراق بە باشترین شێوە ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن، دژی لادانەکانی رژێمی قاسم و عارف و دەستوپێوەندە ئۆرۆستۆکراتە سەربازییەکان بیانپارێزێت، بەمشێوەیە سوپا و میللەت بە رێبەری حیزب یەکگرتو دەبێت"[42].

بەڵام گۆڕانکاری دوەم کە یارمەتی بەهێزکردن و یەکپارچەیی حیزبی دا، دەرکردنی سیستمێکی تازەی دیاریکردنی بەرپرسیارییەت بو، کە رێگەی بە ئەندامانی حیزب دەدا لە ئیشوکارەکانیاندا سەرپێچی لە فەرمانی بەرپرسە ناحیزبیەکانیان بکەن، ئەگەر بچوکترین گومان لە سروشتی ئەو فرمانە یا لەگەڵ رێنماییەکانی حیزبی بەعس ناکۆك بکەوتایەتەوە.

لاوانی بەعسی، ئەوانەی قۆناغی ئامادەییان تەواوکردبو لە کۆلێجی سەربازی وەردەگیران و بەگوێرەی پلەی حیزبایەتیان مەشقی شەش، دوازدە یا بیست و چوار مانگەیان پێدەکرا ، پاشان وەك ئەفسەر پەیوەندییان بە یەکە

سەربازییە جیاوازەکانی سوپای عێراقەوە دەکرد تا کار بکەن بۆئەوەی ئەگەر بڕیارێکی گرنگ دەرچو، بەبێ ڕەزامەندی حیزب جێبەجێی نەکەن.

"حیزب لە ماوەی چەند ساڵێکدا توانی سیستمێکی کارا لە نێوەندی هێزە چەکدارەکان لەژێر سەرپەرشتی سەرکردایەتی حیزب دامەزرێنێت، هاورێیانمان لە سوپادا سەلماندیان کە خاوەنی دیسپلینێکی بەرزن لە دڵسۆزیان بۆ حیزب، ئەو هەڤاڵانە بەفیکرو چالاکیان بەشداریان لە گەشەپێدان و بەهێزکردنی حیزب کرد، تا کار گەیشتە ئەوەی حیزب لەگەڵ ئەفسەروسەربازە دڵسۆزەکان بوونەتە باسکی بەهێز بۆ پاراستن و سەرکەوتنی گەلە مەزنەکەمان"[43].

گۆڕانی سێیەم، بڕیتی بو لە دوورخستنەوەی سوپا لە سەرکردایەتی حیزب و ڕێگەنەدان بەسەرکردایەتی عەسکەر پۆستی باڵا لە سەرکردایەتی حیزب بەدەستبهێنن، هەروەها کۆلێجی سەربازی تەنها ئەوانەی وەردەگرت کە ئەندامی حیزبی بەعس بوون و هەمو ئەو ئەفسەرو سەربازانەش خانەنشین کران کە گومان لە بەعسیبونیان دەکرا، هەر چالاکییەکی سیاسی پەیوەندی بە حیزبی بەعسەوە نەبوایە بە خیانەت لەقەڵەم دەدرا.

گۆڤاری "افاق عربیە" بەعسی لە وتارێکیدا پوختەی ئەم سیاسەتەی حیزبی ڕوونکردۆتەوە: "بڕیاری مۆنۆپۆڵ کردنی چالاکی سیاسی لەناو هێزە چەکدارەکان تایبەت بە ئەندامانی حیزبی بەعس، پەیوەستە بەوەی کە تەنها وەفاداری و دڵسۆزی بۆ بەعس تاکە زامنی یەکڕیزی سوپا و ئەنجامدانی ئەرکە میلی و نەتەوەییەکانێتی، ئەمە سەرباری ئەوەی دەرگا لەبەردەم خەڵکانی دژ بەمیلەتیش دادەخا..

لەبەر ئەو هەموو هۆیانە شۆڕش و سەرکردایەتیەکەی هەتەرن (حریص) ڕێگە بە هیچ ڕەگەزێکی سیاسی بە بەرەی پێشکەوتوخوازیشەوە (ئیتلاف بەعسیەکان لە حکومەتدا) نەدەن، چالاکی سیاسی لەناو هێزە چەکدارەکاندا بکات. هەر لە سەرەتاوە رامانگەیاندوە " هیچ بەرەیەك لەناو هێزی چەکداردا نیە" ، تەنها حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ماف پیادەکردنی سیاسەتی لەناو هێزە چەکدارەکاندا هەیە، بۆیە هەر کەسێك چالاکی سیاسی لەدەرەوەی چوارچێوەی حیزبی سەرکردە . حیزبی بەعسی عرەبی ئیشتراکی . لە ناو سوپادا بکات، توندترین سزا دەدرێت"[44].

هەر سەربازێکی عێراقی تەنها ئینتمای بۆ هەر ڕێکخستنێکی سیاسی هەبێت، ئیدی بەدەر لەوەی سروشتی چالاکی ئەو ڕێکخستنە چییە، بەس بو تا بە خیانەتی مەزن تاوانبار بکرێ، ساڵی 1976 چەندین سەرباز بە تومەتی ئەندامبونیان لە حیزبی شیوعی عێراقدا لە سێدارەدران، "لەپاڵ ئەوەشدا هەر سەربازێك لە دوای 17 / 7 / 1968ەوە لە خزمەتی سەربازی دەربکرایە، یا هەر پۆلیسێك ئینتمای بۆ ڕێکخراوێکی سیاسی هەبوایە، جگە لە ئینتمای بۆ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، لە سێدارەدەدرا"[45]. لە ڕاستیدا هەر داوایەك دژی هەر پۆلیس یا سەربازێك، بەوەشەوە کە دوای مۆڵەتی ئاسایی بۆ سەر کارەکەی نەگەڕاوەتەوە، سزای لەسێدارەدانی بەسەردا دەسەپێنرا.

دەکات و جیاوازی ئەساسی لە نێوانیاندا نابینرێت.

لە پانتاییەکی فراوان لە مێژو کە سەرەتاکەی بۆ کەس ئاشکرا نیە، کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان کە رۆحێکی ناسك و بیرێکی راهێنەرانەیان هەبو، لە گەڕان بەشوێن داوای زاتی و قوڵی ژیانی خۆیان، زانستێکیان داهێنا کە هیندیەکان پێیان وت یۆگا. ئەوان بە کەڵك وەرگرتن لە رێنماییی و نەوا ئاسمانیەکان توانیان میتۆد و هونەرێك دابهێنن بۆ دەرخستنی توانا شاراوەکانی خۆیان و هەروەها بۆ فراوان کردنی مەودای دیتن و موشاهەدەی دەرون.

مەبەست لە ئەنجامدانی ئەم تەکنیکانە گەیشتن و قوڵبونەوە بوە لە قوڵترین داواکاریە رەسەنەکانی خۆیان، واتە شادی و خۆشی بێ هاوتا (ئانانـدام *Anandam*)، و فراوانکردنی ڕوانینی دەرونی و مەودای بینینی شتەکان لە گۆڕەپانە جیاوازەکانی ئاگایی یاخود ئاگایی بێ وێنە (چیتام *Chittam*)، و لەدەرەنجامدا دەرکی ڕاستی و هەقیقەتی "خود" یاخود هەقیقەتی بێ وێنە (ساتیام *Satyam*) بوە.

بە کۆمەڵەی ئەو بارودۆخانە لەگەڵ ئەو ئامۆژگاری و رێنوێنی و رێساو بنەمایانەی کە بۆ گەیشتن بەو بارودۆخانە بەکاردەهێنرێت یۆگای پێ دەوترێت.

مامۆستایانی یۆگا بەپێی توانایی دەرکو نیازی موریدان و یارانی خۆیان و بەپێی قۆناغەکانی فێرکردنی خۆیان، بەمەبەستی رونکردنەوەی زهن و بیری فێرخوازان پێناسەگەلی جیاواز و جۆراو جۆریان بەدەستەوە داوە. هەربۆیە لەوانەیە فێرخوازێکی یۆگا لەماوەی قۆناغەکانی خۆیدا، لەلایەن مامۆستاو پیرەکەی خۆیەوە پێناسەگەلێکی جیاواز ببیستێت. پێناسەگەلێك کە ئامانج و پێکهاتەی ڕاهێنانەکانی فێرخواز پێکدەهێنێت و بۆ پێشەوەی دەبات. بەڵام لە راستیدا ئەو ئەحواڵ و بارودۆخە قوڵەی کە یۆگای پێدەوترێت ناتوانرێت بە هیچ زمانێك بگەیەنرێت تەنها لە دوای ساڵانی زۆر لە ئەنجامدانی چاودێری و سادانا (*Sadana*)[6] فێرخوازێکی راستگۆ دەتوانێت وزە شاراوەکانی خۆی بخاتە گەڕو گۆڕەپانی دیتنی دەرونی خۆی فراوان بکات.

وەك ئەوەی عارفی گەورەی هیند پاتانجالی وتویەتی: "راهێنان و پراکتیزەکردنی یۆگا ئەوکاتە بەهێز و سەقامگیر دەبێت کە بۆ ماوەیەکی زۆر بەعەشقەوە بەردەوامی پێ درابێت" (یۆگاسوترا 1/14). تاکو ئەو کاتەی خۆمان ئەزمونی ئەم حاڵەتە نەکەین پێناسەو شیکردنەوەکان ناتوانن ئەم چۆنیەتیانە لە ئێمەدا دەربخەن. پێناسەکان تەنها زهنی ئێمە رون دەکەنەوەو بیری ئێمە ئاسودە و مەستی ئەنجامدانی ئەم راهێنانانە بەشێوەی ئەقڵی بۆ ئێمە دەردەخەن، بەڵام ئەم ڕاژەکردنانە هیچ کاتێك ناتوانن تیشکێکی ڕاستەقینە لە هەقیقەت لەسەر دڵی یۆگی دەربخەن ، چونکە دەرخستنی ئەم تیشکە پێویستی بە دواکەوتنێکی جیدی و رێك و پێك هەیە.

ئێستا یەکێك لە پێناسەکانی یۆگا کە لەلایەن پاتانجالی عارف و رۆشنبینی گەورەی هیندی کۆن دراوەتە دەست شی دەکەینەوە. پاتانجالی یەکەم کەسە کە فەلسەفەو بۆچون و بیرو ئەندێشەو هەندێك لە تەکنیکەکانی یۆگای بە زمانی سانسکریتی نوسیوەتەوە. کتێبەکەی ئەو (یۆگا سوترا–*Yoga Sutras*) بەیەکێك لە

گـەورەترین و بـەنرخترین نوسـراوەکانی یۆگـا دەژمێردرێـت. شـیکردنەوەکانی پاتانجـالی سـەبارەت بـە یۆگـا یارمەتیـەکی گەورەیـە بـۆ هەرکەسێك کە دەیـەوێت دەرکی ئەزمونی یۆگا بکات. ئەو یۆگای ئاوا پێناسـەکردوە و دەڵێت: "یۆگـاس چـیتە ڤریتـی نیرودهـە"[7] پاتانجـالی تـەنها بەکـەڵك وەرگـرتن لـە سـێ وشـەی (چـتا، ڤریتـی، نیرودهـا) وەهـا قوڵاییـەك لـە فەلـسەفەو مانـای یۆگـا روندەکاتـەوە کـە دەبێتـە جێـی سەرسـوڕمانی هـەر لێکۆڵـەرێك. باشـتر وایـە کـە مانای هـەرکامێك لـەم سێ وشانە بێنمەوە یادو دواتر باسی تەواوی ئەم پێناسەیە بکەم.

چـیتا لـە ریـشەی "چـیت" ەوە هـاتوە کـە مانـای بیـنین و ئاگـایی پەیـداکردن لەسـەر شتێکە، لـەم ڕوەوە چیتا دەبێتـە ئاگایی ڕەهای تاکەکەس. لە زمانی سانسکرێتیدا وشەی ڤریتا بـەمانای بازنـەی داخـراوو ڤـریتیتیش بـەمانای "بازنـە" دێـت. نیرودهـا لـە ریـشەی "ڕودا" بـەمانای کـرداری کوژانـەوەو ڕاگـرتن بەرچـڤە کـراوە، نیرۆدهـا واتـە کوژاندنـەوەو وەسـتاندن و "ڤیرودهـا"ش دژی ئـەوەو بـەمانای کردنـەوە دێت. بەم تەرتیبە مانای سوتراکە بەم شێوەیەی لێدێت: "یۆگا پێکدێت لە وەستاندن و راگرتنی ئاگایی لـە قـەبوڵکردنی چوارچێوەگەلی داخـراوو سنوردار".

بـۆ ڕونبونـەوەی مانـای ئـەم سـوترایە باشـتر وایـە سـەرەتا بـاس لـە قۆناغـەکانی چیتا یـاخود "ئاگـایی" تاکەکـەس بکـەین. لـە نوسـراوەکانی یۆگـا بەتایبـەتی مانـدوکیا ئوپانیـشاد ئاگـایی لەچوار مـەودادا باسـی لێوەکراوە، مەودایـەکیان بنچینەیە و سێ مەوداکەی دیکەش دەرکەوتـەی ئـەون. بـەزمانی سانـسکرێتی ئـەم چـوار قۆناغـە بریتین لە:

1. چاگرەت *Jagrat*.
2. سواپنا *Swapna*.
3. سوشوپتی *Sushupti*.
4. توریا *Turya*.

**جـاگرەت** لـەدونیای بـچوکدا واتـە "نـاخ و دەرونـی مـرۆڤ" قۆنـاغی هۆشـیاری و بێـداری پێدەوترێت. لـەم قۆناغـەدا هەسـتەکان و ئـەقڵ و نەفس چالاکن لەبەرئەوە وتراوە جاگرەت حەوت ئەندامی هەیە (پێنج هەستەکەو ئەقڵ و نـەفس). سـواپنا قۆنـاغی خـەوو خەیاڵـە، لـەم بارودۆخـە ناسکەدا وێنەی خەیاڵ دەرفەتی خۆدەرخستن و دەرکـەوتنی هەیـە. وێنـەکان و نیـشانەکانی خـەیاڵ زمـان و ئـەلف و بێـی جیـاوازی ئـەم جیهانەیـە کـە هەڵبـەت پەیوەنـدی زۆر ناسـکی هەیـە لەگـەڵ قۆنـاغی پێـشودا. سۆشـۆپتی قۆناغی خەوی قوڵ و بێ خەیاڵیە کە لێرەدا هیچ جـۆرە نیـاز و داواکاریـەك لـە ئاگـایی مرۆڤـدا دروست نابێت. ئەم سێ قۆناغـەی ئاگایی (واتـە بێـداری/ هۆشـیاری، خـەیاڵ و خـەوی قـوڵی بێخەیاڵ) بارگەلێکن کـە هـەرکام لـە ئێمـە هـەموو ڕۆژێـك سـەروکارمان لەگەڵیانـدا هەیـە. بـەهۆی زانستی تازەوە دەزانین کە لە هەرکامێك لەم سێ قۆناغە لەرینەوەی شەپۆلە کارەباییەکانی مێشك جیاوازە کە دەبێتـەهۆی ئـەوەی ئاگایی ئێمـە لـە هەرکامێك لەم سێ قۆناغەدا جیاوازبێت .

لـە قۆنـاغی بێداری و هۆشـیاریدا دەسـەڵاتی زیـاتر هەیـە، توانـایی کـۆنترۆڵ وە لێکۆڵینـەوە لەسەر بابەتە هەستەوەریەکان لە ئێمەدا زیاتر و فراوانتربـوە. بـەڵام لـە خەیاڵـدا هـەمو شتێك بـە تیـژی تێپـەر دەبێـت، توانـای ئێمـە لـەم مـەودا بچوکەدا زۆر کەمەو ئاگایی ئێمە زۆر پەرێشان و لاوازە. لـە خـەوی قوڵیـشدا ئاگـایی خۆمـان بەتەواوی لەدەست دەدەین. بەم پێیە زانیمان کە

"تایبەتمەندی ئاگایی" ئێمە لەم سێ قۆناغەدا بەتەواوی جیاوازە. مەبەست لە "تایبەتمەندی ئاگایی" مەودایەك لە وزەیە کە ئێمە لەودا ئامادەو بەئاگاین و توانای کارکردنمان تیایدا هەیە، بۆ نمونە ئێوە لە پۆلێکدا دانیشتون و مامۆستاکەتان وانەتان پێ دەڵێت، بەڵام گوێی پێنادەن و گێرۆدەی بیرکردنەوەکانی خۆتانن، لێرەدا شەپۆل و ئامۆژگاریەکانی مامۆستا لە "تایبەتمەندی ئاگایی" بێداری ئێوەدا نیە. ئەوەی کە باسمان کرد لەوانەیە لە وانەوتنەوەیەکی یۆگادا ڕوبدات، بەڵام مامۆستای یۆگا کە کۆنترۆڵێکی باشتری هەیە لەسەر شەپۆلە ناسکەکانی ناخیەوە و توانای کۆنترۆڵکردنی خەیاڵەکانی هەیە و دەتوانێت شەپۆلێکی ناسك بۆ فێرخوازانی خۆی بنێرێت. لێرەدا ئەگەر فێرخوازان هیچ جۆرە تایبەتمەندیەکی ئاگایی لە مەودای خەیاڵیاندا نەبێت ناتوانن ئەو ئاگاییەی کە لە مامۆستاوە پێیان گەیشتوە وەری بگرن.

با بێینەوە سەر بابەتی "بێداری" ، دوو مەرج پێویستن بۆ ئەوەی بتوانین دەرکی قوڵ و هەمەلایەنەی دونیای بێداری بکەین. یەکەمیان هەستی تەندروست و هەبونی توانایی فکری و تەندروستی مەزاجە، دوەمیان پەیوەست نەبونی زهنە. بەم شێوەیە ئێمە دەتوانین دەرفەتی دەرکەوتن و هەبونی خۆمان لە کەوندا زیاتر و فراوانتر بکەین.

ئەگەر بێت زهنی خۆتان لە نێوان چوارچێوەگەلی داخراوو دوبارەدا ببەستنەوە تایبەتمەندی ئاگایی ئێوە بە بچوکی دونیا بچوکە سازکراوەکەی خۆتان دەبێت. لەحاڵێکدا ئەگەر ئێوە لە چوارچێوەگەلی داخراوو سنورداری بیروباوەرو عاداتی زهن زیاتر بڕۆن و خۆتانی لێ ڕزگارکەن، ئەوا دەتوانن گەورەیی و شکۆداری گەردون دەرك بکەن و ببینن.

ئازادی زهن لە ڕۆتین و شتە سنوردارەکان و هەستگەلی بەرامبەر بەودا دەبێتە هۆی ڕێنوێنی چرای ئاگایی و هۆشیاری ئێوە بەرەو ڕوکارە ناسکەکانی گەردون. ئەم فراوانبونەی ئاگایی دەبێتە هۆی چونە ناوەوەی هێزی هۆشیاری ئێوە بۆ ناو مەوداکانی خەیاڵ و لە کۆتاییدا خەوی قوڵ. ئەمە بارودۆخێکە کە لە چاودێری قوڵدا دێتە پێش. لەو شێوەیەدا تەنانەت لەماوەی خەوی سروشتیشدا هۆشیاری ناسك و گەشەپێدراو لەدەست ناچێت. ئەگەر ئاگایی ئێوە ئاوەها ناسك بویەوە و گەیشتە کەماڵ و یەك پارچە کرا، ئێوە دەکەونە قۆناغی چوارەمی ئاگایی واتە ئاگایی یەکپارچەو یەکگرتوو. لێرەدا قەبارەیەکی گەورە لە وزە و هێز لە مرۆڤدا ئازاد دەکرێت و ئەو دیوارە گەورانەی کە لە نێوان ڕوکارەکانی ئاگاییدا جێگیر بون دەڕوخێن[8]. لە ماندوکیا ئوپانیشاد دا سەبارەت بەم بارودۆخە وتراوە: "ناتوانرێت بگوترێت کە ئەو زانایە یان نەزان، ئەو لە گوماندا ناگونجێت و پێناسەناکرێت و هیچ ئاوەڵناوێك شیاوی ئەو نیە". ئاگایی لەم قۆناغەدا ئەوەندە لە ئاگایی ئاسایی و هەستپێکراو دورە کە چۆن پێناسە بۆ نەزانی دەکەین ئاواش دەتوانین پێناسەی ئەو بکەین.

بۆ گەیشتن بە قۆناغی یەکپارچەیی و یەکگرتویی ئاگایی پێویستە لە هەنگاوی یەکەمی ئاگای بێداری و هۆشیاریدا خۆمان لە چوارچێوەگەلی دەستکرد ڕزگارکەین. جاری وا هەیە ئێمە لە ڕوی نمونە کۆنەکانی خۆمان نمونەی تازە دروست دەکەین، بەڵام لەبەرئەوەی کە لە ناوەڕۆکەوە گەشەمان نەکردوە واتە وزەی

پێویست بۆ کارکردن لە پانتایی گەورەترمان پێ نیە تەنها خۆمان ماندو دەکەین. وابزانن کە ئێوە گەشتونەتە ئەو باوەڕە کە نابێت لەگەڵ کەسدا شەڕ بکەن و توڕە ببن، ئێستا ئەگەر کەسێك ئێوە پەشێو بکات و ئێوەش خراپ لەگەڵیدا بجولێنەوە، ئەوا دوای ماوەیەك کە بەبیری خۆتانی دێننەوە خۆتان سەرزەنشت دەکەن و لە هەڵوێستی خۆتان پەشیمان دەبنەوە. ئەم نمونەیە ئەو خاڵە روندەکاتەوە کە راستە ئێمە نمونەیەکی گەورەتر لە سنورەکانی خۆمان لەدەستدایە (وەکو نمونەی راستبێژی و پاکداوێنی و سینەفراوانی و...) بەڵام لەوانەیە نەتوانین بەپێی ئەو نمونەیە بجولێینەوە چونکە بەهۆی حەزێکی تاریك و هەستێکی نەشیاوو نالەبار ئێمە ناتوانین کارێکی رەسەن ئەنجام بدەین کە گونجاو بێت لەگەڵ پێکهاتەو بنەمای سروشتی راستەقینەی خۆمان. بەهەرحاڵ رون بویەوە کە مەبەست لە چیتە ڤریتی رۆتین و چوارچێوەگەلی زهنین کە وزەو ئاگایی ئێمە لە روکارەکانی بێداری و خەیاڵ و خەودا دەبەستنەوە. ئێمە وەکو مرۆڤ توانایەکی فرە زۆرو جادوییمان هەیە، بەڵام تەنها بە کەڵك وەرگرتن لە ئەندێشەو زهنی خۆمان دەتوانین ئەم وزەیە بێنینە جوڵەو ئاگایی خۆمان فراوان بکەین. زهنێك کە دیل کرابێت و ئەندێشەیەك کە سنوردارکرابێت ناتوانێت ئەزمونی ئەم ئاگاییە بێ سنورە بەدەست بهێنن.

لێرەدا پێویستە سێهەمین وشەش کە پتانجالی لە پێناسەکەی خۆیدا بەکاری هێناوە باسی لێبکرێت. شیکردنەوەی ئەم وشەیە خاڵی زیاترمان بۆ ئاشکرا دەکات بۆ رونکردنەوەی واتای سوتراکە. سێهەمین وشە واتە "نیرۆدها" شێوازێکە لە زهن واتە زهنی ئازادکراوە. لە روانگەی یۆگاوە زهن لەوانەیە بە پێنج بارودۆخی جیاواز دەربکەوێت[9]، شێوازەکان ئەمانەن.

1. مودها *Moodha*.
2. کشیپتا *Kshipta*.
3. ڤیکشیپتا *Vikshipta*.
4. ئیکاگرا *Ekagra*.
5. نیرۆدها *Nirodha* .

1. **مۆدها:** بارودۆخی لێل، وەستاو، بێ جوڵەو نوستوی زهنە، زهن لەم بارودۆخەدا لەژێر کارکردنی "تاماگۆنا"دایە[10]. کەسانێك کە لەم بارودۆخەدان لەوانەیە وابزانن کە زهنی ئەوان بەتاڵە لە فیکر و وابزانن لە پلە بەرزەکانی چاودێریدان بەڵام لە راستیدا ئەوان خاوەنی کەمترین ئاگایین. خەوی درێژخایەن و وەستانی بیرو نەبونی جوڵە و چالاکی دیارترین نیشانەگەلی ئەو کەسانەیە کە لەم بارودۆخەی زهندا جێگیرن.
2. **کشیپتا:** بارودۆخێکە لە پەرێشانی و خەمۆکی زهن کە جاری وایە نیگەرانی و شپرزەییشی بە دواوەیە. زهن لەم حاڵەتەدا لەژێر کارتێکردنی "راجاگۆنا"دایە، کەسانێك کە لەم بارودۆخەدا جێگیرن بە ئاسانی وزەی خۆیان لەدەست دەدەن. نیشانەکانی خۆکوژی و لەناوبردنی شتەکان و مرۆڤەکان لەم بارودۆخەی زهندا دێتە پێش.
3. **ڤیکشیپتا:** بارودۆخی ناجێگیری زهنە، لەم بارەدا زهن لە نێوان ساتڤاگۆناو راجاگۆنا و تاماگۆنادا دێت و دەچێت. وتراوە کە یۆگا لەم بارودۆخەدا دەست پێدەکات. دو دۆخی پێشو تایبەتە بەو بونەوەرانەی کە لە خواروی مرۆڤن و مرۆڤەکان بۆ هەمیشە لەم دوو بارەدا جێگیر

نابن. بەهەرحاڵ لە باری ڤیکشیپتا گۆناکان بۆ خۆدەرخستن ئازادن. کاتێك کە ساتڤا چالاکە کەسەکە لەوانەیە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە هەستێکی قوڵ و لە ئارامی و بینیندا قوڵ ببێتەوە، یاخود لە هەمان کاتدا پاش چەند رۆژێك بچێتەوە ناو خۆیی و هەست بە نائومێدی و بێ دەسەڵاتی بکات، یاخود ئەوەی کە رۆحی شەهوەت و تورەیی بەسەر ئەو کەسەدا زاڵ ببێت. یۆگی دەبێت بتوانێت هەست بەم بارودۆخە جیاوازەی زهنی خۆی بکات و لە توانایی و هونەری یۆگا کەڵك وەربگرێت بۆ ئارامکردنەوەو چڕکردنەوەی زهنی خۆی، باشتر وایە بڵێین دەبێت یۆگی تەواوی نیشانەو ئاسەواری گۆناکان لەسەر زهنی خۆی دیاری بکات و هەمو کاتێك بروانێت کام لەم گۆنایانە بەسەر زهنی ئەودا زاڵن و دواجار بەپێی زانستی یۆگا چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزێتەوە.

4. **ئیکاگرا:** بارودۆخی چڕکراوەو ناوەندکراوی تواناکانی زهنە. لەم قۆناغەدا باسی راجاگۆناو تاماگۆنا نامێنێت و تەنیاو تەنیا ساتڤا دەمێنێت. هەستی پاکی و دڵخۆشی و ئارامی فیکر دەردەکەوێت. ئێوە لە رێگەی ئەم بارودۆخەی زهنەوە (واتە زهنێك کە تەواوی تواناکانی خۆی لەباری ساتڤادا چڕکردبێتەوە) دەتوانن بچنە ناو بارودۆخی نیرۆدها.

5. **نیرۆدها:** بارودۆخی ئازادکراو و رەهابونی تەواوی زهنە. ئەو شەپۆلانەی کە لە گۆناکان دروست بون لەم بارودۆخەدا خامۆشن، بۆیە بەم حاڵەتە وتراوە "تری گۆناتیتا- *Trigunatita*" واتە "ئازادبو لە شەپۆلی سێ گۆناکە".

لێرەدا گەیشتین بەو راستیەی کە چیتە ڤریتی یاخود چوارچێوەگەلی ئاگایی کەوتۆتە ژێر کاریگەری سێ شەپۆلی تیواری کەونی، ئەگەر ئاگایی خۆتان بە یارمەتی هونەری یۆگا بێخەوش بکەن و لە داوی گۆناکان رزگاربن، دەتوانن لە بارودۆخی سەرەتایی و راستەقینەی خۆتاندا جێگیربن. کەواتە یۆگا پێکدێت لە ئازادی زهن لە وەرگرتنی رۆتین و چوارچێوەگەلی داخراو، و ئازادی زهن لە بارودۆخی وەستاوو شڵەژاو و هەست کردن بە خۆشبەختی بەهۆی رەفتاری خەڵك و ئیحساسات و.... چونکە ئەو هەستە خۆشەش دوبارە دەمانخاتە ناو داوی نیگەرانیی لەدەستدانی ئەو هەستە خۆشە. لەوانەیە هەست بە کەماڵ بکەین تەنانەت ئەم ئاگاییەش سنوردارە، چونکە کەماڵی راستەقینە بەندە بە یەکبون و یەکگرتن لەگەڵ کەون (بون). تەنها بەم جۆرە ئێمە کامڵ دەبین.

ناتوانین کاتێك کە سەربەخۆین (واتە کەسێکی سەربەخۆین لە کەوندا و لە دوبەرەکیدا این لەگەڵ سروشت) بڵێین ئێمە کامڵین. زهنی ئارام و رەها میراتی بوێرترین و زاناترینی مرۆڤەکانە.

لەم حاڵەتەدا هیچ رێگرێك نیە لەبەردەم رەوتی وزەی کەسەکەو ئەو دەتوانێت بگاتە یەکبونی ئاگاهانە. ئەم یەکبونە لەگەڵ کەون (بون) شانبەشانی مەعریفەو بەڵێندەری قوڵترین هەست و توانا ناسکەکانی مرۆڤ دەبێت.

"بر تو نزديك گردد اين ره دور
گر نشينى به پيش گاه حزور
هست مطلوب جانت اندر پيش
اندر او مى نگر ، از او ميندیش
زانكه انديشه دورت اندازد

دوست با غیر در نمی سازد"[11]
"شێخ مەحمود شبستەری"

## پەراوێزەكان:

1–ئەم بابەتە لە كتێبی (راه یوگا)واتە (رێگەی یۆگا) ی بەڕێز "بـرزۆ قـادری" وەرگـیراوە كـە بـە "سـوامی مادهاڤانانـدا" بەناوبانگە. ئەم كتێبە لەلایەن "د.محمد احمـــد" و "هـــاوبیر كامـــەران" ەوە لـــە فارســــیەوە وەرگێردراوەتـە سـەر زمـانی كـوردی و خـودی سـوامی مادهاڤانانـدا پێـشەكی بـۆ چـاپی كـوردی ئـەم كتێبـە نوسـیوە. سـوامی مادهاڤانانـدا یەكێكـە لـە گـەورە مامۆسـتایانی یۆگـا لـە ئێـران و هینـد و دامەزرێنـەری ئەنجومەنی زانستە ڤیداییەكانی ئێرانەو ماوەیەكی زۆر سەرنوسەری گۆڤاری زانستی یۆگا بوو لە ئێران. سوامی مادهاڤانانـدا لێكۆڵـەری مورشـیدی یۆگـا و لێكۆڵـەری زانستی پزیشكی ئایورڤیدایە. ئەو خاوەنی چەندەها مورید و قوتابیە لە هیندو ئێران و یەكێكە لە سانیاسە پێگەیشتوەكان.

2– *Yoga*، بەكەسـێك كـە پـەیرەوی ئامۆژگـاری و راهێنانەكانی یۆگا دەكات دەڵێن یۆگی *Yogi* (بۆ پیاوان) و یۆگینی *Yogini* (بۆ خانمان).

3– یۆگـا وشـەیەكی سانسكریتیە و نـاكۆكی هەیـە لەبارەی ریـشەی ئـەم وشـەیەوە. بەپێی ئـەو واتایانـەی سـەرەوە بـەدوای یەكـدا ئـەم ریـشەگەلەیان بـۆ هێنـاوە: یۆجێر *Yojir*، یۆج *Yuj*، یو *Yu*.

4– *Chitta Shakti*، هێـزی كاریگـەری مێـشكی هونەرمەند (نیوەگۆی راست).

5– *Prana Shakti*، هێـزی كاریگـەری مێـشكی كرێكـار (نیوەگـۆی چـەپ). چـیتا و پراناشـاكتی لـە فەلـسەفەی تـانترادا بـە وزەگـەلی ژنانـەو پیاوانـە یـاخود سـاردو گـەرم یـاخود نـاقیس و زاییـد دەربـڕدراوە كـە یەكگرتنیان دەبێتە هۆی كرانەوەی ئاگایی رۆحانی.

6– سادانا كۆمەڵێك ئامۆژگاری و تەكنیكاتی یۆگایە كە لەلایـەن مامۆسـتاوە دەدرێتـە فێرخـوازی یۆگـا. ئـەم تەكنیكانـە دەبێـت بـەردەوام ئـەنجام بـدرێن تـاكو گۆرانكـاری پێویـست و گونجـاو لـە موریـد و رێـرەودا دروست بكات، دوای ئەوە مامۆستا ساداناكە دەگۆرێت و كـامڵتری دەكـات. سـاداناكان تـا كامـڵ بـونی رێـرەو بەردەوام دەبێت.

7– *Yogas Chitta Vritti Nirodha* ئەم پێناسەیە لە فەسڵی یەكەمی یۆگاسوترا، ئایەتی دووەمدا هاتوە.

8– بـەهۆی لێكۆڵینـەوە لەسـەر یۆگیـەكان ئـەم بارودۆخـە لـە روانگـەی زانستیەوە كاری لەسەر كراوە. "سوامی راما" یەكێك بوو كە لە ساڵی 1970 لە ئەمریكا لێكۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام درا. لە كاتێكدا كە ئامێری "ئەلكترۆئانسفالۆگرام" شـەپۆلی دەلتـای (واتـە خـەوی قـوڵی) پیـشان دەدا، سـوامی رامـا دوای هەسـتانەوەی، هەمو ئەو روداوانەی كە لەكاتی خەوی قوڵدا روی دابوو، گێرایـەوە. واتـە لەهـەمان كاتـدا كـە لەخـەوی قوڵـدابوو توانیبووی ئاگایی خۆی لە ژورەكەدا بپارێزێت.

9– ڤیاسـا *Vyasa* لـە تەفـسیرەكەی خـۆی لـە یۆگاسوتراوە ئاماژە بەم پێنج بارودۆخەی زهن دەكات.

10– *Tama gona* لـە فەلـسەفەی یۆگـادا وتـراوە هەموو كەونی ماددی لەژێر كارتێكردنی سێ شەپۆلدایە. یەكـەم: تامـاس، دووەم: راجـاس، سـێهەم سـاتوا. هـەر رۆحێك كە پیوەندی لەگەڵ سروشتدا هـەبوو، گیرۆدەی یەكێك لەم سێ وزە ناسكە دەبێت. ئەم هێزانە بە كورتی بـە "نـەزانی"، "شـەهوەت" و "چـاكە" بەچـڤەكراون. وتـراوە كـە هـەمویان سـنوردارن تەنانـەت"چاكە"ش. چونكە مرۆڤ دەخاتە ناو داوی خۆشبەختی و پاداشتی كـاره باشـەكان. فەسـڵی چـواردەهەم لـە كتێبـی "بهاڤادگیتـا" تایبـەتكراوە بـە شـیكردنەوەی ئـەم سـێ شەپۆلە ناسكە.

11– واتـە: ئـەو رێیـە دوره بۆتـۆ نزیـك ئەبێتـەوە، ئەگـەر لـە ئێـستادا هـەبیت. ئـەو ئامانجـەی هەتـە پێـی دەگەی، تەنیا چاودێر بە، بیری لێمەكەرەوە. لەبەرئەوەی كـە ئەندێـشە و فكـر تـەنیا دوورت دەكاتـەوە و چـاكەو خراپە (دۆست و دوژمن) لەیەك جیاناكاتەوە.

# وێستگەکانی سەردەم

- "ژیان بۆ ئێمە"

**کۆشیعری چۆمان هەردی بە زمانی ئینگلیزی**

لە ئینگلیزیەوە:. عەزیز ڕەئووف

- **بەهۆی هەیمەنەی پارتی دادو گەشەپێکدان،**

**ڕۆشنبیرانی تورکیان هەڕەشەی بەجێهێشتنی ئەو وڵاتە دەکەن**

سمیر صالحە

لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

- **پیدرۆ پارامۆی "خوان ڕۆڵفۆ"**

رەبیع جابر

لە عەرەبییەوە: لاس

- **لە (بەری ڕۆژگارەکان)**

ئیزابیل ئەلیندی

لە عەرەبییەوە: ساکار رەووف

# "ژیان بۆ ئێمە"

## کۆ شیعری چۆمان هەردی بە زمانی ئینگلیزی

لە ئینگلیزیەوە:. عەزیز ڕەئووف

**ئەم شیعرە بەهێزانە گرنگیەکی نێونەتەوەییان هەیە و دەتوانن سنورەکان ببڕن**
**"مۆنیزا ئاڤلی"**

چۆمان هەردی پێش ئەوەی خێزانەکەیان ئاوارەی ئێران بێت لە کوردستانی عیراق لە دایك بووە. لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عیراق، بەڵام کاتێك چۆمان تەمەنی 15 ساڵ دەبێت کوردستان بە چەکی کیمیایی ژەهر باران دەکرێت و خێزانەکەی جارێکی تر ئاوارەی هەندەران دەبنەوە. شیعرەکانی چۆمان هەردی لەبارەی ئاوارەیی و تیرۆرو چەوسانەوەی ژنان و خۆشەویستی خێزان و سەفەر و ژیانەوە نوسراون و چۆمان دەیەوێت بە زمانێکی شیعری ژیانمان بۆ جوانتر بکات.

"ژیان بۆ ئێمە *Life For Us*" کۆشیعرێکی چۆمان هەردیەو شاعیر هەوڵ دەدات لەبارەی ململانێی خەڵکێکەوە بدوێت کە لە جیهاندا نەخشەی وڵاتەکەی نەکێشراوە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە خەم و ئازاری ئاوارەیی و غەریبی دوور لە نیشتمان. شیعرەکانی چۆمان ڕۆحیەتی سەرکەوتنی مرۆڤ نیشان دەدات بەسەر ناخۆشیەکاندا.

ئاوێتەکردنی ململانێی سیاسی و تاکەکەسی هەندێ جار فۆرمێکی تەواو گاڵتەجاڕانە وەردەگرێت، شیعرەکانی چۆمان هەردی وێنەی یادەوەریەکان دەکێشێت، ژیانی ژێر ڕۆکێت و تفەنگەکان و ڕاستیگەلێکی تەواو جیاواز کە ئەویش جیاوازی ڕەگەزیە لە کۆمەڵگەدا: ململانێی سیاسی باوك و لەدەستدانی کتێبەکان، کارکردنی بێدەنگی دایك و خزمەتکردن و پاککردنەوەی ماڵی کەسانی تر.

"ژیان بۆ ئێمە" چوارەمین کتێبی شیعری چۆمان هەردیە بەڵام یەکەمین کتێبیەتی بە زمانی ئینگلیزی. سێ کتێبە شیعریەکەی تری بەزمانی کوردی نوسیونی کە بۆ چۆمام زمانی دایکە. چۆمان هەردی لە ساڵی 1993وە لە بەریتانیا دەژێت و لە زانکۆی ئۆکسفۆرد فەلسەفە و سایکۆلۆژیای خوێندووە. چۆمان تا ئیستاش لە بەریتانیا دەژی و لەگەڵ چەند نوسەرێکی تری تاراوگەدا سەرگەرمی گەشەپێدانی چەند پرۆژەگەلێک لەبارەی داهێنان و نوسینەوە.




"ژیان بۆ ئێمە" گێڕانەوەیەکی قوڵی منداڵیە و باس کردنی ژیانێکە کە پڕە لە خەم و ئازار و لە کۆمەڵگەیەك کە لە ژێر ڕۆکێت و ئاگردا ژیان دەگوزەرێنێت لەناو ڕوداوگەلێکی مێژووی نوێدا. شیعرەکانی چۆمان لەنێوان تاراوگەو نیشتماندایە بەڵام بە کەسایەتیەکی تەواو کاریزما و بەتواناوە کە دەیەوێت بەرەنگاریەکانی غەریبی و تاراوگە ببێتەوە. چۆمان دەیەوێت پرسیارە گرنگەکان بوروژێنێت و بە زمانێکی شیعری خەمی کۆمەڵگەیەك بکاتە خەمێکی تەواو جیهانی. شیعرەکانی چۆمان خوێندنەوەیان سەختە، بۆ نمونە لە ناوەڕاستی شیعری" من چیم دەوێت" کە یەکێکە شیعرە باشەکانی ئەم کتێبە، ئێمە خۆمان لەبەر دەم ئەم ستانزایەدا دەبینینەوە:

من سەربازگەلێکی بەبەزەیی خەیاڵ دەکەم

سەربازگەلێك کە هەرگیز ناڵێن:

"ئێمە دەتانبەین بۆ شوێنێك
لەوێ گۆشتی خۆتان بخۆن"

ئەم شۆكە كتووپڕە و زیاتریش لەمە لەبەر ئەوەیە كە هەنگاوێكی تەواو هێمنانە هەیە بەرەو ڕزگاربوون. زۆرێك لە شیعرەكانی چۆمان هەژێنەرە بەهۆی توندوتیژیەكی تەواو ترسناكەوە: وێنەكێشەكە چیتر لەبەر دەرگاكە دەرنەكەوتەوە، كاتێك كەبینرا دەستەكانی شكابوون و ئارەزوی وێنەكێشانی نەمابوو، بەزۆر بە خەڵكەكەیان دەوت هاوار بكەن:" بژی دادپەروەری"، هاوڕێكەیان لەسێدارەدا، بەڵام ژیان كۆڵنەدانە.

شیعری " پێڵاوەكانی" یەكێكی ترە لە شیعرە باشەكانی چۆمان، ئەو لەبارەی پیرەژنێكەوە دەدوێت. ئەم شیعرە شیعرێكی تەواو جوان و بنیادنەرانەیە.

جۆرج سیرتز لە بارەی شیعرەكانی چۆمان هەردیەوە دەڵێت: شیعرەكانی چۆمان دواندنە لەبارەی تراژیدیا و شەڕ و چەوسانەوە و تەفرو توناكردنەوە، بەڵام بە زیاد لەوە هاوار كردن بۆ گەیاندنی ڕاستیەكان. خۆشەویستی و پێوەری وتن و گۆرانیەكان پاڵ بە قەسیدەكانەوە دەنێت كە فۆرمێكی ڕێپۆرتاژ بەخۆوە ببینێت. شیعرەكانی بە بێدەنگی دەدوێن. لە كۆمەڵگەكەیدا شەرم هەیە بەڵام شیعرەكانی چۆمان شەرمن نین.

هەر لەبارەی شیعرەكانی چۆمان هەردیەوە مۆنیزا ئاقلی دەڵێت: چۆمان تەعبیر لە ئازاری ئەزمونی سیاسی و تاكەكەسی دەكات بەڵام بە تواناو بەهرەیەكی بەهێزەوە. ئەم شیعرە بەهێزانە گرنگیەكی نێونەتەوەییان هەیە و دەتوانن سنورەكان ببڕن.

**سەرچاوە:**
***Bookreview.com***

# بەهۆی هەیمەنەی پارتی دادو گەشە پێکدان، ڕۆشنبیرانی تورکیا هەڕەشەی بەجێهێشتنی ئەو وڵاتە دەکەن

سمیر صالحە

لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

هەڕەشەکردن بە پێچانەوەی جانتاکان و کۆچکردن بۆ وڵاتێکی دیکە، ئەو دیاردەیەیە کە لەم ڕۆژانەدا ناوەندی هەندێ لە گرنگترین نوسەرو ڕۆشنبیرو هونەرمەندەکانی تورکیای گرتۆتەوە. ئەو وەرچەرخانە سیاسیانەی نزیکەی پێنج ساڵە تورکیا بەخۆیەوە دەیبینێ، لەگەڵ گەشتنی پارتی دادو گەشەپێدان بە دەسەڵات کە ڕازی نییە خۆی وەك پارتێکی ئیسلامی میانڕەو وەسفبکات، بگرە هەیمەنەی تەواوی ئەم پارتە بەسەر ناوەندەکانی بڕیاری سیاسی لە سەرۆکایەتی کۆمارەوە بۆ حکومەت و لەوێشەوە بۆ پەرلەمان، هەروەها گرتنەبەری پرۆگرام و بیرکردنەوەیەکی تازە لە بەڕێوەبردن و حوکمکردندا، بڕێکی زۆری ڕۆشنبیران و نوسەران و ڕۆژنامەنوسە عەلمانییەکان و چەپە توندڕەوەکانی خستۆتە دڵەڕاوکێوە، ئەوانەیان کە بە نوسین لە زیاد لە پێگەیەکدا لەگەڵ ئیسلامییەکان ڕووبەڕوی یەکتربونەتەوە. دواهەمین ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ پیانۆ ژەنی بەناوبانگ "فازل صای"یە، ئەم ڕوبەڕوبونەوەیە مورەکەبێکی زۆری خەسارکردو برینێکی قووڵی کردەوە.

نوسەرو ڕۆماننوسی گەورە "ئۆرهان پامۆك"، یەکەمین کەسە هەڕەشەی بەجێهێشتن دەکات، ئەمەش لە دەرئەنجامی ئەو کاردانەوە توندوتیژانەوەیە کە ڕوبەڕوی دەبێتەوە، ئەو کاردانەوانەش بەهۆی ئەو لێدوانانەوەیە کە

"پامۆك" دەربارەی بابەتی ئەرمەنییەكانو هەڵوێستە سیاسییەكانی دەربڕیبوون. ئەو قسانەی "پامۆك" بووە هۆی توڕەبونی زۆربەی زۆری ناسیۆنالیستە توندڕەوەكانی تورك كە دەڵێن ئەو لێدوانو هەڵوێستە سیاسیانەی "پامۆك" هۆكاری ڕاستەوخۆی وەرگرتنی پاداشتی نۆبڵ بوو. كەچی ئەوەتا ئەمڕۆ پیانۆژەنی جیهانی "فازل صای" ناڕەزایو پێناخۆشبونی خۆی سەبارەت بەو گۆڕانكارییە سیاسیو كۆمەڵایەتیانەی لە توركیادا ڕودەدەن، ئاشكرا دەكا و ئاماژە بەوەدەدات بیر لەوەدەكاتەوە خۆیو كچە تاقانەكەی توركیا بەجێبێڵنو دەیەوێ ئەوەندە ژیانەی ماویەتی لە وڵاتێكی دیكەدا بەسەرییبات. هەرای ئەمجارە لەو لێدوانانەوە دەستیپێكرد كە ئەم پیانۆژەنە جیهانییە لە چاوپێكەوتنێكیدا لەگەڵ یەكێك لە ڕۆژنامە ئەڵمانییەكان دەریبڕین، ئەم پیانۆژەنە خاوەنی گرنگترین ژەنینی مۆسیقایەو دەیان خەڵاتی نێودەوڵەتی بەدەستهێناوە. "فازل صای" لەمیانەی ئەو چاوپێكەوتنەدا گوزارشتی لەو ترسو دڵەڕاوكێیەی خۆی كرد كە لە ناوخۆی توركیادا بەهۆی هەڵكشانو پەلهاویشتنی ئیسلامییەوە توشی هاتووە. ڕاستەوخۆ دوای كۆتایی




هاتنی چاوپێكەوتنەكە، ڕۆژنامەنوسی ناسراوی تورك "تۆفان تۆرنش" لەسەر زاری "فازل صای"وە دەڵێ: (ئەو خەونەی توركیا كە دەمانویست بوو بە هەڵم.. ژنی وەزیرەكان هەر هەمویان لەچك بەسەرن..ئیسلامییەكان لە هەڵبژاردنەكاندا بردیانەوە.. ئێمە لە 30٪ و ئەوان لە 70٪. لە كۆشكی شنقایای سەرۆكایەتیو بەهۆی ئاهەنگەكانی جەژنی نیشتیمانییەوە، كێیان مەبەستبوو بانگهێشتیان كرد، بەڵام منیان لەبیرچوبوەوە! ئیدی حەقی من نییە كە دەڵێم ئێرە بەجێدەهێڵمو دەڕۆم؟)

گەرچی وتەبێژی ڕەسمی كۆشكی كۆماری، بەخێرایی ئەو قسانەی "صای" ڕەتكردەوەو ڕایگەیاند ناوی ئەم ژنیارە گەورەیە لە لیستی بانگهێشتكراوەكاندا بووە، دەعوەتنامەیان بۆ ڕەوانەكردوەو دەعوەتنامەكە نەگەڕاوەتەوە بۆ سكرتاریەتی سەرۆك كۆمار، بۆیە گریمانەی ئەوەیانكردووە دەعوەتنامەكەی پێگەیشتبێت. لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا ئەو ڕاگەیاندنە ڕەسمییە نەبووە هۆی ئەوەی ڕێگربێت لە بەرزبونەوەی گرژیو دابەشبونی ناوەندی ڕۆشنبیرانو نوسەرانو

ڕۆژنامەنوسانی تورك. ئەو ناوەندانە وەك پیشەی هەموجارێکیان ئەم هەلەیان قۆستەوە تاکو حساباتی خۆیانی پێ یەکلایی بکەنەوەو بەنزین بەسەر ئاگرەکەدا بکەن و لەم ڕووەوە هەرچییەکیان هەیە بیلێن.

وەزیری ڕۆشنبیری تورکیا "ئەرتۆگرول گۆنای" وتی ئەو دڵەڕاوکەیەی کە لەلایەن "صای"ژەنیارەوە گەورە کراوە، هیچ پاساوێکی بۆ نییە. ئەم قسەیە لە ناوەندی ئۆپۆزسیۆنی چەپەکان و ڕاستەکاندا، وەك یەك، ڕەتکرایەوەو وتیان: (پاشەکشە کردن بەم شێوەیە چارەسەرنییە، ئەوەی پێویستە مانەوەو ڕووبەڕووبونەوەیە.. گەر "صای" بەو شێوەیە ترس و دڵەڕاوکێی خۆی دەربڕیوە.. ئەوا لەسەر حکومەت پێویستە بە جدییەتێکی تەواوەوە مامەڵە لەگەڵ قسەکانی "صای"دا بکات).

نوسەرو ڕۆژنامەنوسی بەناوبانگ "تەها ئەقیول" لە ڕۆژنامەی (میللەت)دا هەوڵی دا بارودۆخەکە ئاسایی و هێوربکاتەوەو ئەوەی خستەوەبیر کە "صای" دەتوانێ ئەو قسانەی کردویەتی، جێبەجێیان بکات و ژمارەیەکی زۆر پایتەختی گەورە هەیە ئامادەن پێشوازی لێبکەن، بەڵام: (لە هەمو ئەوانە گرنگتر ئەوەیە پشت لەم خاکە نەکات کە تێیدا لەدایکبووەو گەورەبووەو کارئاسانی بۆ



کردووە تاکو بگات بەوەی لەمڕۆدا پێیگەشتووە).

هەرچی نوسەری ئیسلامی "ئەحمەد تۆران"ە، لە ڕۆژنامەی زەمان ڕایگەیاند: (ئێمەش بانگهێشتی ئەو ئاهەنگە نەکرابووین، بەڵام هەڕەشەی جێهێشتنی وڵات ناکەین).

ئەو قسانەی "صای" ڕووبەڕووی کۆمەڵێ هەڵوێستی ڕەخنەیی توندبووەوە، لەوانە هەڵوێستی سەرکردەیەکی پارتی دادو گەشەپێدان کە ناوی "میر دەنگیر فرات"ە، ئەم سەرکردەیە دەڵێ: (ئەوەی بەم خاکە ڕازی نییە کە لەسەری گەورەبووەو دەیەوێ دەستبەرداری بێت و جێیبێڵێ، ئەوا ئێمە ڕێز لەو بڕیارەی دەگرین و خەفەت بۆ ڕۆشتنی ناخۆین). ئەوەی مەسەلەکەی زیاتر گرژو ئاڵۆزکرد، لێدوانێکی نوسەری ئیسلامی "عەبدولرەحمان دیلی باك" بوو، ئەم نوسەرە ئیسلامییە دەڵێ: (لەهەر کوێیەك بێت، بە وتنەوەی وانەی قورئان بەو کچە بچوکانەی لەچك لەسەر سەری خۆیان دادەنێن، ڕاوتدەنێین).

ڕۆژنامەنوسی لیبرال خاتوو "بریهان مەعدەن"کە بە نوسینە بزمارییەکانی ناسراوە، ئەم هەڵەی قۆستەوە تاکو پاڵپشتی خۆی بۆ "صای" ڕاگەیەنێت و ئەوەشی ئاشکرا کرد بەهۆی ئەو بارودۆخە گشتییەی ناوخۆی تورکیاوە کە بەدڵی نییە، وایکردووە زۆر بە جدیی بیر

لەوە بکاتەوە بڕوات و لە جێیەکی دیکە ژیان بەسەربەرێت. پاشان ڕۆژنامەنوس "ئەحمەد هاقان" لەمیانەی خوێندنەوەیەکی بۆ حاڵەتی دەرونی "صای"پیانۆژەن، هاتە نێو مەیدانەکەو ئەوەی خستەڕوو کە هۆکاری بێزاریو دڵەڕاوکەی "صای" ناگەڕێتەوە بۆ هەڵکشانو بڵاوبونەوەی ئیسلامی لە سەرتاپای وڵاتدا، بگرە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەم گروپە ئیسلامیانە خۆیان بە نوێنەری ڕاستەقینەی ئیرادەی میللەت دادەنێنو خۆیان وەك تاقەدەنگی میللەت کە پێویستە گوێی لێبگرێت، دەخەنەڕوو.

زۆرێك لەوانەی لە "صای"یەوە نزیکن بە گاڵتەجارییەوە دەڵێن ئەو لە ساڵێکدا زیاد لە 140 ئاهەنگ دوور لە ماڵەکەی کە لە ئەستەنبولە دەگێڕێتو تەنها بۆ ماوەی هەفتەیەك لە ماڵەکەیدا دەمێنێتەوە، بۆیە پێویست بەم هەموو هەراوزەنایە ناکات. لەگەڵ ئەوەشدا، تەنها چەند ڕۆژێکی کەمی ئایندە، دەتوانێت بۆمان بسەلمێنێت ئایا "صای" کە لە بواری مۆسیقاو داهێناندا، ناوبانگێکی جیهانی بۆ تورکیا بەدەستهێناوە، بە ڕاستییەتی لە هەڕەشەی پێچانەوەی جانتاکانیو بەجێهێشتنی وڵات، یاخود ئەوە تەنها کۆمەڵێ فشەو هاشوهوشەو هەوڕێکی ڕەشەو بەخێرایی تێدەپەڕێو دەڕەوێتەوە. ئەمەش دوای ئەوە دێت کە "صای" زیاد لە جارێك ئەو دەعوەتنامە زۆرانەی ڕەتکردۆتەوە کە لەلایەن چەندین وڵاتی ڕۆژئاواوە خراوەتە بەردەستی تاکو ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتانە وەربگرێ، "صای" بەردەوام سووربووە لەسەر ئەوەی دەبێ وێنەی مانگو ئەستێرەی وڵاتەکەی بەسەر پەساپۆرتەکەیەوە ببینێ.

سەرەك وەزیرانی تورکیا "ڕەجەب تەیب ئەردۆگان" بۆ یەکلایکردنەوەی ئەو کێشەیەو کۆتایی پێهێنانی ئەو هەراو زەنا بێ پاساوەو داخستنی ئەو دۆسیێیە، هاتە ناو کێشەکەوە، گەرچی تاڕادەیەك ئەو هاتنە ناوەوەیە دواکەوت، "ئەردۆگان" ڕایگەیاند: (ئەو ڕۆشنبیرییەی کە ئێمە تەبەنیمان کردووە، ڕۆشنبیرییەکە دەمانگەیەنێتە یەکڕیزیو هاوکاریکردنی یەکتر، نەك دوورخستنەوەو لێکترازان، ئەوەی لەسەر ئەم خاکە لەدایك بوبێت، ناتوانێ هەروا بە ئاسانی لێی دوور بکەوێتەوەو پشتی تێبکات). ئاخۆ ئەم پەیامەی "ئەردۆگان" شتەکان ئاسایی دەکاتەوەو مۆسیقاری تووڕە دڵنیادەکاتەوە؟

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط،
2008/1/2

# پیدرۆ پارامۆی "خوان ڕۆلفۆ"

ڕەبیع جابر

لە عەرەبییەوە: لاس

پیاوێک بۆ ماڵەکەی دەگەڕێتەوە. ئایا ئەو ماڵە دەدۆزێتەوە؟ ئایا ماڵ هەروەکی خۆی دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی بەجێی دێڵین؟ دوای ئەوەی دەردەکرێین لێی و ناچار دەکرێین جێی بهێڵین؟ دوای ئەوەی ڕۆژگار نێوانێک دەخاتە بەینمانەوە کە نابڕدرێت؟

دوای هەموو جەنگێک دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەکانمان. ئەو کاتەش ئێمە گۆڕاوین و جیهانیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لە هەر چرکە ساتێکی تەمەنماندا، شتگەلێک لە دەست دەدەین و شت گەلێک بە دەست دێنین. ئەوانەی دوای ماوەیەکی دوورو درێژ دێنەوە بۆ نیشتمان، ئاخۆ نیشتمان دەدۆزنەوە؟ هەر هێندەی ماڵەکانمان بەجێهێشت، وەک ئەوە وایە ئاسەواریان نەمێنێت و تیا



بچن. ئەوەی لەو ماڵانە دەمێنێتەوە ماڵە واقعیەکە نییە، بەڵکو ماڵێکی خەیاڵیە. خەیاڵیەک کە تا ئەبەد لە ناخماندا دەژی و نامرێ.

پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا، "خوان ڕۆلفۆ" (1917-1986) دەستی بە نووسینی تاکە ڕۆمانەکەی خۆی کرد بە ناوی "پیدرۆ پارامۆ"وە. شایەنی باسە پێش ئەم ڕۆمانەی، یەک کۆمەڵە چیرۆکی لە ساڵی 1953دا بە ناوی (پێدەشتی سوتاو) بلاوکردبووەوە. دوای ئەوە دەستی بە نوسینی (پیدرۆ

پارامۆ) کرد. ئەم ڕۆمانە لە ساڵی 1955 دا چاپکراو بڵاوکرایەوە. دوای ئەوە "خوان ڕۆڵفۆ" هیچ شتێك بڵاوناکاتەوە.

دەبێت سەربوردەی ئەم نوسەرە مەکسیکیە چی بێت؟ بۆچی تەنها ڕۆمانێك دەنوسێت و دوای ئەوە بێدەنگ دەبێت؟

"پیدرۆ پارامۆ" هەر لەگەڵ بڵاوبونەوەیدا، نێوبانگ و شکۆمەندیەکی زۆری پەیدا کرد. چەندین جار چاپکرایەوەو بۆ سەر زمانگەلێکی زۆریش وەرگێڕدرا. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا "خوان ڕۆڵفۆ" دوای ئەوە هیچ ڕۆمانێکی تر بڵاوناکاتەوە. ئەو دەڵێت: (من لە پێناو نوسیندا دەنوسم و نوسین حەز و ئارەزوی منە، هەرکاتێکیش نەمەوێت بنوسم نانوسم). هەر لە شوێنێکی تردا دەڵێت: (کار لەسەر پرۆژەیەکی تر دەکەم، پرۆژەیەکی دوور و درێژو وردە وردە خەریکم). سی و یەك ساڵ دوای ئەو قسانە، دەمرێت و هیچیش بڵاوناکاتەوە.

"بۆرخیس" دەنوسێت: (من دەمەوێت یەك چیرۆك بنوسم، بەلاّم بمێنێتەوە، یەك ڕستە بنوسم و بمێنێتەوە. گەر ئەمەم کرد، ئەوا سەرو زیادمە). "خوان ڕۆڵفۆ" ئەمەی کرد. جارێك (پیدرۆ پارامۆ) دەخوێنیتەوەو، تا هەتایە بیرت ناچێتەوە. "گابرییل گارسیا مارکیز" لە ڕۆمانی (سەد ساڵ تەنهایی)دا، سڵاوێك بۆ ئەو ڕۆمانەی "خوان ڕۆڵفۆ" دەنێرێت. گوندی (کۆمالا) کە سەنتەری ڕۆمانی (پیدرۆ پارامۆ)یە، لە (ماکۆندۆ)ی "مارکیز"دا ڕەنگ دەداتەوە. جگە لەمە ڕەنگدانەوەی ئەو مردوانەش دەبینین کە دوای لە دنیا دەرچونیشیان هەر ماون و ئامادەن. هیچ شتێك لەناو ناچێت، مرۆڤ دەمێنێتەوە. لە ڕۆمانەکەی "مارکیز"دا "ملکیادس" دەگەڕێتەوە بۆ "ماکۆندۆ"، لەوێ لەناو دۆست و هاوڵەکانی لە بنەماڵەی "بۆیندیا" دادەنیشێت و مەجلیسیان لەگەڵ دەگرێت. هەروەها پیاوێکی دیکەی ناو ڕۆمانەکە هەیە، بە تیرێك دەکوژرێت، بەلاّم دواتر دەگەڕێتەوەو لە ماڵی بکوژەکەیدا نیشتەجێ دەبێت. ئەم پیاوە شەوانە بە دوای ئاودا وێڵە تا تینوێتی بشکێنێ، ئاوێك برینەکەی بۆ بشواتەوە. ئەفسونی (سەد ساڵ تەنهایی) لە بەیەکداچونی ئەم دوو جیهانەدایە.

ماکۆندۆ دەکەوێتە کوێوە؟ لەسەر نەخشەی جیهاندایە یان دەکەوێتە ناو مەملەکەتی خەیاڵ و فانتازیاوە؟ وەلاّمی ئەم پرسیارە لە (پیدرۆ پارامۆ)دایە. هەموو ئەو جێ و شوێنانەی ون بون و نەماون، بە تەواوی تیانەچوون و نەسڕاونەتەوە. خەیاڵ لەباریدایە هەموو ئەو شوێنانە لە لەناوچون قوتار بکات و ئێمەش لەگەڵیاندا ڕزگار بکات.

(هاتوم بۆ کۆمالا، لەبەرئەوەی پێیان وتم باوکم لێرە دەژی. کەسێکە پێی دەڵێن پیدرۆ پارامۆ. دایکم وای پێوتم..). ئەمەیە یەکەمین ڕستەی (پیدرۆ پارامۆ)یە کە "سالح عەلمانی" کردویەتی بە عەرەبی. حیکایەتخوان ڕودەکاتە (کۆمالا) بە ڕێگا شاخاویەکاندا، بەبێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکی هەبێت. ڕێگا گەلێك کە لە جیهانی واقیعەوە بەرەو جیهانی خەیاڵ و فانتازیای دەبەن. لە ڕێگادا چاوی بە ڕێبوارێك دەکەوێت و ئەویش دەبێتە چاوساغی

بەرەو ئەو گوندەی لە دۆڵێکی قوڵدایە.

سەروەختێك حیکایەتخوان بۆ یەکەمجار و لەو بەرزاییەوە گوندەکەی دەبینێت (گوندەکەی باوکی)، لە ڕێبوارەکە دەپرسێت کە چی بەسەر ئەو شوێنەدا هاتووە (چونکە چۆڵ و بێکەس دیارەو پێدەچێت کەسی تێدا نەژی). ڕێبوارەکە وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: (نەك پێدەچێت وا بێت، هەر بەڕاستی وایە و کەس لێرەدا ناژی).

—ئەی پیدرۆ پارامۆ؟

—پیدرۆ پارامۆش چەند ساڵێکە مردووە.

حیکایەتخوان بە گوندەکەدا دەکەوێتە گەڕان. گوێبیستی چرپە و هەناسە دەبێت و لە باران ڕادەمێنێت. چۆن دەبێت ئەم گوندە چۆڵ بێت، لە کاتێکدا هەموو ئەوانە لە ناو ئەو ماڵانەدا دێن و دەچن کە گڕوگیا داپۆشیون؟ هێدی هێدی ئەو گوندە بەرەو ناخی خۆی پەلکێشمان دەکات. چیرۆك و بەسەرهاتگەلێك وەکی شیعر دێن و دەچن. دیالۆگ گەلێکی زۆر بەهێز، لەگەڵ گێڕانەوەیەکی بێئەندازەو جوان و هونەریدا. "ڕۆڵفۆ" نوسەرێکی ئاسایی نییە. ئەم کورە دێهاتیە مەکسیکیە، لە یەك کاتدا میراتگری "هامسۆن" و "شکسپیر" و "ولیەم فۆکنەرە"، پاشان لە ناخی خۆیەوە شتێکی تایبەتی سەربار دەخات. ئەم هەموو بەهرەو ئەم هەموو مەعریفەیە، کەچی تەنها تاکە ڕۆمانێکی پێدەنوسرێت!

"خوان ڕۆڵفۆ" لە (پیدرۆ پارامۆ)دا دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی منداڵی لە دەست چوویی. دێت گوندێك دروستدەکاتەوە کە گوندەکەی خۆیەتی، بەڵام هاوکات گوندێکیشە خەیاڵ دەیخوڵقێنێت. "ڕۆڵفۆ" هەر زوو گوندی مەکسیك بەجێدێڵێت. کەسوکاری لە شەڕ و شۆڕشەکاندا تیادەچن. دوای ئەو هەموو توندوتیژییە، لە مەکسیکۆی پایتەخت دەگیرسێتەوە. لە پایتەختەوە وەزیفە جارێکی تر بەرەو گوندەکانی دەبەنەوە. پاش ئەو سەردانانەی، ڕۆمان و چیرۆکەکانی دەنوسێت. ئیتر دوای ئەوە هیچ بڵاوناکاتەوە. تۆ بڵێی وازی لە نوسینیش هێنابێت؟

ئەڵێن جارێکیان وتویەتی خەریکی نوسینی ڕۆمانێکە بەناوی (زنجیرە شاخ)ەوە. ئایا "خوان ڕۆڵفۆ" لەو قسانەیدا ورد بووەو بە ڕاستی بووە؟

دەتوانین مەزندەی ئەوە بکەین، پیاوێك دەچێتە کتێبخانەیەکەوەو لەسەر تاقێك ئەو ڕۆمانە دەبینێت (زنجیرە شاخ). ناوی نوسەرەکەی دەخوێنێتەوە، نوسراوە "خوان ڕۆڵفۆ". ڕۆمانەکە دەکاتەوەو دەستدەکات بە خوێندنەوەی. لەگەڵ یەکەم ڕستەدا هەستێکی سەیر دایدەگرێت و هەستدەکات گەڕاوەتەوە ناو ماڵی منداڵی، گەڕاوەتەوە ماڵێك کە زۆر دەمێکە ونی کردووەو جێیهێشتووە. ئەوەتا لەو کاتەیدا دەخوێنێتەوە دەگەڕێتەوە ئەو قۆناغە. با هۆکاری ئەوەتان پێ بڵێم: یەکەمین ڕستە کە دەیخوێنێتەوە ئەمەیە:

(بۆیە هاتوم بۆ کۆمالا، چونکە پێیان ڕاگەیاندم باوکم لێرە دەژی، باوکم کەسێکە پێی دەڵێن پیدرۆ پارامۆ...).

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی (الحیاة)، پاشکۆی (افاق)، بەرواری 2006/5/14.

# لە (بەری ڕۆژگارەکان)

ئیزابیل ئەلیندی

لە عەرەبییەوە: ساکار ڕەووف

**گریانێک بەسەر یادگارییە ونبووەکاندا**

ڕۆمانی (بەری ڕۆژگارەکان) کە بەرهەمی نوێی خاتوو ئیزابیل ئەلیندییەو لە سەرەتای سێپتەمبەری 2007 بڵاوکراوەتەوە، لە بەشێکیا بەناوی (هاوڕێی ڕێگا) باس لە پەیوەندی ئیزابیل لەگەڵ ئەلەندی ویلی مێردە ئەمەریکیەکەی دەکات.

**دەقەکە**

بەبەراورد لەگەڵ (لاگارتو ئیمبلومادا)ی هاوڕێی ڕێگام ئەوا (ویللی) وەك دایکێکی ڕاستەقینە چاودێریم دەکات. گەشتە کورتەکانی کارکردنیشم بە بەراورد بە ئەوانەی کە بۆ دوورترین بەشی تیبەر بوو، جێی داخ بوو زۆریش ماندووی دەکردم. دەبوایە لە ماوەیەکی کورتدا سواری فرۆکە بم و بە شەرمێکی زۆرەوە بەرگری لە خۆم بکەم دژ بە فایرۆس و بەکتریای گەڕاڵەکان. چەند هەفتەیەك لەوێ نەئەبووم، ڕۆژانێکی تەواویشم بە ئامادەکردنی وتارەوە بەسەر دەبرد. نازانم چۆن لە کاتم ئەدزیەوە بۆ نووسین. فێری ئەوە بووم کە چۆن بێ ترس لەبەردەم جەماوەردا قسە بکەم، چۆنیش لە فرۆکەخانەکاندا ون نەبم، چۆن بە شتومەکی ناو جانتایەکی بچوکەوە خۆم دەربازکەم، چۆنیش تۆتۆمبیلێك بە کرێ بگرم و بۆ ئەوانە پێبکەنم کە سلاویان لێدەکردم لە کاتێکدا کە گەدەم ئازاری دەدام و پێڵاوەکانیشم بەتوندی قاچمیان ئەگرت. نەمدەزانی ئەو کات لە کوێم، گرنگ نییە.

**تاقە یادگارێک**

ئەزانم بە هەموو ئەوروپاو ئوستراليا و نیوزیلەندا و ئەمەریکای لاتینی و بەشێك لە ئەفەریقاو ئاسیاو وڵاتە یەکگرتووەکاندا گەڕاوم، جگە لە ویلایەتی داکوتای باکور نەبێت، لەناو فرۆکەکاندا نامەم

بۆ دایکم دەنووسی و باسی سەرچڵییەکانی خۆمم بۆ دەکرد. بەڵام پاش تێپەڕبوونی 25 ساڵ کە نامەکان دەخوێنمەوە شتەکان وا دەرئەکەون لە کەسێکی تر روویدابێ.

تەنها یادگارییەك بە زیندوویی مابێتەوە چوونم بوو لە وەرزی زستاندا بۆ شانۆی نیویۆرك، ئەمەش ئازاری زۆری پێگەیاندم تا لەدواییدا بۆ گەشتێك بۆ هندستان چووم و چاکبوومەوە. من و ویللی لە کۆتایی هەفتەدا یەکترمان بینی و بە سەردانێك بۆ لای "جاسون" و کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی بۆ زانکۆ چووین. ئەمانە کۆمەڵێك گەنجی روناکبیر بوون و چاکەتی چەرمیان لەبەردەکرد. لەماوەی ئەو چەند مانگەدا کە بەسەر جیابوونەوەی "جاسون" لە "سالی" تێپەڕیبوو، جاسون بە هیچ شێوەیەك باسی هاوسەرێتی نەدەکرد، ئێمە وامان دەزانی کە دەستگیرانیەکەی تەواو بووە، چونکە "سالی" لە دوو بۆنەدا وا ئامۆگاری کردبوو، هەرچەندە جاسون ئەمەی بەتەواوی رەت دەکردەوەو ئەیگوت کە ئەوان پاش تەواوکردنی زانکۆ هاوسەرگیریی دەکەن.

### گەڕەکی پێنجەم

من و ویللی ئەو کات هێشتا لەژێر سۆزێکی وروژاودا بووین بۆ منداڵیەکەمان و زۆر بیریشمان لێدەکردەوە. کاتێکیش لەگەڵیدا ژیام، ئەو شەوانی یان بە خوێندنەوە یان بە یاریکردن لەگەڵ هاوڕێ هەرزەکارەکانیدا بەسەر دەبرد. کاتژمێر چواری ئێوارە لەخەو هەڵدەستاو پەتۆیەکی چڵکنی لەخۆی دەئالاند، لە باخچەکەی پشتەوەی ماڵەوە خۆی قەتیس ئەکرد، دەستی بەجگەرە کێشان دەکردو بە تەلەفۆن قسەی دەکرد، تا ئەو کاتەی من دەمکێشا بەسەریدا بۆ ئەوەی بڕوات و وانەکانی بخوێنێت. وەلێ ئێستا ئەو رێگای خۆی وەك نوسەر گرتۆتە بەر، هەر ئەمەشمان لێ چاوەڕوان دەکرد چونکە ئەمانزانی خاوەن بەهرەیە. من و ویللی کاتێ بە کۆڵانی پێنجەمداو لەنێو ژاوەژاو ئاپۆرەی خەڵك و هێماکانی هاتوچۆ و چیمەنتۆو سەهۆڵبەنداندا پیاسەمان دەکرد، یادی رۆژانی رابوردومان دەکردەوە. ئەو کاتەو لەبەردەم جامخانەی دوکانێك، کە خشڵی کۆنی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی روسی تیا نمایش کرابوو، چاومان بە ژنێك کەوت لەسەر زەویەکە خۆی گرمۆڵە کردبوو و هەڵدەلەرزی. ژنەکە ئەفەریقیەکی ئەمەریکی چڵکن بوو، خۆی بە پارچە قوماشێك و کیسەیەکی پاشەڕۆی رەش پێچابوو و دەگریا. ئەو خەڵکە زۆر پەلە بەلایدا تێدەپەڕین بێئەوەی بیبینن، ژنەکە بە نائومێدیەکی زۆرەوە دەینالاند. هەموو جیهان لە ساتێکدا بۆ من لە گرتەی وێنەیەکدا وشك بوو، تەنانەت هەواش بۆ ساتێك لەبەردەم ئەو ئازارەی کە نەئەتوانرا لە نهێنییەکەی بگەی، وەستا. لە تەنیشتیەوە هەڵتوتام و هەرچی دراوێکم هەبوو پێم دا، هەرچەندە دڵنیاش بووم کە بەرازێك دێتو لێی دەبات. ویستم بەردەوام بم لەگەڵیدا، بەڵام ئەو بە ئینگلیزی قسەی نەدەکرد یان هەر زۆر دوور بوو لە قسەکردن. ئاخۆ ئەو ژنە کێ بوو؟ چۆن بەم جۆرە فەرامۆشکردنە گەیشتبوو؟ لەوانەیە لە یەکێ لە دوورگەکانی کاریبی یان لە

کەناری ئەفەریقیەوە هاتبێ و شەپۆلەکان بەرێکەوت هاوێشتبێتیانە کۆڵانی پێنجەم، هەروەك ئەو نەیزەکانەی لە شوێنی دوورەوە دەکەونە سەر زەوی. بەو هەست کردن بە گوناە و حەسرەتەی کە نەمتوانی یارمەتی بدەم یان نەمویست یارمەتی بدەم، مامەوە. من و ویللی هەر بەپەلە بەردەوام بووین لەسەر ڕۆیشتن، لەنێو سەرماو پاش چەند کۆڵانێك گەیشتینە شانۆکەو ژنەکەش بە ونبووی لە شەودا لەدوامانەوە جێما. ئەو کات بە بیرمدا نەدەهات ئەو ژنەم لەبیر بچێتەوە و لاواندنەوەکەشی بووە هاوارێك کە دانەئەمرکایەوە، تا چەند ساڵێك بەسەریدا تێپەڕی و ژیان دەرفەتێکی دامێ کە وەڵامی ئەو هاوارە بدەمەوە.

ئەو کاتانەی ویللی دەیتوانی لە کارەکەی خۆی بدزێتەوە ئەفڕی و لەهەر شوێنێکدا بومایە خۆی دەگەیاندە لام تا شەوێك یان دوان پێکەوە بەسەر بەرین. پشتگیریکردنی بەردەوامی لە خەڵکانی نەدارو ئەوانەی لەکاتی کارکردندا توشی رووداو بوبوون، زیاتر دەیبەستەوەو پەستی دەکرد وەك لەوەی خۆشی پێبدات. ژمارەی کۆچبەران لەنێوان مەکسیك و ئەمەریکای ناوەند، کە زۆربەیان کۆچبەری نایاسایی بوون، بەردەوام لەزیادبوندا بوو، بەهەمان شێوەش رقو کینەی بیانیەکان زیادی دەکرد. ویللی رێژەیەکی لەو قەرەبوانەی بۆ ئەو کەسانەی دەهاتنە لای دانوستانی لەسەر دەکرد یان لە دادگا دەستی دەکەوت، وەریدەگرت. ئەم رێژەیەش کەم بوو و جار بەجاریش کەمتر دەبۆوەو بەگرانیش دەستی دەکەوت، خۆشبەختانە ویللی کرێی نوسینگەکەی خۆی نەئەدا چونکە خۆمان خاوەنی (ماخوری ساوسالیتو)ی کۆن بوین کە نووسینگەکەی لێ بوو. تونگی ژمێریار کاری بەهلەوانی دەکرد تا بتوانێ موچە و ژمیریاری و مامەڵە بانکیەکان دەستەبەربکات، ئەم صینیە خانەدانە وەك چۆن پارێزگاری لە کوڕێکی گەمژە بکات هەروا پارێزگاری لە ویللی دەکرد، ئەمەندەش دەستی دەگرتەوە کە پیسکەییەکەی گەیشتبوە ئاستێکی ئەفسانەیی. بۆ راستیش (سیسیلیا) ی خێزانی جەختی دەکردەوە کە لە شەوداو پاش ئەوەی ئێمە نوسینگەکەمان جێدەهێشت، تونگ هەموو کاسە پلاستیکیەکانی لە خۆڵەکەدا دەردەهێنایەوەو پاکی دەکردنەوەو پاشان لە موبوقەکەدا رێکیدەخستنەوە. لەراستیشدا ئەگەر ئەو چاوە پارێزەرو پێداگرتنەی ئەو نەبوایە لەسەر ژمێریاری ئەوا ویللی بەتەواوی نقووم دەبوو.

تونگ تەمەنی 50 ساڵێك دەبوو، بەڵام لە خوێندکارێکی گەنج دەچوو، باریك و بچووك ، قژی وەك درەختێکی وشکبوو وابوو، جلو بەرگ و پێڵاوی گاوانی لەپێ دەکرد. هەرچەندە لەگەڵ ژنەکەیا لە یەكماڵدا دەژیان، بەڵام ماوەی دوو ساڵ دەبوو قسەیان نەدەکرد. لە ترسی ئەوەی پاشەکەوتەکەیان دابەش نەکەن و لە ترسی دایکیشی کە پیرەژنێکی دڵڕەق و زۆردار بوو، لەیەك جیانەدەبوونەوە.ئەم پیرەژنە ماوەی سی ساڵ دەبوو لە کالیفورنیادا دەژیاو وای ئەزانی لە باشوری صینە، یەك وشەی بە ئینگلیزی نەدەوت، لە بازاڕەکانی (تشاین تاون)

شــــتومەکی دەکــــڕی و لـــە کانتونەکانـدا گـوێی لـە رادیـو دەگـــرت و رۆژنامەشــــی لــــە دوکــانی مانــدرین لــە ســان فرانسیـــسکو دەخوێنـــدەوە. ئەوەی مـن و تـونگی بەیەکـەوە دەبەســـــــتەوە، ســـــــۆزو خۆشەویـــستیمان بـــوو بـــۆ ویللـی، هەرچـەندە هیـچمان لە زمـــانی ئـــەوی تـــر حـــاڵی نـەدەبووین. لـە سـەرەتاداو کـە تـازە گەیـشتبومە لای ویللـی، تـونگ هەڵوێستێکی بەرامبـەرم هـەبوو ئـەویش بـێ متمانـەیی پێشینە بوو هەرکاتێکیش بۆی بلوایـە ئـەم هەسـتەی خـۆی بـۆ دەردەبڕیم.

### زمان و نەریت

بـەیانیان ئـەو کاتـەی ویللـی ریـشی دەتاشـی و منـیش لـە ئاوێنەکـەوە دەمبینـی، حـەزم دەکـرد لــە خـۆم بپرسـم ئـەم پیاوە ئەمەریکیە هێند سپی و تۆکمەیـە ئـەبێ لـە چ شـەیتانیك بێـت؟ ئێمـە بـۆ پێکـەوەین؟ کـە یەکترمان ناسـی چـەند شـتێکی کـەم بەیەکـەوەی ئەبەستینەوە، هــەردووکمان لــە دوو پێگـــەی تــەواو جیــاوازەوە هــاتووین و ئەبوایـــە زمـــانێکی نـــوێی – ئەنگلوئیـسپانی– داهێـنین تـا لەیەکتر بگەین.

رابـــووردو زمـــان و داب و نـــــەریت لـــــە یـــــەکتری دووردەخـــستینەوە، هـــەروەها ئـەو کێـشانەش کـە نـاتوانرێ بـــەری لێبگیرێـــت، کێـــشەی کۆمەڵـــە منــــداڵێك کـــــە بەشـــێوەیەکی دەســـتکرد لـــە خێزانێکـــــدا بەیەکـــــەوە بەسـتراون. بـەڵام ئێمـە بـەزۆر توانیمـان فەزایـەکی بـەرین بـۆ خۆشەویستی والاکەین.

بۆ ئەوەی بمتوانیایە لەگەڵ ویللـی لـە وڵاتـە یـەککگرتوەکان دابمـــەزرێم، دەبوایـــە هـــەموو شتێکی خـۆم جێبهێڵم و چەند بمتوانیایە بۆ شەڕی ئەو ژیانـە پـــڕ شـــپرزەیەی ئـــەو ئامـــادە بکــەم. ئـــەویش، بــۆ ئـــەوەی بەردەوام بین، لەبەرامبەردا زۆر شتی کردو دەستی لەزۆر شتی خـــۆی هـــەڵگرت. هـــەر لـــە ســەرەتاوە رێــزی لــە کارەکــەم گـرت و خێزانەکـەمی پەسـەند کـــرد، بـــۆ هەرشـــتێك کـــە لەتوانایـدا بوایـە لەگـەڵما بـوو. پاڵپـــــشت و پارێزگـــــاری لێئـەکردم تەنانـەت لـە خۆشـم، رەخنـــەی لێنەئـــەگرتم و بـــە هێمنـــی گاڵتـــەی بەحـــەزەکانم دەکـــرد، نەیئەهێـــشت کـــەس زیـــادەڕۆیی لەگـــەڵ بکـــات، کێبڕکێکـی لەگـەڵ نـەدەکردم، تەنانـــەت کـــە ئـــاژاوە لـــە

نێوانمانـدا دەبـوو جوامێرانـە مامەڵەی لەگەڵ دەکردم، ویللی بـەرگری لـە مەیـدانی خـۆی دەکـرد بـێ ئـەوەی پێـدابگرێ لەسەر ترسـی خـۆی، هەمیشە ئـەیوت کـە ئـەو بازنەیـەکی بـچووکی بـە دەوری خۆیـدا کێـشاوەو جگـە لـە مـن و خێڵەکەی نەبێت بۆ کەس نییە لاقەی بکات.

لە ژێـر ئەو روپۆشـە تونـدو رەقـەی ویلیـدا، شـیرینیەکی فراوان نوسـتووە. ئەو هـەروەك سەگێکی پیر بەسۆز بوو. بەبێ ئـەو منـیش نەمئـەتوانی زۆر شـت بـەم هێمنیـە گەورەیـەی ئێـستا بنووسـم، چـونکە ئـەو بایـەخی بە هەموو شتێك ئەدا کـە منـی ئەترسـاند، هـەر لـە رێکەوتنـــــەکانم و ژیانـــــە کۆمەڵایەتیـــــەکانمان تـــــا کارپێکردنی نامۆترین ئامێری ناو ماڵ. سەرەڕای ئەمەش کە ئـەمبینی لـە پاڵمـدا سەرسـام دەبووم، من لەسـەر ئامادەگییە گەورەکـەی راهـاتووم و چـیتر نـاتوانم بـێ ئەو بـژیم، چونکە ویللـی ماڵەکـەم و ژیـانم پـڕ دەکات.

سەرچاوە:
www.alittihad.ae

# بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی ڕەهەند

**لەماوەی مانگەكانی كانونی یەكەمی ساڵی 2007 و مانگی كانونی دووەمو شوباتی 2008دا، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم كۆمەڵێ كتێبی نایابو بەپێزی خستە كتێبخانەی كوردییەوە، كتێبەكانی ئەم سێ مانگەی دەزگای سەردەم دەكرێ بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلینیان بكەین: لێكۆڵینەوە، مێژو، ڕۆژنامەگەری، ئەدەب. لە خوارەوە هەندێ لەو كتێبانە دەخەینەڕوو.**

## تیرۆریسم وەك بیناكردنی كۆمەڵایەتی

ئەم كتێبە یەكێكە لەو كتێبە زۆر باشانەی قسە لەسەر دیاردەی تیرۆرو كەسی تیرۆریست دەكات، كتێبێكە تەواو لەكاتو ساتی خۆیدا بڵاوبوەتەوە. ئاشكرایە لەم ڕۆژگارەی ئەمرۆماندا قسەكردن لەسەر تیرۆر یەكێكە لە بابەتە گرنگو هەستیارەكانی سەرجەم ناوەندە ڕۆشنبیریو ئەكادیمییە ناوخۆییو جیهانییەكان. لە ئێستادا تیرۆر بووەتە ئەو تارماییەی باڵی بەسەر بەشێكی گەورەی جیهاندا كێشاوە، تارماییەك ژیانی هەزاران بگرە ملیۆنان مرۆڤی خستۆتە مەترسییەوە. ئەم كتێبە لەلایەن نوسەرەكەیەوە "عادل باخەوان" كراوە بە پێنج بەرگەوە، هەر بەرگەی دەكرێت بە شێوەیەكی سەربەخۆ بخوێنرێتەوە، واتە خوێنەر دەتوانێت لە بەرگی پێنجەمەوە دەستپێبكاتو بە بەرگی یەكەم كۆتایی پێبێنێت، هەروەك دەتوانێ لەبەرگی یەكەمەوە دەستپێبكاتو بەبەرگی پێنجەم كۆتایی پێبێنێت.

بەپێی بەرگی دووەمی ئەم كتێبەبێت دیاردەی تیرۆر مێژوویەكی دووردرێژی هەیەو ڕەگەكانی دەگەڕێتەوە بۆ دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر، واتە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی فەلەستین لەلایەن (ڕۆم)ەوە داگیردەكرێتو یەكەم گروپی تیرۆرست لە مێژودا بەناوی (زێلۆتیەكان) دروستدەبێت. دواتر هەر لەم بەرگەدا خوێنەر ئاشنادەبێ بە یەكەم گروپی

تیرۆرست لە مێژوی ئیسلامدا، کە گروپی (بکوژەکان) بووەو سەرکردەکەی ناوی "حەسەنی سەباح" بووە. ڕەنگە بۆ خوێنەری کورد بەرگی پێنجەم کە نزیکەی سێ سەد لاپەڕەیە، گرنگییەکی زۆری هەبێت، چونکە لەم بەرگەدا بە درێژیو بەشێوەیەکی ئەکادیمی باس لە ئەزمونی تیرۆر لە کوردستاندا دەکات کە لە گروپی تیرۆریزمی ئەنساری ئیسلامدا دەگاتە لووتکە. گرنگی ئەم بەشەی کتێبەکە لەوەدایە باس لە کۆمەڵێ ڕوداو دەکات کە چەند ساڵێکە ڕویانداوەوبەئاسانی لە یادەوەری خوێنەردا ماونەتەوە، واتە ئەو ڕوداوانە لە گۆڕەپانی کوردستاندا ڕویانداوەو هەندێکیمان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە بینیوە، لێرەوە کاتێ نوسەر دێت و قسە لەسەر ئەو ڕوداوە تیرۆرستیانە دەکات، خوێنەر بەتەواوی ئاگاداری ڕوداوەکەیەو تێیدا ژیاوەو لە نزیکەوە بینیویەتی، ئەمەش یارمەتییەکی باشی خوێنەر دەدات بە ئاسانی لە بابەتەکە بگات، ڕوداوەکانیش بریتین لە:

یەکەم: قەسابخانەکەی خێڵی حەمەو کوشتنی دیل، لە 23 ئەیلول 2001

دووەم: هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی دکتۆر بەرهەم ساڵح، 2 نیسانی 2002

سێیەم: هەڵدانەوەی گۆڕی شێخەکانی بیارە، 20 تەموزی 2002

چوارەم: تیرۆرکردنی شەوکەتی حاجی موشیر، 8 شوباتی 2003

پێنجەم: تەقاندنەوەی هەردوو بارەگای پارتیو یەکێتی لە شاری هەولێر، 1 شوباتی 2004

شەشەم: هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی مەلا بەختیار، 25 تشرینی یەکەمی 2005

لە واقیعدا دوای بڵاوبونەوەی ئەم کتێبە، دەتوانین بڵێین ئێستا ئێمە لە کتێبخانەی کوردیدا خاوەنی کتێبێکین کە بەشێوەیەکی ئەکادیمیو زانستی قسەی لەسەر تیرۆرو کەسی تیرۆرست کردووە، لێرەوە سوپاسی برای نوسەر دەکەینو دەستخۆشی ئەم بەرهەمە پڕ زانیارییەی لێدەکەین. ئەم کتێبە تیراژەکەی دوو هەزار دانەیەو نرخەکەی هەشت هەزار دینارە.




## بنەماکانی تۆتالیتاریزم

ئەم کتێبە یەکێکی دیکەیە لەو کتێبە نایابانەی لە کۆتایی ساڵی 2007 کەوتە کتێبخانەی کوردییەوە. "هانا ئارێنت" کە نوسەری کتێبەکەیە، ساڵی 1906 لە شاری هانۆڤەری ئەڵمانیا لەدایك بووەو لەساڵی 1976 لە نیۆیۆرك کۆچی دوایی کردووە، ئەم خانمە لە زانکۆی (هایدڵبۆرگ)و لە بواری فەلسەفەدا دکتۆرای بەدەستهێناوە. لەگەڵ بەرپابونی جەنگی جیهانی دووەم، ئەڵمانیا بەجێدەهێڵێو بەرەو ئەمریکا کەوتووەتەڕێ، لە زانکۆکانی

پرینستۆن، کالیفۆرنیا، کۆلۆمبیای ئەمریکادا سەرقاڵی وانە وتنەوەو توێژینەوە بووە. ئەم کتێبەی (بنەماکانی تۆتالیتاریزم) بەیەکێك لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ئەم نوسەرە دادەنرێت.

دکتۆر "شاهۆ سەعید" پێشەکییەکی بۆ کتێبەکە نوسیوە، لەو پێشەکییەدا هاتووە: (تۆتالیتاریزم تەنها ماشێنێکی سەربازی نییە کە لە هەوڵی یەکڕەنگکردنی هەمو کەرتە میللی و کۆمەڵایەتی و دەوڵەتییەکاندا بێ، بەڵکو هەمیشە جێگۆڕکێ بە کەرتەکان دەکا و ڕێگەنادا




غروری دەسەڵات، تەنانەت غروری ملکەچ بوون بۆ دەسەڵات لەناخی هیچ کەسێکدا چەکەرە بکا. ڕژێمێکە تەنها لەگەڵ دوژمنەکانیدا دڵڕەق نییە، بەڵکو لەگەڵ پێڕەوانی خۆشیدا دڵڕەق و توند ڕەفتارە). ئەم کتێبە لەلایەن نوسەر و وەرگێڕ حەمە ڕەشیدەوە کراوە بە کوردی تیراژەکەی دوو هەزار دانەیەو نرخەکەی پێنج هەزار دینارە.

## چەند وێستگەیەك لە جیاوازییە فیکرییەکان

خوێنەر لەم کتێبەدا ئاشنایەتی لەگەڵ فیکری چەند بیرمەندو ڕۆشنبیرێکی گەورەی سەر بە نەتەوە جیاواز جیاوازەکان پەیدادەکات. وەرگێڕی ئەم کتێبە "ڕێبوار حەمە تۆفیق" لەو پێشەکییە کورتەی بۆ کتێبەکەی نوسیوە دەڵێ: (ئەو نوسینانەی کە لە دوتوێی ئەم نامیلکەیەدا هاتووە، تێکڕا دەقی فیکرین و پەیوەندییان بەلایەنە جیاوازەکانی فەلسەفە، هزر، مێژوو، بونگەری، سیاسەت، زمانەوانی..هتد، هەیە. هەریەکەیان لەشوێنی خۆیدا وەڵامدەرەوەی ئەو پرسیارەن کە لەسەر جیاوازی وێستگەیەك لە وێستگە فیکرییەکان دەکرێت).

مەبەستی سەرەکی بەڕای وەرگێڕ لە وەرگێڕانی ئەم وتارانە، ئەوەیە خوێنەری کورد بەو جیاوازییە فیکری و فەلسەفییانەی نێوان




فەیلەسوفان یان بیرمەندان یاخود نوسەران بناسێنێ، وەرگێڕ لە ڕێگەی وەرگێڕانی کۆمەڵێ دەقی هەمەڕەنگەوە دەیەوێ لەیەککاتدا دوو مەبەست بخاتەڕوو، یەکەمیان ئەوەیە خودی دەقەکان وەك دەقێکی فیکری نایاب بخاتەبەردەستی خوێنەر، دووەمیان ئەوەیە هەوڵیداوە لەمیانەی ئەو دەقانەوە کۆمەڵێ جیاوازی بخاتەڕوو، بۆ نمونە هەوڵیداوە جیاوازییە فیکرییەکانی نێوان (مرۆڤگەرایی و ڕەچەڵەکناسی، فیزیای کۆن و فیزیای نوێ، حەقیقەت لای پۆپەر و حەقیقەت لای تۆماس کۆهن) دەستنیشان بکات، هەر لەبەر ئەم جیاوازیانەشە ورگێڕ کتێبەکەی ناوناوە: (چەند وێستگەیەك لە جیاوازییە

فیکرییەکان). ئەم کتێبە گەرچی تەنها 105 لاپەڕەی نیو ئەی فۆڕە، بەڵام ناوەڕۆکێکی گەورەو بەپێزی لەخۆگرتووە. تیراژەکەی هەزار دانەیەو نرخی تەنها هەزارو پێنجسەد دینارە.

## موقەدەس و کولتور

ئەم کتێبە باس لە ململانێ و بەریەککەوتنی جیهانی ڕۆژئاواو جیهانی ئیسلامی دەکات، باس لەو قەیرانە فیکریی و ڕۆشنبیرییە دەکات کە لەنێوان ئەم دوو جیهانەدا لەئارادایە، قەیرانی بیرکردنەوەو ئازادی گوزارشتکردن. لەواقیعدا ئەوەی لە ڕۆژئاوا وەك بەشێك لە ئازادی بیروڕا تەماشادەکرێ، لە جیهانی ئیسلامیدا وەك بەشێك لە سنوربەزاندن و گاڵتەکردن بە شتە پیرۆزەکانی ئیسلام لەقەڵەمدەدرێ، ئەوەی لەوێ بەناوی نەبونی سانسۆرو ئازادی میدیا و ڕۆژنامەگەری، باسی لێوەدەکرێ، لێرە دەبنە کۆمەڵێ هێڵی زۆر سورو بەزاندنیان کارەساتی گەورەی لێدەکەوێتەوە، لەم ڕوانگەوە بەشی هەرە گەورەی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو دوانزە وێنەیەی لەمانگی ئەیلولی ساڵی 2005، لەڕۆژنامەی (یولاندس بۆستن)ی دانیمارکی، لەسەر پێغەمبەر بڵاوکرایەوە. ئەو ڕۆژنامەیە وەك لەم کتێبەدا ئاماژەی پێکراوە یەکێکە لە پڕفرۆشترین ڕۆژنامەکانی دانیمارك، ڕۆژانە نزیکەی 150 هەزار دانەی لێ بڵاودەبێتەوە، بارەگاکەی دەکەوێتە (فیجی جی)یەوە کە یەکێکە لە گەڕەکەکانی وڵاتی دانیمارك.

ئاشکرایە بڵاوکردنەوەی ئەو وێنانە بووە هۆی ئەوەی لە جیهانی ئیسلامیدا چەندین خۆپیشاندانی توندوتیژ بێتەئاراوە کە تێیدا ژمارەیەکی زۆر کوژراو بریندارى لێکەوتەوەو چەندین باڵیۆزخانەی وڵاتانی ڕۆژئاوا کەوتنە بەر پەلاماری خۆپیشاندەرە توڕەو هەڵچووەکان.

بڵاوبونەوەی چەندجارەی ئەو وێنانە، بووە هۆی ئەوەی زۆرێك لە ئیسلامییە توندڕەو دەمارگیرەکان، ئەم هەلە بقۆزنەوەو تادوا سنور مەسەلەکەیان گەورەکردو چی ڕق و بوغزی خۆیان هەیە بەرامبەر بە ڕۆژئاوا هەڵیڕێژن. لە چەندین وڵاتی ئیسلامی هێرشکرایە سەر ئەو شوێنانەی وەك ڕمزێکن بۆ ڕۆژئاوا، لەوانە کڵێساکان، خەڵکانی مەسیحی، باڵیۆزخانەو کونسوڵخانەکان.




مامۆستا "سەباح بەرزنجی" کە پڕۆفیسۆری یاریدەدەرە لە زانکۆی سلێمانی، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، پێشەکییەکی کورتی بۆ ئەم کتێبە نوسیوە، مامۆستا لەو پێشەکییەدا بڕوای وایە دەبێ وەڵامی نووسین بە نووسین بێت نەك بە تۆقاندن و هەڕەشە، بەلای مامۆستاوە ئەمە سادەترین بنەمای تەعامولە لە ئیسلامدا. ماوەتەوە بڵێین ئەم کتێبە لە کۆتاییەکەیدا پاشکۆیەکی وێنەو زانیارییەکانی لەخۆگرتووە، لەم پاشکۆیەدا هەندێ لەو وێنانەو لەو ڕۆژنامە عەرەبیانەی دواتر وێنەکانیان بڵاوکردەوە دەبینین، هەروەها وێنەی هەندێ لە خۆپیشاندانەکان دەبینین، لەوانە سوتاندنی باڵیۆزخانەی دانیمارك لە شاری بەیروت،

هێرشکردنە سەر بارەگای یەکێتی ئەورووپا لەشاری غەزەی فەلەستین.

دواجار پێویستە ئاماژە بەوە بدەین نوسەری کتێبەکە "سەلام عەبدولکەریم" خوێندکاری ماستەرە لەبواری مێژوی هاوچەرخ لە زانکۆی سلێمانی. ئەم کتێبە 158 لاپەرەی نیو ئەی فۆرەو تیراژەکەی هەزار دانەیەو نرخی دووهەزار دینارە.

### کتێبەکانی بواری ئەدەب:
### شانۆنامەی دەرگا




ئەم شانۆنامەیە یەکێکە لەو دەقە جوانانەی نوسەری عەرەب "یوسف السائغ" نوسیویەتی و لەلایەن "جەمال غەمبار"ی شاعیرەوە بەزمانێکی پاراوی شاعیرانە کراوە بەکوردی. دەقەکە باس لە داب ونەریتێکی کۆن دەکات، کە بریتییە لەوەی کاتێ پیاوێك دەمرێ، پێویستە ژنەکەشی بە زیندوویی لەگەڵیدا بنێژرێت، بەپێچەوانەشەوە کاتێ ژنێك دەمرێ، پێویستە مێردەکەشی بە زیندوویی لەگەڵیدا بنێژرێت. ئیدی وا رێکدەکەوێت پیاوێك دەمرێ و ژنەکەی بەزیندووی لەگەڵیدا دەنێژرێ، پاشان ژنێك دەمرێ و پیاوەکەی بەزیندووی لەگەڵیدا دەنێژن، دواتر لە جیهانی مردوان و لەناو گۆڕستانەکەدا، ئەو ژن و پیاوە زیندووە کە لەگەڵ مردووەکاندا نێژراون، بەیەکدەگەن، لێرەوە سەرگوزشتەی ئەو دوو مرۆڤە زیندووە دەستپێدەکات. دوو مرۆڤی زیندوو لەناو کۆمەڵێکی زۆری ئێسك وپروسکی مردووەکاندا، دەیانەوێ سەرەتایەکی تازە بۆ ژیانێکی تازە دەستپێبکەن، دەیانەوێ سەرلەنوێ لەناو ئەو هەمو مردووەدا مانایەك بە بونی خۆیان بدەن و جارێکیترو لە شوێن و جێگایەکی دیکەدا، کە گۆڕستانە، زیندەگی بکەن. ئەم دەقە لە ساڵی 2007 لە لایەن هونەرمەند و دەرهێنەری بەتوانا "کامەران ڕەوف" خرایە سەرشانۆ، لەو نمایشەی "کامەران"دا کە لە هۆڵی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان پێشکەشکرا، هونەرمەندان "شەماڵی عەبەرەش" و "شادان فوئاد" ڕۆڵی ئەو پیاو ژنە زیندووەیان بینی کە لەگەڵ مردووەکاندا بە زیندوویی نێژران و توانیان زۆر سەرکەوتوانە ئەو ڕۆڵە ببینن، هەروەها هەردوو هونەرمەند "سیروان جەمال" و "سۆران ئیسماعیل" بەشداربوون لە نمایشکردنەکەدا. ئەم کتێبە 117 لاپەرەی بچوکە و تیراژەکەی پێنجسەد دانەیەو نرخی هەزارو پێنجسەد دینارە.




### پادشای تەنیایی
کۆمەڵە چیرۆکێکی چیرۆکنوسی کوردستانی

